بەرگی دووەم

د - ش

# ئەلمونجید

## بە کوردی

فەرهەنگێکی عەرەبی - کوردییە



وەرگێرانی

جەلال مەحمود عەلی سوبحانی

# ئەلمونجید

## بە کوردی

**فەرهەنگێکی عەرەبی - کوردییە**

**بەرگی دووەم**

**د - ش**



وەرگێڕانی

**جەلال مەحمود عەلی سوبحانی**




د: (اَلــدال): هەشــتەمین پیتــی ئەلفوبێــی عەرەبییەوە کۆی دال لــە ژمێرەی پیتەکاندا (٤)ە.

دأب: ١-(دَأَبَ- فِي العَمَلِ). دَأْباً و دَأَباً و دُؤُوباً: لە کارکەدا سەرومڕ کۆششیکردو ماندوو بوو/ خۆی زۆر ڕەتاند.

(دائِب و دَؤُوب): کۆششــکەرو دەماخسووتێن لە کاردا/ خۆڕەتێن لە کاردا.

(- الدابَّــة). دَأْبــاً و دَأَبــاً: تونــدو خێــرا چوارپێکەی لێخوڕی.

(أَدْأَبَ- هُ). إِدْآبــاً: ١-ماندویکــرد ٢-ناچــاری خۆماندووکردن و کۆششیکرد.

(اَلدَئِب): ماندوو هیلاك.

(اَلدَّأْب والدَأَب): ١-ڕەنجدان و خۆماندووکردن ٢-شەکەتیی و کفتی ٣-خوو.

٢-(دَأَبَ- فِي العَمَــلِ). دَأْبــاً و دَأَبــاً و دَؤُوباً: بێپچڕ/ سەرومڕ/ بەردەوامبوو لە کارەکەیدا.

(دائِــب و دَؤُوب): ســەرومڕ کارکــردە/ بەردەوامبوو.

(أَدْأَبَ- ە): ١-سەرومڕ کاری پێکرد ٢-ماندوویکرد ٣-پشووینەدا ٤-هەمیشەییکرد.

(اَلدائِبان): شەوو ڕۆژ.

(اَلدَّأْب و الدَأَب): ١-نەریت ٢-ڕەوشت و خوو.

٣-(دَأَبَ- هُ). دَأْباً و دَأَباً: دەریکرد.

(دَأَثَ). دَأْثاً: قورسبوو.

(-الثَّوبُ): کراسەکە پیسبوو.

(- الثَّوبَ): کراسەکەی پیسکرد.

(اَلدِئْــث): ڕق و کینەیــەك کــە لــە دڵ دەرنەچێت.

(اَلدَأْثاء (ج) دَآثِ): ژنە کۆیلە.

(اِبنُ دَأْثاء): گەوج.

دَأَدَأَ: ١-(دَأْدَأَ. دَأْدَأَةً و دِئْــداءً): تاتوانــی قووچاندی/ زۆر توند هەرایکرد.

(دَأْدَأَ- فِي إِثْــرِهِ. دَأْدَأَةً و دِئْــداءً): شــوێنپێی

هەڵگرتو دوایکەوت.

٢-(دَأْدَأَ- الشَـيْءَ. دَأْدَأَةً ودِئْداءً): شـتەکەی داپۆشی.

٣-(دَأْدَأَ- الشَـيء. دَأْدَأَةً ودِئْـداءً) (ضد):١- شـتەکەی بزوانـد/ جووڵاند ٢-شـتەکەی لە جووڵە خست/ وەستاندی.

(تَـدَأْدَأَ) (ضد):١-کەوتە جووڵـە/ بزوا ٢-لە جووڵە کەوت/ وەستا.

٤-(تَدَأْدَأَ- عَن فَرَسِهِ): لە چارەویکەی گلا.

(- الحَجَرُ):بەردەکە (گلۆر بووەوە/ تلبووەوە/ خلبووەوە.

٥-(دَأْدَأَ- القَـومُ دَأْدَأَةً ودِئْداءً): خوێشـگەل تێکچرانو تەنگیان بە یەك هەڵچنی/ شـەرە شانیانکرد.

(تَدَأْدَأَ- القَـومُ):تێکچرانو تەنگیان بە یەك هەڵچنی/ شەرە شانیانکرد.

٦-(تَدَأْدَأَ- عَنهُ): خۆی لێلادا/ لێی لاکەوت.

(- في مَشـيِهِ): بـەلارەوە لارەوە رۆیشـت/ لەنگەی بۆ کرد.

٧-(اَلـدَأْدَأُ والـدُؤْداء والـدَأْدَاَةُ والـدَأْداءَةُ (ج) دَآدِيء- مِـنَ اللَّيالـي): شـەوەزەنگی نەموستەچاو.

دار: (اَلدار صِيني) (ن):دارچینی. درەختێکە وەك هەنار لە چیندا هەیە.

دأص: (دَئِـصَ. دَأصاً):لە خۆشـیاندا کەوتە (جرتو فرت/ هەڵپەڕینو گۆرانی).

(- البَعِـيرُ): حوشـترەکە قەڵـەو بـوو و لێکرەوایەوە/ قەڵەویی و لێکرەوانەوە.

دأظ: (دَأَظَ- الإناءَ. دَأْظاً): قاپەکەی پڕکرد.

(- الرَجلَ):١-زۆری لە پیاوەکە کرد کە لەسەر تێریی بخوات ٢-رقیهەستاند ٣-خنکاندی.

(دَأَظَ- القَرحَـةَ):بڕینـە کۆنەکـەی دڕیو دەربوو.

(-دَأَظاً):قەڵەو بوو.

دأل: ١-(دَأَلَ ودَأَل. دَأْلاً ودَأَلاً): بێهێزانـە رۆیشت.

(داءَلَ- هُ. مُداءَلَةً):لە رۆیشتندا بۆڕیداو لەو خێراتر رۆیشت.

٢-(دَأَلَ- هُ. دَأْلاً و دَأَلانـاً):فێڵیلێکـرد/ لـە خشتەیبرد.

(داءَلَ- هُ. مُداءَلَـةً): هەڵیخەڵەتانـد/ فێڵیلێکرد/ لە خشتەیبرد.

(اَلـدَأْل والدُئِـل والـدُؤُل والـدَأَلان) (ح): ١-چەقـەڵ (لەبـەر پێچووپەنـاو فێڵـی وا ناونـراوە) ٢-(ح) گورگ ٣- (ح) گیاندارێکە لە مشکی سەر دارخورما دەچێت.

(الدُؤَالَة):رێوی.

٣-(اَلدُؤْلُول (ج) دَآليل):١-زۆرزانی کەڵەکباز ٢-چورتوم.

(«وَقَعَ القَومُ في دُؤْلُول):خوێشـگەل کەوتنە گێژاوی سەرلێتێکچوونەوە/ گرفتاربوون.

دأم: (دَأَمَ- الحائِطَ). دَأْماً:دیوارەکەی (پشتنا/

قایمکرد).

(- الرَجُلَ): خۆی هەڵدایە سەر پیاوەکەو سواریبوو.

(تَدَأَّم- هُ الماءُ): ئاوەکە دایپۆشی.

(تَداءَم- ت عَلَیهِ الهُمُومُ أوِ الأُمورُ): خەمو مەراق یان کاروبار (لەسەری کەڵەکەبوو/ کۆبووەوە).

(ألدَأم): ئەوەی کە داتدەپۆشێتو بە ژێریەوە دەبیت.

(ألدَأماء): دەریا.

دأی: (دَأَی- الذِئبُ لِلصَّیدِ. دَأواً و دَأیاً): گورگەکە خۆی بۆ نێچیرەکە نایەوە، فێڵیلێکردو هەڵیخەڵەتاند.

(ألدأي (ج) دَأیات): تەختەی سنگ کە دانە پەراسووەکانی پێوە بەندە.

(إبنُ دَأیَة) (ح): قەلەرەشکە.

(ألدایَة (ج) دایات) (فارسیة): مامان.

دبّ: (دَبَّ- السَّقَمُ فِي الجِسْمِ أو البَلَى فِي الثَّوبِ. دَبّاً ودَبیباً): نەخۆشیەکە لە لەشیدا تەشەنەیکرد/ تەنییەوە یان کۆنیی (دایە بەرگەکە/ بەرگەکە کۆنبوو).

(-الجَدْوَلُ): جۆگەکە (رۆیشت)/ کشا.

(أدَبَّ- إلى أرضِهِ جَدْوَلاً): جۆگەیەکی بۆ زەویەکەی راکێشا.

(«أدَبَّ البِلادَ»): خەڵکی وڵاتەکەی کەوتە هاتوچۆو جموجووڵ کە دادو خۆشیی لە وڵاتەکەدا بڵاوکردەوە.

(هُوَ یُدِبُّ عَلَینا عَقارِبَهُ ویَحْرِشُ عَلَینا أقارِبَهُ): خۆی ئازارماندەداتو خزمەکانیش دەکاتە سەرمانو لێمان هاندەدات/ تێمانبەردەدات.

(ألمَدَبّ): ١-رۆگە/ رێرەو ٢-ئاوەڕۆ.

(«مَدَبُّ السَّیل»): ئاوەڕۆی، لێشاوەکە.

(مَدَبُّ النَّملِ): رۆگەی مێرووڵە.

(ألدُّبُوب والدَّبیوب): بەدزمان/ بوختانکەر/ دووزمان/ ئاشووبگێر.

٢-(دَبَّ. دَبّاً و دَبیباً): وەك مار کشا یان بە چوار چنگۆڵە وەك منداڵ رۆیشت/ گاگۆڵکێیکرد.

(هُوَ أکْذَبُ مَن دَبَّ و درَجَ»): ئەو لە هەموو زیندوو مردوویەك درۆزنترە.

(أدَبَّ- الصَبيَّ): منداڵەکەی خستە گاگۆڵکێ.

(ألدُبّ (ج) أدْباب ودِبَبَة (م) دُبَّة) (ح): ورچ.

(«رَکِبَ دُبَّ فُلان أو دُبَّةَ فُلان»): رێی ئەویگرت. شوێن پێی ئەو کەوت.

(ألدُبّي): پێکوت/ پێدار.

(لَیسَ في الدارِ دُبِّي أو دِبِّي): لە خانووەکەدا پێدارێکی تێدا نییە (ئەمە تەنها بۆ نەبوون دەوترێت).

(ألدَبَب) (ج): کوێرەکەی ساوای تازە بوو.

(ألدَّبیب) (مص): هەموو پادارێك و هەرچی بەسەر زەویدا بروات.

(اَلدابَّــةُ): مێــی وشــەی (اَلدّاب): ئــەوە بە تایبەتی بۆ ئــەو چوارپێیانــە بەکاردێت کە سواریدەبن‌و بارەبەرن (بۆ مێ‌و نێرە).

(دابَــة): چوارپێیەك لــەو چوارپێیانە (ئەم (ە)یە بۆ یەکێکە.

(اَلدُوَیبَة) (ح): بچووککراوەی (دابة )یە.

(اَرضٌ مَدَبَّة): زەویەکە/ شوێنێکە کە ورچی زۆر بێت.

(اَلدَّبُــوب والدَیْبُــوب): هەموو گۆشــتنێك/ قەڵەوێك/ تێکسمراوێك.

(ناقَةٌ دَبُوب): مێحوشــترێکی زۆر قەڵەو کە لەبەر گۆشت‌و قەڵەویی وەك خۆی بەکێشبکات وابێت.

(اَلدَّبّــاب (م) دَبّابَة): ١-خشــۆکێکی تیژڕەو ٢-پێدارێکــی گورجــڕەو ٣-لاوازێــك کە خۆی بەکێشبکات.

(اَلدَّبّابَة (ج) دَبّابات) (ا ع): ١-ئامێرێکبوو لە شــەڕدا دەچوونە ناوی‌و دەچوونە بن قەڵاکە، هەر لە ناویەوە قەڵاکەیان کونەکردو لەوێوە هێرشــیان دەبردە ناو قەڵاکــەوە ٢-زرێپۆش/ تانك.

٣-(اَلــدُّب الأکبَــر) (فــك): حەوتەوانــەی گەورە.

(اَلدُّبُّ الأَصغَر): حەوتەوانەی بچووك.

(اَلدَبَّة (ج) دِباب): ١-دەفرێکە بۆ شــلە ڕۆن‌و شتیتر ٢-کووپەی شووشــە ٣-شوێنێك لی زۆر بێت/ لمکە.

(- ج دَبّ): گەنەجمووی دەمووچاو.

(اَلدَبَب): ١-مووی تازە دەرهاتووی دەموچاو/ گەندەموو ٢-تووکی زۆر.

(اَلدَبیب) (ح): ناوروونکەرە.

(اَلدَّبوب والدَیْبُوب): ئەشکەوتی قووڵ.

(اَلدَبّاء الواحِدَةُ دَبّائَة) (ن): کوولەکە.

(اَلدَبّان): ١-گەنەمپەر ٢-گەنەمتووك ٣-تووك کە تازە دەرچێت ٤-زۆریی تووك/ قژ.

(اَلأَدَبّ (م) دَبّاء): ١-کەســێکە کە دەموچاوی تازەمــووی دەرکردبێــت ٢-(ح) حوشــتری (پرتووك/ توكن).

٤-(دَبْــدَبَ). دَبْدَبَــةُ (عامیــة): مندالەکە گاگۆڵکێیکرد.

(- الحافِــرُ علــی الأرضِ): ســمی وڵاخەکە تەپەیهات‌و تەپەتەپەیکرد.

(اَلدَبْــداب (ج) دَبادِیــب): تەپــڵ (لەبــەر دەنگەکەی).

ملحق

دبّ: (دبِّــبَ) (هـ): ســەرێکی تیژی بۆ کرد/ نووکەکەی تیژکرد.

(دَبَّبَ قَضِیاً): نووکــی چێوێکی هەلووکێکی تیژکرد.

---

دبــأ: دَبَــأَ- ەُ. دَبْــأً): تەپەی لێهەســتاندو دارکاریکرد.

(-الشَيْءَ): شتەکە لە جووڵە کەوت/ ڕاوەستا.

(دَبَأَ- هُ و عَلَيهِ): دایپۆشی‌و شاردیەوە.

دبج: ١-(دَبَــجَ و دَبَّجَ- هُ دَبْجــاً): ١-نیگاری کێشا ٢-ڕازاندیەوەو جوانیکرد ٣-چاکیکرد.

(- الطَّيْلَسانَ): بەرگکەی بە نیگار ڕازاندەوەو نیگاری لەسەر چنی.

(الدِيبــاج (ج) دَبابــج و دَبابيــج. الواحدة ديباجة) (فارسية): کراسی ئاوریشمین.

(الدَبَّاج): فرۆشیاری کراسی ئاوریشمین.

(المُدَبَّج)»: ئاوریشمچن‌و نیگارکێشراو.

٢-(الدِّيباجَة): ڕوو.

(«فلاني يَصُونُ ديباجَتَهُ»): خۆی لە نەنگیی دەپارێزێت.

(«يَبذِلُ ديباجَتَهُ»): نەنگیی بەســەر خۆیدا دەهێنێــت‌و ئابــڕووی خــۆی دەبــات (ئەمە ئیدیۆمن).

(ديباجَة الكِتاب): پێشەکیی کتێب.

(ديباجَــةُ الوَجــهِ): جوانیــی پێســتی ڕوو (فارسیە).

(الدِيباجَتانِ): هەردوو ڕوومەت‌و کوڵم.

(المُدَبَّــج): ١-ڕوو و ڕەوشتناشــیرین ٢-(ح) باڵندەیەکی ئاویی ناشیرین شێوەو بیچمە.

ملحق

دبج: (اَلتَّدْبيج): ١-نیگار کێشان‌و ڕازاندنەوە ٢-بــە کاڵایەکی ئاوریشــمین جــوان بکرێت‌و برازێنرێتەوە.

(الكِتابَــة المُزَخْرَفَــة): نوســراوی بە نیگار ڕازێنراوەو جوانکراو.

(اَلتَنْبيج- في البَديع): ڕازاندنەوەی ئاخاوتن بە هێنانی ئیدیۆم‌و لەو بابەتە وەك («القرشُ الأبيضِ لليَومِ الأسْودِ»): ماڵی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش.

---

دبح: (دَبَّحَ): ١-دابوو/ سەری شۆڕکردو پشتی پانکردەوە ٢-سەرشۆڕ بوو/ زەلیلبوو.

(- في بَيتِــهِ): خۆی لــە ماڵەوە هێشــتەوە/ ماڵەوەیگرت‌و نەهاتە دەرەوە.

(دَبَّخَ) = (دَبَّحَ): واتاکانی وەك (دَبَّحَ)یە.

دبر: ١-(دَبَرَ- النَّهارُ أَو الصَّيفُ دَبْراً و دُبُوراً): ڕۆژ یان هاوین (بەسەرچوو/ تێپەڕی).

(-الرجُلُ): ١-مرد\و کۆتاییهات ٢-پیربوو.

(-الكِتابَ. دَبْراً): کتێبەکەی نووسییەوە.

(-بالشَيءِ): شتەکەیبرد.

(-الحَديــثَ عَــن فُــلان): پــاش مردنــی لەسەریدواو باسیکرد.

(دَبَّــرَ- الحَديثَ): ئاخاوتنەکــەی لە زمانی یەکێکیترەوە گێڕایەوە.

(دابَرَ). مُدابَرَةً و دِباراً): مرد.

(أَدْبَرَ- فُلانٌ): فیسار مرد.

(- عَنهُ): پشتی تێکردو لێیدووورکەوتەوە.

(-تِ الدُنيا): (دنیا/ جیهان) نەهاتە بەرەوە، پشتی تێکرد.

(-الأَمــرُ): کارەکــە (بەســەرچوو/ تێپەڕی/ تەواو بوو).

(إِسْتَدْبَرَ- هُ): پشتیتێكرد.
(أَلدَّبْر) (مص): مردن.
(أَلدِبْر): مردن.
(دُبُرُ الصَّلاة): دوادوایی‌و كۆتایی نوێژ.
(أَلدَّابِر) فا): تێپه‌ڕیو/ به‌سه‌رچوو.
(«أَمس الدابِر»): دوێنێی (تێپه‌ڕیو/ به‌سه‌رچوو). (بۆ جه‌ختتكردن) وه‌كو بڵێی (رأيتُه بِعَيني): به چاوی خۆم دیم.
(أَلدابِرَةُ (ج) دَوابِر): ١-مێی وشه‌ی (أَلدابِر): ٢-به‌زین/ هه‌ڵاتن.
(أَلأَدبار): هه‌ڵاتن.
(أَلدَّبْرَة): له شه‌ڕدا به‌ین‌و هه‌ڵاتن.
(أَلدَبار): فه‌وتان/ مردن.
(أَلدِبار): ١-به‌زینه‌كان ٢-قه‌وماوه‌كان.
(أَلدَبْرِيُّ): نوێژی (درەنگوه‌خت/ دواكه‌وتوو).
(أَلدَّبَرِيّ): شتی درەنگان كه پاش تێپه‌ڕبوونی پێویستی په‌یدابێت.
(«شَرُّ الرَأْيِ الدُبَرِيُّ»): خراپترین ڕاڕای درەنگوه‌خته.
(«جاءَ دَبَرِيّاً»): درەنگانێك هات.
٢-(دَبَرَ- هُ). دَبْراً: به‌دوایدا هات‌و پشتیكه‌وت.
(-السَّهمُ الهَدَفَ): تیرەكه له نیشانه‌كه تێپه‌ڕی‌و پشتیكه‌وت.
(أَدْبَرَ- هُ): خستیه دوایه‌وه.

(إِسْتَنْبَرَ- هُ): هه‌ڵیبژاردو به‌دوایدا هات‌و شوێنیكه‌وت.
(أَلدُبُر (ج) أَدبار- مِن كُلِّ شيءٍ): ١-دواوه‌ی هه‌موو شتێك/ پاشینی/ دوادوای. ٢-قنگ.
(الدُبر والأَدبار): كۆتایی/ ئه‌وسه‌ری/ پاشین/ دوادوای/ دواوه‌ی.
(جاءَ دُبُرَ الشَّهرِ وفي دُبُرِهِ وعلى دُبُرِهِ و أَدبارَ الشَّهرِ وفي أَدبارِهِ): (له دوادوای/ له كۆتایی) مانگه‌كه‌دا هات.
(دُبُرُ- البَيتِ): كونج‌و دواوه‌ی خانوه‌كه.
(أَلدَبْر): پشته‌وه‌ی شته‌كه/ پاشی شته‌كه/ دواوه‌ی شته‌كه.
(«جَعَلَ كَلامي دَبْرَ أُذُنِه»): قسه‌كه‌می پشتگوێ خست. واتا به‌گوێنه‌كردم‌و خۆی لیلادا.
(أَلدابِر): ١-شوێنكه‌وته ٢-پاشكه‌وته ٣-كۆتایی/ پاشینی هه‌موو شتێك ٤-دواتیر كه سه‌رنه‌كه‌وتبێت/ تیری پاشكه‌وته.
(«مابَقِيَ في الكنانةِ غيرَ الدابِر»): ته‌نها دوا تیر له تیردانه‌كه‌دا ماوه.
(أَلدابِرَةُ): ١-ده‌ماری پشتپاژنه ٢-به‌رزه‌ی پشتسمی وڵاخ.
(دابِرَةُ الطَّيرِ): چقه‌ی باڵنده.
(أَلدِبْرَة): پاش/ پاشه‌وه.
(ليس لِهذا الأَمرِ قِبْلَةٌ و لادِبرَة): ئه‌م كاره نه بنی هه‌یه‌و نه سه‌ر/ نه پاشی هه‌یه‌و نه

پێش‌و کەس نازانێت ڕوو لە کوێیە.

(اَلدَّبِیر- مِنَ الرَّجُلِ): (پشتەوەی/ پاشی پیاوەکە).

(هُوَ ما یَعرِف قَبیلَهُ مِن دَبیرِهِ): پاش‌و پێشی خۆی (نازانێت/ جیاناکاتەوە) واتا زۆر نەزانە ([illegible]).

(اَلدَّبَـــران): (فك)، هەواری مانــگ کە پێنج ئەستێرەی تێدایەو لە گەلووی گادایە (چونکە شوێن کۆ کەوتووە بۆیە وا ناونراوە).

(الُمدابِر): خاوەن تیری دۆڕاو (لە تیربازیدا).

٣-(دَبَرَ- تِ الرِّیحُ). دَبْراً و دُبُوراً): باکە بوو بە بای خۆرنشین.

(دُبِرَ): بەربای خۆرنشین کەوت.

(أدْبَرَ- فُلانٌ): خۆی دایە بەر بای خۆرنشین/ کەوتە بەر بای خۆرنشین.

(اَلدَّبُور): بای خۆرنشین.

٤-(دَبَرَ- البَعیرُ): حوشترەکە ناوکە ڕیژ بوو.

(دَبَر): حوشتری ناوکەرێژ بوو.

(أَدْبَـــرَ- هُ القَتَـــبُ): کورتانـــی تەســـك ناوکەرێژیکرد.

(- البَعیرُ): حوشترەکە ناوکەرێژ بوو.

(اَلدَّبِر): حوشتری ناوکەرێژ.

(اَلدَّبَـرَةُ (ج) دَبَـــرَ و أَدْبـــار): بڕینـــی ناوکەرێژی.

٥-(دَبَّـــرَ- الأَمـــرَ): ١-کارەکـــەی ســـازاند ٢-تەگبیری کارەکەیکرد/ بیری لێکردەوەو بیری لە ئەنجامەکەی کردەوە ٣-پیلانی بۆ دانا.

(-علـــی هَلاکِـــهِ): پیلانـــی فەوتاندنی داناو فێڵیکردو خەریکبوو.

(تَدَبَّرَ- الأَمرَ): کارەکەی ســـازداو ڕێکخست‌و بیری لە ئەنجام‌و کۆتایی کردەوە.

(إِســـتَدبَرَ – الأَمرَ): ئەنجامـــی کارەکەی بۆ دەرکـــەوت کـــە لە پێشـــدا (ئەوەی بـــە بیردا نەهاتبوو/ بۆی دەرنەکەوتبوو).

(اَلدَّبْرَةُ (ج) دِبار): ١-ئەنجام ٢-کۆتایی.

٦-(دابَـــرَ- هُ). مُدابَرَةً و دِبـــاراً): ناحەزیی لەگەڵدا کرد/ دوژمنایەتی لەگەڵدا کرد.

(تَدابَرَ- القَومُ): ١-خوێشکەل بوون بە ناحەزو دوژمنی یەکتر ٢-لە یەکپچڕان‌و جیایی کەوتە نێوانیانەوە.

٧-(اَلدَّبْـــر. الواحِـــدَةُ دَبْـــرَة (ج) أَدْبُـــر و دُبُـــور): ١-کـــووره هەنگ‌و شـــاره زەردەواڵەو زەردەزیرە ٢-سامان‌و دارای زۆر ٣-شاخ/ چیا/ کێو ٤-زەوییـــەك لە دەریـــادا وەك دورگە ئاو دایپۆشێت‌و لێیبکشێتەوە.

(اَلدِبْر): سامان‌و دارای زۆر (بۆ تاك‌و کۆ وەك یەکە).

مـــالٌ دِبرٌ وأَمـــوالٌ دِبـــرٌ): دارای زۆر/ داراو سامانی قورس.

(اَلدابِر): ڕیشە/ ڕەچەڵەك/ بن‌و بێخ.

(«قَطَـــعَ اللّهُ دابِرَهُم»): خـــودا (ڕەچەڵەکی بڕین/ قڕی تێخستن).

(أَلدابِـرَةُ (ج) دَوابِـر): مێینـەی (بەدووم/ چارمەرش).
(أَلدَبْرَةُ (ج) دِبار): پەڵە زەوییەك كە بكرێتە كشتوكاڵ.
(أَلدِبَار): جۆگەلەی ناو كشتوكاڵ.
(أَلدَّبیر): لە خودا یاخیبوون. گوناهكردن.
(أَلدَبُّـور (ج) دَبابـیر): (ح): ١-زەردەواڵە ٢- بەرگ و پۆشاك و شێوەكەی.
(أَلْدابر): كەسێكە كە دایك و باوكی وەجاخزادە بن/ كەسێكە تانوپۆ ئاوریشمە.
(أَلْدَبُور): ١-بەرپەندار ٢-سامانداری قورس.
(أَلدَّبـورَة) = الصاقـور: چەكوشـی بـەرد ڕێكخستن و تەختكردن.
الملحق:
(دبر: التَدبـیر): ١-ڕێكخسـتن/ ڕازاندنەوەو هەڵچنین.
٢-تَدبیر الأمور: ١-ڕێكخسـتن و تەرتیبكردنی كاروبار ٢-چۆنیەتی بەرێوەبردن و ڕامیاری ٣-ئامادەكردن و ئامادەبوون و ڕێوشوێن دانان.
(«تَدبـیر مَكیـدَة»): پیلاندانانـی فێـڵ و تەڵەكەبازییەك.
(«تَدبیر مُؤامرة»): ڕێكخستن و ڕەنگڕشتنی پیلانێك.
٤-(تدبـیر خُطَّـة»): دانـان و ڕەنگڕشـتنی پلانێك.
٥-(تَدبیرُ إختِلاق): بۆ درۆ هەڵبەستنێك ڕێو شوێن دانان.
(تـدبیر عُذر): ڕێوشوێن بۆ بیانوو دانان.
٦(التَمهید لِشَيء): خۆئامادەكردن بۆ شتێك.
(«تَدبیر مواجَهَة»): تەگبیرو خۆئامادەكردن بـۆ ڕووبەڕووبوونەوەیـەك. بینینێـك ٧-باسكردن یان نووسینی بارێك یان كارێك و بۆ ئەوە هەڵسوكەوت و تەقەلادان.
(«أَلَمَـرءُ في تَفكـیرٍ واللهُ في تَدبیر»): مرۆڤ بە جۆرێك بیردەكاتـەوەو خودایش تەگبیری خۆیدەكات.
(تَدبـیرُ المَنـزِل): مـاڵ بەڕێوەبـردن و هەڵسوڕاندنی كە هی ژنە. زانست و هونەرێكە بۆ چۆنیەتی ڕێكخسـتن و ڕازاندنەوەی ماڵ و سەرپەرشـتیكردنی بـاری تەندروسـتی و ئابووری و ڕوویتری ماڵەكە.
(تَدابـیر): جێبەجێكردنـی كارێكـە كـە هێـزی دەسـەڵات دەیـكات و ڕێوشـوێنێكە وەریدەگرێت.
(«تدبیر صحي»): تەگبیری تەندروستی.
(«إتِّخَـذَ التَدابـیر اللاّزمـة»): تەگبـیری پێویستی كردو وەرگرت و ئامادە كرد.

---

دبس: (دَبَّسَ- الشَيءَ): شتەكەی شاردەوە.
(-الشَّـيءُ): شـتەكە (شـاردرایەوە/ ونبوو/ دیارنەما.
٢-(دَبَّسَ- العِنَبُ): ترێكە (گەیشـت/ تەواو شیرینبوو).

(-العَصيرُ المَغلِيُّ):ناوی ترێ کوڵاوەکە بوو بە دۆشاوی ترێ.

(- الرَجُلُ العَصير):پیاوەکە ئاویترێکەی کرد بە دۆشاو.

(أَدْبَسَ- تِ الأَرضُ):زەویەکە گیاو رووەکە تازەکەی رەش نەخشاند.

(إِدْبَسَّ- الفَـرَسُ. إدْبِساسـا: ئەسـپەکە رەنگدۆشاوییبوو.

(فَرسٌ أَدْبَس):ئەسپی رەنگدۆشاویی.

(الدُّبس):هەموو شتێکی رەنگرەش.

(الدِبْس): دۆشاوی خورماو ترێو خرنووكو شتیتر.

(الدُّبـس):١-دۆشـاوی خورمـاو شـتیتر ٢-هەنگوین.

(الدُبْسَة):سووری زۆر تێری مەیلەو رەش.

(الدَبّاس):١-دۆشاوگر ٢-دۆشاوفرۆش.

٣-(اَلدَّبـس):خەڵکێکـی زۆر زۆری هەمـوو شتێك.

(مالٌ دَبس): دارایەکی زۆر.

(الدُبُّوس (ج) دَبابيس) (فارسية): کوتەکی دار یان ئاسن کە سەرەکەی خرە.

(الدَبُّوس (ج) دَبابِيس):١-دەرزیی سـەرخر ٢-دەرزیی سنجاق ٣-دەرزیی باریك کە لە ئاسن یان زێرەو شتی پێقایمدەکرێت.

دبش: ١-(دَبَشَ- الشَـيْءَ. دَبْشـاً): شتەکەی پاككرد/ توێکڵەکەی لێکردەوە.

(- الطَّعـامَ): خواردنەکـەی (ماشـییەوە/ پاکۆیدا/ خوارد).

(دُبِشَـتِ- الأَرضُ. دَبْشاً):زەویەکە پاکۆدراو واتا هەرچی لێروابووو لە کۆتەرەدرا/ خورا.

(سَـيْلٌ دُباش):لێشـاوێکی رادەر کە هەموو شتێك رادەدات.

(مَكانٌ مَدْبُوش):شـوێنێکی قرتکراو کوللە قرتەی لێبریبوو/ هەمووی خواردبوو.

٢-(اَلدُّبْش. الواحِدَةُ دَبْشَة) (عامية):بەردە وردەو شکاو.

(اَلدَبَـش):١-کەلوپەلـی ناومـاڵ ٢-شـرکەو پرکەی ناوماڵ.

(اَلدَبْشَةُ (عامية):بێشەلان.

دبـغ: (دَبَغَ- الجِلْدَ): دَبْغاً و دِباغاً و دِباغَةً: (پێسـتەکەی/ کەوڵەکەی) خۆشەکرد. (توکی پێوە نەهێشتو نەرمیکردو بۆگەنییو تەڕیی نەهێشت).

(إِندَبَغَ): پێستەکە خۆشە بوو.

(اَلدِبْغ والدِبْغَة والدِباغ والدِباغَة): پێستەی خۆشەکراو.

(اَلدِّباغة): پێستە خۆشەکردن/ دەباغیی.

(اَلدَبَّاغ): پێستە خۆشەکەر.

(اَلمَدْبَغَة والمَدْبُغَة):١-دەباخانە/ شوێنی پێستە خۆشەکردن ٢-ئەو پێستانەی خۆشەکراون.

دبق: (دَبَقَ- الصَائِدُ الطَّيرَ دَبقاً): راوکەرەکە باڵندەکەی بە دەموکانە گرت.

(دَبِقَ- بِهِ. دَبَقاً): پێوەیلکاو بەرینەدا.

(دَبَّقَ- هُ): بە دەمووکانە ڕاویکرد.

(أَدْبَقَ- هُ): پێوەیلکاند.

(تَدَبَّــقَ- الطَّــيرُ): باڵندەکە بــە دەمووکانە ڕاوکرا.

(- الشَّيءُ): شتەکە پێوەیلکا.

(أَلدِبْــق والدابُوق والدَبُوقــاء): دەمووکانە/ جۆرە سرێشـێکی لینجی سـەوزە لــە بەری ڕووەکــی دەمووکانــە دەردەهێنرێت لە تووڵ دەدرێـــت‌و دەخرێتە سـەر درەخـــت‌و باڵندە بـــە هەڵـــە لەسەریدەنیشـێتەوەو دەیگرێت‌و ڕاویدەکەن.

(أَلدِبْق) (ن): جۆرە درەختێکی کورتە بالآیە بەرەکەی لینجە گوڵەکەی شـێوە هێشـووەو بچووکە. سـەرچاوەی زووی وڵاتە گەرمەکانە وەك هندسـتان، لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیشدا بۆ جوانیی دەڕوێنرێت، بەرەکەی دەمووکانەی لێدەردەهێنـن‌و بـۆ ڕاوکردنـی باڵنـدە بەکاریدەهێنن.

دبك: (دَبَكَ. دَبْكاً) (عامية): هەڵپەڕی پێی بە زەویدا دایان بە شتیتردادا دەنگێکی گەورە یان تەپەی لێوەهات.

(- هُ على الأَرض): توند کوتای بە زەویدا.

(- الوعــاءَ): قاپەکــەی (پڕکــرد/ لێوانلێــو کرد).

(دَبَّكَ. تَدْبِيكاً) (عامية): هەڵپەڕی، پێی بە زەویدا داو تەپەی لێهێنا.

(الدَّبْكــة): هەڵپەڕین (ناوەکــەی لە تەپەی پێوە وەرگیراوە).

دبل: ١-(دَبَلَ- الشَّيءَ) دَبْلاً و دُبُولاً: شتەکەی چاکساز کرد/ کۆککردەوە.

(- الأَرضَ): زەویەکــەی پەینڕێــژ کــردو چاککرد.

(أَلدَبْــل (ج) دُبُــول): جۆگــە نــاو (چونکە پاکدەکاتەوەو چاکدەکات).

(أَلدُبال): پەین.

٢-(دَبِــلَ- تْ فُلاناً الدَبُــولُ: دَبْلاً): (بەڵا/ چورتوم)ی (بەسەردا باریی/ تووشبوو).

(«دَبَلَتْهُ الدَبُولُ»): کۆسـتی دایکی بکەوێت‌و کوڕەکەی بمرێت.

(أَلدَبْــل (ج) دُبُول): ١-تاعون ٢-وەیی گران ٣-کۆستکەوتن/ جەرگسووتان.

(أَلدَبْلَــةُ والدُبَيْلَةُ): وەیی گــران/ چورتوم/ ئاپووره.

(أَلدَبُول): ١-جەرگسووتاو/ کۆستکەوتوو/ کوڕ مردوو ٢-وەیی گران‌و لێقەومانی سەخت.

٣-(دَبَــلَ- هُ بِالعَصــا): دارکاریکــرد/ بەدارلێیدا.

٤-(دَبَــلَ و دَبَّلَ- اللُّقْمَــةَ دَبْلاً): پاروومەکەی گەورەکرد/ بابۆڵەیکرد.

(- الشَــيْءَ): شـتەکەی لوولــداو کۆکــردەوە وەك پاروو چــۆن بابۆڵە دەکرێت‌و بە پەنجە

کۆدەکرێتەوە ئاوا.
(ألدُبلَةُ) (ج) دُبُل و دُبَل): ١-بابۆڵە/ پارووی گەورە [..]وەگراوی هەموو شتێك.
٥-(دَبِلَ دَبَلاً): قەڵەوو خرتبوو.
٦-(الدِّبْلَة (ج) دُبُل ودُبَل): کونی تەشوێ.
(الدُبْلَة و الدُبَيْلَة) (طب): دەردی ناوسك و هەناو یان دوومەڵ کە کێم و زووخی لێکدەردەکەوێت.
(الدَوْبَل) (ح): ١-کەری بچووك کە کورتەبالابێت و گەورە نەبێت ٢-(ح)بەکانە/ نێرەی بەراز.
٧-(الدِبلوماسيّ) (یونانیة): دیبلۆمات/ نوێنەری رامیاریی وڵاتەکەی لە وڵاتێکی تردا.
(ألسلك الدِبلوماسي): دەستەی نوێنەرانی رامیاریی کیشوەران لە وڵاتێکیتردا.
(الدِبلُوماسِيَّة) (یونانیة): نواندنی رامیاری کیشوەران لە وڵاتانیتر داو کارکردنیان.
ملحق
دبلج: (دَبْلَجَ): زمانی فلیمەکەی گۆڕی و کردی بە زمانێکیتر و تۆماریکرد.
(- في المَسْرَح): ئەکتەرێکی بە ئەکتەرێکیتر گۆڕی.

---

دبي: (دُبِيَ- تِ الأَرضُ): پێکورە رووەکی زەویەکەی (قرتکرد/ لە کۆتەرەدا).
(مَدْبِيَة و مَدْبُوَّة): زەویی رووەك قرتکراوو خوراو.
(أَدبَي- تِ الأَرضُ): زەویەکە پێکورەی (زۆر بوو/ تێدا).
(اَلدَبَى (ح): ١-پێکورە.
(دَباة) (ح): پێکورەیەك ٢-مێرووولە.
دث: (دَثَّ- الصَيَّادُ بِهِ. دَثّاً): راوچییەکە تێیگرت.
(- هُ): ١-بەردی تێگرت ٢-پیایدا کێشاو ئازاری پێگەیاند ٣-پاڵیپێوەنا.
(- تِ السَمَاءُ): دَثّاً: نمەنمەباران باری.
(ألدَثّ و الدَثَّة والدِثاث): سووکەباران/ نمەباران.
(ألدُثَّةُ): سووکە هەڵامەت.
(ألدَثُوث): دەرپەڕیو/ بە گوژم دەرچوو.
دثر: ١-(دَثَرَ- الرَسْمُ دُثُوراً): کەلاوەکە (تەختبوو/ دیارنەماو/ سڕرایەوە).
(داثِر (ج) دَواثِر): شوێنەوار بڕاو/ تەختبوو/ سڕراوە.
(تَداثَرَ- الرَّسْمُ): شوێنەوارەکە تەختبوو و دیارنەما/ سڕرایەوە.
(إِنْدَثَرَ): ١-سڕرایەوە ٢-پووکایەوە/ لەناوچوو.
٢-(دَثَرَ- السَّيفُ): دُثُوراً: شمشێرەکە ژەنگگرتی/ ژەنگی/ (هەڵهێنا/ لێنیشت).
(- الرَجُلُ): پیاوەکە پیر بوو.
(- الثَّوبُ): پۆشاکەکە پیسبوو/ چڵکنبوو.
(تَدَثَّرَ فَرَسَهُ): بازیدایە سەر ئەسپەکەو

سواريبوو.

(اَلدَثَر): پيسيى/ پۆخلّيى/ چلّك.

٣-(دَثَــرَ- الشَــجَرُ): درەختەكــە گــەلآى زۆربگرت.

(دَثَّرَ- هُ): بە داپۆش داپپۆشى.

(تَدَثَّــرَ و ادَّثَــرَ- بِالثَّــوبِ): بەرگەكەى لە خۆيەوە ئالآندو خۆى پێداپۆشى.

(مُتَدَثِّر و مُدَّثِّر):١-خۆپێچەرەوە ٢-خۆداپۆش لــە بنچينەدا (مُتْدَثِر)ە (ت)كە تێهەڵكێشــى

( اَلدِثــار):١-ئــەو بەرگەى لە ســەرو بەرگى سەرپێستەوە لەبەردەكرێت ٢-پێخەف.

٤-(دَثَــرَ- هُ):١-فەوتانــدى/ مرانــدى ٢-بە پێخەف داپۆشى.

(اَلداثِر):فەوتێن/ لەناوبەر.

٥-(اِدَّثَــرَ):ســامانو داراى زۆرى پێكەوەناو نايە سەريەك.

«مــالٌ دَثْــرٌ و مــالانِ وأَمــوالٌ دَثْــر»: (كۆيشــدەكرێتەوەو دەوترێــت بــە ( دُثُور): ســامانو داراى زۆرو پێكەوەنــراو/ كۆكراوە/ كەڵەكەكراو.

(اَلدَثَر):زۆر/ فرە.

(«عَسْكَرٌ دَثَر»):سەربازێكى زۆر.

(اَلدِثْر):پێكەوەنەرى سامانو ماڵ/ دارا.

(هُوَ دِثْرُ مالٍ):ماڵ پێكەوەنەرە/ دنياريكەرە/ چاك هەڵسوورێنى سامانە.

٦-(اَلدَثُور والدَثارِيّ)ە ١-تەمەڵ/ تەوەزەل ٢-خاوو خليچك ٣-خەوباز/ خەوخۆش.

(اَلأَدْثَر): بێئاگا/ بێهۆش.

دجّ: ١-(دَجَّ ودَجَجَانــاً): خوێشــگەل بــە يەكداهاتنو خاوكەوتنە رێ.

(اَلداجّ (ج) داجُّــون و داجَّة):(بۆ تاكو كۆ بەكاردێت)، كوڵهەڵگرو نۆكەرو دەستوپێوەند (چونكە هەميشە دێنو دەچنو لە هاتوچۆدانو روودەكەنە كاروان).

٢-(دَجَّ- البَيتُ. دَجيجاً و دَجَجاناً):بنميچى خانووەكە دڵۆپەيكرد.

٣-(دَجَّ- السِترَ.) دَجّاً):پەردەكەى دادايەوە.

(دَجَّجَ- تِ السَّماءُ):ئاسمان هەوريكرد.

(- هُ):لەچەك هەڵيكێشا.

(تَدَجَّجَ):خۆى لە چەك هەڵكێشا.

(«تَدَجَّج فِي شَــكَّتِهِ»):خۆى بە چەكەكەيدا كرد.

(اَلدُجَّةُ):شەوەزەنگ ٢-كێوانى رەش.

(اَلمُدَجَّج والمُدَجِّج):١-پرچەك ٢-(ح) ژيشــك (وەك چەك داپپۆشيبێت).

(اَسْوَدُ دُجَاجِيّ):رەشێكى (تاريك/ تۆخ).

(اَلدَجُوجِــيُّ والدَّيجُــوج (ج) دَياجيــج): شــەوەزەنگ/ شــەوى زۆر تاريــك/ شــەوى نەموستەچاو.

٤-(اَلدَجاج (ح) الدِجاج والدُجَاج):مريشك/ مامر.

(دَجاجَةٌ):مريشكێك.

(ج) (دُجج): كێوی‌و ماڵیی هەیە).
(اَلدَجاج الهِنْدِيّ) (ح): مریشکی حەبەشی/ قەلەموون/ عەلەشیش.
(اَلدَجاجَـة):١-خاووخێزان ٢-گولۆڵە خوریی یان دەزوو یان موو.
(اَلدُجاجِيُّ): مریشکفرۆش.
٥-(دَجْدَجَ- اللَّيلُ): شەو تاریك‌و نووتەکبوو.
دجر: (دَجِرَ. دَجَراً):١-سەرسامبوو/ حەپەسا ٢-سەرخۆشبوو.
(دَجِـر و دَجْـران) (ج) دَجْری و دُجَاری): ١-حەپەساو ٢-سەرخۆش.
(داجَرَ. مُداجَرَة): هەڵات.
(اَلدِجْران): کۆڵەکەی کەپر.
(دِجْرانَة): کۆڵەکەیەکی کەپر.
(الدَّيجُور (ج) دَياجِير و دَياجِر):١-تاریکیی زۆر/ شەوەزەنگ.
(«النُور والدَّيجُور»):ڕووناکیی‌و تاریکیی زۆر ٢-گڵی ڕەشباو.
دجل: ١-(دَجَلَ. دَجْلاً):درۆیکرد.
(دَجَّـلَ- البَعِـيرُ):قەترانی لە حوشـترەکە هەڵسوو.
(- الإِناءَ):قەترانی لە قاپەکە هەڵسوو.
(- الشَيءَ):شتەکەی داپۆشی.
(- الأَرضَ):بە پەین زەویەکەی چاککرد.
(اَلدَجال):پەین.
(اَلدُجَيل والدُجالَة):قەتران.
(دِجلَـة): ڕوبـاری دیجلە کە لـە عیراقدایە (دەشـێت وشـەکە نێر بکەیت‌و مێ بکەیت). (بۆیە وا ناونراوە چونکە کە هەستاوە زەویی داپۆشیوە).
(اَلدَجَّال):١-ناوی زێڕ.
(ج) دَجَّالون و دَجاِلَة): درۆزن/ سـاختەباز (بە نـاوی زێـڕ چۆوێنراوە کە سـاختەیەو ژێرەوەی وا نییە).
(«اَلمَسِـيحُ الدَجَّـال»): عیسـا درۆزنە کە لە ئاخرە زەمانـدا دەردەکەوێت/ جەجال.
(اَلدَجَّالَـة): جەجاڵیـەکان/ ئەوانـەی دوای جەجاڵ دەکەون کە زۆرن زەویی دەگرنەوە.
٢-(دَجَـلَ و دَجَّـلَ- بِالَـكانِ دَجْـلاً):لـە شوێنەکەدا مایەوەو نیشتەجێبوو.
دجـم: ١-(دَجَـمَ- اللَّيـلُ. دَجْمـاً):شـەو (تاریکبوو/ تاریك داهات).
اَلدُجَـم:ناسـۆری دڵداریـی، پەرێشـانیی‌و گرفتاریی.
(«أَخَذَتْهُ دُجَمُ العِشْـقِ»):تووشـی ناسۆرو نائارامیی‌و پەرێشانی دڵداریی بووە.
٢-(دَجِمَ و دُجِمَ. دَجْمـاً): پەژارە دایگرت/ خەفەتیخوارد.
٣-(اَلدَجْم- مِنَ الشَيء):بابەتی شت/ جۆری شت.
(غَديـرٌ دَيْجَـم): گۆمێکـی شـەپۆلاویی‌و شڵەقاو.

دجــن: ١-(دَجَنَ- اليَومُ. دَجْنــاً و دُجُوناً): رۆژەکەی تاریك و تاڵبوو، هەورو بارانبوو.

(- اللَّيلُ): شەو تاریکبوو.

(أَدْجَن (م) دَجْناء (ج) دُجْن): ١-تاریکە شەو ٢-تاریك.

(أَدْجَنَ اللَّيلُ): شەو تاریکبوو.

(- تِ السَّماءُ): باران (سەرومڕ باری/ بێپشوو باری).

(- المَطَــرُ أَوالحُمّى): باران یان تا ســەرومڕ بوو/ بەردەوامبوو.

(- القَومُ): خوێشــگەل کەوتنە ژێر هەورێکی تاڵی تاریکەوە.

(إِدْجَوجَــنَ اليَــومُ): ئەمــڕۆ هەورێکی تاڵی تاریك دنیایگرتەوە.

(الدَجْــن (ج) دُجْــن و دِجــان و دُجُون و أَدْجــان): ١-هەورێکی نیشــتووی تاڵی تاریکی بارانــاوی ٢-بارانێکــی زۆر/ شەســتەباران/ لێزمەباران.

(«يَــومُ دَجْــنٍ و يَــومُ دَجْــنٌ»): ڕۆژێکــی (لێزمەباران/ بارانی بەخوڕ).

(لَيلَةُ دَجْنٍ لَيلَةٌ دَجنٌ): شەوێکی بە لێزمەو باران.

(الأَدجَن): تاریکستان/ تاریکی.

(الدُجْنَــة (ج) دُجَــن و دُجُنَات): تاریکیی/ تاریکایی.

(- فِي أَلْوانِ الإِبلِ): ناشیرینترین ڕەنگی ڕەشی حوشتر.

(أَلدُجُنَّــة والدَجِنَّة والدِجِنَّة (ج) دُجُنَّات): ١-تاریکیی ٢-هەورێکی تاڵی تاریکی نیشــتووی پڕ باران.

(يَومٌ دُجُنَّةٌ و يَومٌ دُجُنَّةٍ): ڕۆژێکی (تاریکی باراناویی/ تۆف).

(لَيلَــةٌ دُجُنَّةٍ و لَيلَةٌ دُجُنَّةٌ): شــەوێکی تۆفی تاریك.

(لَيلَــةٌ مِدجــان): شــەوێکی تاریکــی ئەموستەچاو.

(أَلداجِنَــةُ والمُدْجِنَةُ مِنَ السَّحاب): هەوری تاڵی بە لێزمەوباران.

٢-(دَجَــنَ- بِالمَكانِ. دُجُوناً): لە شــوێنەکەدا نیشتەنیبوو و ڕاهات.

(-أَلحَمــامُ وغَــيرُهُ): کۆترەکەیــان هیتر بە شوێنەکە ڕاهات و ماڵیبوو/ کەوییبوو.

(داجِــن (م) داجِن و داجِنَــة (ج) دَواجِن): ماڵیی و ڕاهاتوو/ کەویی.

(«دَجَنــو فِي لُؤمِهِــم»): بــە بەدخواهــی ڕاهاتوون و وازی لێناهێنن.

٣-(داجَــنَ- هُ. مُداجَنَــةً): فریویــدا/ لــە خشتەیبرد/ هەڵیخەڵەتاند.

ملحق

دجــن: (دَجَّــنَ): زینــدەوەرە کێوییەکــەی ماڵیکرد.

---

دجا: ١-(دَجا- اللَّيلُ. دَجْواو دُجُوّاً): شــەو

تاريك داهات/ شەوداهات.
(داج): تاريكە شەو.
(لَيلَةٌ داجِيَةٌ): شەوێكی تاريك.
(داجـی- ەُ مُداجـاةً): ١-لەگەڵیدا هەڵیكردو دڵی ڕاگرت‌و دوژمنايەتيەكەی لێشـاردەوە ٢- نيمچە خۆشی‌و ڕەفێی لەگەڵدا نواند.
(أدْجی وتَدَجَّی و ادْجَوْجی- اللَّيلُ. إجْجاءً و تَدَجِّياً و إججيجَاءً): شەو تاريك بوو/ تاريك داهات.
(- البَيتَ): پەردەی ماڵەكەی دادايەوە.
(لَيلٌ دَجِيّ): تاريكە شەو.
(ألدُّجْيَة (ج) دُجـیً): ١-تاريكيی يان هەورو تاريـك ٢-بنەپڕاوكەر كە خۆی تێدا حەشـار دەدات/ حەشارگە.
ألدَّياجي: تاريكستان.
٢-(دَجا- الثَّـوبُ. دَجْواً و دُجُـوّاً): جلەكە (فراوانبوو/ فشبوو).
(ألدُجَّـةُ (ج) دُجَـات و دُجـیً): قۆپچـەی كراس.
(ألداجي- مِنَ العَيشِ): ژيانی تێروتەسەلیی.
(نِعمَةٌ داجِيَةٌ): خۆشـيیەكی تێـرو پڕیی‌و پڕناز.
دحَّ: ١-(دَحَّ- الشَّيءَ في الأَرضِ. دَحّاً): شتەكەی خستە ژێرزەوییەوەو شاردیەوە.
(- الرَّجُـلَ): پشـتيملی گرتـوو تونـد پاڵيپێوەنا.

(- البَيتَ في الثَّرى): خانووەكەی لە گڵەكەدا گەورە كرد/ فراوانكرد.
(الطَّعـامُ بَطنَـهُ): خواردنەكـە ورگـی لێپەيداكردو دراندی‌و شۆڕيكردەوە.
(إندَحَّ بَطنُهُ. إندِحاحاً): ورگی لێپەيدابوو/ ورگی (دەرپەڕی/ گەورە بوو).
٢-(الدَحْـدَحُ والدَحْدَحَـةُ و الدَحْـداحُ والدَحداحَـةُ والدُحـادِحُ والدُحَيدِحَـةُ): كورت/ كورتەبنەی ورگن.
دحـر: ١-(دَحَـرَ- ەُ. دَحْـراً و دُحُـوراً و مَدْحَرَةً): ١-دەريكرد ٢-ڕايفڕاندو دوريخستەوە ٣-پاڵيپێوەنا ٤-شكاندی.
(داحِـرٌ دَحُـورٌ): ١-شـكێنەر ٢-ڕافڕێن ٣- دەركردوو ٤-بەزێن.
(مَدحُور): ١-بەزويو ٢-دەركراوو دوورخراوە.
٢-(دَحْرَجَ- ەُ): تليپێداو خولانديەوە.
(تَدَحْرَجَ): تليخوارد/ خولايەوە.
(ألدُحروجَـة (ج) دَحاريـج): ئـەوەی دەخولێنرێتەوە، ئـەوەی قالۆنچە تليدەدات‌و دەيخولێنێتەوە.
الدُحَيرِيجَة (عامية): زيزانە.
دحز: (ألدَحْز): زۆر پتەوو سەخت.
دحـس: ١-(دَحَسَ- بَـينَ القَومِ. دَحْسـاً): خوێنشـگەلی لە يەكـتر پڕكرد/ لـە يەكتری بەردان/ نێوانيانی تێكدا.
(- بِالشَّرِّ): ئاشوبی لە نێواندا چاند بێئەوەی

پێیبزانرێت.

(اَلدَّحَّــاس والدُّحــاس (ج) دَحَّاســات و دَحاحِيــس) (ح): كرمــى زەوى (كرمێكــى زەردە).

٢-(دَحَسَ- الشَيءَ. دَحْساً): شتەكەى پڕكرد.

(دَحَسَ و أدْحَسَ- السُــنبُلُ): گوڵە گەنمەكە پڕدان بوو.

(اَلدَّحَــاس مِنَ البُيُوتِ): ماڵــى پڕو ئاوا/ پڕ لە خەڵك.

(اَلدَيْحَس): هەموو شتێكى زۆر.

٣-(دَحَــسَ- بِرِجْلِــهِ. دَحْســاً): بــە قــاچ وێقلەمەيكرد.

٤-(دَحَــسَ- الجَــزَّارُ. دَحْســاً): قەســابەكە دەســتى خستە نێوان پێســتو گۆشتى ئاژەڵە سەربڕراوەكەوەو گورووى.

(- الثَــوبَ في الوِعــاءِ): جلەكــەى خســتە قاپەكەوە/ ئاخنييە قاپەكەوە.

٥-(دَحِــسَ- ت أُصْبُعُــهُ) دَحَســاً: پەنجەى مووبلێهات.

(مَدْحُوْس): كەسى پەنجەمووليْهاتوو.

(مَدحووسة): پەنجەى موولێهاتوو.

(اَلدّاحِس والداحُوس): موو (جۆرە برينێكە لە سەرى پەنجە دێت).

دحص: (دَحَصَ-المَذْبوحُ بِرِجْلِهِ):سەربڕراوەكە كەوتە پەلەقاژێو پەلكوتان.

(- الرَجُلُ): كابرا پەلەيكرد.

دحــض: ١-(دَحَــضَ- الحُجَّــةَ). دَحْضــاً و دُحُوضــاً: بەڵگەكــەى/ بيانووەكەى (بە درۆ خستەوە/ بەرپەرچدايەوە/ پووچيكردەوە).

(- تِ الحُجَّــةُ): بەڵگەكــە پووچكرايەوەو بە درۆ خرايەوە.

(تِ الشَمْسُ): خۆر بەرەو خۆرئاوا كشا.

(أدْحَــضَ- الحُجَّــةَ): بەڵگــەو بيانووەكەى پوچكردەوەو بە درۆيخستەوە.

(إنْدَحَــضَ البُرهــانُ): ســەلماندنەكە پووچكرايەوەو هەڵوەشايەوە.

٢-(دَحَضَ). دَحْضاً: وەك سەربڕراو قاچى لە خۆڵەكەوە ژەندو بۆ شت گەڕا.

(- عَــنِ الأمــرِ): دەربــارەى كارەكــە گەڕاو لێيكۆڵييەوە.

٣-(دَحَــضَ- ت رِجلُــهُ. دَحْضــاً): قاچــى هەڵخليسكا/ قاچى خزا.

(- المَطَرُ. التلاعَ): بارانەكە بەرزيىو نزميى زەويەكەى لووسكردو خزيكرد.

(أدْحَضَ- الرجلَ): قاچەكەى خزاند.

(اَلدَحْــض والدَحَــض (ج) دِحــاض- مِــنَ الأمْكِنَة): شوێنى خز.

(اَلمَدحَضَةَ): خزگەو لووسگە/ لێژگە.

دحــق: ١-(دَحَقَ- هُ و أدْحَــقَ- هُ. دَحْقاً):١-دووريخستەوە ٢-دەريكرد.

(إنْدَحَقَ):١-پەرکرا/ دەرکرا ٢-دوورخرايەوە.

(اَلدَحيق):١-دوور ٢-دوورخراوە/ پەركراو.

(«دَحيقُ القَوم»): دەربەدەرو دورخراوەی خوێشگەل‌و نەتەوە.
(مُندَحِقُ البَطنِ): ورگدەرپەڕیو.
٢-(الداحِــق): ١-گـەوج ٢-قوشـقی/ ڕقــن/ تووڕە.
دحل: ١-(دَحَلَ دَحْلاً): ١-هەڵات‌و خۆیشاردەوە ٢-دووركەوتەوە.
(دَحِــلَ): دَحَــلاً: ورگــی داكــەوت/ ورگــی شۆڕبووەوە.
دَحِلٌ: ورگداكەوتوو/ ورگشۆڕ/ ورگن.
(ألدَحِــل): كورتەباڵای قەڵەوی (ورگشــۆڕ/ ورگدەرپەڕیو/ ورگن).
٢-(دَحَــلَ- البئــرَ). دَحْــلاً: (لــە لاوە/ لە تەنشتەوە) بیرەكەی هەڵكەند.
(دَحَــلَ و أَدْحَــلَ- فِي الدَحــلِ): چــووە ناو بیرۆچكەكەوە.
(ألدُحْــل والدَحْــل (ج) دِحَــال و أَدْحال و أَدْحُل و دُحُول و دُحْلان): چاڵێكە دەمەكەی تەسك‌و بنەكەی فراوان/ بیرۆچكە.
(ألدَحْلَةُ): چاڵاو/ بیر.
(ألبِئــر الدَحُــول والدَحْــلاء): چاڵاوێكــی تەنیشت فراوان‌و دەمتەسك.
٣-(داحَــلَ- هُ. مُداحَلَــةً): لە خشــتەیبرد/ فریویدا/ پێچوپەنای لێكرد.
(ألدَحِل): فێڵباز/ لە خشتەبەر/ بەپێچووپەنا.
(ألدِحَال): ملنەدان.

(ألدَاحُــول (ج) دَوَاحِيــل): تەڵــەی دار یان تەڵەیــتر كــە ڕاوچــی بــۆ ڕاوكردنی ئاســك دەینێتەوە.
(ألداحُول والدَحَّال): ڕاوچییەك كە دارەداو/ تەڵەیدار بۆ ڕاوی ئاسك بەكاربهێنێت.
دحــم: ١-(دَحَــمَ- هُ.. دَحْمــاً): تونــد پاڵیپێوەنا.
٢-(دَحْمَسَ- اللَّيلُ): شەو تاریكیكرد.
(ألدَحْمَــس والدُحْمُــس (ج) دَحَامِــس): ١-هەموو شتێكی ڕەنگڕەش‌و تاڵ ٢-ڕەشییەكی (زۆر تاریك/ تۆخ).
(«لَيلٌ دُحْمُسٌ»): شەوەزەنگێكی نەموستەچاو.
(ألدُحَامِــس): ١-پیــاوی قــول/ زۆر ڕەش ٢-قەڵەوی تێكسمڕاو ٣-ئازا/ بەجەرگ.
٣-(دَحْمَلَ- بِهِ): خولۆرپكردەوە/ گلیكردەوە/ تلیكردەوە.
دحا: ١-(دَحا- البَطْنُ). دَحْواً: ورگەكە گەورە بوو/ داكەوت.
(- اللهُ الأَرضَ): خودا زەویی ڕاخست‌و تەختیكرد.
(إِدْحَــوى). إِدْحِــواءً: كرایــەوەو ڕاخــرا/ پانبووەوە.
٢-(دَحــا الحَجَرَ بِيَــدِهِ). دَحْواً: بەدەســت بەردەكەی هەڵدا.
(«دَحــا المَطَرُ الحَصَى عَــن وَجهِ الأَرضِ»): بــاران چــەوی بــە زەوییەكــەوە نەهێشــت‌و ڕایماڵی.

دحى: (دحى- الشَيءَ). دَحْياً: شتەکەیکردەوەو راخست/ بلاویکردەوە.
(تَدَحَّى- الشَيءُ): شتەکە کرایەوەو بلاوبووەوە/ راخرا.
(إنْدَحى- البَطنُ): ورگەکە فراوانبوو/ گەورە بوو.
(ألدَجِيَّة) (ح): دێڵە مەیمون.
(ألدِخْيَة) (ج) دِحاء): گەورەی سەربازان.
الأُدْحِيَّ و الإدْحِيّ و الأُدْحُوَّة والأُدْحِيَّة): هێلکەی وشترمرخ لە لمدا.
دخّ: ١-(ألدَخُّ والدُّخ): دووکەڵ.
٢-(دَخْدَخَ- الرَجُلُ): هەنگاوەکانی کورتکردەوەو خێرایکرد.
(- عَنهُ الشَيءَ): شتەکەی لێبڕیو لێدوورخستەوە.
(تَدَخْدَخَ- الرَجُلُ): دڵی تەنگبوو/ دڵی گوشرا.
دخر: (دَخَرَو دَخِرَ. دَخْراً ودُخُوراً): سووکەو سەرشۆڕو بێپایە بوو.
(أدْخَرَ- هُ): سەرشۆڕیکردو کەساسیکرد/ داماویکرد/ زەبوونیکرد.
دخس: ١-(دَخَسَ- الشَيءَ في الرَّمادِ. دَخْساً: شتەکەی بە ژێر لمەکەوە کرد.
(- فِيه): چووە ناویەوە.
(ألدَّخْس): هەڵەوی لەش تێکسمڕاو.
(دِرعٌ دِخاس): زرێیەك کە هەڵقەکانی نزیك یەکبن/ زرێی هەڵقە سفت.
(ألدَخيس- مَنَ الكَلأ): گیای پڕی بەیەکداچوو.
(«هُوَ دَخيسُ اللّحمِ»): ئەو گۆشت توندو پتەوە.
(كَلأ دَيْخَس): گیای زۆرو چڕ/ بەیەکداچوو.
٢-(دَخِسَ- الحافِرُ). دَخَساً: سمەکە تووشی هەڵاوساویبوو.
(دَخِسٌ): سمی هەڵاوساو.
(ألدَخَسُ): هەڵاوساویی سمی وڵاخ.
٣-(الدَخْس) (ح): ورچی جوانتەمەن.
(ألدَخَس)) (ح): دۆلفین (جۆرە نەهەنگێکە).
(عَدَدٌ دِخاس): ژمارەیەکی زۆر.
(ألدَخِيس): ژمارەی زۆر.
(ألدَواخِس والدُخَّس): کوورەی بەرد/ سێپایەبەرد.
دخل: ١-(دَخَلَ- الدارَ). دُخُولاً و مَدْخَلاً): چووە ناو خانووەکەوە.
(- بِهِ): خستیە ناوەوە.
(- عَلَيهِ): سەری لێداو ڕووبەڕوو دیدەنیکرد.
(دَخَّلَ- هُ): کردی بەناودا/ ڕێیدا بچێتە ناوەوە.
(داخَلَ- هُ العُجْبُ). مُداخَلَةً: خۆپەسەندبوو.
( -هُ في أُمورِهِ): ١-بەشداریی کاروبارێکرد ٢- دەستی خستە کاروبارێیەوە.
(أدْخَلَ- هُ. إدْخالاً و مُدْخَلاً): کردیە

ژوورەوە/ کردی بە ناودا.
(تَدَخَّلَ) = دَخَلَ: چووە ناوەوە.
(- فِي الأُمُورِ): ١-خۆی هاویشتە ناو کارەکەوە/ پەنجەیخستە کارەکەوە ٢-خۆی تێهەڵکێشکرد.
(تَدَخَّلَ- الشَّيءُ): شتەکە وردە وردەو کەمکەم چووە ناوەوە.
(تَداخَلَ الشَّيءُ): شتەکە (بەیەکدا چوو/ ئاڵۆزکا).
(- هُ): شتەکە چووە ناوەوە.
(- تِ الأُمُورُ): کارەکان بەیەکدا چوون/ لە یەکناڵان و جەواشە بوون/ ئاڵۆزکان.
(إِدَّخَلَ و اندَخَلَ): چووە ناوەوە.
(اَلدَّخْل): ١-دەسکەوت/ دەرامەت ٢-دەرد/ نەخۆشیی.
(اَلدَخَلَ): خەڵکی دەرەکیی کە خۆیان ئەکەن بە تاقمێك کە لەوان نین.
(اَلدِخْلَـةُ): ئاوێتەکردنی رەنگەکان بۆ دەرهێنانی رەنگێکیتر.
(اَلدُخَّل (ج) دَخاخِيل): ١-گیاکە لە بنی درەختدا دەربێت ٢-لەشکەتەو پتەو لەش ٣-فیرنەگولە/ کلاورەش (باڵندەیە).
(اَلداخِل (فا)): ژوورەوە چوو/ ناوەوە چوو.
(داخِلَـة (ج) دَواخِـل الإِزار): بەرگی سەر گۆشتی مرۆڤ/ بەرگی ژێرەوە.
(الدِخال): ١-بەیەکداچوونی هەندێك جومگە

٢-باڵی ئەسپ کە لە نێوان هەردوو گوێچکەیەوە دێتە خواری.
(اَلدَّخِيل (ج) دُخَلاء): ١-یەکێکی دەرەکیی کە خۆی بە لە هۆزێك یان نەتەوەیەك دابنێت و لەوانیش نەبێت ٢-هەموو وشەیەکی بێگانە کە هاتبێتە زمانی عەرەبییەوە.
(اَلمَدْخَـل): ١-دەرگە/ چوونکە ٢-چوونە ناوەوە.
(«هُوَ حَسَنُ المَدخَل»): ئەو باش بۆ کارەکانی دەچێت.
(دَخّالُ الأُذُن) (ح): گوێکونکەرە (مێرووییەکە لە فرە پێکانە، کورتەپێیە، بە زۆریی رەنگرەشە، کاتی پشوو خۆی گرمۆڵە دەکات لە شوێنە ناتەواوەکانی توێکڵی داردا دەژی.
(اَلتَداخُـل) (ف): بەیەکداچوون/ لە یەك ساتدا دوو جووڵەی لەرەلەر روویدات و لە پنتێکدا بێت. لە ئەنجامی بەیەکداچوونی دوو رووناکیی و ئەگەر هەندێك مەرجی پێویست ببێت تاریکیی روودەدات. هەروەها بەیەکداچوونی دوو دەنگ لە هەندێك جاردا دەبێتە هۆی خنکاندنی هەردوو دەنگەکە.
(رَجُلٌ مُتَداخِل): پیاوێکی ئەستووری توند گۆشتی تێکسمراو وەك گۆشتەکەی چنگی دابێتە یەك.
٢-(دُخِلَ أَمْرُ فُلان): کاروباری فیسار گەند بوو.

(- فِي عقلِهِ أَو جَسَدِهِ): مێشکی یان لەشی تێکچوو/ دەردداوێتیە هۆشی یان لەشی.
(دَخِلَ. دَخَلاً): گەندیی‌و خراپیی تێیداوە.
(مَدْخُولٌ عليه): دەرداویی بووە.
(تَداخَلَ- هُ): ١-هات بەسەریدا/ هات بە مێشکیدا ٢-تێیهات.
(اَلدَّخَل): ١-خەوش/ کەموکوڕیی/ لەکە ٢-گومان.
(دَخْلُ الرَجُلِ): ئەوەی لە دەروونی پیاوەکەدایە ناوەوەی پیاوەکە.
(اَلدَّخَل): ١-ناتەواویی میشک‌و بیماریی لەش ٢-خەوش‌و ناتەواویی‌و رەسەن/ نارەسەنیی ٣-فێڵ/ هەڵخەڵەتاندن.
(دَخْلَتُهُ و دِخْلَتُهُ و دُخْلَتُهُ): ئەوەی لە دەروونی مرۆڤدایە/ ناوەوەی مرۆڤ.
(«هُوَ عَفيفُ الدَخلَة»): ئەو دەروونپاکە/ سینەسافە/ نیازو ڕێڕەو چاکە.
(الدِخْلَة): نیازی دەروون/ کورۆک‌و ئامانجی کار.
(«فَرَشْتُهُ دِخْلَةَ أَمْري»): کورۆک‌و ئامانجی کارەکەم بۆ دەرخست/ نیازی دەروونی خۆمم بۆ یەکالا کردەوە.
(دُخُلُ و دُخَّيلى و دُخَيلاءُ الرَجُلِ): کاروبارو نیازو ناوەوەی دەروون‌و ڕێڕەوی پیاوەکە.
(داخِلَةُ الإنسانِ (ج) دَواخِل): نیاز/ خواست/ دڵ‌و دەروون‌و ڕێڕەوی مرۆڤ.
(داخِلَةُ الأَرض): نهێنیی ناوسکی زەوی/ ناوەوەی زەوی.
(دَخيلُ الرَجُلِ= داخِلَتُهُ): ناوەوەی دەروونی مرۆڤ/ نیازو ڕێڕەوو ئامانج/ خواست.
(«داءُ دَخيل»): دەردێك کە لە ناوەوەی لەشدا بنجی داکوتابێت.
(دَخيلَةُ الشيءِ): ناوی ناوەوەی شت.
(دَخيلَةُ المَرْءِ): خواست‌و دەروون‌و ویژدانی مرۆڤ.
(اَلمُدخَل) (مفع): مرۆڤی دەروونپیسی نارەسەن.
(اَلمَدْخُول): ١-مێشك تێکچوو (بە هۆی قەوماوێکە) ٢-خەوشدار/ لەکەدار/ ناتەواو ٣-گاڵتەجاری ئەم‌و ئەو.
(نَخلَةُ مَدْخُولَة): دارخورمایەکی کورۆك پووکاوەو بۆگەن.
٣-(اَلدُخْلُل والدِخْلَل): دەروونایی/ کەسێکە شت لە دەرووندا بهێڵێتەوەو دەرینەبڕێت.
(دُخْلُلُ الرَجُل): ١-دەروون‌و ناوەوەو ویژدانی پیاوەکە ٢-ئەوەی دەستەخاتە کاروبارییەوە.
(الدِخْلِل): جەوریی تێهەڵکێشی گۆشت.
الملحق:
دخل: (اَلدُّخُولِيَّة): ١-باجی سەرکالاو کەلوپەلی هاتووە وڵاتەوە/ هاوردە ٢-پارەی چوونە ئاهەنگ‌و شتیتری وەها.

دخم: ١-(دَخَمَ- هُ. دَخْماً): ١-بێزارانە

پاڵپێوەنا.

٢-(دَخْمَسَ – هُ): فریویدا/ فێڵی لێکرد.

دخــن: ١-(دَخَــنَ وأَدْخَــنَ وادَّخَــنَ- تِ النارُ): ئاگرەکە دووکەڵیکــردو دووکەڵەکەی بەرزبووەوە.

(دَخِــنَ – الطَّعــامُ واللَّحــمُ و غَيرهُمــا): چێشتەکەو گۆشــتەکە لە کاتی ئامادەکردندا دووکەڵاویبوو/ بۆدووکەڵبوو.

(دَخِنَ): خواردنی بۆدووکەڵ.

(دَخِــنَ- تِ النارُ): دووکەڵی ئاگرەکەزۆر بوو و ورووژا.

(دَخِنَ ودَخُنَ). دُخْنَةً: ڕەنگی ڕەشــبوو وەك ڕەنگی دووکەڵ.

(أَدْخَن (م) دَخْناء): ڕەنگدووکەڵیی.

(دَخَّنَ): جگەرە یان نێرگەلەی کێشا.

(دَخَّــنَ لفافَةَ أو نارجيلَةَ): دووکەڵی جگەرە یان هی نێرگەلەکەی هەڵمژی.

(دَخَّنَ- الشــيءَ): دووکەڵی بەگژ شــتەکەدا کرد/ شتەکەی دووکەڵاویکرد.

(تَدَخَّنَ- الشيءُ): شتەکە دووکەڵاویبوو.

(تَدَخَّــنَ- تِ النارُ): ئاگرەکــە دووکەڵیکردو دووکەڵەکەی ورووژا.

(الدَخَــن (مــص)= الدُخــان): دووکــەڵ. دووکەڵکردن.

(الدُّخْنَــة): ١-ڕەشــێز ٢-بوغــورد کــە دەسووتێنرێتماڵەکە بۆنخۆش دەکات.

(الدُخــان والدُخَّــان (ج) أَدخِنَــة ودَواخِن ودَواخِــين): ١-دووکــەڵ ٢-تووتــن (بە پێی ناونانی تازە).

(المَدْخَن): دووکەڵگە.

(المِدْخَنَة): دووکەڵکێش.

(داخون (ج) دُواخِين) (عامية): دووکەڵکێش.

(المُوخَنَة (ج) مَداخِن): ئاگردان.

(الداخِنَــة (ج) دَواخِــن): کەلەبەرێــك/ کلاورۆژنەیــەك کــە دووکەڵی لێــوە بچێتە دەرەوە/ لێوە دەرچێت.

(الدخنان (م) دَخْنانَة): شتی دووکەڵگرتوو.

٢-(دَخِــنَ – خُلُقُــهُ). دَخَنــاً: ڕەوشــتی بۆگەنبوو/ بەدڕەشوتبوو/ بەدخوو بوو.

(الدَخَــن) (مــص): ١-گەنیــی ٢-بەدخۆیی/ بەدڕەوشتیی.

(«لَســتُ أُصالِحُهُ على دَخَــن»): تا ئەو ئەو بەدخوییەی هەبێت لەگەڵیدا ئاشتنابمەوە ٣-قین/ ڕك/ دەغەزاریی ٤-گۆڕینی ئاوەزو ئاین و شکۆی باووباپیر.

٣-(اِدَّخَــنَ – الزَرعُ): کشــتەکە دەنك پتەو بوو.

٤-(الدُّخْــن. الواحِدَة دُخْنَــة) (ن): هەرزن. کە بــە باڵنــدەو مریشــك دەدرێــت و تەنها دانەوێڵەیەکــە کە لەناوچــەی کەمەری گۆی زەوی بروێنرێت.

(أَبو دُخْنَة) (ح): باڵندەیەکە ڕەنگی وەك هی

کلاوکوره وایه.
دخى: (اَلدَّخى): تاریکیی.
(لَیلَةُ دَخْیاء): شەوێکی تاریك و نووتەك.
دد: ١-(اَلدَدُ): ١-یاری و گەمەو ڕابواردن/ کات بەسەربردن.
(اَلدَدا): یاری و گەمە.
(«ما أنا في دَدٍ والدَدُمِنّي»): من پیاوی یاری و ڕابواردن نیم و ئەویش پیشەی من نییە ٢-سەردەم/ دەم/ کات.
(«مَضى دَدٌ مِنَ الدَّهرِ»): دەم و سەردەمێك تێپەڕی.
٢-(د. د. ت) (ك): تۆزێکی سپییە، مێرووکوژە ناوە زانستیەکەی (دیکلۆرۆدیفنیل) (تریکلۆریتان)ە میللەری زانای سویسری دۆزییەوەو بۆیدەرکەوت کە کار لە مێروو دەکات ئەویش ساڵی (١٩٣٢) بوو.
ددب: (اَلدَیْدَب والدَیْدَبان) (فارسیة): ١-دیدەوان/ چاودێر ٢-پێشەنگ ٣-ڕێنوما.
ددن: (اَلدَدَن): گەمەو یاری و ڕابواردن: کاتبەسەربرن.
(اَلدَدان): ١-کەسێکە کە دەوڵەمەند نەبێت ٢-شمشێری کوڵ و نەبڕ ٣-(ضد): بڕە ٤-نەبڕ.
(اَلدَیْدَن والدَیْدان): نەریت و خوو.
درّ: ١-(دَرَّ- الحَلیبُ). دَرّاً: شیرەکە زۆر بوو.
(- تِ الدُنیا على أهلِها): جیهان فەڕو بێری چاکی بەسەر خەڵکدا ڕژاند/ باراند.
(- تِ الناقَةُ بِلَبَنها): مێحوشترەکە شیری زۆری دا.
(«دَرَّت حُلوبَتُهُ»): خێرو بێری زۆر بوو.
(دَرَّ- تِ العُروقُ. دَرّاً و دُروراً): دەمارەکان پڕ لە خوێن بوون (وەك چۆن گوان پڕ لە شیر دەبێت).
(- العَرَقُ): (ئارەق/ خوو)ی لە لەشدەرپەڕی/ هاتەدەرێ/ لەش ئاویدەردا.
(دَرَّ- السَّماءُ بالمَطَرِ): ئاسمان ئاوی باراند.
(أدَرَّ- تِ الناقَةُ): مێحوشترەکە شیری زۆری دادا.
(«أدَرَ اللهُ لَكَ أخْلافَ الرِزقِ»): خودا ڕۆژیی زۆرت بەسەردا ببارێنێت/ دەرکی ڕۆژیت لێبکاتەوە.
(إستَدَرَّ- اللَّبَنُ): شیرەکە زۆر بوو.
(- هُ): شیری پێزۆرکرد/ شیری زۆری پێدادا.
(اَلدَرّ) (مص): ١-شیر ٢-شیرزۆریی.
(«لِلّهِ دَرُّهُ»): خێری دەسگیر بوو هی خودایەو خودا خێربدات.
(«لا دَرَّ دَرُّهُ»): خێری زۆری نەیەتەڕێ.
(«لِكُلِّ دَرٍّ حالِبٌ»): هەموو شیردۆشینێك (پیاوی خۆی هەیە، شیردۆشی خۆی هەیە) واتا هەموو کارێك بە پیاوی خۆی دەکرێت.
(اَلدَّر (فا) (ج) دَرُور و دُرَر و دُرّار): مێحوشتری بەشیر/ فرەشیر.
(اَلدِرَّةُ (ج) دِرَر): ١-شیر ٢-شیری زۆر

٣-شێرلەبەرڕۆیشتن/ شیرهاتن ٤-خوێن.
(اَلدَرُور): مێ؛وشتری بەشیر/ شیرزۆر.
(«حَربٌ دَرُور»): شەڕی خوێناویی.
(التَـدِرَّة): شـیردانی زۆر/ شـیر زۆر لەبەرڕۆیشتن.
(اَلمِدرار): ١-شـیری لێشاو ٢-بە لێشاوو بە خوڕ لەبەرڕۆیشتن.
(«عَـینٌ مِدرار»): چاوی فرمێسـك بە خوڕ لەبەر ڕۆیشتوو.
(سَـماءٌ مِدرار): ئاسـمانێکی بە بـاران (بە لێزمە/ بەخوڕ) بارین.
٢-(دَرَّ- النَّبـاتُ. دَرّاً): ڕووەکەکـە دەرهاتو لوولیخوارد/ بەیەکداچوو.
٣-(دَرَّ- السِـراجُ. دَرّاً ودُرُوراً): چراکـە شەوقیدایەوە/ ڕووناکیدا.
(- وَجْهُهُ دَرّاً): ڕووی ڕوونبووەوەو گەشبووەوە/ پاش نەخۆشیی.
(اَلـدُرّ الواحِـدَةُ دُرَّة (ج) دُرَر و دُرَّات): مرواریی مەزن.
(اَلكَوكَبُ الـدُرِّيّ)، (فك) (والدَرِّيّ والدِرِّيّ): هەستارەی پرشنگدار وەك گەوهەرو مرواری.
(دُرِّيُّ السَّيفِ): شەوق و بریسکەی شمشێرەکە.
(الدَرير): چرای (شەوقدار/ بە شەوق).
٤-(دَرَّ- تِ السُـوقُ. دَرّاً ودُرُوراً): بازاڕەکـە گەرمبـوو/ فرۆختـی زۆربـوو و کاڵاکـەی فرۆشرا.

٥-(دَرَّ- الفَـرَسُ. دَريـراً): چارەوێکـە دایە پرتاو/ دایە چوار ناڵەو غار.
(اَدَرَّ المِغْزَلَ): تەشیەکەی باش ڕست.
(- الشَّـيءَ): شـتەکەی هێنایـە جووڵـە/ بزواندی.
(- تِ الريحُ السَّحابَ): باکە هەورەکەی هێناو پێشخۆیدا.
(دَرَرُ الريحِ): هەڵگەی با.
(إستَدَرَّ- تِ الريحُ السَّحابَ): باکە هەورەکەی هێناو دایە پێش خۆی.
(فَرَسٌ دَرِّيٌ ودُرِّيٌ و دِرِّي): چارەوێی بەگوڕ/ بەتاو/ بەغار.
(اَلدَرير) (مص): چوارپێی خێرا/ بە گوڕ.
(اَلدَرَّارَة): تەشی.
٦-(أدَرَّ- عَلَيـهِ الضَرْبَ): کوتەکوت دایگرت/ تێر کوتای/ تێری لێدا.
(اَلدِرَّةُ (ج) دِرَر): قامچی کە پێی لێدەدرێت.
(«مَرَّ على دَرَّته»): هیچ بەربەسـتی ناکاتو لەسەر کوتەکوتی خۆی دەڕوات.
٧-(اَلدَرّ): دەروون.
(دَرَرُ- الطَّريقِ): ناوەڕاستو ڕووی ئەوسەری ڕێگەکە.
(«هُما على دَرَرٍ واحِدٍ»):بە جووتە لەسـەر ڕێگەیەکنو بۆ ئامانجێکن.
(اَلدُرَّة): (ح) تووتی (عامیە).
درأ: ١-(دَرَأَ — هُ. دَرْءً و دَراَةً): توند پاڵیپێوەنا.

(- السَّيلُ عَلَيهِ): لێشاوەکە بەسەریدا هات.

(«دَرَأَ- الرَجُلُ عَلَينا»): پیاوەکە لەپڕ هات بەسەرماندا پەلاماریداین.

(دَرَأَ- هُ. مُدارَأَةً): کەوتە پاڵەپەستۆی.

تَدَرَّأَ- القَومُ تَدارُؤاً): خوێشگەل ناتەبابوونو لەگەڵ یەك کەوتنە ململانێیو ناحەزیی.

(إنْدَرَأَ- السَّيلُ): لێشاوەکە تیژ هوروژمیهێنا.

(- الحَريقُ): ئاگرەکە تەشەنەیکرد.

(- فُلانٌ عَلَينا): لەپڕ فیسار لێمانەرپەڕی/ لێمانپەیدابوو.

(اَلدَرْء) ١-لادان/ دوورخستنەوە.

(«دراُ المفاسِدِ أَولى مِن جَلْبِ النِّعَم»): دوورخستنەوەی خراپەو خۆلێلادان لە خۆشیو بوون لە پێشترە.

(«جاءَ السَّيلُ دَرْءً»): لێشاوەکە داپەڕیو هاتو کەس نەیزانی لە کوێوە هات ٢-ناکۆکیی.

(اَلمِدْرَا): هۆی لادانو دوورخستنەوە.

(الدَريئَة): قوڵفەیەکە/ نەڵقەیەکە نێزەوەشێن مەشقی نێزەوەشاندنی لەسەر دەکات.

(اَلتُدرأ والتُدْرَأَة): پارێزەری نەبەردو سەربەرزو کۆڵنەدەر.

٢-(دَرَأَ- الشَيءَ. دَرْأً و دَرْأَةً): شتەکەی ڕاخست/ پانکردەوە.

٣-(دَرَأَ- تِ النارُ. دُرؤً):ئاگرەکە شەوقیدایەوە.

(- البَدْرُ):مانگی چواردە کەشەوقیدایەوە.

(الدُرِّيء والدِرِّيءُ) (فك): هەسارەی (گەشەدار/ پرشنگدار/ بەشەوق).

(الدَراريء) (فك): هەسارە مەزنەکان کە ناویان نازانرێت.

٤-(دَرَأَ- هُ مُدَرَأَةً):١-لاواندیو میهرەبانیی لەگەڵدا نواند ٢-فریویدا/ فێڵی لێکرد.

(تَدَرَّأَ- الصائِدُ): ڕاوچییەکە خۆی حەشاردا تا نێچیرەکە بخلافێنێت نەیبینێتو فریوی بدات.

(إدَّرَأَ- الصَّيدَ ولِلصَّيدِ): حەشارگەی بۆ خۆی دروستکرد/ چووە بنەوە.

(الدَّريئَة): حەشارگە/ بنەی ڕاوکەر/ ئەوەی ڕاوچی خۆی تێدا دەشارێتەوە تا نێچیرەکە بخەڵەتێنێتو نەیبینێت.

٥-(تَدَرَّأَ- عليهِ. تَدَرُّؤً):زماندرێژیی لەگەڵدا کردو بەسەریدا خوڕی/ خۆی بەسەردا ڕاوەشاند.

٦-(اَلدَرْءُ):پێچو پلووچی جۆگەو شتی وەها/ خوارو خێچی.

(«قَوَّمْتُ دَرْءَهُ»):خواروخێچیم ڕاستکردەوە.

درب: ١-(دَرَبَ. دَرَباً و دُرْبَةً):(شارەزابوو/ کارامەبوو/ لێزانبوو/ وەستابوو) لە کارەکەیدا.

(- بالشَّيءِ):مەشقی لەسەر کردو بە شتەکە ڕاهاتو حەزی لێکرد/ پێوەینووسا/ پێوەیراهات.

(دَرِب ودارِب-(م) دَربَةٌ و دارِبَة):١-شــارەزا/ کارامــە ٢-پێــوە ڕاهاتــوو حەزلێکــردووی پیشەکەی.

(دَرَّبَ- هُ بِالشَّــيءِ و فِيهِ وعَلَيهِ):مەشــقی لەسەر شتەکە پێکردو پێیڕاهێنا.

(ـ الجُنْدِيَّ):ســەربازەکە لەسەر ئارامگرتن و هەڵمەتــن لــە کاتی شــەڕدا مەشــقیکردو ڕاهات و فێربوو.

(اَلدُّرْبَة):ڕاهاتووی جەنگ و قاڵبوو.

(تَدَرَّبَ- بِالشَّــيءِ و فِيهِ و عَلَيهِ):مەشــقی لەسەر شتەکە کردو پێیڕاهات.

(اَلــدَّرب (ج) دُرُوب و دِرَاب):١-ڕێچکــە ٢-دەرگــای/ دەروازەی/ گەورەی هێــڵ ٣-دەرگا ڕێی فراوان.

(اَلدُّرْبَة) (مــص):١-نەریت/ خوو ٢-بوێریی لە جەنگ و هەموو هەڵوێستێکدا.

(فِي العَفــوِ دُرْبَةٌ»):لێخۆشــبوون/ لێبوردن بوێرییە.

((اَلدَّرُوب والدَّرْبُوت — مِنَ الجِمال والنُوق): حوشــتری نێرومێی نەرم و ئاسان و ملدەر (لە ڕاهاتنەوە وەرگیراوە).

(اَلدُّرَّابَة= الدُّرْبَة):١-نەریت/ خوو ٢-بوێریی جەنگ و هەموو کارێك.

(اَلمُــدَرَّب) (مفــع):١-فێرکــراوو ڕاهاتــوو ٢-ئەزموونداری وەی و نارەحەتی زۆر.

(- مِــنَ الإبِلِ):حوشــتری ڕاهاتووی کاروان و بارو سواربوون.

٢-(أَدْرَبَ):فووی بە شەیپوورەکەدا کرد.

(- القَــومُ): خۆیشــکەل چوونــە خاکــی دوژمنەوە.

٣-(اَلدِرْبان والدُرْبان (ج) دَرابِنَة) (فارسية): دەرگاوان.

٤-(دَربَــزَ- البــابَ) (عاميــة):دەرگاکــەی داخســت و پشــتکوێیدا کــە لــەو دیــوەوە نەکرێتەوە.

(اَلدَربَزِيــن والدَرابَزِيــن و الدارابزون (ج) درابزونات) (يونانية):محاجەرەی ئاسن یان دار کە بۆ پێپلیکە دەکرێت.

٥-(اَلدِرباس (ج):١-شــێر ٢-سەگی پەتکراوو بەستراوە.

٦-(دَرْبَــصَ. دَرْبَصَةً):لە ترســاندا ماتبوو/ کڕبوو.

٧-(اَلدَربَنْد):دووکانداخستن (فارسيه).

دَروَنْد (عامية):دووکانداخستن.

الملحق:

درب: (اَلمُدَرِّب)مەشقپێکەر/ کەسێکە پیشەی مەشقپێکردنە.

(اَلمُــدَرِّبُ الرياضــي): مەشــقپێکەری وەرزشــەوانەکان. فێریان دەکات چۆن یارییە وەرزشــیەکان بکــەن و دەســتووری یارییەکان چییە و سەرپەرشتیی چالاکییەکانیان دەکات. کەســێکە مەشــق بــە زۆرانبــازەکان دەکات.

کەسێکە مەشق بە تیپێکی یاریی دەکات‌و ئامادەیان بۆ پێشبڕکێ دەکات.

(مُـدَرِّب مُلاکـم): مەشـقپێکەری یاریـی مستێن.

(«مُدَرِّب فریق کرة القدم»): مەشقپێکەری تۆپی پێ.

(المُدَرِّب) (ا ع): مەشـقپێکەری سەربازەکان. فێری چۆنیەتیی جەنگاوەریی‌و بەکارهێنانی چەك‌و هونەری شەڕکردنیان دەکات.

(المـدرب في الادارة): لـە بەڕێوەبردنـی فەرمانـدا: فرمانێکە/ کارێکە لـە کاروباری گشتیدا، ئەو کەسەیە ئەو کارمەندەیە کە ئەو کارە دەگرێتە دەست.

---

درج: ١-(دَرَجَ- الشَـیخُ أو الصَبـیُّ دُرُوجاً و دَرَجاناً): پیرەکە یان منداڵەکە کەوتەڕێ.

(دَرِجَ دَرْجـاً): ملـی ڕێگـەی خـۆی گرت‌و ڕۆیشت.

(إستَدْرَجَ- هُ): خستیە سەرڕێ‌و ڕۆیشتن.

(الدَّرَج (ج) أدْراج ودِراج): ڕێ.

(«خَلَّـهُ دَرَجَ الضَبِ»): لێیگـەڕێ با بڕوات‌و عەرەبانەکەی خۆی ڕابکێشێت.

(«رَجَعتُ أدْراجي»): بە کوێدا ڕۆیشـتبووم هەر بەو ڕێگەیەدا هاتمەوە.

(الدارج) (فا): ١-پێگرتوو ٢-ڕاهاتوو.

(صَبـيٌ دارِج): منداڵێکـی گەورەبـووی پێگرتوو.

(الدارِجَـةُ (ج) دَوارِج): دەسـت یـان پێـی جوارپێ.

الدَرَّاج: ١-دووزمان/ زمانبەد/ قسەچن ٢-(ح): ژیشك.

(الدَرَّاجَة): ١-پاسکیل.

(الكَراجَّـة) (عامیـة): پاسـکیل ٢-زرێپۆش (ئامێرێکبوو درەخشاو سەربازەکان دەچوونە ناوی بۆ نیقەلاکان لە کاتی شەڕدا.

(المَدْرَج (ج) مَدارِج): ١-ڕێ ٢-ڕێڕەو ٣-ڕێباز.

(«إمْش في مَدرَجِ الحَقِّ»): بە ڕێی ڕاستدا بڕۆ ٤-نیشـتگەی فڕۆکە/ ڕێنیشتنەوەو هەستانی فڕۆکە لە فڕۆکەخانەدا.

(مَدْرَجُ — النَّملِ): ڕامێروو.

(«هُوَ أخْفى مـن مَدرَجِ النَّملِ»): لە ڕامێروو شارراوەترە.

(مَدْرَجُ الأكَمَة): ڕێی بەپەکدا چووی گرد.

(المَدْرَجَـةُ (ج) مَـدارِج): ڕێ/ ڕێگا. بەشـی زۆری ڕێگاکەو ڕووی ڕێگاکە.

٢-(دَرَجَ- الرَجُـلُ. دُووجـاً و دَرَجاناً): بە پلەکاندا یان پێپلیکەکاندا سەرکەوت.

(- البِنـاءَ): خانووەکەی بـە چەند نهۆمێك کرد/ نهۆمی لەسەر نهۆم هەڵساند.

(دَرِجَ دَرْجـاً): پلـەو پایـەی بڵندبوو/ بەرز بووەوە.

(دَرَّجَ- البِنـاءَ): پێپلیکـەی بـۆ خانووەکـە دروستکرد.

(- هُ إلى كَـذا): وردەوردە لـەو شـتەی نزیککردەوە.

(تَدَرَّجَ – إِلى كَذا): پلە پلە بۆ ئەوەچوو/ بۆی سەرکەوت.

(إسْـتَدْرَجَ – هُ):١-پلـە پلـە سەریخسـت/ بەرزیکردەوە/ پێشیخسـت ٢-هەڵیخەڵەتاندو هێنایە ژێر باڵ/ ژێر ڕکێف.

(-هُ إلى كذا): وردە وردە لێینزیککردەوە.

(اَلـدَرَج أدْراج و دِرج): ١-پلـە ٢-پێپلیکـە/ پلیکانە.

(دَرَجُ السُـلَّم): پلـەی پەیژە کە بەسـەریدا سەردەکەون.

(اَلدُرَجَـة (ج) دُرَج): پلیکانـە/ پێپلیکـە/ قالدرمە.

(اَلدَّرَجَـة (ج) دَرجات): ١-چینو پلەو پایەو جـێ ٢-پلـەك کە بەشـێکە لە (٣٦٠) بەشـی چێوەی بازنە گەورە بێت یان بچووك.

(اَلدَرَجَـة السِّـينِيَّة): پلەکـی سـینی کـە ئەوەدیەکی گۆشـەی وەسـتاوە کە یەکسـانە بـە (٦٠) خولـەك هـەر خولەکێکیـش (٦٠) چرکەیەو هەر چرکەیەکیش ١٠ بەشـیترەو هەریـەك لـەو بەشـەیش دەکرێـت بـە ١٠ بەشیترەوە. عەرەب چرکەیان دەکرد بە (٦٠) بەشـیترەوەو هەریەکـە لەو بەشـەش دەکرا بـە (٦٠) بەشـیترەوەو ئە ئاوا بەو شـێوەیە دەڕۆیشت.

(اَلدَرَجَـة المِئَوِيَّـة أَو غراد): پلەی سـەدی کە سەدیەکی گۆشەی وەسـتاوەو بە گوێرەی پلەی سـەدی دەکرێت بە (١٠) دەسـگیرادەوە دەسـیگرادێکیش دەکرێـت بـە (١٠) سـانتیگرادەوە سـانتیگرادێکیش دەکرێت بە (١٠) ملیگرادەوە.

(اَلمَدْرَجَـة (ج) مَدارِج): ئـەوەی کە دەبێتە هۆی گەیشـتن بە باشـترو باڵاتر لـەوەی کە هەیە.

(«هـذا الأَمـرُ مَدرجَـةُ لِهذا»): ئـەم کارە پلەیە بۆ سـەرکەوتنی ئەوە یـان هۆیەکە بۆ ئەنجامدانی باشتر لەوە.

(اَلمُـدَرَّج): ١-تەلانـۆك (هەمـوو هۆڵێك یان شـوێنێك وەك تەلانـی یەك لەسـەر یەك و کورسـی لێریزکرابێـت بەرامبەریشـی وتارگەیـەك هەبێت یـان یاریگەیەك هەبێت یان شـانۆیەك هەبێت یان پەردەیەکی سـپی بۆ پیشـاندانی فیلـم هەبێـت ٢-خانوویەکی فراوان کە لە شـێوەی نیوەبازنەدا بێت، دیوار بەرز بێت کورسـی تەلانشـێوە دامەزرابێت/ پانتاییەکی مەیدانێکـی لەبەردەمدا بێت بۆ یاریی بەکاربێـت پێیدەوترێت (ئەمفیتیاتر) یانم (ستاد).

٣-(دَرَجَ- القَـومُ. دُرُوجاً و دَرَجاناً): مردنو قڕیانهات.

(«هُوَ أَكْذَبُ مَنْ دَبَّ و دَرَجَ»): ئەو درۆزنێکی

وایە زیندوو مردووی ناگاتێ.

(دَرَجَ- الرَجُـلُ): کابــرا بــە وەجاخکوێری مرد.

(إنــدَرَجَ- القَــومُ): خوێشــگەل قڕیانهــاتو نەمان.

(«ذَهَــبَ دَمُــهُ دَرَجَ أو ذَهَــبَ دَمُــهُ أدراجَ الرِّيــاحِ»): خوێنەکــەی بە فیڕۆ ڕۆیشــتو تۆڵەی نەسێنرا.

(تُــرابٌ دارِج): خۆڵێك باهەڵیدەســتێنێتو دەیبات.

(قَبيلَةٌ دارِجَة): خێڵێکی لەبنهاتوو/ فەوتاو.

٤-(دَرَجَ و دَرَّجَ- الثَّــوبَ أو الكِتابَ. دَرْجاً): جلەکــەی پێچایەوەو لوولیــدا. یان کتێبەکە، نوسراوەکەی داخستو پێچایەوە.

(أدرَجَ- الثَــوبَ أو الكِتــابَ): جلەکــە یــان کتێبەکەی پێچایەوەو لوولیداو داخست.

(- الشَّيءَ في الشيءِ): شتەکانی بەیەکدا کردو پێچانیەوەو هەڵیگرتن.

(إنْدَرَجَ- في كذا): چووە ناو ئەوەوە.

(ألــدَّرْج): تۆمارکردنــی نووســینی شــتێك تیایدا.

(«أنْفَذْتُــهُ في دَرَجِ الكِتــابِ»): لە کتێبەکەدا تۆمارمکرد/ نووسیم.

(ألُــدْرَج والمُدْرَجَــةُ (ج) مَــدارِج): کتێبــی پێچراوەو توێخراو بەرەی نوسراوی پێچراوەو توێخراو.

(ألَمدرَج (ج) مَدارِج): ١-نوسراوی پێچراوە ٢-نامەی پێچراوە یان کتێبی تۆمارکراو.

٥-(دَرِجَ. دَرْجاً): لە قســەکردنو نایندا ڕێی ناوەڕاستی گرت.

٦-(دَرَّجَ- هُ الأمــرُ): کارەکــە بێــزارو وەڕسیکرد.

٧-(ألــدُرْج (ج) أدْراج و دِرَجَــة)-جانتــای دەســتیی ژنانە یــان توورەکەی پێویســتیی ئارایشت.

(ألدَرْج- في القِراءَة): بە ســایە (واتا یەکسەر نەك بە حونجە خوێندنەوە.

(«قَــرَأَ دَرْجــاً): بــە ســایە/ یان یەکســەر خوێندیەوە.

(«قَرَأَ كرجاً») (عامية): یەکســەر/ بە سایە خوێندیەوە.

(«هُوَ وَهُمْ دَرْجُ يَدِكَ»): (بۆ هەمووان هەروا دەوترێت: ئەو، ئەوان ئەموســتیلەی دەستن/ بۆ هەموو فەرمانێکت ملکەچن.

(ألــدَرَج (ج) أدْراج ودِراج الــدَرْج): ١-ڕێ ٢-ناوبڕێکەری نێوان دووان بۆ ئاشتکردنەوەیان.

(ألدُرَّج): کاری گرنگو ســەخت/ زەحمەت/ گران کە پیاو سەرلیسیمە بکات.

(«وَقَعَ في الدُرَّج»)»: کەوتە گێژاوی سەختیو پڕ زەحمەتەوە.

(ألــدَرُوج — مِــنَ الرِّياح): بای بــە تەوژمو خێرا.

(- تِ الناقَــةُ بِذَنَبِها): مێحوشــترەکە کلکی بەردایە خــوارەوە بــۆ لای ڕەفیچکی ڤاچیو لارانی.
(-تِ الجارِيَــةُ): کەنیزەکەکــە بــە نــازەوە ڕۆیشتو داوێنی کراسەکەی بەکێشکرد.
(- فُلانٌ الى فلانٍ): فیســار لەگەڵ فیســاردا شەرمو شــکۆی خستە لاوەو بێپەروا لەگەڵیدا دوا.
(ذَيَّلَ- الثَــوْبَ): کراســەکەی درێژکردەوەو شۆڕکرد.
(- الكِتــابَ): پەراوێزی بۆ کتێبەکە کرد/ لە پەراوێزیشتدا زیادەی نووسی.
(أذال وأذْيَلَ- الثَوبُ إذالَةً و إذيالاً): کراسەکە شۆڕبوو تا لە زەوی خشا.
(- الرَجُلُ ثَوْبَهُ): پیاوەکە بەرگەکەی وا شۆڕکرد تا لە زەوی بخشــێت ٢-لکی/ داوێنی بەرگەکەی درێژکرد.
(- تِ المَــرأةُ قناعَهــا): ژنەکــە بەچەکــەی دادایەوە.
(- الدَّمعَ): فرمێسکی ڕشت/ گریا.
(تَذَيَّلَ- تِ الجارِيَــةُ): کەنیزەکەکە بە نازو لەنجــەو لارەوە ڕۆیشــتو لکی کراســەکەی ڕاکێشا.
(- في الكَلامِ): بێپەردەو پەروا کەوتە قســەو دوان.
(- الفَــرَسُ): چارەوێکە لە غاردا کلکی گرتو ڕاوەشاند.
(الذَيْــلُ (ج) أذيــال وذُيــول وأذْيُل): ١-کلك ٢-پایان/ دوایی شت/ داوێن/ لك/ پەراوێز.
(«طالَ ذَيْلُهُ»): خۆشــگوزەرانبوو/ ساماندار بوو/ دارا بوو.
(ذَيلُ الثَّوبِ): دامێنو لکی کراســی درێژ کە بە زەویدا دەخشێت.
(ذَيــلُ الريــحِ): ١-ئــەو خاشــاكو پووشو پەڵاشو شــتەی کــە باکە لــە دوای خۆیەوە بەجێیدەهێڵێــت ٢-ئــەو خۆڵەی کە بەســەر زەویدا رایدەدات.
(ذَيــلُ الفَــرَسِ): کلکی چارەوێکــە یان ئەو تووکەی کە کلکەکە بەریداوتەوە.
(أذيَالُ و ذُيُــولُ – النَّاسِ): دواکەوتووەکانی خەڵك/ مرۆڤی چینی نزم.
(ألذائِل) (فا): کلکدار/ دامێندار.
(«دِرعُ ذائِــل أَو ذائِلَــة»): زرێــی دامێدار/ درێژ.
(ألذَيَّال): کلکدرێژ.
(«ثَوبُ مُذال و مُذَيَّل»): بەرگێکی دامێندرێژ کە لە زەوی بخشێت.
(دِرعُ مُذَالَة): زرێیەکی درێژ.
(ألمِذْيال): کلکدرێژ (بۆ نێرو مێ دەوترێت).
٢-(ذالَ- الشــيءُ. ذَيْلاً): شــتەکە ســووكو بێبایەخبوو.
(-ت حالُهُ): باری هاتە کزی/ خراپبوو.

(أَذالَ وأَذيَـلَ- هُـزُ إِذالَةً وإِذيالاً): سـووكو رسوايكرد/ بە چاوى سووك تەماشايكرد.

(- فَرَسَـهُ أَو غُلامَهُ): بەتەنگ چارەوێكەوە يان كورەكەوە نەهات ئيتر چرووسـانو دايانە كزىو لاواز بوون.

(- مالَهُ): سامانو داراكەى خراپ بەختكرد/ بەخشـانو تەخشـانيكرد/ دەسـتبلاوانە لەدەستيدا.

(تَذايَـلَ- ت حالُـهُ): بـارى هاتـە كـزىو بەدگوزەرانبوو.

(الذَيل (ج) أَذيال وذُيُول وأَذْيُل): ١-سـووكو رسوايى ٢-داماويىو باركزبوون.

(«هُـوَ في ذَيلٍ ذائِلٍ»): ئەو لـە داماوييەكى زۆردايەو رسوا بووە.

(المُذالَة): كۆيلە.

٣-(أَرضٌ متَذَيِّلَـةٌ): زەوييەكـە پرووشـە بارانگرتى/ بارانێكيكەم گرتيەوە.

ذام: (ذامَ- هُ. ذَيْماً و ذاماً): تەشـەرى لێداو كەموكوورِيى دەرخست/ خراپ ناويهێنا.

(مَذيم ومَذيُوم): تەشـەرلێدراوى بە خراپ باسكراو/ زەمكراو.

(الذام والذَّيم): خەوش‌و بە خراپ باسكردن/ زەمكردن.

ذين: (الذِّين): خەوش/ كەموكوورِيى.




ر: (اَلــراء) (ر): دەهەمــين پيتــی ئەلفوبێی عەرەبییــە (ر) لــە ژمێرەی کــۆی پیتەکاندا (٢٠٠٠)ە.

الملحق:

راء: (اَلرائِيَّة): ڕێی: بە هەموو هەڵبەســتێك دەوترێــت کــە ســەروا کــەی (ر) بێــت. بەناوبانگترینــی ئــەم جــۆرە هەڵبەســتە هینەکــەی (ابــن عبدون)ە کە تیایدا شــین بۆ (بەنی ئەفگەــس) دەکات و هینەکەی (ابن البَوَّاب الخطاط) و (ابن الحسن التُهامِي)یە کە تیایدا شین بۆ کورەکەی خۆی دەکات.

(رأب: ١-(رَأَبَ- الصَــدْعَ. رَأبــاً): (درزەکەی/ قڵیشــەکەی/ لێکترازانەکــەی) پەیوەســت و چاککردەوە.

(- الشَــيءَ): شــتەکەی هێنایــەوە یــەك/ کۆکردەوەو هێواش پێکیەوە بەست.

(- بَیْنَهُــم): نێوانیانــی ڕێکخســتەوە/ تەبایکردنەوە.

(أَرْأَبَ- الصَدْعَ. إرآباً): (درزەکەی/ قڵیشەکەی/ لێکترازانەی) پەیوەست و چاککردەوە.

(اَلــرِّاب (مص) (ج) رِئــاب): ١-درز/ قڵیش/ لێکترازان ٢-سەردار/ گەورە.

("كَفى لِفلان راباً لأَمرِكَ"): بەسە ئیتر فیسار گەورەیی کاروبارت بکات یان تێکیبدات.

(اَلرُؤبَــةُ (ج) رِئــاب و رُؤبــات): ١-پارچــە تەختەیەك یان هەر شــتێکی وەها کە شتێکی پــێ چاکبکرێــت ٢-ئــەوەی کــە کونێك یان کەلەبەرێکی پێ بگیرێت.

(الرئاب): ١-چاککەرەوە ٢-تەبا کاری نێوان.

(«هُــوَ رِئــابُ بَنی فُــلان»): ئــەو تەباکارو پیاوچاکی فیسار بەرەیە/ کۆککاریانە.

(اَلمَــرْأَب): گــەراج/ شــوێنی چاککردنەوەی ئوتومبیــل و پاســکیل و شــتی وەهــاو تێــدا ڕاگرتنی.

(اَلرَّأّاب والمِرآب): وەستای چاککەرەوەی شت/ کۆککار.

٢-(رَأَبَ- تِ الأَرضُ. رَأْباً): زەویەکە پاش بڕینی ڕووەکەکەی شین بووەوە/ ڕووەکەکەی دەرهاتەوە.

٣-(الرُؤبَة (ج) رِئاب ورُؤبات): ١-ماست / مەیو ٢-تێپەڕینی کاتژمێرێکی شەو.

٤-(رَأبَلَ. رَأْبَلَةً): وەك پێخاوس ڕۆشت/ وەك قاچ کۆڵەوار قاچی خشاند.

(تَرَأْبَلَ- القَومُ): خوێشگەل بە دزە دزە سووسەیانکرد.

(- علیه): شێر ناسا هەڵمەتیبردە سەری.

(الرِئْبال والرِيبال (ج) رَآبيل ورَآبِل ورآبِلَة و رَيابيل (ح): ١-شێر ٢-گورگ.

رات: (الراتينج) (ك): مادەیەکە وەك کەتیرەیە دەسوتێت. هەندێك دار وەك سنەوبەرو ئەرزو دارقەزوانو مەستەکی دەریدەکات.

رؤد: ١-(رَؤُدَ- الغُصْنُ. رُؤُودَةً): تووڵەکە زۆر تەرو تازەو ناسکبوو/ تازە چووز بوو.

(رَؤُد): تووڵی درەخت کە زۆر ناسكو تازەو تەرە/ تازە چووزە.

(تَرَأّدَ- تِ الريحُ): باکە گێژیدا هەردەمەو لە لایەکەوە هەڵیکرد.

(- الرَجُلُ): هەستاو موچڕکێکی پێدا هات.

(تَرَأَدو ارتَأَدَ- الغُلامُ): مێردمنداڵەکە لە خۆشیو نەرمیی لەشیدا لەرەی لێوە هات.

(- الغُصْنُ): چڵەکە (شەکایەوە/ لەرەلەریبوو/ لەرییەوە).

(- العُنقُ): ملەکە خواربووەوە.

(اَلرَأدُ والرَأْدَةُ والرُؤْدَةُ والرُؤودَةُ): کیژۆڵەی ناسکی جوان/ تازە چووز.

(اَلرُؤْد= الرَّأْد): ١-تازە/ چووز ٢-ناسانییو ناسکییو هێواشی.

(اَلرِئْـد (ج) أرْآد): ١-چوزی تازەی درەخت ٢-بێچوولەی درەخت.

٢-(تَرَأَدَ وتَراءَدَ- الضُحى): چێشتەنگاو داهات.

(رأدُ ورائِدُ الضُحى): دەمی چێشتەنگاو/ کاتێکە خۆر بەرزبۆتەوەو هەتاو هەموو لایەکی گرتۆتەوە.

٣-(اَلرُؤد والرَأد): سەری ئێسکی کاکیلە کە لە بن گوێدایە.

(اَلرِئْد (ج) أَرآد): هاوتەمەن.

(«هذا رِئْدي»): ئەمە هاوتەمەنمە.

٤-(اَلرادْيُولا) (ن): ڕووەکێکە لە بنەچەی کەتانە.

رار: (رَأْرَأَ): گلێنەی چاوی جووڵاندو تیژ تەماشایکرد.

(- بِعَيْنَيْهِ): هەردوو چاوی بزواندو گێڕانی.

(رَأْرَأَ (م) رَأْرَا ورَأْرَأَة ورَأْراءُ ورَأْراءَةُ): چاوگێڕو بەسەرنج/ بەڕوان.

(- تِ الظِباءُ): ئاسکەکان کلکیان هێناو برد/

بزواندیان.

(- السَحابُ أَو السَرابُ): هەورەکە یان تراویلکەکە شەوقیدایەوە/ بریسکەیهات.

(- الرَجلُ): لە قسەکردندا یان خوێندنەوەدا دەنگی (ر)ی زۆر دووپات کردەوەو وتەوە.

راس: (رَأَسَ- القَومَ رِئاسَةً): سەرۆکایەتیی/ سەرکردایەتیی نەتەوەکەیکرد.

(رُؤسَ. رِئاسَةً): سەرۆکییکرد/ سەرۆکبوو.

(رَأَّسَ- هُ): کردی بە سەرۆك/ بە گەورە.

(تَرَأَّسَ وارتَأَسَ): سەرۆکایەتییکرد/ بوو بە سەرۆك.

(اَلرَأس): سەرۆك/ گەورەی/ نەتەوە.

(اَلرائِس (فا) (ج) رُؤّاس): پێشەوا/ سەرکردە/ والی.

(اَلرَیئَس (ج) رُؤَساء): ١-سەرۆکی نەتەوە ٢-رابەر ٣- (ا ع) پلەیەکی ئەفسەریی سەربازییە.

(اَلرَئیس (ج) رُؤَساء): ١-سەرۆکی نەتەوەو رابەریان/ پێشەوایان ٢-(مو): یەکێکە لە دوو قامیشی جوزەلەکە کە لە پاڵ یەکدان ئەمە بەوە یان دەڵێن کە لە لای راستدایە کە ئاوازەکە دەردەهێنێت ئەویتریان پاڵپشتەو ئاوازەکەی ئەگۆڕە.

(اَلمَرؤُوس): ژێردەستەی سەرۆکو کارگوزارییەکەی.

(رَأَسَ- هُ. رَأساً): دایبەسەریدا.

(رَئِسَ): هاواری ژانە سەریکرد.

(اِرتَأَسَ- هُ): بۆدەقەی ملی گرتو سەری پێدانەواند.

(- الشیءَ): سواری سەری شتەکە بوو.

(اَلرَأس (ج) اَرؤُس و رُؤُوس ورُوس وآراس (ع ا): ١-سەر پاش مل لە مرۆڤداو لە بنی ملەوە لە ئاژەڵدا ٢-بە ئاژەڵەکە خۆی دەڵێن. دەوترێت: چل سەرمەڕ ٣-سەرەوەی شت.

٤-(الراس- اَلبَنجَق) (مو): بەشی کۆتایی عودەکەیە کە بۆ خوارەوە چەمییەوە ٥-سەری مانگ یان سەری ساڵ کە یەکەمین رۆژیانە.

٦-(رَأساً) (فَعَلَهُ راساً): یەکسەر کردی.

(وَلَدَتْ ثلاثَةً رَأساً علی راسٍ): سێ منداڵی بوو یەك لە دوای یەك.

(«رُمیتُ مِنكَ فِي الراسِ»): بەرامبەرم راتو خراپبوو/ پلارێکی وات تێگرت دیاربوو کە چارەم لات نانوێنێت.

٨-(هذا قِسمُ بِرَاسِهِ»): لە کاروباریدا سەربەخۆیە.

٩-(اَنتَ علی راسِ اَمرِكَ): تۆ خۆت سەرکاری کارەکەتی.

(رِئاسُ السَّیف): دەسکی شمشێر.

(«اَنتَ علی رِئاسِ اَمرِكَ»): تۆ خۆت گەورەو سەر کاروباری خۆتیت/ خۆت گەورەی خۆتیت.

(اَلرَئیس): سەر بەرکەوتوو یان سەر قرنجاو.

(اَلرُوَیس) (ن): گوڵکۆ: کۆمەڵە گوڵێکە تەختێکیان هەیەو سەریان بەسەری یەکەوەیە.

(اَلاَرْاَس (م) رَاْساء): کەللەزل/ سەرزل.

(اَلرَاْس- مِنَ الخَیل):١-ئەسپێکە لە پێشبڕکێداو لە غاردا گاز لە سەری ئەسپەکانیتر دەگرێت ٢-ئەسپێکە لە پێشبڕکێدا سەردەکەوێت.

(اَلمَرْؤوس): ١-سەرزل/ کەللەزل ٢-سەر بەرکەوتوو یان سەر قرنجاو.

(اَلرَوائِس الواحِدَة رَئیسَة): ١-هەوری پێشەنگ ٢-بەرزایی دۆڵ.

(اَلرُؤاسيّ): سەر زل.

٣-(رَاَسَ- السَّیلُ الغُثاءَ. رَاْساً): لێشاوەکە گەندەو خاشاکی کۆکردەوەو ڕامالّی.

الملحق:

راس: اَلرَّاْسْمال: سەرمایە ئەو دارایییەی کە خاوەنەکەی بیبێت بێگوێدانە ئەوەی کە ئەو دارایییە بەرهەمی هەبێت.

(«یُنفِقُ مِن رَاْسمالِهِ»): لە سەرمایەکەی بەختدەکات/ خەرجدەکات.

(اَلمال المُوَظَّف اَو المُستَثمَر وقیمتُهُ): ئەو دارایییەی/ ئەو پارەیەی کە خراوەتە کارەوە/ بەرهەمهێنانەوەو برەکەی.

(«قَدَّمَ الراسمالَ لَمَشروع»): سەرمایەی پرۆژەیەکی داو پێشکەشکرد.

(قیمةُ المالِ موضوعُ الدَّین): ئەو پارەیەی کە بە وام دراوە بە بێ ئەوەی سوودەکەی لەگەڵدا بێت.

(«اَلرَاْسمال والعَمَل»): سەرمایەو کار.

(اَلرَاْسمال (مجازاً): سەرمایە (بە خوازە) هەرچی مرۆڤ کەڵکی لێوەرگرێت.

(«رَاْسمالُهُ عِلمُهُ»): سەرمایەکەی زانستییەکەیەتی.

(اَلرَاْسمالِیَّة): سیستمێکی ئابوورییەو هۆی بەرهەمهێنان هی خاوەن سەرمایەکانە کە خستوویانەتە ئەو کارەوەو بەرهەمی پێدەهێنن.

(مجموع الرَاْسمالیین اَو البلدان الراسمالیة): گشت سەرمایەدارەکان یان وڵاتە سەرمایەدارەکان.

---

راف: (رَاَفَ ورَؤُفَ ورَئِفَ و تَرَاَّفَ- بِهِ. رَاْفَةً ورَآفَةً و رَاْفاً): زۆر بەزەیی پێداهاتەوە.

(رَؤوف و رَؤُف و رَاْف و رَئِف ورائِف): زۆر بە بەزەیی/ دڵنەرمو میهرەبان.

(رَاَّفَ واسْتَرْاَفَ- ه): داوای بەزەیی لێکردو میهرەبانیی لێخواست ٢-بەزەیی جووڵاند/ وایکرد بەبەزەییبێت.

(تَراءَفوا): بەزەییان بەیەکدا هاتەوەو لەگەڵ یەکدا میهرەبانبوون.

(اَلرَاْف): مەی.

رال:١-(اِسْتَرْاَلَ- الرَاْلُ): بەچکەوشترمرخەکەی بەهێزو چوستبوو.

(- النَباتُ): ڕووەکەکە وەك ملی بەچکە

وشترمرخ دریژ بوو.
(اَلــرَال (م) رَالَة (ج) رِئــال وأرْؤُل ورِئلان ورِئالَة) (ح): بەچکەوشترمرخ.
(نعامَةٌ مُرئِلَة): وشترمرخی بەچکەدار.
(اَلْمرائِل): پەلەکەر/ خیّراکردوو.
٢-(اَلرُؤَال): کەفی دەمی ئەسپ.
(اَلرائِل والرَاؤول): دانێکە لە پشت کاکیلەوە دەردێت.
رام: ١-(رَأَمَ- القِــدْحَ. رَأمــاً): چەرخەکــەی چاککردەوە.
(رَئِــمَ- الجِــرْحُ. رَاماً و رِئمانــاً): برینەکە هاتەوەیەك‌و خەریکی چاکبوونەوە بوو.
(أرْأَمَ- الجِــرحَ. إرآماً): برینەکەی تیمار کرد تا چاکبووەوە.
٢-(رَأَمَ- الحَبْلَ. رَاماً): پەتەکەی توند بادا.
(أرْأَمَ — الحَبْلَ. إرآماً): پەتەکەی توند بادا.
٣-(رَئِمَ- الشَيءَ. رَاماً ورِئماناً): شتەکەی بە دڵدا چووو هۆگریبوو.
(-تِ الناقَةُ وَلَدَها): مێحوشترەکە بەچکەکەی خۆی بە دڵەوە ناو سۆزیدایە.
(رائِم ورائِمة ورُؤُوم (ج) روائِم): ســۆزدەر/ بەسۆز/ لاوێن.
(«ظِئْرٌ رَؤُوم خَيرٌ مِن أُمٍّ سَؤُوم»): دایەنێکی بەسۆز لە دایکێکی بێسۆز چاکترە.
(«هُوَ رَؤُومٌ لِلضَّيم»): ئەو سەرشــۆڕەو قایلە بە زەبونکردنی.

(أرْأَمَ- الناقَةَ. إرآماً): ســۆزی حوشترەکەی بۆ بەچکەی حوشترێکیتر جووڵاند.
(- هُ على الأمر): ناچاری کارەکەیکرد.
(تَرَأَّمَ- هُ وتَرَأَّمَ- عليه): بەزەیی پێداهاتەوەو سۆزی بۆی جووڵا.
(اَلرَوَائِم): ئاگردان. لەبەرئەوەی خۆڵەمێشەکە دەگرێتە باوەش وەك جەرگی بێت.
٤-الرِئــم (م) رِئمَــة (ج) أرئــام وآرام (ح): ئاسکی سپی.
(اَلرُؤام): لیکیدەم.
رای: ١-(رأى. يَــرى. رَأياً و رُؤيَــةً و راءَةً و رُئياناً): دی/ بینی بە چاو یان بە ئاوەزو هۆش هاتە بەرچاوی/ چاویکرد/ هەستی پێکرد لە بنچینــەدا (يَرى) (يَرْأى)یە بەلام بە دەگمەن (يَــرأى) دەوترێت. کــرداری داخوازییەکەی (رَ)یە. واتا تەماشا بکە، ببینە.
(رَأَى- الرايَةَ): ئاڵاکەی چەقاند.
(- الزَّنْدَ): دەستی بە پەلەپیتکەی چەکەکەدا ناو ئاگریدا.
(- الزَّنْدُ): پەلەپیتکەکە (ئاگریدا/ ئاگریکردەوە).
(«ياتُرَى وياهَل تُــرَى»): ئایا/ ئاخۆ/ دێتە بەرچــاوت/ دەبینیت یان بیرت بۆی دەچێت؟ (نەبیستراوە رانەبوردووی (رأى) کە بە واتای گومان بێت مەگەر بە شێوەی نادیار (مجهول) بێت).
(راءَ= رأى- الشيءَ): شتەکەی (دی/ بینی).

(رأيتُهُ. تَرئِيَةً): پێچەوانەی ئەوەم پیشــاندا کە/ لەسەریمو هەم.
(راءيْتُهُ مُــراءاةً ورئاءً): ١-پێچەوانەی ئەوەم پیشاندا کە من لەسەریم ٢-راوێژم پێکرد.
(أَرى- هُ. إِراءَةً وإِراءً): پیشــانیدا/ وای لێکرد بیبینێت.
(مُرّ (م) مُريَةٌ): تەماشاکەر.
(«أرني بِرَأيكَ»): رای خۆتم پێبڵێ چی بکەم باشە.
(«أَرى اللهُ بِفُــلانٍ»): خودا فیســاری گرفتار کردو دوژمنەکەی پێخۆشکرد.
(أَرْأَى. إِرْءاءً): ١-رادروســتو ژیــر بــوو ٢-گەوجیــی بە ڕوویــەوە دیاربــوو ٣-مەرایی‌و ڕووپامایکرد/ کوزکەشیکرد ٤-تەماشای خۆی لە ئاوێنــەدا کرد ٥-خەونــی زۆر بوو ٦-کاتی تەماشاکردنی پێڵوەکانی بزواند.
(-تِ الحامِلُ مِن غَيرِ ذواتِ الحافِرِ والسَبعِ): ئاوســێك بێجگە لە سمدارەکان‌و دڕندەکان بە گوانیدا دەردەکەوێت‌و دیاردەبێت کە ئاوسە.
(مُرءٍ ومُرئِيَةٌ): دیار ئاوس.
(- الرايَةَ): ئاڵاکەی چەقاند.
(تَرَأَى وتَراءى- في المِرآةِ): ڕوانییە ئاوێنەکە.
(- لَهُ): بەرەو ڕووی بووەوە تا بیبینێت.
(«تَرَأَى بِرَأيِ فُلان»): رای فیساری لاپەسەند بوو و شوێن ڕاکەی ئەو کەوت.
(تَــراءَى- الناسُ): خەڵکەکــە چاویان بڕییە یەکتری.
(«تَراءَينــا فِي الأَمــرِ»): پێکــەوە ڕوانیمانە کارەکە/ سەرنجمان لێدا.
(«تَــراءَى لِــيَ أَنَّ الأَمــرَ كَيــتَ وكَيــتَ»): بۆمدەرکەوت کە کارەکە واو وایە.
(«تَراءَينا الهِلالَ»): بۆ یەکەم شــەوی مانگ گەڕاین بزانین دەیبینین یان نا.
(إِرتَأَى- الأَمرَ): ١-لە کارەکەی ڕوانی/ سەرنجی لــە کارەکــەدا ٢-گومانــی لێکــرد ٣-تەگبیری کارەکەیکرد.
(إِستَرْأَى-هُ): ١-بانگیکرد بیبینێت ٢-رای ئەوی خواست.
(«إِســتَرْأَيتُهُ واسْتَرْيْتُهُ»): داوامکرد بیبینم یان ڕای ئەو بزانم.
(- بالمِرآةِ): لە ئاوێنەکەوە دی.
(ألــرأي (ج) آراء وأَرآء): ١-ڕاو بڕواو بۆچونی مرۆڤ.
(«رأيي كَذا»): ١-بڕواو بۆچوونی من ئەوەیە ٢-تەگبیری چاك.
(-الدَّبــرِيّ): ڕای پاشــدەم/ ڕایەکــە کــە درەنگوەخت دەربڕێت.
(- الفَطــيرِ): ڕای کاڵو کرچ/ ڕای لە پڕو بە بێبیرکردنەوە.
(ألرِئي والرُئِيّ والــرُؤاء والرِيّ): دیمەن یان قەشەنگیی دیمەن.
(ألرِئيّ ويكســر): جنۆکە دەبینرێت‌و حەزی

لێدەکرێت.

(«بِهِ رأيٌ مِن الجِنّ»): جنۆکە دەستی لێوەشاندوە یان جنۆکەی لەگەڵدایە.

(رَئِيُّ القَومِ): گەورە ڕابێژی خوێشگەل.

(اَلرِئاء) (مص): مەرایی/ ڕیایی/ ڕووپامایی/ کوزکەشی.

(«فَعَلَ ذلك رِئاءً»): ئەوەی کردی مەرایی بوو/ بۆ خۆبردنە پێشەوە بوو/ پێچەوانەی ئەوەی دەربڕی کە لە دەروونیدایە.

(«قَومٌ رِئاءٌ»): خوێشگەلێکن خۆش خۆش یەکتری دەبینن.

(«دُورُنا رِئاءٌ»): خانووەکانمان بە بەرچاوی یەکتریەوەن و بەرامبەر یەکن.

(اَلرُؤيا (ج) رُؤى): خەون.

(اَلرُؤيا أو الرَأيا): تینی چاو.

(«جاءَ حينَ جُنَّ رُؤيا أو رَأيا»): کاتێك هات کە تاریك داهات و بەرچاو تاریك بوو تینی بینینی ئەوی نەبوو.

(اَلرُؤيَةُ (ج) رُؤى): ١-دیتن/ بینین بە چاو یان بە دڵ ٢-بینایی.

(اَلرِيَّة= الرُؤيَة): تەماشاکردن/ دیتن/ چاوپێکەوتن.

(اَلتَرئِيَة): دیمەن/ چاوئەنداز یان جوانیی و قەشەنگیی دیمەن.

(اَلرَءاء): چاوگێڕو چاك تەماشاکەر.

اَلمَرأى والمَرآة: بەرچاو/ بینین/ دیار/ دیمەن.

(«هُوَ مِنّي مَرأى ومَسمَعٌ أو بِمَرأى و مَسمَعٍ»): ئەو بە بەرچاوی منەوەیەو دیارەو دەیبیسم.

(«تُخبِرُ عَن مَجهولِهِ مِرآتُهُ»): دیمەن و رووی ناوەوەی دەروونی دەردەخات و دەنوێنێت.

(اَلمِرآة (ج) مَراءٍ و مَرايا): ئاوێنە/ ئەوەی کە خۆتی تێدا دەبینیت.

(يَتَمَرأى): لە ئاودا تەماشای وێنەی خۆی دەکات.

٢-(رَأى – الرَجُلَ. رَأياً): سیی کابرای تووشکرد.

(أَرأى إرءاءً): هاواری سیی کرد.

(اَلرِئَة (ج) رِئات ورِئُون (ع ا)): سی کە گرنگترین ئەندامی کۆئەندامی هەناسەیە لە مرۆڤ و زیندەوەردا.

(رِئَوي): هی سی.

٣-(أَرأى): شایستەتر/ شایانتر.

(اَلمَرآتُ): شایستە/ شیاو/ شایان.

(«هُوَ مَرآةٌ بكذا»): ئەو (شایستەی/ شایانی) ئەوەیە.

(اَلمَرآة) (مو): ئەوەیە کە بە ملی عودەکەوەیەو پێی ڕێکدەخرێت.

الملحق:

رأى (اَلرَأي): ڕا.

(أَصحابُ الرَأيِ والقِياس): خاوەن ڕاو

پێوەرەکان، (ئەو زانایانەی شەرع و قورئانن
کە فەتوای ئاینیی لە قورئان و فەرموودەکانی
پێغەمبەرەوە هەڵدەهێنجێنن لەگەڵ
دەربڕینی ڕای خۆیان و بە پێی پێوەری
لەوەپێش.
(«القِیاسُ الکبری»): ڕا گرنگ و گەورەکان
کە لە قورئاندا هەبێت و لە فەرموودەکانی
پێغەمبەردا هەبێت، پشت بەو دوانە
دەبەسترێت.
(«القِیاسُ الصغری»): فەتوا بچووکەکان کە
لە ڕووداوی لەوەپێشەوە هەڵدەهێنجێنن و
ڕای لەسەر دەدەن.

---

ربَّ: ١-(رَبَّ- القَومَ): گەورەیی و ڕابەری
خوێشگەلیکردو ڕامیارییکردن.
(- الشَیءَ): خاوەنداریی شتەکەیکرد.
(تَرَبَّبَ- الأرضَ): خۆی بە خاوەنی زەویەکە
کردو پیشاندا.
(ألرَبّ (مص) (ج) أرباب ورُبُوب): ١-گەورە/
ئاغا ٢-خاوەن ٣-خوداوەند/ لەناوە پیرۆزەکانی
خودایە.
(رَبّي و رَبانِيّ و رَبُوبِيّ): خودایی/
پەروەردگاریی.
(ألرَبَّةُ): ١-مێی وشەی(ألرَبّ) ٢-هەموو بتێك
کە لە شێوەی مێینەیە وەك (لات).
(ألمَربَّة): ولات.
(ألرُبّان (ج) رَبابِنَة وربابين): سەرکەشتیەوان.
(ألربابَة): ١-خودایکردن/ خودایەتی ٢-
خاوەنداریی ٣-ولات.
(ألرُبوبَة والرُبوبِيَّة): پەروەردگاریی/
خودایەتی.
(ألمَربوب): بەندە/ کۆیلە.
(ألرُبّانِي): سەرکەشتیەوان.
(ألرَبّانِيّ): ١-خوداناس ٢-قەشەی دیانەکان ٣-
زانای خوداناسیی.
٢-(رَبَّ- الأمرَ. رَبّاً): کارەکەی سازاند/
چاککرد.
(رَبَّ و رَبَّبَ وأرتَبَّ- الوَلَدَ. تربیباً وتَربِبَةً
إرتباباً): کوڕەکەی پەروەردە کردو بەخێو
کرد تا بلۆقبوو و پێگەیشت.
(تَرَبَّبَ- الصَبيَّ): منداڵەکەی پەروەردەو
بەخێوکرد تا گەورەو بلووق بوو.
(ألرَّبّ) (مص) (ج) أرْباب ورُبُوب):
١-پەروەردەکار ٢-ڕابەر ٣-چاکساز ٤-گەورە
٥-خاوەن ٦-کارڕێخەر ٧-خوداوەند.
(ألراب): باوەپیارە.
(ألرُبى): ١-مەڕی زاو یان مەڕی بەرخەردوو
٢-بەرخی تازەبوو/ تازە دەرهاتوو.
(ألرابَّة): باوەژن.
(ألرَبیب والرَّبُوب (ج) أربَّة): زڕکوڕی
ژنەکە. کە لە پیاوێکیترەو زڕکوڕی پیاوەکە
کە لە ژنێکیترە/ هەنەزا.
(ألرِباب والرِبابَة): پەیمان/ بەڵێن/ گفت.

(اَلمَرْبوب): پەروەردەکراو.

(اَلرَبيبَـة (ج) رَبائِـب): ١-دايـەن ٢-کچـی ژنەکە لە پياوێکيـتر/ هەنەزا ٣-ژنی پياوەکە ئەگەر منداڵی لە پياوێکيتر هەبێت منداڵەکە هەنەزايە.

٣-(رَبَّ- النِعمَةَ. رَبّاً): نازو خۆشـگوزەرانيی پتر کرد.

(اَلرُبّی): خۆشگوزەرانی/ نازو سامانی زۆر ٢-چاکەو خێر.

(اَلمُرَبَّـب): نـازو نيعمـەت پێـدراو/ خۆشگوزەرانکراو.

٤-(رَبَّ- بِالمَـکانِ. رَبّـاً): لـە شـوێنەکەدا نيشتەنيبوو/ جێگير بوو.

(أَرَبَّ- بِالمَکانِ): ١-نيشـتەجێبوو ٢-سـەرومڕ بوو/ بەردەوامبوو/ مايەوە.

(«أَرَبَّـتِ السَّـحابَةُ»): هەورەکـە سـەرومڕ باراندی.

(اَلمَرَبّ): نشينگە/ شوێنی نيشتەجێبوون.

(«هذا مَرَبُّ القَوم»): ئێرە شـوێن نشينگەی خوێشگەلە.

٥-(رَبَّ- الشَيءَ. رَبّاً): شتەکەی کۆکردەوە.

(تَرَبَّبَ- القَومُ): خوێشگەل کۆبوونەوە.

(اَلرَّبَب): ئاوی زۆر.

(اَلرِبَّةُ): خانووی گەورە.

(اَلرِبَّة (ج) أَرِبَّة و رِباب): کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر.

(اَلمَـرَبّ): پياوێـك کە خەڵـك کۆبکاتەوە ٢-جێکۆبوونەوە.

(«هـذا مَـرَبُّ القَـوم»): ئەمـە شـوێنی کۆبوونەوەی خوێشگەلە.

(اَلمَـرَب والمِربـاب): زەوييەك کـە ڕووەکی زۆربێت/ گيای زۆر لێڕوابێت.

(اَلرُبّی): گرێکوێرە/ گرێی توندبەستراو.

(اَلرِباب): دەستە دەستەی خەڵکی دەکەسيی/ دە نەفەريی.

(اَلرَبّاب): کۆمەڵ.

(اَلرُبّان والرَبّان): کۆمەڵ/ گروپ.

(«أَخَذَ الشَيءَ بِرُبّانِهِ»): شتەکەی بە کۆمەڵ برد/ هەمووی برد/ سەرتاپايبرد.

٦-(رَبَّ- الدهـنَ. رَبّـاً): ڕۆنەکـەی قـاڵو خۆشکرد.

(-الـزِقَّ. رَبّـاً و رُبّاً): دۆشـاوی خورمای لە هيزەکە هەڵسـوو بۆنی خۆشـبوو ڕۆنەکەی ناوی خراپ نەبوو.

(رَبَّبَ- الدهنَ): ڕۆنەکەی قاڵو خۆشکرد.

(أُرنُـبَّ- العِنَبُ): ئاوەترێکەی کوڵاندو کردی بە دۆشاو.

(اَلرُب (ج) رِباب ورُبُوب) (ط): ١-دۆشاوی خورما يان ترێو شـتيتر ٢-دۆشـاوی خەسـتەوەبووی ميوە.

(اَلرِبَّـة (ج) أَرِبَّـة ورِبـاب) (ن): درەختی خڕنوم.

(اَلمُرَبَّب): مرەبا.

(اَلمُرَبَبات): مرەبا.

٧-(أَرَبَّ- مِنهُ): لێینزیکبووەوە.

(اَلرباب): دۆستەکان/ برادەرەکان/ یاران.

٨-(رُبَّ ورُبَّــة ورُبَّمــا ورُبَّتَمــا): لەوانەیە/ رەنگــە/ دەشــێت/ زۆر دوور نییە/ جاری وا هەیە. وشەکە بە بێگرتنیش دێت.

(رُبَما): شایەتا/ لەوانەیە/ رەنگە.

(رُبَّما الخَليــلُ مُقْبِلُ ورُبَّما أَقْبَلَ الخليلُ»): رەنگــە/ لەوانەیــە خەلیل بــەرەو لای ئێمە بێت/ بەرەو ئێرە بێت.

(اَلرَبَب): ١-ئاوی شیرین.

(اَلرَّباب واحِدَتُهُ رَبابَة): ١-هەوری سپی.

(رَبابة): هەورێکی سپی ٢-(مو) رەبابە.

(اَلرُبّى): پێداویستی.

(اَلرُبَّان): ١-تازەو نوێیی/ سەرەتایی.

(إفعل ذلــك بِرُبّانِهِ): بە تازەیی ســەرەتایی ئەوە بکە.

٩-(اَلربرَب): گەلەگاکێویی.

(ربــأَ. رَبــأً): بڵندبــووەوە/ ســەرکەوت/ بەرزبووەوە.

(-على جَبَلٍ): سەرکەوتە سەر شاخێك.

(- الشَيءَ): شتەکەی بەرزکردەوە.

(- القَومَ و لِلقَوم): بوو بە پێشــەنگی سوپای خوێشکەل.

(- فِي الأَمــرِ): تەماشــای کارەکەیکردو بیری لێکردەوە.

(رابأَ-ەمُرابأَةً): ١-چاودێرییکرد٢-پاسەوانییکرد ٣-خۆی لێپاراستو لێیدوورەپەرێز گرت.

(إرتَبَــأَ- المَرْبَأَةَ): ســەرکەوتە ســەر قولەی چاودێریی.

(- على الجَبَلِ): ســەرکەوتە ســەر چیاکە/ شاخەکە.

(- بهم): پێشەنگیانبوو.

(«إرتَبَأَ الشَــمسَ مَتى تَغرب»): چاودێریی ئاوابوونی خۆریکرد.

(اَلرَبــيء والرَّبيئــة (ج) ربايــا): دیدەوانی سوپا/ فەرمولی سوپا/ پێشەنگی سوپا.

(بَثُوا رَباباهم): دیدەوانەکانیان بڵاوکردەوە.

(اَلمَرْبَأ والمِرْبَأ والمَرْبَأة والمُرْتَبَأ): چاودێریگە/ قولەی چاودێریی.

(اَلمِرْباء): پلە.

٢-(رَبَأَ- المالَ رَبأً (ضد): ١-داراو ســامانەکەی پاراســتو خەملانــدو زۆریکــرد ٢-داراکەی لەبەرد داو لەناوبرد بە تەنگیەوە نەهات.

(«أَرْبَأ بِه»): بیپارێزەو بە تەنگیەوە بێ.

(«إنّــي أَرْبأُ بِــكَ عَن ذلِكَ»): ئــەوەم بۆ تۆ ناوێتو پێی قایل نابم.

(«مارَبَــأتُ رَبْــأَهُ»): نــە بەوەمزانیو نە بە تەنگیشیەوە هاتم.

٣-(رَبَــأَ- المــالَ. رَبْأً) (ضــد): ١-داراکەی بە فیرۆدا ٢-بەتەنگ ماڵەکەیەوە هات.

(رَبَّأَ-هُ تَرْبِئَةً): بەفیرۆیدا.

ربت: ١-(رَبَتَ- الصَبِيَ. رَبتاً): کوڕەکەی پەروەردەو گەورە کرد/ بەخێوکرد.

(رَبَّتَ- الصبيَّ تَربيتاً): ١-پەروەردەیکردو گەورەیکرد ٢-هێواش بەلاو پشتیدا کێشا تا بنوێت.

٢-(رَبِتَ — الشيءُ رَبَتاً): شتەکە قەپاتبوو/ توند بوو.

ربث: ١-(رَبَثَ ورَبَّثَ- هُ عَن كَذا. رَبْثاً): ڕێی لەوە لێگرتو نەهێشتو ساردیکردەوە/ خاویکردەوە.

(تَرَبَّثَ): خاوەخاویکرد/ خۆی خاپاندو خۆی دواخست.

(اَلرَبيث= المَربوث): دەستنراوە بەرو نەهێشتووی کردنی کارێك.

(اَلرِّبيثَى): ڕێگرو نەهێڵی کردنی کارێك یان دەستگەیشتنی بەو شتە.

(اَلرَبيثَة (ج) رَبائِث): ١-ڕێلێگر/ نەهێڵ ٢-فێڵ.

٢-(إرتَبَثَ وأَرْبَثَ- القَومُ): بلاوبوونەوە/ جیابوونەوە.

(-أَمرُهُم): کاریان کزو بلاوو بێسەروبەر بوو/ کاریان یەکینەگرت.

ربج: (رَبُجَ ورَبِجَ. رَباجَةً): (بێمێشك/ نازیرەك/ گەمژە/ کەودەن) بوو.

(تَرَبَّجَ): ١-گەمژە بوو/ بێمێشك بوو ٢-حۆل و سەرسامبوو.

(اَلإربجان) (ن): ڕوومکێکە.

ربح: ١-(رَبِحَ- فِي تِجارَتِهِ رِبحاً و رَبَحاً و رَباحاً): لە بازرگانیەکەیدا قازانجیکرد.

(تِجارَةٌ رابِحَة): بازرگانیەکی قازانجکردوو/ بە قازانج.

(رَبَّحَ- هُ): قازانجیی پێگەیاند.

(رابَحَ- هُ على سِلعَتِهِ. مُرابَحَةً): قازانجی بۆ کاڵافرۆشراوەکەی دایە.

(أَربَحَ- النَاقَةَ): سەرلەبەیانیو نیوەڕۆیش حوشترەکەی دۆشی.

(-ُ على سِلعَتِهِ): بۆ شتەکەی کە لێیکڕی قازانجیدایە.

(تَرَبَّحَ): داوای قازانجیکرد.

(إِستَربَحَ): قازانجی خواست/ داوای قازانجیکرد.

(- الشَيءَ): داوای قازانجی شتەکەیکرد.

(اَلرِبْح (ج) أَرباح والرَباح): بردنەوە/ دەستکەوت/ قازانج.

(اَلرَبَح= اَلرِبح): ١-قازانج ٢-حوشترێك بهێنرێتە سەر فرۆشتن.

(مالٌ رابِح): ماڵێکی بە قازانج/ قازانجدەر.

(مَتْجَرٌ رَبيحٌ): کۆگایەکی بە قازانج/ قازانجی (لێبکرێت/ تێدابکرێت).

٢-(اَلرُبَح) (ح): بەچکە حوشتر یان گوێرەکە کە لە دایکی ببڕێتەوە.

(أَلرَباح): ١-مەی ٢-شارێك كە كافوری لێوە بهێنرێت.

(أَلرَباحيّ): شارێكە كافوری لێوە دەهێنرێت.

(أَلرُباح والرُبَّاح (ح) رَبابيح) (ح): بەچكە حوشترێك یان گوێرەكەیەك كە لە دایكی ببڕێتەوە ٢-(ح) كارۆژلەیەك ٣-(ح)نێرە مەیمون.

ربخ: (رَبِخَ- البَعيرُ. رَبَخاً): حوشترەكە لە لەكەدا بە زەحمەت ڕۆیشت.

(أَربَخَ- الرَملُ): لمكە چڕو نەستوور بوو.

(- الرَجُلُ): پیاوەكە گرفتار بوو تەنگانەی هاتەبەر/ تووشی سەختیبوو.

(تَرَبَّخَ- الرَجُلُ): شلبوو باڵی لێدایەوە/ یان ڕاكشا.

(أَلرَّبيخ): ڕیخۆڵە نەستوورە.

الملحق:

ربخ: (أَلرَّابخون (ج) أَلرَّوابيخ): (ڕەنگە) كە بۆ لووسكردنو ڕنینی تەختەودار بەكاردێت.

ربد: ١-(رَبَدَ- بِالمَكانِ. رُبوداً): لە شوێنەكەدا نیشتەجێبوو و مایەوە.

(- هُ): بەندیكردو هێشتیەوە.

(- الإبلَ): حوشترەكەی لە گەورەكەدا، لە چەپەرەكەدا، لە بەندگەكەدا بەستەوە.

(أَلمِرَبَد): ١-بەندگە/ چەپەرو گەوری بەندكردنی حوشتر ٢-دەشتو پانتاییەكە لە پشت خانووەكانەوەیە خراوەتە سەر خانووەكان.

(أَلمِربَد للتَمرِ): جێی وشككردنەوەو كۆكردنەوەی خورما.

٢-(رَبَّدَ- تِ الشاةُ): مەڕەكە گوانیكردو خاڵی ڕەشو سپی تێدا پەیدابوو/ نەخشا.

(تَرَبَّدَ الضَرعُ): گوانەكە خۆی نەخشاند.

(-تِ السَّماءُ): ئاسمان هەوری تێدا پەیدابوو/ هەور گرتی.

(- الرَجُلُ): گرژو مۆنبوو.

(- اللَونُ): ڕەنگەكە گۆڕا.

(إِرْبَدَّ واربادَّ. إِربِداداً واربيداداً): دێزبوو/ ڕەنگی دێزی لێنیشت.

(أَلرَبْد) (ن): ڕووەكێكە.

(أَلرُبْدَةُ): بۆرەقنە/ بۆر/ تۆزڕەنگ.

(أَلأَربَد (م) رَبْداء): ١-بۆر/ بۆرەقنە.

(«عامُ أَربَد»): وشكە ساڵ/ ساڵی بێباران و قاتو قڕی.

٢-(أَلرَبداء): بەدكاری.

(«داهِيَةُ رَبداء»): زۆرزانێكی بەدكار.

(أَلمُتَرَبِّد): شێر.

ربذ: (رَبِذَ. رَبَذاً): دەستو قاچی لە ڕۆیشتن یان كاركردندا سووكو گورجبوو.

(رَبِذ): چابوك چالاك لە ڕۆیشتندا یان كاركردندا/ سووكدەستو قاچسووك.

(أَلرَبِذ (م) رَبِذَة): گورجەبێ/ پێسووك لە ڕۆیشتندا.

(«هُـوَ رَبِـذُ العَنَـان»): تاكـەو گورجانـە هەڵدێت.

٢-(أربَـذَ الثَـوبَ أو الحَبْـلَ): بەرگەكە یان پەتەكەیبڕی.

(الرِبْـذَة والرَبَذَة (ج) رِبَذ ورِبـاذ ورَبَذ): قوڵفی پێهەڵواسینی قامچی.

٣-(ألرِبْـذَة): ١-هەمـوو پیسـییەك ٢-پیاوی بێفەر.

(الرِبْذَة والرَبَـذَةُ (ج) رِبَذ ورِباذ ورَبَذ): ١-پارچە پەڕۆیەك كـە زەرەنگەر زێڕەكەی پێ شـەوق هەڵدەهێنێـت ٢-پارچـە خورییەكی رەنگـین كـە دەكرێتە گوێ یان ملی حوشـتر ٣-پارچەخوریـیـەك قەترانی پێ لە حوشـتر هەڵدەسوون ٤-سەری سوراحی.

(لِثَّةٌ رَبْذَة): پووكێكی تەنك/ كەمگۆشت.

ربـز: (رَبُزَ. رَبـازَة): ناسـكو بەرێز بوو/ بەوێڵبوو.

(رَبَّزَ- القربَةَ): كونەكەی پڕكرد.

(إرتَبَـزَ- الشـيءُ): شـتەكە: تـەواو بوو بە كامبوو.

رِبيز: مرۆڤی ناسكو بەرێز/ بەوێڵ.

ربس: (١-رَبَسَ- هُ بَيَدَيهِ رَبْساً): بە هەردوو دەست لێیدا.

(ألرَبيس): بەدوودەست لێدراو/ پێداكێشراو.

(رَبَـسَ ورَبَّـسَ القَربَةَ رَبْسـاً): كونەكەی پڕكرد.

(إرتَبَـسَ- العُنقود): ١-هێشـووەكە تێكچڕا/ چنگی دایە یەك ٢-چڕو پڕبوو.

(ألرَبْس): زۆر/ فرە.

(«جاءَ بمالٍ رَبْس»): دارایەكی زۆری هێنا.

(ألرِّبيس): تێكچڕاو/ چڕوپڕ/ تێكسمڕاو.

٢-(أرْبَـسَ- هُ. إرباسـاً): لێیجیابـووەوەو دوژمنایەتیی لەگەڵدا كرد.

(إرْبَـسَّ- أمرُهُم إربساسـاً): كاروبارەیان كز بوو/ پەككیكەوتو لێكپچڕانو بڵاوبوونەوە.

(-الرَجُـلُ): كابرا سـەری خـۆی هەڵگرت/ وێڵبوو.

(- في أمــرِهِ): لـە كارەكەیدا هاتە دەسـتو كاریكرد.

٤-(ألرَبْس): كاریبەدو دزێو.

(ألرَبيــس): ١-وەی/ جورتووم ٢-كەسـی وەی تووشبوو/ گرفتاری بەڵا ٣-ئازا/ دلێر.

(أُمُّ الرُبَيْس): ١-مار ٢-جورتوم.

(ألرَبساء (ج) رُبس): وەیی سەخت/ ئاپۆرەی گران.

(جاءَ بأُمورٍ رُبس): كاری وەیبەخشی كرد.

(ألريباس) (ن): رێواس.

ربش: (أرْبَشَ- الشَجَرُ):درەختەكە گەڵایكردو پەلی هاویشتو شكۆفەیكرد یان بەریگرت.

(ألرُبْشَة): رەنگجییایی.

(ألأرْبَش (م) رَبْشاء): رەنگجیا.

(أرضٌ رَبْشاء): زەوییەكی پڕگیای رەنگین.

ربص: (رَبَصَ- بِهِ رَبْصاً): چاوەڕێبوو تووشی خێرێك یان وەیەکی بکات یان چاوەڕێبوو ئەو تووشی فەرێك ببێت یان خراپەیەك بکات.
(تَرَبَّصَ): چاوەچاویبوو/ چاوەڕێبوو/ خۆی بۆ نایەوە.
(-عَنِ الأَمرِ): دەستی لە کارەکە هەڵگرت و وەستا.
(-فِي المَكانِ): لە شوێنەکەدا مایەوە.
(-بِفُلانٍ): خۆی بۆ فیسار نایەوە تووشی گاشەی بکات یان تووشی چاکەیەکیبێت.
(-بِسِلعَتِهِ الغَلاءَ): کەلوپەلەکەی بۆ گرانیی هێشتەوە.
(الرُّبْصَةُ): ١-خۆنانەوەو بۆ هەڵگەڕان/ چاوەڕێکردن ٢-ڕەنگجیایی.
ربض- (رَبَضَ- تِ الدابَّةُ رَبْضاً و رُبوضاً و رِبْضَةً): چوارپێکە سنگی لە زەوی نا/ چۆکیدادا تا بخەوێت.
(- الأَسَدُ على فَريسَتِهِ والقِرْنُ على قرينِهِ): شێرەکە خۆی بەسەر نێچیرەکەیدا داو شەرکەرەکە خۆی بەسەر شەرکەرەکەیتردا، ناحەزەکەیداداو سواری کۆڵیتەی سنگیبوو.
(-فُلاناً أَو المَكانَ. رَبْضاً و رُبُوضاً): پەنایبردە بەر فیسار یان پەنایبردە بەر شوێنەکە.
(رَبَّضَ- هُ بِالمَكانِ): لە شوێنەکەدا دایمەزراند/ داینیشان.
(- الدَوابَّ): چوارپێکەی کردە پشتیرەکەوەو هێشتیەوە.
(رَبَّضَ السَّقاءَ): جەوەندەکەی نیشان بەوەی ئاوی هێندە تێکرد کە بنیشێت.
(أَربَضَ الدَوابَّ): چوارپێکەی کردە تەویلەکەوە.
(- الرَّجُلَ): باری پیاوەکەی وا گرانکرد تا خۆی بەزەویدادا.
(-تِ الشَّمسُ): گەرمای خۆر وا تاویسەند، دڕندەکان لە تاواندا خۆیان بە زەویدا دا.
(تَرَبَّضَ): لە بێهێزیدا نیشتەنیبوو نەهاتە دەرێ.
(الرُّبْضُ): ١-بناغەی/ بنچینەی خانوو ٢-هەرچی بە زەوییەوە نووسابێت ٣-ناوەڕاستی شت.
(الرُّبْض والرَّبْض والرُّبُض): ١-ژن (چونکە پیاوەکەی دەهێڵێتەوە/ گیردەدات ئارام و ستارەی دڵی دەدات). ٢-دایك ٣-خوشك.
(«رَجُلُ رُبْضٌ عَنِ الأَسفارِ أَو عَنِ الحاجاتِ»): پیاوێکە بۆ گوزارو پێداویستیی ناچێت خۆی متکردووەو نایەتە دەرێ.
(الرِّبْضُ- مِنَ البَقَرِ): گاگەل کە کۆبن و بمێننەوە.
(الرَّبَضُ): ١-ژنی هاوسەر ٢-دایك ٣-خوشك.
٤-(ج) أَرباض): پشتیری/ گەوری مەڕ ٥-تەنگەی کورتان ٦-هەوارگەی خوێشەگەل ٧-خانوو و نشینگەی چوار کەناری شار

٨-شـووراى شـار ٩-ڕیخۆڵە ١٠-هەرچی پەناى بۆ بەریت و هۆى سـتارەو ئارامیدڵ بێت وەك خێزان و خزم و سامان و خانوو هەر شتێك لەو بابەتە بێت.
(الرابِـضُ (فـا) والرَبّـاض): ١-نیشـتەنی ٢-خۆنێرەوە ٣-شێر.
(الرابِضَـةُ): ١-مێـى وشـەى الرابِـض: ٢-دەستەپاچەى کارى گەورەو بەرزیی.
(الرُبْضَـةُ والرُبَضَـةُ): پیـاوى پەککەوتەى ماڵکەوتە یان زۆر خۆى بخزێنێتە ماڵەوە.
(الرِبْضَةُ): ١-شـوێنی کوشـتنی خوێشگەلێك کە لە پەلامارێکدا کوژرابن ٢-تەرمی مردوو/ لاشـە ٣-ڕانـە مەڕێـك و گەلـە خەڵکێك ٤-ڕانـە مەڕو شوانەکەى کە لە هێشتگەیەکدا/ پەچەیەکدا بن.
(الرَبُوض (ج) رُبُض- مِن القُرى): دێى زۆرى ئاوەدان و چڕ.
(-مِنَ الشَّجَرِ): درەختی گەورە.
(- مِنَ الدُرُوع): گەپە زرێ و زرێی فراوان.
(قِربَةٌ رَبُوض): مەشکەى گاوەس/ مەشکەى گەورە.
(الرَبیـض): ١-ڕانـە مـەڕو شـوانەکەى لە هێشـتگەکەیدا/ چەپەرەکەیدا ببن. ٢-ناوسك بە هەموو ڕیخۆڵەو ورگ و شتیتریەوە.
(المَربِـض (ج) مَرابِـض): گـەور/ پشـتیر/ پەچە/ هێشتگەى ئاژەڵ.
(المَربِض والمَربَض): ناوسك بە هەموو ورگ و ڕیخۆڵەو شتیترەوە.
ربـط: (رَبَـطَ- هُ رَبْطـاً): بەسـتیەوەو شەتەکیدا.
(رابَطَ- الجَیشُ. رِباطاً و مُرابَطَةً): سوپاکە سنورى دوژمن یان هێڵی جەنگی گرت و خۆى تێدا قایمکرد
(تَرابَطَ- الماءُ فِي المَکانِ): ئاوەکە لە شوێنەکەدا کۆبووەوەو مایەوە/ پەنگیخواردەوە.
(إرتَبَـطَ- فِي الحَبلِ): بە پەت بەسـترایەوەو پێی هەڵواسرا.
(- فَرَساً): ئەسپەکەى بۆ پەتی بەستنەوەکە برد.
(الرِباط (ج) رُبُط): ١-پێبەسـتە/ گوریس/ پەت/ پێبەند.
(«فُـلان لَهُ رِبـاطٌ مِـنَ الخَیلِ»): فیسـار ئەسـپێکی بەسـتراوى زۆرى هەیە ٢-قەڵا یان شـوێن کە سـوپا مۆڵی تێدا دەخـوات/ مۆڵی تێـدا دەدات ٣-دڵ وەکـو هەموو لەشـی پێوە بەسترابێت.
(«قَـرَضَ رِباطَـهُ»): بەنـدى دڵـی پچڕا/ مـرد. یان لە نەخۆشـییەکەى هەڵسـایەوەو ڕزگاریبوو.
(الرُبْـط واحِدُها رَبیط): کۆمەڵە ئەسـپی بەستراوەى تاقەتکراو/ ئالیك پێدراو.
(رَبیط): ئەسپێکی بەستراوەى ئالیك پێدراو.
(الرَبیط= المَربوط): بەستراوە.

(اَلرَبيطَة): ولاخی بەستراوە.
(«دابـةٌ رَبيطَة ودابةٌ رَبيط): جوارپێیەکی بەسـتراوە (بـە پێچەوانـەی پێـوەرەوە وادەوتریٚت).
(اَلمَربَـط والمَربِـط (ج) مَرابِط): شـوێنی بەستنەوەی جوارپێ/ بەستگە.
(اَلمِربَط والمِربَطَة (ج) مرابِط): پێبەستەی جوارپێ ولاخو ئاژەلیتر.
(اَلرَبَّاط): کەسـێکە سـنگەکان دەبەستێتو دەچەقێنێت.
(اَلرَّابِطَــة): ١-مێـی وشـەی (اَلرّابِــط): ٢- پەیوەندیی/ پەیوەستیی/ دلبەستە.
(اَلمُرابِطَــة (ج) مُرابِطــات): کۆمەڵێـك کە ڕووبـەڕووی دوژمــن مۆڵیخواردبێـت یــان کۆمەڵێك بۆ کارێك وەستابێت.
(اَلرِباط (ج) اَلرِباطــات): میوانخانــەی هەژاران و بێنەوایان.
٢-(رَبَطَ- هُ اللهُ على قَلبِهِ رَبْطاً): خودا دڵی قایمکردو ئارامی پێبەخشی.
(- جَأشُــهُ): دڵی قایمو بە ورە بوو/ نەبەرد بوو.
(رِباطَــةُ الجَــأشِ): دڵقایمیــو بــە ورەیی/ نەبەردیی.
(رابَطَ- الأمــرَ. رِباطاً ومُرابَطَةً): لەسـەر کارەکە هەتەرو سەروەر بوو/ بەردەوامبوو.
(اَلرابِــط (فــا): پارسـا یــان خــودا ناسـی دنیانەویسـت ٢-داناپـەك کـە وازی لـە دنیا هێنابێت/ دنیانەخواز/ گۆشەگیر.
رابِطُ الجَأشِ: دلقایمو بەورە، نەبەرد.
اَلرَبيط: ١-پارسـا یان خوداناسی دنیا نەخواز ٢-دانا.
(رَبيطُ الجـأشِ): نەبەرد/ دلێـر/ دلقایمو بەورە/ ئازا.
الملحق:
ربط/ (اَلرُّبْط): بە یەکگەیاندنو کۆککردن/ بەیەکەوەبەستن.
(اَلرُّبْــط بـينَ الَـوانِ): بەیەکگەیاندنـی رەنگەکان.
(اَلرَّبْــط في الفَلسَــفَة): لــە فەلسـەفەدا پەیداکردنـی پەیوەنـدی لـە نێـوان دوو پێزانیندا بۆ پێکەوەلکانیان لەمێشکداو لەبەر هەر هۆیەك بێت.
(اَلرَّبْطَــة): ١-بەسـتنەوەیەك ٢-گورزەیەك/ چەپکێك.
«ربطة مَعكَرونة»: گورزە مەعکەرۆنەیەك.
(اَلرُّبْطَة): پێبەسـتە وەك پێبەستەی برین یان سەربەستە.
(«رَبطَةُ مِن نَسيج): پێبەستەیەکی چنراو.
(رَبَطَةُ السـاق): پێبەسـتەی پـێ/ لاق ئەو پێبەستەیە لە گۆرەویدایەو گۆرەویەکە لەپێ توند دەکات.
(«وسام رَبطَةُ الساق»: پێبەستەی ئافەرینو

نیشانەی لاق کە کۆنترین و بەرزترین نیشانەی ئینگلیزییە لەسوارچاکیدا. شا ئەدواردی سێیەم لە دەوروبەری ساڵی ١٣٤٨دا دایهێناو دایمەزراند.

(رَبطَةُ العُنُق): بوینباخ کە پارچە کووتاڵێکە لە ملەوە دەئاڵێنرێت و بەسەر سنگدا بەردەبێتەوە.

(اَلتَّرابُط): پێکەوە پەیوەند بوون و یەکگرتن.

(«تَرابُط بينَ اَقسام مَوضوع»): پێکەوە پەیوەندبوونی بەشەکانی باسێك.

(اَلتَرابُط- في الفلسفة): پەیدابوونی پەیوەندیی لە نێوان دوو بیژانیندا لە فەلسەفەدا لەبەرئەوەی بە هۆیەکەوە لە مێشکدا یەکیانگرتووە.

(- في المَنطِق): لە گوتاردا پەیوەندییە کۆکەرەوەی تاکی زنجیرەیەکە.

---

ربع: ١-(رَبَعَ. رَبْعاً): راوەستاو چاوەرێیکرد.

(«اِربَع عَلَيْكَ اَو على نَفْسِكَ اَو على ظَلْعِكَ»): راوەستە یان خۆتبگرە یان چاوەرێبکە.

(رَبَعَ- عَنهُ): وازی لێهێنا.

(- بعَيشِهِ): بە ژیانی خۆی قایلبوو.

(عليه): میهرەبانی لەگەڵدا کرد سۆزی بۆی جووڵا.

٢-(رَبَعَ- القَومَ. رَبْعاً): ١-خوێشکەلەکەی بە خۆیەوە کرد بە چل یان بە چوار ٢-چوارەیکی

ماڵەکەی بردن.

(- الحَبلَ): گوریسەکەی بە چوارلۆنە بادا.

(-تِ عَلَيهِ الحُمَّى. رَبْعاً): هەر چوار رۆژ جارێك تاکە گرتییەوەو هاتەوە سەری.

(رُبِعَ – الرَجُل): هەرچوار رۆژ جارێك تاکە گەراپەوە سەری.

(رَبَّعَ- البَيتَ اَوِ الحَوْضَ): خانووەکەی یان گۆلەکەی چوارگۆشە دروستکرد.

(اَرْبَعَ): چوو ساڵی چوارەمینەوە.

(- القَومُ): بوون بە چوار کەس.

(-الرجُلُ): تای چوار رۆژ جارێك گرتیەوە.

(تَرَبَّعَ – في جُلوسِهِ): چوار مەشقی دانیشت.

(اَلرُبع والرُبُعُ (ج) اَرباع ورُبوع): چواریەکی شت.

(اَلرَبْع والرَبَعَ): چوارشانەو باڵا مامناوەندی.

اَلرِبْع: سێ رۆژ ناوی لە حوشترەکان بڕی و سەری چوارەهەمین رۆژ بردنیە سەر ئاو.

(حُمَّى الربع): تایەك بە چوار رۆژ جارێك بیگرێت.

(اَلرَبْعَةُ (ج) رَبعات ورَبَعات): (بۆ نێرو مێ) ١-باڵا مامناوەندی.

(جونَةُ العَطار): سەبەتەی عەتار چونکە چوارگۆشەیە.

(اَلرَّابع): چوارەهەمین.

(اِبِلٌ رَوابع): گەلەحوشترێك کە بە چوار رۆژ

جارێك ئاو بخۆنەوە.

(رُبَاع): چوارچوار.

(«أتوارباعَ»): چوار چوار هاتن.

(الرَباعِـي (ج) رُبْع ورُبُـع و رِبْعان و رِباع و رُبَـعْ وأربـاع (م) رَباعِيَة (ج) رباعيات): ئەوەی دانی نێوان کەڵبەو دانێکی پێشـەوەی کەوتبێت/ شیلەی پێنەمابێت.

(الرَباعِيَّــة (ج) رَباعيات): ئەو دانەی نێوان کەڵبەو دانێکی پێشەوەیە.

(الرُباعِيّ): چوارینە.

الرُباعي أو الشـكل الرُباعـي (هـ): چوارلا، شێوە چوارگۆشەیی.

الرُوبَعَة): ١-چوارمەشقیی دانیشتن ٢-کورتەبنە.

(أربَعَة (م) أربَع (ع ج)): چوار.

(الرِياحُ الأرْبَع: رِيحُ الصَبا): بای خۆرهەڵات. سەوا.

الدُبُور: بای خۆرنشین. شەماڵ.

ريح الجنوب: بای وەشت/ بای باشوور.

ريح الشمال: رەشەبا/ بای باکوور.

(ذوات الأرْبَع): زیندەوەری چوارپێ.

(أم أرْبَـع وأرْبَعــين) (ح): هەزارپـێ کـە مۆریچەیەکی ژەهرداره.

(أرْبَعون): چل.

(الأرْبعاء والأرْبُعاء والأربَعاء): چوارشەمو.

(أرْبَعاوان): دوو چوارشەمو.

(أرْبَعاءات وأرْبَعاوات): چوارشەموەکان.

(الأرْبُعاء) (ب): ستونێکی خانوو.

(قَعَـدَ الأربُعَــاء والأرْبُعــاوي مُتَرَبِّعــاً): چوارمەشقیی دانیشت.

(المُرْبَــع): کەسـێکە چـوار رۆژ جارێـك تا بیگرێت.

(المُرَبَّــع) (هـ): چوارگۆشـەو چـوارلا (ع ج) ٢-چەندانــەی ژمارەیەك. (٩) دوو چەندانەی (٣)یە.

(الرَبيع (ج) رُبُع): چوارییەك.

(التَرْبيع) (ع ح): دوو چەندانەی ژمارەیەك.

(المِربــاع): چوارییەکی تاڵانی کە سـەرۆك لە پێش ئیسلامدا بۆ خۆی دەبرد.

(المِرباع والمُرتَبِع والمَرْبُوع): باڵا مامناوەندی.

٣-(رَبَــعَ- بِالمَـكان. رَبْعاً): ١-نیشـتەجێبوو ٢-ئاسوودەبوو ٣-دڵنیابوو.

(الرَبــع (ج) رِبــاع ورُبُوع وأرْبُــع وأرْباع): ١-خانــوو ٢-ئەوەی لــە چــوارلای خانوودایە ٣-گــەرەك ٤-پلەوپایــە ٥-کۆمەڵــە خەڵکێك/ دەستە/ برادەران.

(الرُبوع): گەرەکەکان/ ئاوەدانیەکان.

(الرَبــاع): گوزەرانچاکیــی/ بارچاکیــی/ گوزەرانباشیی.

(«هُــم علــى رِباعِهِــم»): ئــەوان لەســەر بارچاکیی/ زووی خۆیانن.

(الرَباعَــة والرِباعَــة): ١-لە خۆشـیدابوون، بارچاکیی ٢-سەرۆکایەتیی.

(«لايُقيــم رَباعَةُ القَــوم إلا فُلان»): كەس سەرۆكايەتيی نەتەوە/ خوێشكەل باش ناكات فيسار نەبێت.

(«هُوَ رَباعَةُ قومِهِ»): ئەو سەردارو گەورەی خوێشــگەلەكەيەتی ٣-بوونو داراييەك كە بە هۆيەوە خۆشگوزەران دەبێت.

٤-(رَبَعَ- الرَّجُلُ رَبْعاً): تووشــی خۆشی ژيان بوو.

(- الإبِــلُ): حوشــترەكان پاش ســێ رۆژ ئاو نەخواردنــەوە رۆژی چــوارەم چوونە ســەر ئاوخواردنەوە.

(-الرَبيعُ رُبُوعاً): بەهار هات/ بەهاريكرد.

(رُبِعَ- القَومُ): بارانی بەهار لە خوێشكەليدا/ بۆيانباری هەروەهــا زەويەكە بارانی بەهاری ليدا.

(أرضٌ مَربوعَــةٌ): زەويــی بارانــی بەهــار ليدراو.

(أربَعَ- القَومُ): ١-خوێشكەل كەوتنە بەهارەوە ٢-بەربارانــی بەهارو لەوەڕو ئاوی زۆر كەوتن يان چوونە لادێ.

(-الإبِــلَ): حوشــترەكانی بەرەڵاكــرد، بــۆ ئاوخواردنەوەكەی بچن.

(- الرَّجُلُ): پياوەكە بە هەرزەكاريی منداڵی خستەوە.

(تَربَّعَ وارْتَبَعَ – الجَمَلُ): حوشــترەكە بەهار لەوەڕاو قەڵەو بوو.

(-بالمَــكانِ): بەهار لــەو شــوێنەدا مايەوەو نيشتەجێبوو.

(اَلرَبْــع (ج) رِبــاع ورُبُوع وأرْبَــع وأرباع): هەوارە بەهار.

(اَلرُبَع (ج) رِباع وأرباع (م) رُبَعَة (ج) رُبَعات ورِباع): بەچكە حوشتر يان گوێرەكەيەك كە لە ســەرەتای بەهاردا لە دايــك ببێت ئەگەر لە كۆتايــی بەهاردا لەدايك ببێــت پێيدەڵێن (هُبَع).

(اَلرَّبيع (ج) أرْبَعة ورِباع وأربِعاء): كەشــی بەهار لە (٢١) نەورۆزەوەيە تا ٢١ خەرمانان.

(ربيــع الأول والآخــر): مانگــی ســێيەمو چوارەمی مانگی عەرەبی.

(رَبيعٌ رابع): بەهارێكی تەڕو بەپيت.

(-ج أرْبِعــاء ورُبعان): ١-بەختەباران ٢-بارانی بەهــار/ بەهارەباران كە گيــای پێدەڕوێت ٣-گياو لەوەڕ كە چوارپێ لەسەری دەلەوەڕێت.

(اَلمَرْبَع): بەهارەباران.

(اَلمَرْبَع والمُرْتَبَع): بەهارە هەوار.

(اَلمِربَاع): ١-شــوێنێك كە لە سەرەتای بەهاردا گيا دەربكا ٢-حوشتری بەهارە زێ.

(اَلرُوبَعَــةُ) (طــب): دەردێكــە كــە بەچكە حوشترو گوێرەكە دەيگرێتو دەيبات.

(اَلرَبيعَة): ١-باخچە ٢-نانەبەرە/ توێشەبەرە.

(اَلرَّبيعــي مِنَ المســاكِن): بەهــارە لانە كە بەهاران تيايدا كات بەسەردەبەن.

(اَلرُّبيعِيَّـات) (ن): بەهاريـی کۆمەڵە گوڵو گیایەکن وەکو گوڵە بەهارە بوغوردی مریەمو گیای گۆیی.

(اَلمَرابیع): بارانە سەرەتاییەکانی بەهار.

٥-(رَبَع- الرَجُلُ. رَبْعـاً): بۆ تاقیکردنەوەی هێـزی بەدەسـت بەردەکـەی هەڵگـرتو بەرزیکردەوە.

(رابَعـوا- الحِمْلَ): بار بەرزکـەرەوە کە یان خستە ژێر بارەکەوە.

(إرتَبَعَ- الحَجَرَ): بەردەکـەی بەرزکردەوەو هەڵگرت.

(إسـتَرْبَعَ – البَعیرُ لِلسَّـیرِ): ١-حوشترەکە لە رۆیشتندا تەکانیدایە خۆیو توانی بڕوات.

(-الشَيءَ): توانای بەسەر شتەکەدا شکا.

(- الغُبارُ): تۆزەکە هەستا.

(- الرَملُ): لمەکە کەڵەکەبوو.

(اَلمِرْبَع والمِرْبَعَةُ): دارێکە باری بۆ سەرپشتی حوشترەکە پێبەرزدەکرێتەوە.

(اَلربیعَةُ): سەنگی هێز پێتاقیکردنەوە.

٦-(اَلرَوبَع): بوودەڵەو بێتوانای ڕسواو نزم.

(اَلرَبیعَةُ): کڵاوناسـن کە لە شـەڕدا سـوار لەسەریدەکات.

(اَلیَربـوع (ج) یَرابیـع (ح): گۆڕهەڵکەنە. جۆرە مشکێکە دەستکورتو پێدرێژ.

الملحق:

ربـع: (الرَبّاع – في الریاضَة): قورس هەڵگر لـە وەرزشـدا: کەسـێکە کە سـەنگی قورس هەڵدەگرێتو توانای خۆی پێ تاقیدەکاتەوە.

(اَلرُباعیـات): هەڵبەسـتە چوارینـەکان کە هەریەکەیان چوار دێرە.

رباعیات الخَیام: چوارینەکانی خەیام.

---

ربـغ: (رَبَـغَ- القَـومُ في النَّعیم رَبْغـاً): لە تێروتەسەلییو نازو خۆشیدا بوون.

(رَبِـغَ- عَیشَـهُ رَبَغـاً): ژیـانو گوزەرانیان خۆشو فراوان بوو/ تێرو تەسەلبوون.

(-الرَجـل): کابرا داوێنپیـسو بەرەڵا بوو/ بەدرەوشتبوو.

(رَبِغٌ): داوێنپیسو بەرەڵا/ بەدرەوشت.

(رَبْغٌ رَباغَةٌ): زۆر بوو.

(اَلْرَبَغ): زۆرو فراوانبوو.

ربـق: (رَبَقَ- هُ. رَبْقاً): بەسـتیو گرێیلێدا/ کەمەندیدا.

(-هُ في الأمرِ): تووشی کارەکەیکردو گرفتاریکرد.

(رَبَّقَ- هُ): لە کەمەندیدا.

(- هُ في الأمـرِ): بـە داوی کارەکەیەوە کردو گرفتاریکرد.

(-الكَلامَ): قسەکەی هەڵبەست.

(تَرَبَّقَ- هُ): هەڵیواسی.

(تَرَبَّقتُ الشَـيءَ في عُنُقي): شـتەکەمکردە (گەردنم/ ملم).

(إرتَبَقَ- في الحِباكَـةِ): بەپەتەکەوە بوو/ بە داوەکەوە بوو.

(- فِي الأَمرِ): کەوتە داوی کارەکەوە.
(إرتَبَقتُ فِي حِبالِهِ): بەداوەکەیەوە بووم/ لە خشتەیبردم/ کەوتمە فێڵەکەیەوە.
(اَلرِّبق): داوەکە چەند گرێیەکی تێدایەو هەر گرێی قوڵفەیەکی تێدایە/ کەمەند.
(اَلرِّبقَــةُ والرِبقَةُ (ج) رِبَق ورِباق وأَرباق): قوڵفە.
(حَلَّ ربقَتَــهُ): خەمەکەی لــە کۆڵکردەوە/ گرێکوێرەکەی بۆ کردەوە.
(اَلرَّبيق): ئەوەی بە داوەوە دەبێت/ کەمەند کراو.
(اَلمُرَبَّقَة): کولێرە بە چەورە/ نانەچەورە.
ربــك: (رَبَــكَ- الشــيءَ. رَبكاً): شــتەکەی تێکەڵکرد.
(-الرَبيكَةَ): ١-قوڕیگرتەوە ٢-کەرەو دۆیکرد.
(- هُ): خستیە لیتەوە قوڕاوەوە.
رَبِــكَ. رَبَــكاً: قوڕی بــۆ گیرایەوە/ ســەری لێتێکچوو/ چەواشەو دەستبەستە بوو.
(رَبِك و رَبيك): سەرلێتێکچوو/ دەستبەستە/ چەواشە بوو.
(إرتَبَكَ- فِي الأَمرِ): شڵەژاو سەری لێتێکچوو/ سەری لە کارەکە دەرنەکرد.
(- فِي الوَحلِ): کەوتە قوڕاوەکەوە.
(-فِي کلامِهِ): دەمی تێکەڵو پێکەڵبوو.
(-الصَيدُ فِي الحِباكَةِ): نێچیرەکە لە داوەکەدا شپرزە بوو/ پەشۆکا.

(-الأَمرُ): کارەکە ئاڵۆز بوو.
(إربــاكَ- رَأيُهُ إربيكاكاً): ڕاکەی چەواشــە/ تێکەڵو پێکەڵبوو.
(- الرَجُلُ عَنَ الأمرِ): لە کارەکە سڵەمییەوەو دەستی لێهەڵگرت.
(اَلربيكة): ١-قوڕاو/ لیتاو ٢-کەرەی تێکەڵ بە ماست.
(رَمــاهُ بِرَبيكة): کارێکی بەســەردادا تیایدا چەواشە بوو.
اَلرَّبيك والرَبوك= لَقَط: پەنیرو خورماو ڕۆن دەشێت ئاویشی بەسەردا بکرێت.
(الأَربَكَ- مِنَ الإبل): حوشتری ڕەش.
ربــل: (رَبَــلَ- القَــومُ. رَبلاً): خوێشــگەل ژمارەیان زۆر بوو پەلیان هاویشت.
(-المَراعي): لەوەڕگاکان چڕوپڕ بوون.
(رَبَّــلَ ولَربَــلَّ- المَكانُ): شــوێنەکە گیایەکی جوانو زۆری لێڕوا.
(تَرَبَّلَ): ١-لەوەڕا ٢-قەڵەو بوو.
(-جِسمُهُ): ١-لەوەڕا ٢-قەڵەو بوو.
(-جِسمُهُ): لەشی هەڵاوساو گەورە بوو.
(- القَومُ): ئاژەڵەکەیــان کردە لەوەڕگاکەوەو لەوەڕگاکە خورا.
(-تِ الأَرضُ): ١-زەوییەکــە لەوەڕگــای چاکی تێدا پەیدابوو ٢-لە پایزدا دیسان گیاکە سەوز بووەوە.
(إرتَبَلَ- مالُهُ): سامانو ماڵەکەی(پەرەیسەند/

زۆر بوو).

(اَلرَّبــل (ج) رُبُــول) (ن): درەختێکــە بــە بێباران دەردەچێت.

(اَلرَبَل): ڕووەکێکە ڕەنگی زۆر سەوزە.

(رَجُلٌ رَبِلٌ): پیاوێکی کەتە/ زەبەلاح.

(اَلرَبِلَــةُ والرَبَلَــةُ (ج) رَبَــلات): ١-بنــڕان ٢-هەموو پارچەگۆشتێکی پتەو.

(اَلرَّبيل): قەڵەو/ گۆشتن.

(اَلرَبيلَة): ١-قەڵەویی ٢-شێ ٤-تێروتەسەلیی/ نازو نیعمەت ٥-ناگوزەرانی/ نەبوونیی.

(اَلرَبالَة): گۆشتنی/ قەڵەویی/ خورتیی.

(«ضَمَــرَ بَعــدَ رَبالَــة): پــاش قەڵەویــی پووکایەوە.

(اَلرِبال (ج) رَبابيل): گیاو ڕووەکی باڵاکردوو تێکئاڵاوو.

(اَلمِربــال): زەوییــەك کــە گیاســەوزەکەی زۆربێت.

٢-(رابَــلَ): پیــس و بەدخواز بــوو خۆی بۆ خراپەکردن نایەوە.

(تَرَبَّل): خۆینایەوە ڕاوبکات.

(تَرابَلَ): شــاڵاوی بۆ خەڵك بردو وەك شێری درندە هەڵیکوتایە سەریان.

(اَلرِبيل): دزێکی چابوك بە تەنیا هەڵکوتێتە سەر خوێشگەل.

(اَلرِيبال (ج) رَبابيل): شێر.

ربن: (اَرْبَنَ): پێشەکیی دایە.

(اَلرَبــونَ اَو الأَربُونَ اَو الأَرْبــان- عَرَبون): پێشەکیی.

(تَرَبَّنَ): بوو بە پاپۆڕەوان.

(اَلرُبّــان والرُبّانِيّ (ج) رَبابِنَــة ورَبابين): پاپۆڕەوان کە پاپۆڕ لێدەخوڕێت.

(رُبّانُ كُلِّ شَــيءٍ): دەستەوو دایەرەی هەموو شتێك/ کۆمەڵەکەی.

(اَخَذَ بِرُبّانِهِ اَو بِرِبّانه): هەمووی وەرگرت و برد.

ربــا: (ربا- المالُ رِباءً ورُبُوّاً): پارەکە/ داراکە (گەشــەیکرد/ گەورە بوو/ پەرەیسەند/ زۆر بوو).

(رابَى: مُراباةً): پارەکەی/ داراکەی بە سوود دا.

اَربى.إربــاءً: لــەوەی کــە دابــووی زۆرتری وەرگرتەوە.

(- الشَــيءَ): شــتەکەی پەرەپێدا/ وایکرد کە زۆر بێت.

(- عَلَيهِ في كذا وارتَبا. إرتباءً): لێی زیادکرد/ لەوەدا لێیزیاد کرد.

(اَلرِبا): ســوود کــە وامدەرەکە لــە قازانجی پارەکەی وەریدەگرێت.

رَبَوِيّ: ١-سوودخۆر ٢-پاشماوەی شت/ زیادەی شت.

(اَلرَبْو (ج) اَرباء): کۆمەڵ.

(اَلرَبَــاء): ١-چاکــە/ پیاوەتیــی ٢-منــەت/ چاوبەرەوژێریی.

(لِفـلانٍ علـيَّ رَبـاءٌ): چاكـەو پیاوەتیـی بەسەرمەوەیە/ چاو بەرمۆنێریم.

(اَلرَبْوَة (ع ح): ملیۆن.

الكَرَّة: سەدھەزار.

اَلرِبْوَة (ج) رِبى: كۆمەڵە خەڵكێكی زۆر وەك دە ھەزار كەس.

٢-(رَبـا- الوَلَـدُ. رَبْـواً ورُبُـوّاً): منداڵەكە پەروەردە بوو.

(«رَبَیتُ ورَبیتُ. رَباءً و رَبیباً»): پێگەیشتم‌و پەروەردە بووم.

(رَبَّى- الوَلَدَ. تربِیَةً وتَرَبِّی):١-خواردنیدایەو بەخێویكرد/ پەروەردەیكرد ٢-ڕەوشتداریكرد.

(رابـى- الرَجُـلَ. مُرابـاةً): دڵـی ڕاگرتوو لەگەڵیدا ھەڵیكرد.

اَربى- هُ إِرباءً: بە ئومێدیكرد.

(اَلأُربِیَّـةُ): بنەماڵـەو ئامۆزاكانـی خێزان‌و كەسوكاری نزیكی.

(«جـاءَ في أُربِیَّـةِ قَومِهِ): لەگـەڵ بنەماڵەو ئامۆزاكانیدا ھات.

٣-(رَبـا- الرابِیَـةَ رِبـاءً ورُبُـوّاً والرِبْوَةُ): سەركەوتە سەرگردەكە.

(اَلرَبْو (ج) اَرْباء = اَلرابِیَة): گرد.

(اَلرابِیَة (ج) رَوابٍ و الرُبْوَة والرَبْوَة والرِبْوَة (ج) رُبـىً و رُبـيّ):١-بەرزایـی/ تەپۆڵكـە ٢-گردۆڵكە ٣-گرد.

(اَلرَباة والرِباوة والرَبـاوَة والرُباوَة): گرد/ بەرزایی/ تەپۆڵكە.

(اَلأُرْبِیَّة (ع أ): بنی ڕان‌و سەری ڕان.

٤-(رَبات- الفَرَسُ. رَبْواً):١-ئەسپەكە بایكرد/ سكی ھەڵاوسا ٢-ھەناسەی سواربوو.

(اَلرَبْـو (ج) اَربـاء): ھەناسەسـواریی/ تەنگەنەفەسیی.

(الرَبو والرَبْوَة) (طب):١-باكردنی ناوسك ٢-دەردێكە دەداتە سی‌و تووشی تەنگەنەفەسیی دەكات.

٥-(رَبَّى- التُفاحَ أو غَیْرَه بِالسُكَّر):سێوەكەیان ھەر شـتێك لەو بابەتەی بەشەكرد پەروەردە كردو كردی بە مرەبا.

(اَلمُرَبـيُّ) (ط): مرەبا. كە بـە میوە یان بە نیشاستەو شەكر پەروەردە دەكرێت.

(اَلرُبِیَـة (ح): جـۆرە (مێرووچەیەكـە/ ڤالۆنچەیەكە).

الملحق:

ربـو. (اَلتَربِیَـة): پـەروەردە ١-خۆراكدان‌و گەورەكردن‌و بەخێوكردن.

(«تربیـة الأطفال»): منـداڵ بەخێوكردن‌و ڕەوشتداریكردن.

(«تربیة السَمَك»): پەروەردەو بەخێوكردنی ماسـی ٢-ڕەوشـداریكردن‌و پەروەردەكـردن پێگەیاندن.

(«تَربِیَـةُ الشَّـباب»): پەروەردەكـردن‌و پێگەیاندنـی لاوان. خەملاندن‌و پێگەیاندنی

هێزی لەش‌و ئـاوەزو گیانی مـرۆڤ بە پێی بەخشدراوی سروشتیی مرۆڤ‌و بۆ ڕاهێنان‌و گونجـان لەگـەڵ ژینگـەو دەوروپشـت لـە کۆمەڵێکی دیاردا.

(«تَلَقَّـي تربيةً حسـنةً»): پەروەردەیەکی باشی وەرگرت.

(اَلتربِيَةُ): زانست‌و هونەرێکە کە ئەو واتایانەی پێشـوو دەگرێتەوە بەرو دەیکاتە ڕێڕەوو بە ڕێگەی فێرکردن ئەنجامی دەهێنێت.

«أساليب في التربية»: شێوازی پەروەردە.

رتّ ١-رَتَّ. رَتَتاً: لاڵەپەتە بوو/ زمانی گرتی.

(أرَت (م) رَتّـاء ورُتّـى (ج) رُتّ): لاڵەپەتە/ یەکێکـە زمانـی بیگرێـت‌و بـاش قسـەی (بۆنەکرێت/ نەیەت).

(أرَتَّ- هُ اللهُ إرتاتاً): خودا لاڵەپەتەیکرد.

(اَلـرَت (ج) رُتـوت): سـەردارو پێشـەنگی نەتەوەو میللەت.

(«هُوَ مِن رُتُوتِ الناسِ»): ئەو لە سەردارانی خەڵکەکەیە/ لە پیاوەگەورانی خەڵکە.

(- (ج) رِتَتَـة): ١-زۆر توندوتیـژ ٢-یەکانەی ئازای بە هەڵمەت ٣-(ح) بەرازی کێوی.

اَلرُتَّـة: گرتنـی زمان/ لاڵەپەتیـی زمان یان زمانی قسە ناتەواو.

٢-(رَتْـرَتَ): گرتنـی زمان لـە دەنگی (ر) یا (ت)دا.

رتأ: رَتَأَ- هُ. رُتوءاً: خنکاندی.

(-العُقدَةَ): گرێکەی توندکرد.

(- في المَـكانِ): لـە شـوێنەکەدا جێگیر بوو/ مایەوە.

(- الرَجُلُ): دەرپەڕی‌و ڕۆیشت.

(اَرتَأَ): بە ساردییەکەوە پێکەنی.

رتـب: ١-(رَتَبَ – الشـيءُ رَتْبـاً ورُتُوباً): ١-شتەکە چەسـپی‌و جێگیربوو/ دامەزرا ٢-قنج وەستا.

(«رَتَـبَ في الصَلـوةِ»): لـە نوێژەکەدا قنج ڕاوەستا.

(رَتَّبَ- ه): ڕێکخیست‌و چەسپاندی/ دایمەزراند.

(اَرتَبَ): ڕاست‌و قنج ڕاوەستا.

(- الغُلامُ الكَعْبَ): مێرمنداڵەکە پاژنەی ڕێك ڕاگرت‌و چەسپیکرد.

(تَرَتَّبَ): قنج وەستاو نەجووڵا/ دامەزرا.

اَلراتِب (ج) رَواتِب: مووچە.

(عَيـشٌ راتِـب): ژیانێکـی ڕێکوپێـك‌و هەمیشەیی.

(اَلرَواتِـب): دەسـتووری پەیڕەوکردنـی ئەرکـەکان یا دیاریکراوی کاتـی بەجێهێنانی ئەرکەکان.

(اَلتُرْتُـب والتُرْتَـب): ١-شـتی چەسـپاوی جێگیربـوو و نەگـۆڕ ٢-هەمیشـە/ هەتاهەتا ٣-خاك (لەبەر تەواو چەسپیویی‌و جێگیربوونی‌و درێژمانەوەی) ٤-کۆیلە/ بەندە.

(اَلرَتيب): هەمیشە لەسەر یەکرێکەو یەکبار

بوون و نەگۆڕان/ هەمیشە دامەزراو.

٢-(رَتُبَ- ـهُ- ـهُ): ڕێکیخست و خستیە پلەو ڕێزەی ئەو.

(أَرْتَبَ): پاش دەوڵەمەندیی و بوون کەوتە دەرۆزە/ سواڵ.

(تَرَتَّبَ): لە پایەی ئەودا بوو/ لە ڕێزەی ئەودا بوو.

(الرَّتب): بۆشایی نێوان پەنجەکان.

(الرَّتَب): ١-بۆشایی نێوان پەنجەکان ٢-تەنگانەو سەختیی/ گرانیی ٣-هەڵەت و بەرزیی زەوی ٤-ڕەمەزەبەرد کە تاوێرەکانی نزیك یەکن و پلە پلەن.

(الرَّتيب (ا ع): ئەوەی لە سوپادایەو پایەدارە.

(الرُّتْبَة (ج) رُتَب): پلەوپایە.

(الرَّتَبَة): بۆشایی نێوان پەنجەکان.

المَرتَبَة (ج) مَراتِب: ١-پلەوپایە ٢-جێگەی بالا.

(التَّراتُب (ا ع): زنجیرەی پلەی سەربازیی.

٣-(التُّرتُبَة): لاڕێ/ کوێرەڕێ.

٤-(رُتَباغا أو رُوتاباغا (ن): جۆرە کەلەرمێکە بۆ ئالیکی وڵاخ دەروێنرێت بە تایبەتی ڕۆژانی بوون. بە کەڵکی خۆراکی مرۆڤیش دێت و خۆشە بە تایبەتی لە گرانیدا دەخورێت.

الملحق:

رتب: (المُرَتَّب): ١-دامەزراوو ڕیزکراو ٢-لە ڕیزنراو ٣-موچەو مانگانەی مووچەخۆر.

رتج: ١-(رَتَجَ- الباب. رَتجاً): دەرگاکەی داخست.

(رَتِجَ- الخَطيبُ. رَتَجاً): وتاربێژەکە قسەی بۆ نەهات.

(أَرتَجَ- البابَ): دەرگاکەی (تەواو داخست و قایمیکرد/ چەسپیکرد).

(- تِ الدجاجَة): مریشکەکە پڕهێلکە بوو.

(- البَحرُ): دەریاکە هەستاو دەریاوانەکە دەرفەتی دەرچوونی برا.

(- الثَلجُ): بەفر (بێپشوو باری دەروبەریگرت و ڕەشکەنەك برا).

(أُرْتِجَ وارتُتِجَ واسْتُرتِجَ- على الخَطيبِ): وتاربێژەکە (زمانی لێبەستراو قسەی بۆ نەهات/ بۆ نەکرا).

(سِكةٌ رِتجٌ): ڕێیەکی (داخراو/ بێدەروو).

(مالٌ رِتجٌ): سامان و ماڵێك دەست نەیگاتێ.

(الرَّتَج والرِتاج): ١-گەورە دەرگا ٢-دەرگایەکی داخراو کە دەرگایەکی بچووکی تێدابێت.

(الرِتاجَة (ج) رَتائِج): تاوێر.

(الرِتاجَة والمَرتَج (ج) مراتِج): تەسکەڕێگا/ کوێرە ڕێگا. لە تەسکیدا وەکو براببێت.

(المِرْتاج): ئەوەی دەرگای پێدادەخرێت وەك کولۆم و سورگی و قفل.

٢-(رَتَجَ- الصَبِيُّ. رَتَجاً): منداڵە نۆپێچکەکە دارەدارەیکرد/ ڕۆیشت.

٣-(أَرتَجَ- الخِصْبُ): پیت زەویی هەموو

لایەکی گرتەوەو گیا ڕواو پیت فرە بوو.
(مَکانُ مُرْتَجٌ): شوێنێکی پڕگیاو ڕووەکو بە پیت.
رتخ: (رَتَخَ- بِالمَکانِ. رُتوخاً): لە شوێنەکەدا نیشتەنیبوو.
(-عَـنِ الخَیرِ): لـە چاکەو خێـر دواکەوت/ دوورکەوتەوە.
(- العَجِـینُ): هەویرەکەی شـلکردەوە/ ئاوی زۆری تێکردو شلبوو.
(اَلرَتَخَـةُ): ١-قـوڕو چڵپـاو ٢-لیتـەی زۆرو خەست.
(جِلْدُ اَرْتَخ): پێستی وشکەوەبوو.
رتـع: ١-(رَتَـعَ. رَتْعـاً و رُتُوعـاً و رَتاعاً): تێروتەسـەلو لە نازو خۆشیدا بوو/ بۆ هیچ دانەدەما.
(- فِي المَكانِ): لە شـوێنەکەدا مایەوە پڕ نازو خۆشگوزەرانبوو/ تێروتەسەلبوو.
(راتِـع (ج) رُتُـع ورُتَّـع ورِتـاع ورُتُوُع و راتِعُون): خۆشـگوزەرانو بەنازو تەسەلو بۆ هیچ دانەماو.
(-فِي مـالِ فُلان): بـە ماڵی فیسـارەوە ژیاو خۆشیی بینی خواردیو خواردیەوە.
(اَرْتَـعَ- القَـومُ): خوێشـگەل کەوتنـە نازو خۆشـگوزەرانییەوەو لەوەڕگـای چاکیـان دەستگیر بوو.
(- تِ الأَرضُ): لـەوەڕی زەویەکە ئاژەڵەکەی تێرکرد.
(- الغَیـثُ): بارانەکە لەوەڕگـای پێگەیاندو ئاژەڵی تێکرد.
(-الدَوابُّ): چوارپێکانی لەوەڕاندو تێرکرد.
(اَلرَتع): تێروتەسەل/ بۆ هیچ دانەماو.
(«کَلأَ رَتِـع»): لەوەڕێـك کـە ئـاژەڵ تێروتەسەلبکات.
(اَلرَتْعَةُ): لەوەڕی چاكو بەرفراوان.
(اَسْـمَنَني القَیـدُ والرَتْعَةُ»): حەسـانەوەو تێروتەسەلیی قەڵەویکردم.
(اَلمُرْتِع): تێروتەسـەلو خۆشـگوزەرانو بۆ هیچ دانامێنێت.
(اَلمَرْتَع):١-لەوەڕگا/٢-شوێنیتێروتەسەلبوونو خۆشگوزەرانیی.
(اَلرَتّاع): شوانی چاك لەوەڕێنی حوشترەکانی کە بۆ لەوەڕگای باش دەیانگێڕێت.
(اَلأَرتاع- مِنَ النّاس): خەڵکێکی زۆر.
(«رأَیتُ اَرتاعاً مِنَ الناس»): خەڵکێکی زۆرم دی.
٢-(رَتَـعَ- فِي لَحـمِ فُلان. رَتعـاً و رُتُوعاً و رَتاعاً): لە پاشملە بە خراپە باسی فیساریکرد/ غەیبەتیکرد.
رتـق: (رَتَـقَ- الثَـوبَ. رَتْقـاً): بەرگەکەی درووەوە یان چنییەوە.
(- الفَتَـقَ): هەڵوەشـاوییەکەی/ درزەکـەی درووەوەو چاککردەوە.
(«رَتَـقَ فَتْقَهُـم»): نێوانیـان تێکچووبـوو

تەباپكردنەوە/ پەكيخستنەوە.

(- الشَيءَ): شتەكەی گرتو دايخست/ هێناپەوە پەكو پێكيەوە نووساندەوە.

(إرتَتَقَ- الشَيءُ): شتەكە پەكيگرتەوە.

(الراتِق (فا): ١-چاكساز/ پێكەوەنەرو چاككەرەوە ٢-تەباكار ٣-چنەرەوە.

(«هُوَ الراتِقُ والفاتِق»): ئەو چاكسازی كاروبارە.

(الرتاق): دوو بەرگ كە دامێنەكانيان پێوە دەدروون.

(الرَتَقَة (ج) رَتَق): قلێشی نێوان پەنجەكان.

(الرُتُوق): دەسەلاتو نگينو سەربەرزيی و شكۆيی.

رتك: (رَتَكَ- البَعيرُ. رَتْكاً و رَتَكاً و رَتَكاناً): حوشترەكە گورگەلۆقەيكرد.

(أرتَكَ- البَعيرَ): گورگەلۆقەی بەحوشترەكە كرد.

رتل: (رَتِلَ- الشَيءُ. رَتِلاً): شتەكە ڕێكو پێك دامەزرا/ دروستو بەسەروبەر بوو.

(رَتِل): دروستو ڕێك دامەزراوو بەسەروبەر.

(رَتَّلَ- الكَلامَ): قسەكەی باشكردو دامەزراند/ بەسەروبەر كردی.

(- القُرآنَ): قورئانەكەی بە ئاوازو دەستوور خوێندەوە.

(-الصَلَواتِ): بە ئاوازەوە سلاواتيدا.

(تَرَتَّلَ- فِي القَولِ): جوانو بە شێنەيی قسەيكرد.

(ألرَتَل) (مص): ١-ئاخاوتنی جوانو ڕێكوپێك.

(«كَلامٌ رَتَلٌ»): ئاخاوتنی چاكو ڕێكوپێك ٢-هەموو شتێكی باش ٣- (ا ع) ڕيزە سەربازێكی سفت وصتاوو شاندەرەپەك.

(«ثَغْرٌ رَتَلٌ»): دانێكی سفتو دەمو لێوێكی جوان.

(«رَتَلُ السَيَّارات»): ڕيزە ئوتومبيلێكی ڕۆيشتوو.

(الأرتَل): ئەوەی كە ڕێكو پێك دامەزرابێتو ڕيزكرابێت.

(التَراتيل): ١-چاككردنی دەنگ ٢-بەدەنگينەزم خوێندنەوە ٣-سلاواتو خوێندنەوە بە ئاوازەوە.

(ألتَرتِيله (ج) تَراتيل): نوێژێكی ديانەكانە بە ئاوازو دەنگەوە دەيكەن.

٢-(الأرتَل): ئەوەی دەنگی گرتنی تێدابێتو دەنگ نووسابێت.

(الرُتَيلاء (ج) رُتَيلاوات) (ح): ١-بە هەموو مۆريچەپەك كە بە خەڵكەوە بدات دەڵێن وەك مێشو زەردەواڵەو داپيرۆچكەو ئاوا لەو بابەتە ٢-(ن) ڕووەكێكە گوڵی وەك گوڵی سەوسەن وايە.

رتم: ١-(رَتَمَ- هُ رَتْماً): شكاندی يان

(اَلرُدحَة): حەساری پشتەوەی خانوو.

(رُدحَةُ الصائِد): کەلەکە بەرد یان کۆڵیتەی بەردەکـە ڕاوچـی لـە سـووری خانووەکەی هەڵیدەچنێت و دروستیدەکات.

(اَلرَداح (ج) رُدُح): تاریکیی.

(اَلرداحَـة والرِداحَـة): (خانوویەکـە/ قۆختەیەکە) بۆ ڕاوی کەمتیار دروستدەکرێت.

٤-(اَلرَدح): ئازارێکی کەم/ سووکە ئازارێک.

ردخ: (رَدَخَ- رَاسَهُ. رَدْخاً): سەری قرنجاند.

ردس: ١-(رَدَسَ- القَـومَ رَدْسـاً): بـەردی تێگرتن/ بەردبارانی خوێشکەلی کرد.

(رادَسَ- هُ): بەردیان گرتە یەکتری.

(اَلمِـرْدَس والمِـرداس): ئـەو بەردەیــە کـە هەڵدەدرێتە چاڵاوەوە/ بیرەوە تا بزانرێت ئایا ئاوی تێدایە یا نەمنا.

٢-(رَدَسَ- الحائِـط رَدْسـاً): دیوارکـەی کوتایەوە.

(- الأرضَ): زەویەکەی تەختکردو ڕێکخست.

(- بِالشيءِ): شتەکەی برد.

(- الحَجَرَ بالحَجَر): بەردەکەی بە بەردەکەیتر شکاند.

(- الرَجُلَ): پیاوەکەی سەرشۆڕ کرد.

(تَـرَدَّسَ- مِن مَکانِـهِ): لە شـوێنەکەیەوە (بەربووەوە/ کەوتە خوارێ).

(اَلمِرْدَس والمِرداس): ١-زەویی پێکوت/ ئامێری پێکوتانەوە ٢-سەر/ کەللە.

ردع: ١-(رَدَعَ- هُ عَـن کَـذا رَدْعـاً): لـەوە گێڕایەوەو نەیهێشت توخنی بکەوێت.

(تَرادَعَ- القَـومُ): یەکتریان گێڕایەوە بەریان لە یەکتریگرت.

(إرتَدَعَ): گێڕرایەوەو بەری لێگیرا.

(اَلرَدْع) (مـص): ١-بەرلێگرتن و گێڕانەوە ٢-گەردن/ مل.

(«رَکِبَ فُلان رَدْعَهُ»): فیســار ملیپێوەناوەو ناگەڕێتەوە.

(«رَکِبَ البَعیرُ رَدْعَهُ»): حوشــترەکە کەوت و ملی بەناودا چوو.

(اَلمردَع): کەسێکە نائومێد بگەڕێتەوە.

٢-(رَدَعَ-السَّـهمَ. رَدْعاً): تیرەکــە بە زەویدا کوتا تا نووکەکەی تێدا قایمبێت.

(«أخَـذَهُ فَرَدَعَ بِـهِ الأرضَ»): گرتی و زەوی پێکوتایەوە.

(رُدِعَ- بِهِ): درا بەزەویدا.

(إرتَـدَعَ- السَّـهمُ): تیرەکـە بەر نیشـانەکە کەوت و شکا.

(اَلرَّدیع): بە زەویدا دراو/ کەوتوو.

(سَـهْمٌ رَدیع ومُـرْدَع): تیرێـک نووکەکەی کەوتبێت/ لێبووبێتەوە.

٣-(رَدَعَ- هُ بِالشيءِ): شتەکەی تێهەڵسوو یان پەلاویکرد.

(رُدِعَ. رَدْعَةً): ڕەنگی گۆڕراو زەردهەڵگەڕا.

(رَدَّعَ- هُ بِالزَعْفَران): زەعفەرانی تێهەڵسوو

و زەردی هەڵگەراند.
(تَرَدَّغَ): زەردهەڵگەرا.
(إرتَدَعَ- بالطيب): بۆ ناوبیوو. بۆنی خۆشی تێهەڵسوورا.
(اَلرَدع) (ن):١-زەعفەران ٢-بۆنی خۆشی کە بەلەشەوە بێت.
(اَلرِداع): قوڕاو.
(ثَوبٌ رَدیع): بەرگێك بە زەعفەران ڕەنگکراو.
(اَلمِرْدَع) کەسێك بۆنی خۆشی تێهەڵسووڕابێت/ لێدرابێت.
٤-(اَلرُداع): نەخۆشیی بۆ گەڕانەوە/ بۆ هاتنەوە.
(اَلمِرْدَع):١-تەمەڵ/ تەوەزەل ٢-کورتەبنە/ کورت.
ردغ: ١-(رَدَغَ- تِ السَّماءُ رَدْغاً): باران زەویی تەڕکرد.
(اَرْدَغَ- المَکانُ): شوێنەکە پڕ لە لیتە بوو/ بوو بە قوڕاوو چڵپاو.
(رَدِغ): شوێنێك لیتاو چڵپاو بێت.
(إرتَدَغَ): کەوتە لیتاوو چڵپاوەوە.
(اَلرَدْغ والرِداغ): قوڕو لیتە.
(اَلرَدْغَة والرَدَغَة (ج) رَدْغ ورَدَغ ورِداغ ورَدَغات): قوڕو لیتەی خەست.
(ماءٌ رَدَغَة): ئاوی تێکەڵ بە قوڕ/ قوڕاو/ لیتاو.

٢-(رَدَغَ- بِهِ الأَرضَ رَدْغاً): بە زەویدا کوتا.
(اَلرَدیغ): بە زەویدا/ کوتراو/ دراو.
٣-(اَلرَدیغ): گەوج.
(اَلمَرْدَغَة (ج) مَرادِغ): نێوان گەردن و ئێسکی چەڵەمە ٢-باخچەی جوان/ بە شکۆفەو قەشەنگ.
ردف: ١-(رَدَفَ- هُ رَدْفاً):١-پاشیکەوت ٢-لە پشتیەوە لەگەڵیدا سواربووبوو بە پاشکۆی.
رِدْف: پاشکۆ.
(رَدِفَ- لَهُ: رَدفاً):١-شوێنیکەوت بە شوێنیەوە بوو ٢-بوو بە پاشکۆی/ لە پشتیەوە سواربوو.
(رادَفَ- هُ): بوو بە پاشکۆی.
(«دابَّةُ لاتُرادِف»): وڵاخێکە پاشکۆ/ پشتسوار هەڵناگرێت.
(اَرْدَفَ): یەك لە دوایەك بوون/ بە دوای یەکدا هاتن.
(- هُ): لە پشتیەوە سواریکرد.
(دابَةُ لاتُرْدِف): وڵاخێکە پاشکۆ هەڵناگرێت.
(- لَهُ): بەدوایدا هات.
(-الشَيءَ بالشَيءِ وعَلَيهِ): شتەکەی بە دوای شتەکەدا کرد/ ئەو دوو شتەی شوێنیەك خست.
(«أردَفتُ خَیْلاً علی خَیلٍ لي»): ئەسپێکم بەدوا ئەسپەکەی خۆمدا بەکێشکرد.
(تَرَدَّفَ- هُ): لە پشت ئەوەوە سواربوو.
(تَرادَفا):١-بەدوای یەکدا ڕۆیشتن/ شوێنی

یەکتری کەوتن ٢-یاریدەی یەکتریاندا ٣-لە پشت یەکترەوە سواربوون.

(- تِ الكَلِماتُ): وشەکان هاوواتا بوون.

(إرتَدَفَ- هُ): ١-بە دوایدا هات/ شوێنیکەوت ٢-لە پشت ئەوەوە سواریکرد.

(- العَدُوَّ): لە پشتەوە بەسەر دوژمنیدا دا.

(إِسْتَرْدَفَ- هُ): داوای لێکرد لە پشتیەوە سواری ولاخەکە بێت/ پاشکۆی خۆی بنێت.

(اَلرِدْف (ج) أَرْداف): ١-شوێنکەوتوو ٢-کەسێکە لە دوای یەکێکەوە سواربووبێت/ پاشکۆ بێت ٣-ئەنجامی کارەکە ٤-کۆتایی هەموو شتێك/ ئەو سەری هەموو شتێك ٤-(فك) هەسارەیەکە نزیك هەسارەی (نَسرُ الواقِع) بێت.

(اَلرِدف – فِي الجاهِلِيَّة): لە پێش ئیسلامدا هاونشینی شا بوو لە پاش شاوە دەیخواردەوە لە کاتی شەڕیشدا جێنشینی ئەو دەبوو ئەگەر دەستە سەربازی تایبەتیی شایش بهاتایەوەو تالانیی پێبوایە ئەم چواریەکی تالانییەکەی وەردەگرت.

(- مِنَ الدابَّةِ): سمتی یان پاشینی ولاخ.

(اَلرِدْفان): شەوو ڕۆژ.

(اَلرَدِيف) (ج) رِداف ورُدَفاء): ١-کەسێکە لە پشت یەکێکیترەوە سواربێت پاشکۆ بێت ٢-(فك) ئەستێرەیەکە نزیکی هەسارەی (نَسرُ الواقع)ە ٣-سەرباز کە تا کاتی پێویست بەرەلا بکرێت.

(اَلـرداف- مِنَ الدَّابة): سمتی یا پاشینی ولاخ.

(اَلرِدافَة): جێنشینی شا لە پێش ئیسلامدا.

(اَلرُّدافى): لایەنگران و پشتگیران.

(«جاؤوا رُدافى»): لایەنگران یەك بە دواییەکدا هاتن/ بەڕەودوا هاتن.

(اَلرَوادِف): ١-سمت و کەفەلەکان ٢-خوێشکەلە لە دواوە هاتووەکان.

(اَلرادِفَة والرادوف): پەلی شۆڕەوەبووی دارخورماکە ناگاتە زەوی ٢-لۆچی لەسەر یەکنیشتووی بەرز.

٢-(رَدِفَ- الأَمرُ القَومَ. رَدْفاً): کاریان بەسەردا داباری.

أَرْدَفَ- القَومُ الأَمرَ: کاریان بەسەردا داباری.

الملحق:

ردف: (اَلْمُرادِفات): هاو واتاکان، ئەو وشانەن کە جیان لە وشەداو واتایەك دەبەخشن.

---

ردك: (رَوَدَك- هُ): چاکیکرد جوانیکرد.

(اَلرَّوْدَك): چاکڕوستکراو/ باش بەدیهێنراو.

ردم: ١-(رَدَمَ- الثَلْمَة. أَوِ البابَ رَدْماً): درزی دیوارەکە/ کەلەبەرەکەی یان دەرگاکەی گرت/ قەپاتکرد.

(- تِ الشَجَرَةُ. رَدْماً): درەختە وشکبووەکە ژیایەوەو گەڵای دەرکردووە.

(رُدِمَ- الشَيءُ): پارچەکانی شتەکە لێکترابەوەو یەکخرایەوە.

(رَدَّمَ- الثَوبَ): بەرگەکەی پینەکرد.

(تَرَدَّمَ- ثَوبَهُ): جلەکەی پینەکرد.

(- الثَوبُ): جلەکە کۆنو شڕ بوو.

(اَلــرَدْم) (مص): ئەوەی لــە دیواری ڕووخاو بەردەبێتەوە.

(اَلرَدْم والرُدام والمِردام): بێکەڵك/ بێفەڕ.

(اَلرَدَم (ج) رُدُوم): دەرگابەستن/ قەپاتکردن یان درزو کەلەبەر گرتنو پڕکردنەوە.

(اَلرَديــم (ج) رُدُم ـمِنَ الثِياب): جلی دڕاو/ شڕ.

(ثَــوْبٌ مُــرَدَّم ومُرتَــدَم): بەرگــی دڕاوی پینەکراو.

(اَلمُتَرَدَّم): شوێنی پینەکراو.

٢-(رَدَمَ القَــوسَ. رَدمــاً): ژێــی کەوانەکەی ڕاکێشا تا دەنگی لێپەیدابێت.

(- البَعيرَ): لە حوشترەکەیەوە ژەند.

(اَلرَدْم) (مص): دەنگی کەوان.

(اَلأردَم (ج) أرْدَمون): کەشتیەوانی کارامە.

٣-(رَدَمَ- السَــحابُ. رَدْمــاً): هەورەکــە هەر مایەوە/ سەرومڕ بوو.

(- تِ الحُمَّى عَلَيه): تاکەی هەر مایەوە.

(أرْدَمَ- السَّحابُ): هەورەکە هەر مایەوە.

(-تِ الحُمــى عَلَيــهِ): تاکــە هــەر مایەوەو بەرینەدا.

(تَــرَدَّمَ- تِ الخُصُومــةُ): (دوژمنایەتیەکە/ ناحەزیەکە) هەر مایەوەو درێژەیکێشا.

٤-(رَدَمَ- الشَــيءُ. رَدْمــاً): شــتەکە کشــا/ ڕۆیشت.

٥-(رَدَمَ- تِ النَاقَةُ على وَلَدِها): مێحوشترەکە سۆزی بە بەچکەکەیدا.

(تَرَدَّمَ- تِ النَاقَة على وَلَدِها): مێحوشترەکە سۆزی بە بەچکەکەیدا.

٦-(تَــرَدَّمَ- هُ): ســۆراغیکردو لــە کاروباری گەیشتو زانی لە چیدایە.

(- القَــومُ الأرضَ): ئاژەڵــی خوێشــگەل جارێکیتریش لەوەرگاکەیان خواردەوە.

ردن: ١-(رَدَنَ- الأشياءَ. رَدْناً): شتەکانی ڕێك هەڵچنی.

(-تِ المَرأةُ): ژنەکە تەشیڕست.

(إرتَدَنَ- تِ المَرأةُ): ژنەکە ڕیسەکەی بە تەشی ڕست/ تەشی بەکارهێنا.

(اَلرَدَن (ج) أرْدان): ١-ڕستن ٢-ئاوریشم.

(اَلرادِن) (ن): زەعفەران.

(اَلأَردَن): جۆرە ئاوریشمێکی سوورە.

(اَلمِردَن): تەشی.

(خَيْطٌ مَردون): داوی ڕێســراوو گەیەنراو/ نەپچڕاو.

(أحْمَرُ رادِنِيّ): سوورێکی زەرد تێکەڵ.

٢-(رَدَنَ- النَــارَ. رَدْناً): دووکەڵی لە ئاگرەکە هەستاند/ دووکەڵی بە ئاگرەکە کرد.

٣-(رَدِنَ- الجِلــدُ. رَدَناً): پێســتەکە کرژبوو چووەیەك.

٤-(رَدَّنَ وأَردَنَ – القَميصَ): قۆڵی بۆ کراسەکە کرد.

(اَلرُدْن (ج) اَرْدَان): بنی قۆڵی کراس ٢-دەمی قۆڵەکە/ فەقیانەی کراس عەرەب زوو پارەو دیناریان تێدەخست.

(«ثَقُلَ رُدْنُهُ»): فەقیانەکەی قورس بووە واتا پارەدارو دەوڵەمەند بووە.

٥-(أَردَنَ- تِ الحُمی): تاکە درێژەی کێشا.

٦-(اَلرَدْن): دەنگی لە یەککەوتنی چەك.

(اَلُردِن): تاریك.

(عَـرَقٌ مُـردِنٌ): نارەقێکی لەش کە بۆنی ناخۆشبێت/ بۆمچك.

(اَلرُدَیْنِـيّ): نێـزەی ڕودەینـی. ڕوودەینـی نافرەتێکبـوو بـە ڕاستکردنەوەی نێـزە بەناوبانگبوو.

ردە: (رَدَهَ- فُلاناً بِحَجَـرٍ. رَدْهاً): بەردێکی گرتە فیسار.

(- الرَجُـلُ): بـە میهرەبانیـی و ئازایەتیی و شتیتری خۆی بوو بە گەورەی خوێشکەلی.

(- البَیتَ): خانووەکەی گەورە کرد.

(اَلرَدْهَة (ج) رَدْهٌ وردَاهٌ ورُدَّهٌ): ١-خانوویەك لە گەورەییدا بێوێنە بێت ٢-گەورەترین ژووری خانووەکە/ هۆڵی خانوو ٣-چاڵی سەرکێو یان چاڵی تاوێر کە باراناوی تێدا کۆدەبێتەوە.

ردی: ١-(رَدی- الشَـيءَ. رَدیـاً ورَدَیانـاً): شتەکەی شکاند.

(- هُ): بەریکەوت.

(-هُ بَحَجَرٍ): بەردێکی تێگرت.

(-تِ الفَرَسُ): چارەوێکە سمکۆڵیکرد.

(رادَی- عَنِ القَوم. مُراداةً): بە بەرد بەرگری لە خوێشکەلکرد.

(أَردی – الفَـرَسَ): ئەسپەکەی خستە سمکۆڵکردن.

(اَلرَداة (ج) رَدیً): تاوێر.

(اَلمِـردی (ج) مَراد): تاوێرێـك یان بەردێك بەردیتری پێبشکێنرێت.

(اَلمَرادِي): ١-پەلەکانی ئەسـپ یان حوشتر ٢-ئەسپ کە سمکۆڵ بکات.

(اَلمِرداة (ج) مَـرادٍ): ١-تاوێرێك یان بەردێك بەردیتری پێبشـکێت ٢-کـوڕی جەنگ کە بە بەرداش چوێنراوە.

(«طَحَنَتهُ مِـرداةُ طحون»): کۆڕی جەنگ/ بەرداشی جەنگ هاڕی.

(اَلُمـردِي (ج) مَرادِي): سـەوڵ کـە پاپۆڕی پەهێشبیرێت.

٢-(رَدَی- فِي البِئـرِ. رَدیـاً و رَدَیاناً): کەوتە بیرەکەوە.

(- فُـلانٌ): فیسـار لـە کێوێکـی بـەرزەوە بەربووەوە/ کەوتە خوارەوە.

(رَدِيَ ردیً): ١-کەوتە خواری ٢-مرد.

(رَدَّی- هُ فِي البِئرِ): خستیە چاڵاوەکەوە.

(- الرَجُلَ): فەوتاندی/ مراندی.

(أَردى- هُ في البِئـــرِ): خســتيه چاڵاوەكەوە/ بیرەكەوە.

(- الرَجُلَ): فەوتاندی/ مراندی.

(تَرَدّى- في البِئرِ): كەوتە چاڵاوەكەوە.

(الرَدِي): فەوتاو/ مردوو.

(«رَجُلٌ رَدٍ»): پیاوێكی فەوتاو.

٣-(رَدَى-تِ الجارِيَـــةُ. رَدْيــاً و رَدَيانـــاً): كەنیزەكەكە یاریی هەنگڵەشەلێیكرد.

(اِرتَدَى- تِ الجارِيَةُ): یاری هەنگڵەشەلێیكرد.

٤-(رَدَى- علـى الخَمســين مِن عُمــرِهِ رَدْياً ورَدَياناً): تەمەنی لە پەنجا ساڵ تێپەڕی/ پتر بوو.

(أَردى- على الخَمســين): تەمەنی لە پەنجا ساڵ زیاتر بوو.

(- مالُهُ): سامانەكەی/ داراكەی زۆر بوو.

٥-(رَدَى- فُلانٌ. رَدْياً ورَدَياناً): ڕۆیشت.

(«مــاأَدري أَيــنَ رَدى»): نازانـــم بـــۆ كـــوێ ڕۆیشت.

٦-(رَدَّ- الرَجُــلَ): ســەربەرگەكەی لەبــەر پیاوەكە كرد.

(تَرَدَّى): سەر بەرگی لەبەركرد.

إرتَدَى:١-سەر بەرگی لەبەركرد ٢-شمشێری لە خۆیدا.

(الرِداء (ج) أَرْدِيَة):١-ســەربەرگ وەك عەباو جبە... هتد.

(«هُوَ غَمْرُ الرِداءِ»): زۆر خێرخوازو چاكەكارە.

(«هُوَ خَفيفُ الرِداءِ»): ئەو باری سووكە. نە بەژێر وامەوە/ قەرزەوە بووەو نەخێزانیشی زۆرە.

(اَلــرِداء): ١-ســەرپۆش ٢-شمشـێر كــە لــە خۆدەدرێت‌و لەســەر جلــەوە دەبێت ٣-كەوان (چونكە بە شــان‌و لایەلــەوە هەڵدەگیرێت ٤-ئەوەی خۆی پێدەرازێنرێتەوە وەك گەردنبەند دەكرێتە مل‌و بەژێر بندەســتدا دەبرێت یان گەوهــەرو مرواری كە ژنان لــە ملیەكەن ٥-ئاوەز/ ئەقڵ ٦-تێنەگەیشتن.

(رِداءُ الشَّــمسِ): پرشــنگو درەوشــانەوەو ڕووناكیی‌و جوانیی خۆر/ تیشكی خۆر.

(- الشَّباب): ئاسـكیی‌و هەرەتی گەنجێتیی‌و جوانیی.

(الرِداءَة): ١-لێفــەو هەرچی بەخۆدا دەدرێت ٢-بەرگەلێفە.

(المِرْدَاة والمِردى (ج) مَراد): ١-سەربەرگ هەر شتێك كە لە خۆتەوە بپێچیتەوە ٢-بەرگۆش.

٧-(رادى- الرجُلَ. مُــراداةً): دڵی پیاوەكەی ڕاكێشاو ڕاگرت‌و لەگەڵیدا هەڵیكرد.

رذّ: (رَذَّ-تِ السَّماءُ. رَذاذاً): ڕشێنە بارانێكیكرد/ نەمەبارانێك باری.

(أَرَذَّتِ- السَّــماءُ): نەمەبارانێك باری/ ئاسمان نەمەبارانێكی باراند.

(أَرَذَّتِ- السَّماءُ): ئاسمان نەمەبارانێكی باراند.

(-تِ القِربَةُ): مەشــكەكە چی تێدابوو دایداو

ڕۆیشت.
(اَلرَّذاذ): ڕشێنەباران/ نمەباران.
رذل: (١-رَذُلَ ورَذِلَ. رَذالَـةً ورُذولَـةً): ١-ڕسوابوو/ شایستەی سـووکبوون‌و ڕسواییبوو ٢-ناپەسندو ناشیرینبوو.
(رَذْل (ج) أَرْذال ورُذال ورُذول ورَذْلـوون ورَذیل (ج) رُذْلاء ورِذال): ١-سـووك/ ڕسواو نزم ٢-ناپەسندو ناشیرین.
(رَذَلَ- هُ. رَذْلاً): سـووك‌و ڕسوایکرد/ سووك تێڕوانی.
(اَرْذَلَ): ١-کارێکی ناپەسـەندو ناشـیرینیکرد ٢-هاودەم‌و هاوڕێکانی ڕسواو سووکبوون.
(- هُ): ڕسـواو سـووکیکرد/ بە چاوی سووك تەماشایکرد.
(اَلرُذال): ١-ڕسواو سووك/ نزم ٢-گەمن.
(اَلأَرْذَل (ج) اَراذِل وأَرْذَلـون): سـوکترین‌و ڕسواترین.
(اَلمُرذِل): کەسێکە هاودەمەکەی یان وڵاخەکەی (ناتەواو/ سووك‌و بێبەها) بێت.
(اَلرَذیلَـة (ج) رَذائِـل): کاری ناشـیرین‌و ڕسـوایانە/ بەدڕەوشـتیی/ کاری ناپاسەند/ پیس/دزێو/ ناشیرین پێچەوانەی کاری چاك‌و مەردانەو سەربەرزانە.
٢-(رَذَلَ- هُ. رَذْلاً): هەڵێنەبژارد/ پەسـندی نەکـرد/ بە چـاکـی نەزانـی/ سـووك هاتە بەرچاوی/ بەلایدا نەچوو.

(اَرذَلَ- هُ): هەڵێنەبژاردو بە باشـی نەزانی/ هەڵیبوارد/ پەڕیکرد.
(اَلدَراهِمَ): پارەکەی فەڵبکرد/ ساختەکرد.
(اِسْـتَرذَلَ- ه): بـە خـراپ‌و فەڵبیدانـا/ ناپەسەنیکرد.
(اَلأَرْذَل (ج) اَراذِل وأَرْذَلـون): زۆر خـراپ/ بەد/ گەمن.
(اَلـرُذال والرُذالَة): گەمندەی ئەو شـتە پاش هەڵبژاردنی باشەکەی.
(رُذالَةُ کُلِّ شَـيءٍ): گەمندەی هەموو شـتێك/ خراپەکەی.
رذم: ١-(رَذَمَ ورَذِمَ- الإنـاءُ رَذْماً و رَذَماناً و رَذَماً): فاپەکە پڕبوو و لێڕژا.
(رَذِم): فاپی لێوانلێوو لێڕژاو.
(اَرذَمَ- الإناءُ): فاپەکە پڕبوو لێڕژا.
(- عَلی الخَمسـینَ مِن عُمـرِهِ): تەمەنی لە پەنجا تێپەڕی.
(اَلـرَذوم (ج) رُذُم ورَذَم): ١-لەگەمنـی پـڕی لێوانلێـو لەملاولایـە لێبڕژێـت ٢-هەمـوو شلەیەك.
٢-(اَلـرَذْم والـرُذام): بوودەڵـەی نامـەردو بێوێژدان.
(اَلـرَذام والرَذَمـان- مِنَ النـاس): کۆمەڵە خەڵکی جیاجیا.
(«رایتُ رَذَماً مِن الناس»): کۆمەڵە خەڵکێکی جیاجیامدی.

(«كانَ فِي رَدَمانٍ مِن الناسِ»): لەناو كۆمەڵە خەڵکێکی کەمدابوو.

ردي: ١-(رَدِيَ. رَداوَةً): نەخۆشی پەکیخست/ داماویکرد.

(رَدِيّ (ج) رُداة (م) رَدِيَّــة): پەککەوتــەی نەخۆشی/ داماو.

(أَردَى- هُ): پەکیخست/ پەرێشانیکرد/ داماویکرد.

(أُردِيَّ): بــە هۆی نەخۆشــییەوە پەککەوتە بوو.

(اَلرَدِيّ): بێهێزی لاواز.

٢-(أردَى- هُ): فێزمونیکــرد/ پەرپکرد یان پشتگوێیخست.

مُــرْدَى: فێــزمون/ لێدوورەوەکەوتــوو/ فەرامۆشکار.

رزّ: ١-(رَزَّ- تِ الجَــرادَةُ رَزّاً): کوللەکە کلکی بە زەویدا کرد کە گەراکەی دانێت.

(- هُ): نێزەی پێداکرد، تێچەقاند.

(- السَــهْمَ فِي الحائِطِ): تیرەکەی لە دیوارەکە چەقاندو قایمیکرد.

(- البابَ): قوڵفی بۆ دەرگاکە کرد.

(أَرَزَّتِ- الجَــرادَةُ): کوللەکــە گــەرای لــە زەوییەکەدا دانا.

(إِرتَزَّ السَهمُ فِي الحائِطِ): تیرەکە لە دیوارەکە چەسپبوو.

(- البَخيلُ عِندَ المَسْأَلَةِ): چرووکەکە لە پرسە بابەتەکەدا گیربوو چرووکییکرد/ رژدبوو.

(اَلرِزَّةُ (ج) رُزَز ورِزاز ورَزّات): قوڵفی دەرگا ٢-سنگ/ مێخزنجیر دەچەقێنرێت بە زەویداو یــان بە دیواردا بۆ پێوە بەســتنەوەی وڵاخ ٣-(طب)؛ ئازاری پشت/ ئازاری کەمەر.

(اَلإِرزِيز): تێچەقاندنێکی جێگیر.

٢-(رَزَّ- تِ السَّــماءُ رَزّاً): بــاران دایکــردو خرمەیهات.

(اَلرِز والرِزيــزَى): ١-هەورەگرمــە ٢-دەنگی دوور ٣-قۆرەی سك ٤-هەموو دەنگێك.

(اَلرَزاز): قورقوشم.

(رَزِيزُ الرعدِ): گرمەی هەور.

(اَلإِرزيــز): ١-هەورەگرمەیەك ٢-تەرزە لووکە ٣-دەنگدرێژ ٤-بانگکەر.

٣-(رَزَّزَ- الــورقَ): تەختــە کانزاکــەی لووسکرد.

(- الأَمرَ): کارەکەی ئامادەی ئەنجامدانکرد.

٤-(اَلرُزّ (ن)= الأَرُز) (یونانية): برنج.

(اَلرَزِيز: (ن): رووەکێکە رەنگی پێدەکرێت.

(اَلرَزّاز): برنجفرۆش.

(اَلمُرَزَّز- مِنَ الطَّعام): چێشــتی برنج/ پلاو/ قوبوولیی هەرچشتێك برنجی تێدابێت.

(اَلمَرَزَّة): ١-مەرەزەجار ٢-ئەو شوێنەی چەڵتوکی لێکۆدەکرێتــەوە/ خەرمانــی چەڵتووك/ ئەو شوێنەی برنجی تێدا زۆر دەبێت.

رزأ: (رَزَأَ- الرَجُلَ- مالَهُ رَزْأً ورُزْأً ومَرزِئَةً): دەستی بۆ ماڵی کابرا بردو لێیلاداو کەمیکردەوە.

(- الرَجُلَ): خێرو چاکەی لە پیاوەکە دەستکەوت.
(«هُوَ يُرْزَأُ»): ئەو خێرخوازە/ چاکەکارە.
(رَزِيءَ- الرَجُلَ رُزاً): چاکەی لە پیاوەکەوە دەستگیربوو.
(إرتَزَأَ- الرَجُلَ): خێری لە پیاوەکەوە دەستگیر بوو.
(- هُ الشَيءَ): شتەکەی بۆ کەم و کورتکردەوە.
(- الشَيءُ): شتەکە کەمیکرد.
(اَلـرُزْء (ج) أَرْزاء والرَزِيئَة والرَزِيَّة (ج) رَزايا): کۆستی گەورە/ لێقەومانی سەخت/ چورتومی گران.
(اَلْرَزَّا (ج) مُرَزَّؤون): پیاوچاکی میهرەبانو بەخشندە/ بەدەستودڵ.
(اَلْمُرَزَّؤون): نەتەوەیەك پیاوچاکەکانیان مردبێت.
(اَلْمَرْزِئَةُ): چورتومی سەختو گران/ کۆستی گەورە/ لێقەومانی سەخت.
رزب: (رَزَبَ- هُ. رَزْباً): یاوەرییکردو لێینەبووەوە/ پێوەی لکاو بەرینەدا.
(اَلإِرْزَبّ): ١-کورت/ کورتەبنە ٢-کەتە.
(اَلمِرزاب (ج) مَرازِيب= اَلميزاب): ١-پلووسك ٢-چاپۆری درێژ.
(اَلمَرْزَبَة): سەرۆکایەتی.
(اَلمِرزَبَة و المِرْزَبَّة (ج) مَرازِب والإِرْزَبَّة): توولە ئاسنێك.

(اَلمَرزُبان (ج) مَرازِبَة) (فارسية): سەرۆك (لە لای فارسە کۆنەکان).
رزح: ١-(رَزَحَ- الجَمَلُ رَزْحاً ورُزُوحاً ورَزاحاً): حوشترەکە لەبەر بێهێزیو شەکەتیی کەوت بە زەویداو نەیتوانی هەستێتەوە.
(رازِح (ج) رُزَّح): ڕەمـاو/ لە بێهێزیو شەکەتیدا کەوتوو.
(- الرَجُلُ) پەکیکەوت، بێتوانا بوو ئەوەی بە دەستیەوە بوو لە دەستیدا.
(- العِنَب): تریێ کەوتووەکەی/ هەڵوەریوەکەی هەڵگرتەوەو کۆیکردەوە.
(رَزَحَ وتَرازَحَ- ت حالُهُ): (باری/ ڕەوشی) خراپبوو/ پەکیکەوت.
(«رَزَحَ- المَرِيضُ») (عامية): نەخۆشەکە پەکیکەوتووەو ناتوانێت هەستێت/ لەپێ کەوتووە.
(کذلك الماشِي مِنَ الأَعياء): هەروەها ڕێبواری کەشەنگو شەکەتی لە پێکەوتوو.
(رَزَّحَ- النَاقَةَ): مێحوشترەکەی لاوازکرد.
(أَرزَحَ- العِنَبَ): ترێ هەڵوەریوەکەی کۆکردەوەو هەڵگرتەوە.
((إبِلٌ رُزَّح ورَزحى ورَزاحى ورَوازِح): حوشتری بێهێزی لاوازی پەککەوتە.
(اَلمَـرزَح): ١-زەویی نیشتوو و نزم (وەکو نەتوانێت لە دەوروپشتی خۆی بەرزتر ببێتەوە) ٢-بوارێکی دوور.

(اَلمِـرْزَح والمِرْزَحَـة (ج) مَـرازِح): چیلکه کۆڵەکەکـە دەخرێتــە ژێـر مێـوەوە تــا بەرزیبکاتەوە.

اَلمِرزاح- مِنَ الإبلِ (ج) مَزاريح): حوشترانێك کـە زۆر لەربـنو پەککەوتــە بــن نەتوانن ببزوێن.

٢-(رَزَحَ- الرَجُـلَ بِالرمــحِ رَزْحــاً ورُزُوحاً ورَزاحاً): نێزەی بە پیاوەکەدا کرد.

رزخ: (رَزَخَ- ه بِالرَمحِ): نێزەی پێداکرد.

رزد: (اَلرَزْدَق) (فارسـیة): ١-ڕیزە خەڵك ٢-ڕیزەھەنگ.

(اَلـرُزداق (ج) رُزداقــات ورَزادیــق): دێو ئــەو زەویو بەراوانــەی بــە چواردەوریدایە (فارسیە).

رزغ: ١-(اَرْزَغَ- الماءُ): ئاوەکە کەمیکرد.

(- المَكانُ): شوێنەکە لیتەی زۆر بوو.

(- المُحْتَفِرُ): بیرھەڵکەنەکە گەیشتە قوڕ.

(- المَطَــرَ الأرضَ): بارانەکــە زەویەکەی تەڕ کردو ئاوی لەسەر نەڕۆیشت.

(اَلرَزَغ): تەڕایی یان شێ.

(اَلرَزِغ والــرازِغ): لــە قوڕاو ھەڵکێشــراو/ کەوتوو ناو قوڕو چڵپاو.

(اَلرَزَغَــة (ج) رَزْغ ورِزاغ): لیتــەو قــوڕو چڵپاو.

٢-(رازَغَ- هُ): بێچو پەنای لەگەڵدا کرد/ فێڵی لێکرد.

(اَرزَغَ- الرَجُلَ): لە کەداریکرد/ خەوشداریکرد.

(- فِي فُلان): ١-زۆر ئازاری فیســاریدا ٢-ڕسواو سووكو لەکەداریکردو ئابڕوویبرد.

(إسترَزَغَ- هُ): بە بێتوانا ھاتە بەرچاوی/ بە سووكو ھیچو پووچی دانا.

رزف: ١-(رَزَفَ- إلَيــهِ. رَزيفــاً): چــووە بەردەمی/ لێی چووە پێشەوە.

(- الجَمَلُ): حوشترە کە خێرایکرد.

(- الأمرُ): کارەکە نزیکبووەوە.

(رَزَّفَ- إلَيهِ): لێی چووە پێشەوە.

(- الجَمَــلُ): حوشــترەکە خێرایکــرد/ پەلەیکرد.

(اَرْزَفَ- إلَيهِ): لێی چووە پێشەوە.

(- الجَمَلُ): حوشترەکە خێرایکرد.

(- الناقَــةَ): مێحوشــترەکەی ھانــدا خێــرا بڕوات.

(اُرْزِفَ القَــومُ): خوێشــکەڵیان ڕاطرانــدو ڕاویاننان.

(ناقَــةٌ رَزُوفٌ): مێحوشــترێکی لۆقــنو بــە ھەنگاو.

(رَزَّافاتُ البَلَدِ): ئەوەی لە شارەکەوە نزیکە.

٢-(رَزَفَ ورَزَّفَ واَرْزَفَ- الجَمَــلُ. رَزيفــاً): حوشترەکە بۆڕاندی.

رزق: ١-(رَزَقَ- هُ): ڕۆزیی بۆ ھێنا/ دایە.

(«رَزَقَ- هُ اللهُ الغِنــى»): خــودا دارایکــرد/ دەوڵەمەندیکرد.

رُزِقَ): رۆزیی دەستگیربووو بەختەوەر بوو.
(إرتَزَقَ- هُ): داوای رۆزیی لێکرد.
(- الجُنْدُ): سەربازەکان ئازوخەو بەشە رۆزیی خۆیان وەرگرت.
(إستَرْزَقَ- هُ): داوای رۆزیی لێکرد.
(اَلرِزق (ج) أرزاق): ١-رۆزیی/ هەرچی کەڵکی لێببینرێت ٢-باران.
(«اَلرِزقُ الحَسَـن»): رۆزیـی چاك کە بە بێ رەنج دەستگیری بکەوێت.
(اَلـرِزق والرَزقَــة (ج) رَزَقــات): موچەی مانگانەو رۆزیی سەرباز.
(الرَزّاق- اَلرازِق): رۆزیدەر (تەنها بە خودای مەزن دەوترێت).
(اَلمَـرزُوق) (مفع): رۆزی پێدراو/ کەسـێکە شانسدار بێت.
(اَلمُرتَزَق (مفع): ئەوەی کەڵکی لێببینرێت.
(اَلمُرْتَزِقَـة): ١-خوێنـگەلێك کـە رۆزیانەی خۆیان وەرگرتبێت ٢-سـەربازی بەکرێگراوی دەوڵەتێکیتر بێت شەر بۆ ئەولایەنە بکەن کە بە کرێیگرتوون.
٢-(اَلرازِقـيّ)٢- بێتوانـا/ بێهێـز ٢-ترێـی ( مُلاحيّ)کە جۆرە ترێیەکە ٣-مەی.
(اَلرازِقِيَّة)٢-مەی ٢-بەرگێکی سپی کەتان.
رزم: ١-(رَزَمَ- الشـيءَ. رَزماً)شتەکەی کرد بە گورزەو بەستی.
(- بِالشَّيءِ)شتەکەی گرتو برد.

(رَزَّمَ- الثِيـابَ): جلەکانـی کۆکـردەوەو بەستنیو کردنی بە بەستەك.
(رازَمَ بَينَهُمـا): پەکیخسـتنو پێکـەوە کۆیکردنەوە.
(- فِي المطاعِمِ): هەر جـارەی لە خواردنێکی خوارد جارێك ماستو جارێك گۆشت.
(اَلرَزْمَةُ): ژەمە خواردنێك لە رۆژێکدا.
(اَلرِزْمَةُ- مِـنَ الثِيابِ وغيرهـا (ج) رِزَم): بەسـتەكو بوخچەی جلو بەستەکە نوێنو بەستەكو گورزەی هەر شتێك بێت.
(اَلرِزْمَة التَّوافقية): کۆمەڵە راسـتەهێڵێکن چوارن دەگەنــە پنتێك دەگەنە چەند پنتێك کـە بەشـکردەیەکی گونجاوبـن. (اَلرزمــة اللاتوافُقِيَّة): کۆمەڵە راسـتەهێڵێکن چوارن دەگەنــە پنتێـك دەگەنە چەنــد پنتێك کە بەشـکردەیەکی نەگونجاوبن. (هـ) (اَلمِرزَم): پێبەستە/ کەشتی پێدەبەسترێتو وەك پەتو گوریسو گوشو شتیتر.
٢-(رَزَمَ- علـى عَدُوِّهِ. رَزْمـاً)دوژمنەکەی پێچایەوەو بە سـەریدا زاڵ بـوو جۆکی نایە سەری.
(- الرَجُلُ)مرد.
(- البَعيرُ. رُزُوماً رُزاماً)حوشترەکە لوولبوو لەبەر بێهێزی هەڵنەستا.
(رازِم (ج) رُزّام)حوشـترێك لەبەر بێهێزیی نەتوانێت راستبێتەوە/ هەستێت.

(رَزَّمَ- القَومُ): خوێشکەل خۆیان بە زەویدادا/ نەجوولانەوەو نەرۆیشتن/ شوێنەکەیان جۆڵنەکرد.

(رازَمَ- الدارَ): خۆی خزاندە خانووەکەوەو بەرینەدا/ زۆر تێدا مایەوە.

(الرِزام (ج) رُزَّم): پیاوی بەتواناو دەسەلات/ نەبەردو در.

(اَسَدٌ رَزامَةٌ ورَزامٌ): شێر نێچیرەکەی ژێر نابێت و بەسەریەوە بمرێنێت.

(المُرتَزَم): ژێرخۆنراو/ تەختکراوی زەوی.

(«تَركْتُهُ بالمُرتَزَم»): لە زەویدا تەختمکردو وازم لێهێنا.

٣-(رَزَمَ- الشِتاءُ. رَزْمَةً): زستان ساردیکرد.

(نوءُ المِرْزَم والمِرْزَمان) (فك): دوو ئەستێرەی باران لەگەڵ دوو ئەستێرە روناکەکەدان کە لەوپەری گەرمادا دەردەکەون.

(المِرزَم): ئەستێرەیەکی باران.

٤-(رَزَمَ- تِ الأُمُ بالوَلیدِ رَزْماً): دایکەکە کوڕیەکەی بوو.

٥-(اَرزَمَ- تِ الناقَةُ): مێحوشترەکە بە دەوری بەچکەکەیدا هات/ سۆزیدایە/ لەگەڵیدا میهرەبانبوو.

(- الرعدُ): هەورەگرمەکە ناڵەیەکی توندیکرد.

(اِرزامَ. اِرزیماماً): تووڕە بوو/ توند بوو.

(غَیثٌ رَزِمٌ): بارانێکی بە هەورەگرمەی بێبڕ.

(الرَزَمَـةُ): ١-دەنگی توندو بەرز/ ناڵەی توند ٢-زریکەو دەنگی منداڵ ٣-دەنگی حوشتر لە گەرووەوە بێکردنەوەی دەنگی کاتێک سۆز بە بەچکەکەی دەدا.

(«لاخَیرَ في رَزمَة لا دِرَّةَ فیها»): سۆزێک شیردادانی بەدواوە نەبێت بێکەڵکە بە یەکێک دەڵێن گفتێک بدات و نەیباتە سەر/ زمانی لووسبێت و مەرایی بکات و درۆزنبێت/ بە یەکێک دەڵێن ساختەباز بێت.

(اَلرَّزیم): ١-نەرەی شێر/ نەرەنەر ٢-نفیشك/ کەرە.

رزن: ١-رَزَنَ- الشَيءَ رَزناً): شتەکەی بەرزکردەوە سەنگیبکات/ بە دەست بۆ قورسی و سوکی هەڵیسەنگاند.

(رَزُنَ. رَزانَة): سەنگینبوو/ قورسبوو.

(اَلأرزَن) (ن): ئەرژەن درەختێکی سەختە داردەستی لێدروستدەکرێت.

٢-(رَزَنَ- بالمَكانِ. رَزْناً): لە شوێنەکەدا نیشتەجێبوو.

(الَرزَن والرِزن (ج) رُزُن ورِزَان واَرْزان): بەرزاییەك چاڵی تێدابێت و تیایدا ئاو کۆببێتەوە.

(الرِزنَـة (ج) رِزان): چاڵێك کە ئاوی تێدا کۆبێتەوە/ گۆلاو.

٣-(رَزُنَ. رَزانَـةً): سەنگینبوو/ مەندبوو/ ئاغر بوو.

رَزين وهيَ رَزانِ ناوترێت (رزينة)؛ مەند/ ئاغر/ سەنگين.

(تَرَزَّنَ- في الأَمرِ أَو في مَجلِسهِ)؛ ١-لە كاروبارێدا يان لە كۆڕو دانيشتندا، سەنگين‌و مەند بوو/ ئاغر بوو.

اَلرَزين: ١-بە ئارام‌و سرەوت/ مەندو هێمن ٢-ڕا ڕاست‌و دروست.

(«هُوَ رَزِينُ الرَأيِ»)؛ ڕا دروست‌و چاكە.

٤-(رازَنَ – الرَجُلَ)؛ بوو بە دۆستی‌و لەگەڵيدا گونجا.

(تَرازَنا)؛ يەكيانگرت/ يەكانبينی.

٥-(اَلرزن)؛ كەنار/ لا.

(اَلرَوْزَنَة (ج) رَوازِن) (فارسية)؛ كلاوڕۆژنە.

(رزی- فُلاناً. رَزياً)؛ چاكەكەی/ خێرەكەی فيساری وەرگرت.

(اَرزی- إِلَيهِ وإِرزاءً وأَرْزی- إِلَيهِ ظَهْرَهُ)؛ پاڵی بە پاڵيەوەدا/ پشتی پێبەست‌و پەنايبۆبرد.

رسّ: (رَسَ- البئرَ. رَساً)؛ چاڵاوەكەی هەڵكەند.

(اَلرَسّ)؛ ١-كۆنە چاڵاو/ كۆنەبير ٢-كانزا.

٢-(رَسَّ- الشَيءَ. رَسّاً)؛ بە نهێنی كردی (بە ژێرەوە/ بەناودا) شاردیەوە.

(- المَيتَ)؛ مردووەكەی (ناشت/ بەخاك سپارد).

(رَسَّ واَرَسَّ- السَقْمُ في جَسَدِه. رَسّاً ورَسيساً)؛ دەرد دايە لەشی‌و لێينەبووەوە.

(اَلرَسَّةُ)؛ ستونی قايم‌و چەسپاو.

(اَلرَسِيس)؛ چەسپاو/ بنجبەست.

٣-(رَسَّ- خَبَرَهُم. رَسّاً)؛ هەوڵيدا هەواڵيان بە هۆی خۆيانەوە بزانێت.

(- لَهُ الخَبَرَ)؛ هەواڵەكەی (پێگەياند/ بۆ دەرخست/ دايە).

(تَراسَّ- القَومُ الخَبَرَ)؛ بە نهێنی هەواڵەكەيان بە يەك گەياندو لێی دووان.

(إِرتَسَّ- الخَبَرُ في الناسِ)؛ هەواڵەكە لەناو خەڵكدا بڵاوبووەوە/ تەشەنەيكرد/ جاڕدرا.

(اَلرَسّ) (مص)؛ (سووچێكی/ سووسەيەكی) هەواڵ.

(«بَلَغَنِي رَسٌّ مِنَ الخَبَرِ»)؛ (سووچێكی/ سووسەيەكی) هەواڵەكەم گەيشتێ.

(اَلرَسيس)؛ هەواڵی ناڕاست يان ساغ نەبووبێتەوە.

(رَسَّ بَينَهُم. رَسّاً) (ضد)؛ ١-نێوانی چاككردنەوە/ يەكيخستنەوە ٢-نێوانی تێكدان/ ناتەبايكردن/ لەيەكيكردن.

(اَلرَسيس)؛ ژير.

٥-(راسَ- هُ بالأَمرِ مُراسَّةً)؛ باسی كارەكەی لەگەڵدا كردەوە.

(اَلرَسّ)؛ ١-سەرەتای شت ٢-سەرەتای تاگرتن.

(«بِهِ رَسُّ حُمَّی»)؛ خەريكە تايبگرێت. ٣-سەرەتای حەزو دڵداری/ ئەوين.

(رَسيسُ الحُمَّی)؛ سەرەتای تاگرتن‌و لەش گەرمبوون.

(رَسِيسُ الحُبِّ): سەرەتای (حەزو/ ئەڤین/ دڵداریی).
٦-(اَلرَسّ): نیشانە.
(رَسُّ الحُبِّ): جێکارو پاشماوەی حەزو دڵداریی لە دڵدا.
(اَلرُسَّةُ والأُرْسُوسة): کڵاوقووچ.
(اَلرُسَّی): بان.
(رَسِیسُ الحُبِّ): جێکارو پاشماوەی حەزو دڵداریی لە دڵدا.
(«ریحٌ رَسِیسٌ»): بایەکی نەرم/ شنەبا.
رسب: (رَسَبَ ورَسُبَ- الشيءُ في الماءِ. رُسوباً ورَسَباً): شتەکە لە ئاوەکەدا نیشت/ کەوتە بنی.
(«رَسَبَ فِي الإمتِحانِ»): لە تاقیکردنەوەکەدا دەرنەچوو/ مایەوە/ کەوت.
(- تِ العَینُ): چاوەکە بە قووڵداچوو.
(اَرسَبَ- هُ): نیشاندی.
(اَلرُسَبُ والرَسَب والمِرسَب- مِن السُیُوف): شمشێری تیژ کە زۆر دەچێتە لەشی پێداکراوەکەوە.
(اَلراسِب- مِنَ الرِجالِ): پیاوی (بەرگەگرو خۆڕاگر/ نەگۆڕ/ قایم).
(اَلرَسُوب- مِنَ الرِجالِ= الراسب): خۆڕاگرو بەرگەگر/ قایم.
(- مِنَ السُیوف): شمشێری تیژ کە چاک بەلەشدا دەچێت.

(اَلرَّواسِب (ط ١): مادەنیشتوەکان/ لیتەی نیشتو کە گڵ‌و شتیترەو چینی سەرەوەی زەوییەکە لافاوو رووبارو لێشاو لە شوێنە نزمەکانداو بۆ دەریاو رووبارەکان دێت‌و دەنیشێت چین لەسەر چین کەڵەکە دەبێت پێیشیدەڵێن نیشتووەکان. مادە نیشتووەکان.
٢-(اَلراسِب والرَسُوب- مِنَ الرجال): سەرمەند.
اَلرَوْسَب: زۆرزان.
الملحق:
رست: (اَلرُّست): ڕەست/ یەکەمین مەقامە لە حەوت مەقامە بنچینەییەکانی مۆسیقادا.

---

رسح: ١-(رَسِحَ. رَسَحاً): گۆشتی سمت‌و ڕانی پووکایەوە.
(اَرسَح (م) رَسْحاء (ج) رُسْح): سمت پووچ‌و ڕان لاوازو کەمگۆشت.
(اَرسَحَ- هُ): لەڕیکرد/ لاوازیکرد.
(اِمرَأَةٌ رَسحاء): ژنێکی ناشیرین.
رسخ: ١-(رَسَخَ. رُسوخاً): چەسپبوو/ جێگیربوو.
(«رَسَخَ الحِبرُ في الصَحیفَةِ والعلم في القلبِ»): مەرەکەبەکە لەسەر پەڕەکە چەسپی‌و زانستەکەش لە دڵ‌و مێشکدا چەسپی.
(«فُلانٌ راسِخٌ في العِلْمِ»): فیسار لە زانستدا کوڵاوە/ دەستی لە زانستدا زۆر باڵایە.
(اَرسَخَ- هُ): چەسپاندی/ بنچەسپتیکرد.

(تَرَسَّـخَ- في التقـى): لەسـەر پارێزەگـەی سـەرومڕ بوو/ لـە پارێزکردنەکەی نەپچڕا/ قایمبوو/ چەسپا.

٢-(رَسَخَ- الغَدیرُ رُسُوخاً): ئاوی گۆمەکە بە زەویدا چوو ڕۆچوو وشکبوو.

٣-(الرَسْـخ عِنْـد غُلاةَ لَصحابُ التَناسُـخ): لای تیژڕەوەکانـی گیانوەگوێـزان ئەوەیە کە گیانـی مردوو لە لەشـەوە دەچێتە ڕووەك و بێگیانەکان.

رسد: الرَسْدَق والرُسْداق (فارسیة)- الرَزْدَق والرَزْداق): دێ/ گوندو زەویی دەوری.

رسع: ١-(رَسَـعَ- العُضوُ. رَسْعاً): ئەندامەکە خراپبوو/ گەنبوو/ لاکەوتو شلبوو.

(- ت عَینُهُ): پێڵوەکانی بەیەکەوە نووسانو چاوی تێکچوو.

(رَسِعَ. رَسَعاً): پێڵوەکانی تێکچوو.

(أرسَع): کەسێکە پێڵووی چاوی تێکچووبێتو بەیەکەوە نووسابن.

(- ت عَینُـهُ): چـاوی تێکچـوو پێڵووەکانی گۆڕان هەڵاوسانو سووربوونەوە.

(رَسعاء): چاوتێکچوو و پێڵوو هەڵاوساو.

(رَسَّعَ): فرمێسکەی چاوی تێکچوو.

٢-(رَسَـعَ- الصَبيَ وغَیرَهُ رَسْـعاً): مورووی چاوەزاری کردە دەستو پێی منداڵەکە.

(رَسَّـع- الصَبيَّ): مورووی چـاوەزاری کردە دەستو پێی کۆرپەکە.

٣-(رَسِـعَ بِهِ الشيءُ. رَسَـعاً): شتەکەی پێوە لکا.

(رَسَّـعَ): نیشـتەنیبوو و لە مـاڵ دەرنەچوو مایەوە.

(- الشَيءَ): شتەکەی لکاند/ نووساند.

(- السـیرَ): قایشـەکەی دڕیو قایشـێکیتری پێداکردو تێچەسپاند.

(الرَسیع): ١-پێوەلکاو/ پێوەنووساو/ چەسپاو ٢-قایشێك کە قایشیتری تێچەسپابێت.

(الرُسُـوع): توولـە چەرمـی هۆنـراوەو لە ناوەڕاستی کەوانەکەدا دەبێت.

(الرِساعَة(ج)الرَسائِع):تولە چەرمی هۆنراوە بە دامێنی ڕاگری شمشێرەوە دەبێت.

رسغ: (رَسَغَ- البَعیرَ. رَسْغاً):هەردوو مەچەکی دەستی حوشترەکەی بە پەتێك بەست.

(رَسَـغَ- للمَطَرُ): باران هێندە باری مەچەکی حوشترەکە بە زەویدا چەقی.

(راسَـغَ- هُ): لە زۆرانەکـەدا مەچەکیگرتو دایبەزەویدا.

(الرُسْـغ والرُسُـغ (ج) أرْسـاغ وأرْسُغ) (ع ا): مەچەکی دەسـتو قولەپـێ. بۆ مرۆڤـو چوارپێ.

(الرَسَغ (طب): شلبوونی مەچەکو قولەپێی چوارپێ.

(الرِسـاغ): پەتێکـە بە هـەردوو مەچەکی وڵاخەوە دەبەسـترێتو بـە مێخزنجیرێکەوە

یان سـنگێكەوە دەبەسـترێت و ڕێی ڕۆیشتنی لێدەگرێت.
(رَسَـغَ- العَیـشَ): گوزەرانـی خـۆش و تێروتەسەلكرد.
(إرتَسَغَ- علی عیالِهِ):گوزەرانی خێزانەكەی خۆشكردو تێروتەسەلیكردن.
(الرَسیغ- مِنَ العَیشِ)ژیانی (تێروتەسەلی/ گوشادیی).
\ (- مِنَ الطَعام):خۆراكی مشەو زۆر.
(المُرَسَّغ – مِنَ الآراء)ڕای دامەزراو كە هیچی بەسەر هیچەوە نەبێت.
٢-(رَسَّـغَ- الكَلامَ)قسەكەی بە فیشاڵ و درۆ هۆنییەوە.
رسـف: (رَسَفَ. رَسْفاً و رَسِـیفاً و رَسَفاناً): وەك كۆتكراو ڕۆیشت.
(أرْسَـفَ- الدابَـةَ):چوارپـێ كۆتكراوەكەی دەركرد.
(إرْتَسَـفَ- الشـیءُ)شـتەكە بەرزبووەوە/ هەڵبەزییەوە.
رسل: ١-رَسِلَ- الشَعرُ رَسَلاً ورَسالَةً)قژەكە پەخشانبوو/ هاتە خوارەوە/ شۆڕبووەوە.
(مُسْتَرسِل)شۆڕەوەبوو/ پەخشان.
(أرسَلَ- القَولَ)نێبەرواو هەرەمە قسەیكرد.
(تَرَسَّـلَ- في الرُكـوبِ)لـە سـواریدا لاقی شـۆڕكردەوەو جلەكـەی بەسـەردادان و دایپۆشین.

(-في القُعودِ):چوارمەشـقی دانیشت لەشی و قاچی بە جلەكەی داپۆشی.
(إسْتَرسَلَ- الشَـعرُ):قژەكە خاوو بەردراوە بوو/ شۆڕ بوو.
(- في الـكَلام):درێـژەی بـە قسـەكەداو پەكالایكردەوە.
(- إلَیـهِ):دڵـی خـۆی بۆ كـردەوەو بوو بە هاونشینی.
(الرَسْل – مِنَ الشَعرِ)قژی خاوو بەردراوە.
(الرِسْـل (ج) رِسَـال)فەرزانیی و خۆشیی/ فەرو بەرهەمی زۆر ٢-شـیرو ماست چونكە لە كاتی خۆشی و فەردا زۆر دەبێت.
(الرَسـیل (ج) أرْسُـل ورُسُـل ورُسَـلاء): فراوان.
(الرَسْلَةُ) تەمەڵیی.
(رَجُـلٌ فیـه رَسْـلَةٌ):پیاوێكـی تەمـەڵ و تەوەزەلە.
(«هُم في رَسْـلَةٍ مِنَ العیـش»)لە ژیانێكی نەرم و بێگیرو گرفتدان.
(المُرسَلَةُ (ج) مُرْسَلات)گەردانەیەكی درێژی بەردراوەی سەرسنگ.
٢-(رَسِلَ- البَعیرُ. رَسَلاً ورَسالَةً):حوشترەكە خۆشڕەوتبوو.
(رَسَّـلَ- في القراءَةِ)لەسەرخۆ خوێندیەوەو دەستووری خوێندنەوەی پەیڕەو كرد.
(«رَسَّـل قِراءَتَـهُ»):خوێندنەوەكـەی بـە

دەستووڕو شێنەییبوو.

(- فِي القِراءَةِ): لەسەرخۆ خوێندییەوە/ لە خوێندنەوەکەدا هێواشبوو.

(تَرَسَّلَ): خاوو لەسەرخۆ بوو/ شێنەییبوو/ هێواشیکرد.

(إسْتَرسَلَ- الشَيءُ): شتەکە نەرمبوو/ ئاسانبوو زوو بە دەستەوە هات.

(الرَّسلُ- مِنَ السَيرِ): ڕۆیشتنی ئاسانو خۆش.

(- مِنَ الإبِلِ): حوشتری ڕەوتخۆش.

(الرِسْلُ (ج) رِسالٌ): سەری بازووی ئەسپ.

(الرِسْلُ والرِسْلَةُ): شێنەییو لەسەرخۆو هێواشی.

(«على رِسْلِكَ يا رَجُل»): هێواشو لەسەرخۆ بە.

(ناقَةٌ رَسْلَةٌ): حوشترێکی نەرمی لەسەرخۆ/ خۆشڕەوت.

(الرِسالُ): دەستو پێی حوشتر/ چوارپەلی حوشتر.

(ناقَةٌ مِرسالٌ (ج) مَراسيلُ): مێحوشترێکی خۆشڕەوت.

(الرُسَيلَةُ): هێواشۆکە/ نەرمۆکە/ خۆشڕەونۆکە.

(«ألقى الكلامَ على رُسَيلاتِهِ»): بە نەرمۆکەیەکەوە قسەکانیکرد/ تۆزێک لەسەرخۆ دوا.

(راسَلَ- هُ فِي و على وبالأمرِ): نامەیەکی بۆ ئەو کارە لەسەر ئەو کارە نووسیو نارد.

(- هُ الغِناءَ): پێشبڕکێی گۆرانیی لەگەڵدا کرد.

(أرسَلَ- هُ): ١-ناردی ٢-بەرەڵایکرد/ بەریدا ٣-ڕایسپارد.

(- بهِ إلَيهِ): دەربارەی بەرەو ڕوویکرد.

(- قَولَهُ مَثَلاً): وتەی خۆی کردە پەندو نموونە تا چاوی لێبکەن.

(- فُلاناً عَلَيهِ): فیساری کردە سەری.

(تَرَسَّلَ): ١-نامەکەی داڕشتو هێنایە کایەوەو پەیامنێرییکرد ٢-داوای پێغەمبەرێتییکرد.

(تَراسَلَ- القَومُ): نامەیان بۆ یەکتریناردو وەکو یەك ڕەفتاریانکرد/ چاویان لە یەککرد.

(الرَسَلُ (ج) أرسالٌ): ١-دەستە/ ڕەوە/ گرووپ/ کۆمەڵی هەموو شتێك ٢-کۆمەڵە خەڵك.

(الرِسْلَةُ): کۆمەڵ/ دەستە/ گرووپ.

(جاؤوا رِسْلَةً): بە کۆمەڵ کۆمەڵ هاتن.

(الرَسُولُ (ج) رُسْل ورُسُل وأرسُل ورُسَلاء): ١-پێغەمبەر ٢-پەیام/ نامە ٣-فرستادە/ نێردراو ٤-یەکێ لە نێرراوەکانی حەزرەتی عیسا کە ئینجیلی پیرۆزیان بڵاوکردەوە.

(الرَسِيلُ (ج) أرسُل ورُسُل ورُسَلاء): ١-نێردراو/ فرستادە ٢-کەڵ/ نێرە ٣-پەیام/ نامە ٤-فرستادە/ نێردراو/ نامەبەر ٥-هاوخەبات ٦-ئەسپی یەدەك لە پێشبڕکێدا ٧-ناوی شیرین.

(اَلرِسـالَة والرَسالَة (ج) رَسـائِل ورِسالات) (ج) رَسائِل ورِسالات)؛١ـپێغەمبەریی ٢ـنامە ٣ـپەیام.

(اَلمِرسـال (ج) مَراسـیل)؛١ـتـیری بچووك/ تیرۆکە ٢ـنامەبەر (کە سـووکەڵەیە وەك تیر دەڕوات).

(اَلرَّسُـوليّ (م) رَسُـولِيَّة)؛ لای دیانـە کاسـۆلیکەکان ئەو فەرمـانو نامانەن کە لە لایەن پاپا یان شـوێنی پاپاوە دەردەچێت کە بڕیارو ڕانوماو شتیترن.

(اَلمُرسَـلات)؛ فریشـتەکان یـان بـاکان یان ئەسپەکان.

الملحق:

رسل: (اَلإرسَال)؛ بەردان/ بەرەڵاکردن.

إرسالُ- الكَلام؛ گوێزانەوەو گەیاندنو ناردنی ئاخاوتن لە شوێنێکەوە بۆ جێیەکیتر.

(«إرسال كتاب»)؛ نامە ناردنێك.

(اَلإرسـال)؛ کـردەی بڵاوکردنـەوەو وێنەگوێزانەوە بە هۆی ڕادیۆو تەلەفزیۆنەوە.

(جهـاز الإرسـال)؛ ئامێـری بێتەلـی بڵاوکەرەوە.

(اَلإرسـالِيَّة)؛ تاقمێکـن بـۆ بڵاوکردنەوەی ئاینێك بۆ شوێنێك دەنێردرێن.

(اَلإرسالِيَّة- في التِجارَة)؛ ئەو کاڵاو کەلوپەلە بازرگانیەیە کە لە شـوێنێکەوە بۆ جێیەکیتر دەنێردرێت.

(اَلمُراسِـل)؛ ١ـنامەنێـر ٢ـهەواڵنێـر ڕۆژنامەنووسـێکە کـە هـەواڵو زانیاریـی کۆدەکاتەوەو بۆ گۆڤـارو ڕۆژنامەیەك یان بۆ جێگری هەواڵێکیدەنێرێت.

---

رسم: ١-(رَسَـمَ- المَطَرُ الدِيارَ. رَسْماً)؛ باران ئاوایەکانـی کاولو تەختکردو شـوێنەواری بەجێهێشتن.

(- نَحوَهُ)؛ بەرەو ڕووی خێرا ڕۆیشت.

(- البَعيرُ رَسـيماً)؛ حوشترەکە توند پێی بە زەویەکەدا ناو ڕۆیشت شوێنپێی بەجێهێشت.

رَسُـوم؛ حوشـتری توند پێدانەرو شـوێنپێ جێهێشتوو.

(رَسَّمَ وأرسَمَ- النَاقَة)؛ مێحوشترەکەی توند لێخوڕیو شوێنپێی پێبەجێهێشت.

(تَرَسَّـمَ- الدارَ)؛ بیری لە خانوەکە کردەوەو سەرنجی لە کەلاوەکانیدا.

(تَرَسَّـمَ- الشَيءَ)؛ شـتەکەی هێنایەوە یادی خۆی/ بیری کردەوە.

(- البانـي أَوِ الحافِر)؛ خانەسـازەکە یان بیر هەڵکەنەکـە بیری لە شـوێنی خانووەکە یان بیرەکە کـردەوە لە کـوێ دروسـتیبکات یان چاڵاوەکە لە کوێ هەڵکەنێت.

(اَلرَسـم (مـص) (ج) رُسُـوم وأرسُـم)؛١ـ پاشماوەی کەلاوەی خانووەکە ٢ـبیری ئاودێری پڕکراوە یان تەپیو.

(اَلرَسَم)؛ باش ڕۆیشتن.

(اَلراسِم): ناوی کشاو/ ڕۆیشتوو.
(اَلرَوسَم): وەبی گران/ جورتوومی قورس.
(اَلرَســمان والمِرسَم): ڕۆشتنێکی حوشترە کە توند پێ بنی زەویداو شوێنپێ بەجێبهێلێ.
(اَلرَّواســم): دەربڕەی ئامادە کە لە کۆندا بە سەرمەشق دەکرا.
(اَلرَواسِم. الواحدةُ راسِم وراسِمَة): حوشترێك کە توند پێ بە زەویدا بنێت و شوێنپێ بەجێ بهێڵێت.
٢-(رَســَمَ- على كذا رَسماً): لەسەر ئەو شتە نووسی و هێڵیکێشا.
(- الكِتابَ): کتێبەکە یان نامەکەی نووسی.
(-دائِرَةً أو قَطعاً مَخروطِيّاً أو خَطّاً مُنحَنِياً علــى مُضَلَّع (هــ)): کێشــانی بازنەیەك یان پارچــە یــان هێڵێکــی چەماوە/ لــە چەند لایەکــدا بە مەرجێك بەســەری چەند لاکەدا تێبەڕێت.
دائِــرةً أو قَطعاً مَخروطِيّاً أو خطاً مُنحَنِياً- في مُضَلَّع: کێشــانی بازنەیەك یان پارچە یان هێڵێکــی چەمــاوە لەنــاو چەنــد لایەکدا بە مەرجێك لە پنتێکدا بەر لاکانی بکەوێت.
(رَسَمَ- الثَوبَ): هێڵی بڕینی جلەکەی کێشا.
(اَلرَســم (مــص) (ج) رُســوم وأرْســم): ١- نواندنی شتەکە ٢-نیشانە ٣-وێنەکێشان ٤-بەوە دەوترێت کە ڕاســتیی نانوێنێت/ پێچەوانەی ڕاستیی ٥-وێنەکێشــان و نواندنی شتەکان یان زەلامەکان یــان دیمەنی سروشــت و دیمەن و چاوئەندازی لادێ بە قەڵەمی ڕەش یان فڵچەی وێنەو نیگارکێشێك.
(اَلرَوسَم): نیشانەو شوێنکار/ شوێنەوار.
اَلرَسّام: وێنەکێش و نیگارکێش.
(اَلراســوم (ج) رَواسِــيم والرَوْسَــم (ج) رَواسِم): شــەقڵ تەختەیەکە لێیهەڵکەنراوە شەقڵی گەنمی سوورو جۆی سووری خەرمانی پێدەکــەن تــا دزیــی لێنەکرێــت ٢-ئــەوەی کــە نەخــش و نیگاری لەســەر گــۆزەی تەڕ پێدەردەکەن.
(اَلرَواسِــيم): کۆمەڵە پەڕاویکبوون لە پێش ئیسلامدا هەبوون.
٣-(رَسَــمَ- لَهُ كذا. رَسْماً): ١-فەرمانی ئەوەی پێدا ٢-پلانی ئەوەی بۆ دانا کە بیکات.
(إرتَســَمَ- الأَمرَ): فەرمانەکــەی بەجێهێنا/ پەیڕەویی فەرمانەکەیکرد.
(«رَسَمَ لَهُ كذا فارْتَسَمَ- هُ): فەرمانی ئەوەی پێداو ئەویش فەرمانەکەی بەجێهێنا.
(اَلرَسْم): فەرمان/ دەستووردان.
(اَلرَسْم- عند أَهْلُ الجباية = المَكْس): باجی (کەلوپەل/ کاڵا).
(اَلمَرســوم (مفع) (ج) مَراســيم ومرَاسِم): ١-فەرمان ٢-نووســراو بە تایبەتی نوســراوی کاربەدەستان و والییەکان دەربارەی کاروباری بەڕێوەبــردن و ئــەو بڕیارانــەی کــە میری

دەریدەکات.
٤-(رَسَمَ- هُ. الْسَقْفَ): پلەیەکی کلێسەیی بە قەشەکەدا.
(الْرِسامَة): پلەیەك بدرێت بە قەشەیەك.
(اِرتَسَمَ- الرَجُلُ): پلەیەکی کلێسەیی وەرگرتو بەرز بووەوە.
(- لِلهِ تَعالی): ناوی خودای بە گەورەیی بردو هێنا/ مەزنیکردو کەوتە نزاو دوعاو پارانەوە.
الملحق:
رسم: (اَلرَّسمي): ١-یاسایی/ میری.
(«الدَّوام الرَسمي»): بینگریی دەستووریی.
(اَللِّباس الرسمي): بەرگی یاسایی.
(اَلرَّسمي): ئەوەی پشتی پێدەبەسترێت.
(«هذا هُوَ الكلامُ الرسمي»): ئەمەیە ئاخاوتنی یاسایی.
(اَلرَّسمي عِندَ العامَّة): یاسایی‌و دەستوری/ لای خەڵکە رەشۆکییەکە ئەوەیە کە راستیبێت‌و گەمەبازیی‌و قۆشمەیی نەبێت.
(اَلرَّسمیون): خاوەندەسەلاتەکان.
(«وَصَلَ الرسمیون»): خاوەن دەسەلاتەکان گەیشتن.
(اَلرَّسمیات): ئەو دەستوورو رێبازانەیە/ نەریتانەیە کە کۆمەڵگا دایناوەو لەسەریدەروات.
(اَلتَّقَیُّد بِالرَسمیات): لەسەر دەستوورو رێباز رۆیشتن‌و پێوە پەیوەندبوون.
(بِلا رَسمیات): بێگوێدانە نەریت‌و دەستوور.

---

رسن: (رَسَنَ- الدابَّةَ رَسْناً): ١-رەشمەیکردە سەری وڵاخەکە ٢-جواریێکەی بەرەڵاکرد بۆ خۆی بلەوەرێت.
(اَرسَنَ- الدابَّةَ): ١-رەشمەو سەرکەڵەی کردە سەری وڵاخەکە ٢-وڵاخەکەی وەها کرد بۆ خۆی بلەوەرێت.
(- المُهْرُ): جوانووەکە ملیدا رەشمەی بکەنە سەر/ هەوساری بکەنەسەر.
(اَلرَسَن (ج) اَرْسَان واَرْسُن): رەشمەی وڵاخ/ هەوسار.
(«رمی بِرَسَنِهِ علی غارِ بِهِ»): جڵەوی بۆ بەرەڵاکرد چی دەکات بیکات.
(اَلمَرسِن والمِرسَن- مِنَ الدابَّةَ (ج) مَراسِن): شوێنی بەستنی رەشمەو سەرکەڵەی هەوساری وڵاخ.
رسا: ١-(رَسا. رَسْواً و رُسُوّاً): بنجبەست‌و قایمبوو/ چەسپی.
(راسٍ (م) راسِیَة (ج) رَواسٍ و رِاسیات): بنجبەست‌و قایم/ جیگیر/ چەسپیو.
(- تِ السَفینَةُ): پاپۆرەکە لەنگەریگرت‌و وەستا.
(راسی- هُ): لەمەلەدا لەگەڵیدا پیشبرکێیکردو بەزاندی.

(أَرسـى- الشَـيءُ إرساءً): شـتەكە چەسپی/ بنجبەستبوو.
(- السَفينَةَ): لەنگەری بە پاپۆڕەکە گرت.
(- الوَتَـدَ في الأَرض): سـنگەكەی (بەزەویدا چەقاند/ داكوتا).
(الرَسـيّ): ١-بنجبەست/ چەسـپیو ٢-ستونی چەسپیو لە ناوەراستی دەواردا.
(المُرسی) (مفع): بنجبەستكراو/ چەسپاو.
(«يَسـألونَكَ عَنِ السـاعَةِ أيان مُرساها»): لێتەپرسـن كاتـی دیاریكـراوو چەسـپاوی زیندووبوونەوەكەیە.
المَرسَـی (ج) مَراسٍ: لەنگەرگای پاپۆڕەكان/ بەندەر/ شوێنی وەستانی پاپۆڕ.
(«قِدرٌ راسِـيَةٌ»): گامەنجەڵێكی چەسپاو كە لەبەر گەورەیی جووڵەی پێنەكرێت.
(المِرساة (ج) مَراسٍ): لەنگەری پاپۆڕ.
(«ألقـى مَراسِـيَهُ»): لەنگەری فڕێـدا ولتا نیشتەنیبوو.
(«ألقَـتِ السَـحابُ مَراسِـيَها»): هەورەكـە لەنگەریگرتو دایرشتە باران.
(الرَواسي): كێوانی بنجبەستو چەسپاو.
٢-(رَسـابَينَ القَوم. رَسـواً): ئاشتیو تەبایی لەنێو خوێشگەلدا چەسپاند.
٣-(رَسا- عَنهُ حَديثاً. رَسْواً): فەرموودەیەكی لەوەوە گێڕایەوە.
(- لَهُ الحَديـثَ): كەمەكێكی فەرموودەكەی سـووچێكی قسـەكەی بـۆ دەرخسـتـە بـۆ گێڕایەوە.
(الرَسو): سووچێكی/ كەمێكی/ سەرەتایەكی فەرموودەكە یان قسەكە.
رشّ: ١-(رَشَّ- الماءَ رَشّاً وتَرشاشاً): ئاوەكەی وەشـاند/ ئاوڕشـێنیكرد ٢-پرژاندنـیو بلاویكردەوە.
(- تِ السَّـماءُ): ئاسمان ڕشـێنەیكرد/ وردو كەمەكێك باراندی.
(- الشَيءَ): شتەكەیشت.
(أَرَشَّ- ت السَّـماءُ): ئاسـمان ڕشـێنەیكرد/ بارانی ڕشاند.
(- تِ الطَعنَةُ): شـوێنی تیغ تێچەقاندنەكە فراوانبوو خوێن لێوەی فیچقەیكرد.
(- شِـواءُ): برژاوەكە (خوێنو چەورییەكەی دەردا/ دڵۆپاندی).
- الفَرَسَ): ئارەقی بە ئەسپەكە دەردا هێندە غاری پێكرد.
(تَرَشّـشَ- عليه المـاءُ):١-پرژەپـرژی ئاوی بەركەوت ٢-ئاوەكە پرژا، ڕۆیشت.
(الرَّش) (مص) (ج) رِشـاش):١-ڕشینەباران ٢-لێدانی بە ئازار.
(الرَشاش): ئاو یان خوێنو شتی هەڵپرژاو.
(الرَشّـاش) (ا ع): شەسـتیر/ مەترەلـۆز/ پرژێن.
(الرَشيش (ا ع): تفەنگی شێوە شەستیر.

(اَلرُّشيشــةُ) (ا ع): تفەنگێکی بچووکی شێوە شەستیر.

(اَلمِرَشَّةُ): ئاوپرژ/ ئامێری پرژێن.

٢-(رَشْــرَشَ- الشــيءُ. رَشْرَشَــةً): شــتەکە خاوبووەوەو نەرمبوو.

(- البَعيرُ): حوشترەکە جۆکیداداو پاشا سنگی لە زەویەکە خشاندو جێی سنگیکردەوە.

(تَرَشْرَشَ- الماءُ): ئاوەکە رۆیشت/ کشا.

(خُبْزٌ أَو عَظمٌ رَشْــرَشٌ أَو رَشراشٌ): نانێك یان ئێسقانێکی نەرمو خاو.

رشــأ: (رَشَــأَ- الظَبــيُ. رَشْــأً): کارمامزەکە قاچیگــرتو بەهێزبــوو لەگــەڵ دایکەکەیدا رۆیشت.

(- تِ الظَبيــةُ): ئاســکەکە کارمامزێکی بوو قاچیگرتو لەگەڵ دایکیدا رۆیشت.

(اَلرَشَــأُ (ج) أَرشــاء (ح)): کارمامز یان ئەو کارمامزەی قاچدەگیرێتو دەڕوات.

رشــت: (اَلرِشْــتَة (ط) (فارسـية)): جــۆرە چێشتێکە بە نیسكو وردە پارچە هەویر.

رشح: ١-(رَشَحَ وأَرْشَحَ وارْتَشَحَ- الإِناءُ. رَشْحاً و رَشَحاناً): قاپەکە ئاویا شلەکەی دەڵاند.

(- الجَسَدُ):لەشەکە (ئاوی دەردا/ ئارەقیدەردا/ خوێیدەردا).

(«لَم يَرشَح له بِشَــيءٍ»): شتێکی لە دەست نەبووەوە یــان شــتێکی لێهەڵنــەوەری. واتا هیچی نەدایە.

(رَشِــحَ. رَشَــحاً و رَشَــحاناً): ئاوی‌ــدەردا/ ئارەقیکردەوە خوێیدەردا.

(تَرَشَّحَ- الماءُ): ئاوەکە لە نێوان بەردەکانەوە دەرچوو/ دەڵاندی.

(اَلرَشْح) (مص):١-ئەرەق و ئاوی لەش/ خوێ ٢-دەڵاندن ٣- (طب) ئاوو چڵم لە لووتدا بێتە خوارەوە بە هۆی هەڵامەتەوە ٤-ئارەقدەردان.

(اَلراشِــح) (فــا) (ج) رواشِــح):١-دەڵاندنو دەرچوونــی ئــاو لە نێــوان بــەردەوە/ ئاوی هەڵقوڵیــو ٢-دامێنی کێو کە ئــاو بدەڵێنێتو لەبەریبڕوات.

(اَلرَشيح): خوێ/ ئەرەقی لەش.

(اَلأَرشَح): دڵۆرپاتر/ زیرەکتر.

(«هُــو أَرشَــحُ فُــؤاداً»): ئــەو دڵۆرپاتــرە/ زیرەکترە/ هوشیارترە.

(اَلمِرشَح والمِرشَحَةُ):خوێهەڵچن/ئەرەقهەڵچن کە دەخرێتە ژێر زینەوە بۆ هەڵمژینی ئارەقی پشتی چارەوێکە یان چوارپێکە.

٢-(رَشَــحَ- الظَبــيُ رُشــوحاً): ئاســکەکە هەڵەمبازیدا/ بازیدا.

(- رَشَــحَ وأَرشَــحَ- تِ الناقَةُ وَلَدَها رَشحاً): مێحوشــترەکە بنکلکی بەچکەکــەی خوراندو بەســەری پاڵیپێوەنا لەگەڵیدا بڕوات لەسەری راوەستا تا شوێنی بکەوێت.

(راشِــحٌ ومُرْشِــحٌ ومُرَشِّــحٌ): مێحوشــتری بەرێوەبەردەی بەچکەکەی بەو شێوەیە.

(رَشَّحَ- تِ الناقَةُ وَلَدها): مێحوشترەکە بەچکەکەی بەڕێوەبردو لەسەری وەستا.
(- ت الظَبيةُ وَلَدَها): ئاسکەکە کارمامزە تازە بوەکەی لستەوە.
(تَرَشَّحَ وَلَدُ الناقَةِ): بەچکە حوشترەکە پێیگرتو کەوتە دوای دایکی.
(-تِ الظَبيَةُ): ئاسکەکە بەچکە تازەبووەکەی خۆی لستەوە.
(اَلراشِح (فا) (ج) رَواشِح): خشۆکەکانو مۆریچەو مۆریان.
(- مِنَ الفُصْلان): بەچکە حوشترو گوێرەکەکە توانای ڕۆیشتنیان هەیە.
٢-(رَشَّحَ – الغَيثُ النَبتَ): باران گیاکەی پێکەیاندو پەروەردەیکرد.
(- الوَلَدَ): کوڕەکەی بۆ کارێك پەروەردە کردو پێکەیاندو ئامادەیکرد.
(«هُوَ يُرَشَّحُ لِولايَة العهد): ئەو پێدەگەیەنرێتو ڕادەهێنرێت تا ببێتە جێنشین.
(رَشَّحَ نَفْسَهُ لِلإنتخابات أَوِ لِغيرِها): خۆی بۆ هەڵبژاردن یان هیتر پاڵاوت.
(- المالَ): سامانو دراکەی باش هەڵسووڕاندو خەملاند.
(تَرَشَّحَ- الرَجُلُ الأَمرَ): بۆ کارەکە هەڵبژاردەو کارامەو ناودار بوو/ شایستە بوو.
(تَرَشَّحَ لِلإنتخابات أَو لِغيرِها): خۆی بۆ هەڵبژاردن یان هیتر پاڵاوت.
(إِسْتَرشَحَ –النَباتَ): گیاکەی پەروەردەو چاودێریکرد تا ئاژەڵی تێبکات.
(- النَباتُ): گیاکە بەرزبووەوە/ باڵایکرد/ پێگەیشت.
(اَلرَشيح (ن): ڕووەك/ گیا.
(اَلمُرَشَّح): پاڵێوراوو ناوهێنراو لە هەڵبژاردندا یان بۆ پایەیەك.
(مُرَشَّحُ الضابط) (ا ع): پلەیەکی ئەفسەرە لەسەربازیدا.
رشد: ١-(رَشَدَ ورَشِدَ رُشْداً ورَشاداً و رَشَداً): ڕێی ڕاستیگرت/ ڕێی ڕاستی دۆزییەوە/ هۆشی بە خۆیدا هاتەوەو کەوتەوە سەر ڕێبڕاست.
(- أَمْرَه): سەری لە کارەکەی دەرکرد/ لەسەر ئەوە تێیگەیشت.
(رَشَّدَ- هُ إِلى كذا و عَلَيه ولَهُ): بۆ ئەوە ڕانومایکرد/ ڕێی ئەوەی پیشاندا.
(- هُ القاضي): قازی بە بالغو پێگەیشتویدانا.
(أَرشَدَ- هُ إِلى كذا وعَلَيه ولَهُ): بۆ ئەوەو بۆ سەر ئەوە ڕانومایکرد.
(إِسْتَرْشَدَ- هُ): داوایلێکرد ڕانومایبکات/ بیخاتە سەر ڕێی ڕاستی ئەو کارە/ ڕێبەدێیی بکات.
(- لأَمرِهِ): ڕێی ئەنجامدانی کارەکەی دۆزییەوە/ ڕێبەدێی کارەکەیکرد.
(اَلرُشْد) (مص): ١-ڕێبڕاستگرتن ٢-گومڕانەبوون

٣-پێگەیشتنی کوڕو کچ/ باڵقبوون.
(اَلرَشْـدَةُ والرِشْـدَةُ): پەیوەندیی شەرعی/ دروستیی.
(«وُلْدٌ لِرُشْـدَةٍ»): منداڵانی شـەرعیی/ هی پەیوەندیی دروستیی.
(اَلرَشَدی): ١-شەرعێتی شەرعی/ دروستی ٢-ڕێبەدێیی/ ڕانوماگردن/ ڕێدەرکردن.
(اَلرَشـید): ١-ژیرو هوشـیار ٢-پێگەیشتوو/ باڵقبوو ٣-ڕێبەدیـکار/ ڕانومار ٥-ڕانوماکراو/ ڕێبەدیکراو.
(اَلمُرْشِدَةَ (ج) مُرْشَدات): کچی پێشڕەو کە لە تیپی دیدەوانی کچانی پێشڕەودان.
اَلمَراشِد: شوێنی تختو ڕێکی ڕێکاکان.
٢-(اَلرَشاد والرَشد) (ن): تەرەتیزە.
(اَلرَشــادَة (ج) رَشاد): ١-تاوێر ٢-بەردێکی پڕ بەمشت.

الملحق:

رشد: (اَلرَّاشِــد): ١-کـوڕو کچی پێگەیشتووی تەمەنــی بلۆقبــوون/ تەمەنــی هەســتو هوشــیاریی ٢-کوڕو کچی گەیشتووی تەمەنی یاســایی ٣-کەســێکەکە ڕێگەی هەقو ڕاستیی گرتبێتو لەسەری هەتەرو سوور بێت.
(«اَلخُلَفــاءُ الراشِــدُون»): جێنشــینەکانی پێغەمبەر کە ڕێگەی ڕاستو هەقیانگرتو لە سەری سوورو هەتەر بوون ئەوانیش حەزرەتی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو عەلی بوون.

(اَلمُرشِد): ڕابەر/ ئامۆژگار/ ڕانوماکار.
(«اَلمُرْشِد إلى الطريقِ القَويم»): ڕێپیشاندەری ڕێی ڕاست.
(اَلمُرْشد): ڕێبەری پاپۆڕەکان بۆ تێپەڕبوون لە کەناڵەکانداو لەنگەرگرتن لە بەندەرەکاندا.
(«مُرشِدٌ ساحِلِي»): ڕێبەری ڕۆخی دەریا.
(«مُرشِـدُ المينـاء»): ڕێبـەری پاپـۆڕ لــە بەندەرەکاندا: لە ئەسکەلەکاندا.
(مَرشِـدٌ فِي التَّصَـوف): ڕابـەرو شـێخی سۆفییەکان.
(«اَلمُرشِـدُ التَربَـويّ»): سەرپەرشـتیاری پەروەردەیی ئەو کەسەیە کە سەرپەرشتیی‌و چاودێریـی مامۆسـتاکان دەکاتو ڕانومـای چونیەتی‌و ڕێگەی ڕاستی وانەوتنەوە دەکات.
(«اَلمُرشِـدُ الروحي»): پەروەردەکارو ڕابەری گیان. ئەو کەسـەیە ژیانی گیانیی کەســانو کۆمەڵان پەروەردە دەکاتو ڕێبەر دەکات.

---

رشف: (رَشَـفَ ورَشِـفَ- الماءَ ونَحوَهُ. رَشْفاً و رَشِـيفاً و تَرشَـافاً و رَشَـفاً و رَشَـفاناً): ئاوەکە یان شـتیتری وەهای بەلێو هەڵلوشی‌و هەڵمژی.
(- الإنــاءَ): هەرچـی لــە قاپەکـەدا بــوو هەڵیلووشی‌و خواردیەوە.
(رَشَّفَ وأَرشَفَ وتَرَشَّفَ وارْتَشَفَ- الماءَ): توند ئاوەکەی هەڵمژی.
(اَلرَشْــف والرَشَــف): جۆرە ئاوێــک لە بنی

گۆلەكەدا مابێتەوە.

(«حَوضٌ رَشَفٌ»): گۆلێك ئاوى تێدا نەبێت.

(اَلمِرشَف (ج) مَراشِف): ئاومژە/ تورومپا/ ئەوەى ئاوى پێهەڵدەمژرێت.

(اَلرَّشاف): فرە هەڵمژ.

(اَلمَراشِف): لچو لێو.

رشق: ١-(رَشَقَ- ەُ بِالسَّهمِ رَشْقاً): تیرى تێگرت/ تیربارانیكرد.

(- ەُ بِبَصَرِهِ): تیژ تەماشایكرد/ چاوى لێدەرپەڕاند/ چاوى تێبڕى.

(«رَشَقَهُم بِنَظرَة»): چاوى لێدەرپەڕاندن/ خێسەى لێكردن.

(- ەُ بِلِسانِهِ): تەشەرى لێدا/ تیرو توانجى تێگرت/ زمانى لێگرت.

(راشَقَ- ەُ مُراشَقَةً): تیرەبارانى یەكتریانكرد یان بەردبارانى یەكتریانكرد یان خێسەیان لەیەكتریكرد یان بە زمان یەكتریان بریندار كردو قسەیان بەیەكتر گوت.

(أَرشَقَ- الرامي): تیرهاوێژەكە تیرەكەیگرتە شوێنە بەرامبەرەكەى.

(«أَرشَقَني مَقصَدي»): پێشبڕكێى ئامانجەكەى منى لەگەڵدا كردم.

(- النَّظَر إِلَيهِ): تیژ چاوى تێبڕى/ خێسەى لێكرد.

(- القَومَ بِبَصَرِهِ): چاوى بۆ هەڵبڕینو تیژ تێبڕوانین.

(-تِ الظَبيَةُ): ئاسكەكە ملیى درێژكردو تیژ روانى.

(تَرَشَّقَ- في الأَمرِ): لە كارەكەدا تونندوتیژ بوو.

(تَراشَقَ- القَومُ): بەگژ یەكتردا چوونو یەكتریان تیربارانكرد.

(«تَراشَقوا بِأَلسِنَتِهِم وتَراشَقوا بِأَعيُنِهِم»): زمانیان لەیەك بەربوو چاویان لە یەك دەرپەڕاند.

(اَلرشق (ج) أَرشاق): تیر تێگرتن.

(اَلرَّشَق): كەوانێكى تیرتیژ/ خێرا.

(اَلأَرشَق): سووكتر.

(«ماأَرشَقَ هذه القَوس»): ئەم كەوانە چەند سووكەڵەو تیژتیر هاوێژە/ تیر خێرایە.

(اَلرَّشقَةُ) (ا ع): ڕیزە تەقین ڕیزكردنى گوللەو گوللە تۆپ.

(رَشقَةُ اللِّسان) (ج) رشقات): زمان لێبەربوونو تەشەرلێدان/ تیروتوانج هاویشتن.

(«إِيّاكَ ورَشَقا اللِسان»): ئاگات لێبێت زمانت لێبەرنەبێت.

٢-(رَشُقَ- الغُلامُ رَشاقَةً): ١-هەرزەكارەكە شۆخ دەرچوو قەدوباڵا جوانبوو ٢-لە كاردا سووكەڵەو چابوكبوو.

(رَشيق (ج) رِشَق): شۆخو شەنگو سووكەڵە لە كاراد.

(اَلرَشيق (ج) رَشَق): شۆخ و شەنگ و لە كاردا لەشسووك و چابوك.

(-مِنَ اللَّفظِ أو الخَطِّ): زمانشیرین یان نووسین جوان.

(اَلأرشَق): قنج و قیت.

(«جيدٌ أرشَق»): کەمەر ڕێك و جوان قەد.

٣-(راشَقَ- هُ. مُراشَقَةً): پێبەپێی ئەو ڕۆیشت/ شانبەشانی ئەو بوو.

٤-(اَلرَشْق والرِشْق): سیرەی پێنووس.

(«سَمِعتُ رَشْقَ قَلَمِه»): سیرەی پێنووسەکەیم بیست/ سیرەی قەڵەمەکەی هاتە گوێم.

رشم: ١-(رَشَمَ. رَشْماً): نووسی.

(- بَيْـدَرَ الحُنطَـةِ): خەرمانە سوورەکەی گەنمەکەی شەقڵکردو نیشانەیکرد.

(رَشَّمَ): نووسی.

(اَرشَمَ وارتَشَمَ- الإناءَ): بەقەڵەمی مۆرهەڵکەن قاپەکەی (نیشانەکرد/ لێنووسی).

(اَلرَشْـم): شەقڵی خەرمان کە خەرمانی سووری پێ شەقڵ و نیشانە دەکەن و پێوەی دیاردەبێت تا هەڵیدەگرن ٢-شوێنکاری باران بە زەوییەوە شوێنکاری هەموو شتێك.

اَلرَشم: ١-شوێنکاری باران بە زەوییەوە ٢-شوێنکاری هەموو شتێك/ نیشانەی هەموو شتێك ٣-ڕەشیی بە سەرو قەپۆزی کەمتیارەوە.

(اَلرَوشم والراشُوم): جۆرە شەقڵێکە نیگارکێشراو خەرمانی سوورو شتیوەهای پی شەقڵدەکەن.

اَلرُشْمَة: ڕەشی سەرو قەپۆزی کەمتیار.

(اَلأرْشَم): ١-ئەوەی کە خاڵ و میل یان هەر نیشانەیەکیتری پێوە بێت ٢-سەگ کە ڕەشی لە نێوان هەردوو کونەلووتیدا هەبێت.

٢-(رَشِمَ. رَشَماً): بۆنی خواردنیدەکردو بۆ خواردن دەگەڕا.

(اَرشَم): یەکێکە بۆنی خواردنی کردبێت و بۆی بگەڕێت.

٣-(أرشَمَ- الشَجَرُ): درەختەکە گەڵایکرد.

- البَرقُ): هەورە بروسکەکە چەخماخەیدا.

(- تِ الأرضُ): زەوییەکە گیایدەرکرد.

(-تِ الماشِيَةُ): ئاژەڵەکە گیاتازە دەرهاتووەکەی خواردو لەسەری لەوەڕدا.

(اَلرَشَم) (ز): گیای تازە دەرهاتوو.

(اَلأرْشَم- مِنَ الغَيثِ): نمەبارانێك/ ڕشێنەباران/ بارانێکی کەم.

(«عامٌ أرشَم»): ساڵێکی کەمباران و کەمبەرو بووم.

٤-(اَلرُشْمَة): سەرکەلەی ولاخ.

رشن: (رَشَنَ. رَشْناً و رُشُوناً): مشەخۆریی و چڵێسییکرد.

(- الكَلْبُ في الإناءِ): سەگەکە سەری بە قاپەکەدا کرد.

(اَلراشِن) (فا): ١-مشەخۆر ٢-شاگردانە.

(حَلوان) عامية:شاگردانه.

(اَلرَشْن والرَشَن):كەلێی شتێك یان ڕێژنەی ڕووبــار كــە ئــاوی لێــوە دێتــە خــوارەوەو دەڕژێت.

(اَلرَوْشَــن (ج) رَواشِــن= اَلكُوَّة) (فارسیة): كلاوڕۆژنە.

رشا: ١-(رَشا- ەُ رَشْواً):بەرتیلیدایە.

(راشَــی- فُلانــاً. مُراشــاةً):مەراییكردو بە ڕووكەش لەگەڵیدا بوو.

(تَرَشّــی- الرَجُلَ):ڕووكەشــكارانە لەگەڵیدا نەرمبوو.

(اِرْتَشی):بەرتیلیوەرگرت/ بەرتیلیخوارد.

(-مِنهُ رَشْوَة):بەرتیلی لێوەرگرت.

(اِسْتَرشَــی- فِي حُكْمِهِ):لــە دادوەرییەكەیدا داوای بەرتیلیكرد.

(اَلرُشْوَة والرِّشْوَة والرِشْوَة (ج) رُشیً ورِشیً): بەرتیل.

٢-(اَرْشَی- الدَلوَ):پەتی بۆ سەتڵی چاڵاوەكە كرد/ پێوەیبەست.

(- الشَجَرُ):درەختەكە پەل و پۆی درێژكرد.

(اَلرِشــاء (ج) اَرشِیَة):پەتو گوریسیو ئالەو بابەتانەو پەتی سەتڵی چاڵاو.

(اَرشِــیَةُ النَبات):پەل و پــۆی درێژەوەبووی گیاو ڕووەك.

(اَلرَشاة (ج) رَشا) (ن):گیایەكە.

(اَلتِرشاء):پەتی دۆڵكەو سەتڵی بیر/ چاڵاو.

٣-(اَرشَــی- القَــومُ فِي دَمِــهِ): خوێنشــكەل بەشداریی/ ڕشتنی خوێنەكەیبوون.

(اَرْشَــوا بِسِــلاحِهِم فیه):بە چەكی خۆیان بەشدارییانكردو لە كوشتنەكەی‌نیشتن.

٤-(اِسْتَرشَــی- الفَصلُ):بەچكە حوشــترەكە یان گوێرەكەكە مژینی دایكی ویست.

(- مــاقِي الضَرعِ)شــیری گوانەكەی چۆڕەبڕ كرد.

(اَلرَشِيّ):بەچكە حوشتر یان گوێرەكە.

رص: ١-(رَصَّ- الشــيءَ. رَصّــاً):شــتەكەی ڕیزكردو پێكیەوە نووساندن.

(مَرصوص ورَصیص)ڕیز بوو و پێكەوەلكاو/ جووتبوو.

(رَصّــصَ- ەُ)١-ڕیزیكــردو پێكیەوەلكانــد/ جووتكرد ٢-قورقوشمی تێهەڵسوو.

(تَرَصَّصَ وارتَصَّ):پێكەوە لكان/ چوونە پاڵ یەك/ پێكەوە جووتبوون/ چەسپین.

(تَــراصَّ- القَــومُ):یەكیانگــرتو چوونــە پاڵیەك/ یەكریز بوون.

(اَلرَصَص)سفتیی دان.

(اَلأَرَصّ (م) رَصّاء (ج) رُصّ):دانسفت.

(«فَخْذ رَصّاء»)ڕانی پێكەوەنووساو/ لكاو.

(اَلرَصاص. الواحِدَةُ رَصاصَة (ك)قورقوشم. بۆیە وا ناونراوە چونكــە بەناویەكدا چووەو یەكیگرتووە هێماكەی ( pb)یە ٢-(ا ع) گوللە.

(اَلرَصاصِي)ڕەنگكەقورقوشمی/ خۆڵەمێشیی.

(اَلرَصِيـص (م) رَصِيصَـة (ج) رَصائِص): ئەوەی چنگی داوەتەیەکو یەکپارچە بووە.

(رُصَّت علی القَبرِ الرَصائِصُ): گۆڕەکە سفت بەردڕێژ کرا.

(اَلمَرصُوص- مِنَ البُنيان): ساختمانی تۆکمەو پتەو/ سفتو یەکگرتوو.

(اَلرَصّاصَـة): بەردڕێـژی ئەمـلاولای سەرچاوەکە/ کانییەکە.

٢-(رَصّصَ- الرَجُلُ): ڕکەی لە پرسیارکردندا کرد/ پێی لە پرسـیارکردنەکەدا گرت/ سوور بوو.

(اَلاُرصُوصَة): کڵاوقووچ خڕ وەك کاڵەك.

(الرَصّاصَة): ڕژد/ چرووك/ پیسكە.

٤-(رَصْـرَصَ- البِنـاءَ): سـاختمانەکەی/ بیناکەی تۆکمەو قایمکرد.

(- فِي المَكانِ): لە شوێنەکەدا چەسپی.

(اَلرَصْراصَة): ١-زەویـی ڕەقەن ٢-بەردڕێژی سفتی ئەملاولای کانی/ سەرچاوە.

رصح: (رَصِحَ. رَصَحاً): نزیك نێوان هەردوو سمتیبوو.

(اَرصح): سمت جووتبوو.

رصـــخ: (رَصَـــخَ- فِي الأمرِ): چووبــووە ناو کارەکەوە/ لە کارەکەدا قاڵبوو.

رصــد: ١-(رَصَــدَ- هُ. رَصْداً و رَصَــداً):١-چاودێریبوو/ ڕێوانیبوو ٢-بۆی لە بنەدا بوو/ خۆی بۆ نابووەوە گرفتاریبکات.

(راصَدَ- هُ): چاودێریبوو.

(اَرصَدَ- الرَقيبَ): چاودێری بۆ دانا.

(- لَهُ شَيْئاً): شتێکی بۆ ئامادە کرد.

(لَـهُ خَـيراً اَو شَـرّاً: پاداشـتی چاکـە یان خراپەکەیدایەوە.

(تَرَصَّدَ- هُ- تَرَقَّبَهُ): چاودێریکرد.

(- لَهُ): خۆی بۆ نایـەوە/ بۆی لە بنەدابوو/ لەسـەر ڕێگەکەیـدا لە بۆسـەدا بـوو و بۆی دانیشت.

(تراصَدَ- الرَجُـلان):١-دوو پیاوەکە خۆیان بۆ یەکتری نابووەوە ٢-چاودێری یەکتر بوون.

(اِرتَصَدَ- هُ): چاودێریکرد.

(اَلرَصَد (ج) اَرْصـاد):١-ڕێ/ ڕێگا ٢-ڕێوان/ ئەوانـەی چاودێرن وەك نۆکـەرو کارەکەرو پاسـەوان (بـە تاكو کـۆو نێرو مـێ هەروا دەڵێن). لەوانەیە بە کۆی بڵێن: (اَرصاد).

(اَلراصِد (فـا) (ج) رُصَّد ورَصَدَ): چاودێر/ ڕوانكار/ چاوەڕوان ٢-شێر ٣-بنەوان/ بۆسەوان کە لە بۆسەو بنەدایە.

(اَلرَّصيد): کەمینگر/ بۆسەگر.

(اَلرَصُود): چاوەچاو. حوشـترێك چاوەچاوی حوشترێکیتر بێت پاش ئەو ئاو بخواتەوە.

(اَلرُصْـدَة): چاڵەڕاو. چاڵێکـە بۆ ڕاوکردنی شێر یان هیتر.

(اَلمَرصَـدْ (ج) مَراصِـد):١-ڕاوگـە/ بنە ٢-ڕوانگە.

مەنجەڵەکە یان دەمەکە کەفیکردو فڕێیدایە دەرەوە.
(«أرغى الرَجُـلُ وأزبَدَ»):پیاوەکە دەمارگیر بــوو کەوتــە هەڕەشــەو گوڕەشــەو دەمــی کەفیکرد.
(-الشَيءُ):شتەکە زۆر سپیبوو/ بریقەیدایەوە.
(-السِــدْرُ ونَحــوَهُ):درەختی کونــارو ئالەو جــۆرە هێندە گوڵی ســپی دەرکرد وەك کەفی دەریا دەینواند.
(تَزَبَّدَ- الشِدقُ):لالفاوەکە کەفیچەند.
(-الرَجُــلُ):کابــرا تووڕە بــوو/ دەمارگیربوو کەوتە هەڕەشەو گوڕەشە.
(ألزَبَــد (ج) أزباد والزَبَــدَة (ج) زَبَد)کەفی سەرکەوتووی سەرناوو شتیوەها.
٢-(زُبَّادُ اللبن):شیری بێچەوریو بێکەڵك.
(إختَلَــطَ الخاثِــرُ بالزُبّاد):چــاكو خراپ تێکەڵبوو.
(ألمُزْبِد) (فا):کەفچێن/ کەفهەڵدەر.
(بَحرٌ مُزْبِد):دەریایەکی هەستاوو شەپۆلاوی کە کەف دەهاوێتە لێوار.
(ألمُزبِدَةُ) (ح):مۆریچەیەکی نیو باڵە لیکێکی لینج دەردەدات.
٣-(ألزَبــاد):بۆنی زەباد کە لە پشــیلە زەباد دەردەهێنرێت.
(ألزَّباد):سنور.
الزَّبــاد/ قط الزَباد/ ســنور الزبــاد (ح): گیاندارێکــی گۆشــتخۆرە لە پشــیلە دەچێت لەژێر کۆمیــدا توورەکەیەك هەیە مادەیەکی بۆنخۆشی تێداکۆدەبێتەوەو هەیە پێیدەوترێت زەباد یان (سیفیت).
(ألزُبّاد) (ن) الزُباد: (ن)جۆرە رووەکێکە.
ألزبدِيَّــة (ج) زَبــادِيّ): بەلەمــی کاشــی چێشت.
زبر: ١-(زَبَرَ- البِئرَ. زَبْراً):دیواری بیرەکەی بە بەرد هەڵچنی.
(-البِنــاءَ):دیــواری خانووەکەی بە وشــکە کەڵەك هەڵچنی.
(-هُ عَــنِ الأمرِ):بــەری کارەکــەی لێگرتو نەیهێشــت بیــکات (چونکە بــەری گومڕایی لێبگیرێــت وەك چۆن دیــواری چاڵاو بە بەرد هەڵچنرێت ئە ئاوا بروا قایمدەکرێت).
(زَبَــرَ- الســائِلَ): بــە ســواڵکەرەکەدا/ دەرۆزەکەرەکەدا هەڵشاخا.
(-الرَجُلَ):کابرای دایە بەر بەرد.
(ألزَبْــر): (مص)١-بــەرد ٢-ئەقڵ/ ئاوەز کە بەرەنگار دەبێتو رێدەگرێتو ناهێڵێت.
(ألزِبْر):ئاوەزو هۆش.
(«مالَهُ زِبْرٌ»):بێئاوەزو هۆشە.
(ألزَبور (ج) زُبُر):ئشا.
(ألزِبير):وەی/ جورتوم/ ئاپۆرە.
٢-(زَبَرَ- عَلَيهِ. زَبْراً):ئارامی لەســەر گرت/ خۆیگرت.

٣-(زَبَـرَ وزَبَّـرَ وازدَبَـرَ- الكِتـابَ. زَبْراً): پەراوەکەی/ پەرتووکەکـەی/ کتێبەکەی یان نامەکەی نووسی.

(اَلزَبْر) (مص):١-نووسین ٢-ئاخاوتن.

(اَلزِبْر (ج) زُبُور):کتێب/ پەراو/ پەرتووك.

(اَلزَبُـور (ج) زُبُر):کتێب/ پەراو (بە زۆریی بـە زەبوورەکەی/ نامەکـەی حەزرەتی داود دەڵێن).

(اَلزَبير):شتی نوسراو.

(اَلتَزْبِرَة):نووسین.

(اَلمِزْبَر):پێنووس/ خامە/ قەڵەم.

٤-(زَبُرَ. زَبارَةً):لەشی قەبەو کەتەبوو.

(اَزْبَرَ- الرَجُلُ):١-لەشـی کەتـە بوو ٢-بوێر بوو/ بەورە بوو.

(-الكَبْـشُ):بەرانەکەی (گەپ/ گەورە) کرد، کەتەکرد.

(اَلزَبْر):زۆر بەهێزو توند.

(اَلزُبْرَةُ (ج) زُبَر وزُبُر):١-پارچە ئاسـنێکی گەپ/ زل/ گەورە ٢-دەسـتگای ئاسـن. کۆڵو ناوشانو پشت.

(اَلزَبْر):بەتواناو توندوتیژ/ زۆر بەهێز.

(اَلزَبير):پیاوی بە زەبرو زەنگ.

(اَلأَزْبَـر (م) زَبْـراء (ج) زُبْـر والمُزبِـر): ناوشانپان.

٥-(اِزْبَـأَرَّ- النَباتُ أَو الوَبَرُ. اِزْبِئْراراً):گیاکە یان تووکی حوشترەکە سەرێدەرهێنا.

(-الشَعْرُ):قژەکە بژبووەوە.

(-الكَلْبُ):سەگەکە خۆی فشکردەوە.

(-الرَجُـلُ):پیاوەکـە خـۆی گیفکـردەوەو ئامادەی بە گژداچوونبوو/ خراپەکارییبوو.

(اَلزَبَر والزَلْبَر):هەمووی/ گشتی.

(اَلزُبْرَةُ (ج) زُبَر وزُبُر):یاڵی ملو سەرشانی شێرو هیتر.

(اَلأَزْبَـر (م) زَبْراء (ج) زُبْـر):وەزنەدار/ زەبرومشێن.

(اَسَـدٌ مَزْبَرانِيّ):شـێرێکی یـاڵو مل پڕو چڕتووك.

٦-(اَلزَبُور (ج) زُبُر):تیپ.

(اَلزَبير):١-پیاوی ناسك/ بەویڵو زمانشیرین ٢-قورەرەش.

(اَرْضٌ مَزْبَرَةٌ):زەوییەکی پڕ زەردەواڵە.

(اَلزَنبور (ج) اَلزَنابير):زەردەواڵە.

٧-(زَبْرَجَ- الشيءَ):شـتەکەی چاکساز کردو رازاندییەوەو دەستی پێداهێنا.

(اَلزِبْـرِج (ج) زَبـارِج): ١-رازاندنـەوەو جوانکردن بە رەنگو تێهەڵکێشکردنی سیمو هەموو شـێوەیەکیتر ٢-هەموو شتێکی جوانو قەشـەنگو چـاك ٣-زێـڕ ٤-تەنکەهەورێکی ئاڵهەڵگەراو.

٨-(اَلزَبَرجَد (ج) زَبارِج) (فارسية):زەمروت/ زوبەرەدەج.

٩-(زَبرَقَ- الثَوبَ):پۆشاکەکەی/ بەرگەکەی

لـه ڕەنگـی سـوور یـان زەرد هەڵکێشـاو ڕەنگیکرد.

زبـط: (زَبَـطَ- البَـطُّ. زَبْطـاً وزَبيطاً): مراوییەکە قیراندی/ دەنگی بەرزکردەوە.

(اَلزَباطَة والزَبَّاطَة) (ح): مراوی.

زبع: (تَزَبَّعَ): ١-بەدڕەوشـتبوو ٢-تووڕەو تڕۆ بوو. کەوتە جرتو فرت.

(اَلزَبيـع): گرمەگرمکەرێـك کـە تـووڕە بووبێت.

(اَلزوبَعَـةُ (ج) زوابِـع): گەردەلـوولو گێژەڵووکەی با کە بە ئاسماندا بچێت.

(أُمُّ زَوبَعَة وأبو زَوبَعَـة): گێژەڵووکە کە بە ئاسماندا بڕوات/ گەردەلوول.

(اَلزَّوابِع): وەیو جۆرتومی سەخت.

٢-(اَلزَوبَع): ١-سووكو ڕسوا ٢-کورتەبنە.

٣-(اَلزِبْعِـری): ١-بەدڕەفتار/ بەدخو ٢-ڕەقو تونـد سروشـت/ کەرتـر ٣-ئـەوەی تووکی دەموچاوو بڕۆی زۆر بێت ٤-مێی مارماریشۆك/ مێی گیرنگ/ مێی تیمساح.

٤-(اَلزِنْباعَة): لووتی پێلاوو سۆل.

زبـق: ١-(زَبَقَ-شَـعرَهُ زَبْقـاً): قژەکـەی تووکەکەی هەڵکەند.

(-تِ المَـرْأَةُ بِوَلَدِهـا): ژنەکـە منداڵەکـەی فڕێدا.

(اَلأَزْبَـق): گەوجێك کە لە گەوجیدا ڕیشـی خۆی هەڵدەکێشێت.

(اَلزَبيقَـة والمَزبوقَـة- مِنَ اللحي): ڕیشـی هەڵکێشراو.

٢-(زَبَـقَ- هُ فِي السـجن): لـە بەندیخانەدا بەندیکردو تەنگی پێهەڵچنی.

(-هُ فِي الشيء): ئاخنیە شتەکەوە ترنجاندیە شتەکەوە.

(-الشَيءَ بِالشَيءِ): شتەکەی تێکەڵی شتەکەیتر کرد.

(اِنْزَبَقَ- فِي البَيتِ): چووە ماڵەوە.

(-فِي الحِبالَـةِ): ١-بەداوەکـەوە بـوو تێیئالا ٢-خۆی (حەشاردا/ شاردەوە).

(اَلزابُوقَـة- مِنَ البَيتِ): (سـووچو قوژبنی/ کونجووری) خانووەکە/ ماڵەکە.

٣-(زَبَقَ- القِفلَ زَبقاً): کۆڵۆمەکەی/ قفڵەکەی کردەوە.

زبـل: ١-(زَبَـلَ وزَبَّـلَ- الأَرضَ. زَبْــلاً): زەویەکەی پەینڕێژ کردو چاکیکرد.

(اَلزِبْل (ز) = اَلسرجين أو السرقين): پەینی ئاژەڵ.

(اَلزِبْلَةُ والزَبيل= اَلزِبْل): پەیین.

(اَلمَزْبَلَة والمَزْبُلَة (ج) مَزابِل): سەرەلوێنك.

٢-(زَبَـلَ وازْدَبَلَ- الشَـيءَ زَبلاً): شـتەکەی هەڵگرت.

(اَلزُبْلَة): پاروو.

(اَلزُبال والزِبـال): ئەوەی مێرووله بە دەمی هەڵیدەگرێت.

(ماأصابَ مِنهُ زِبالاً): تا هێندەی شتی دەمی مێرووله‌یه‌کیشی لێ چنگنەکەوت.

(ألزُبالَة): جۆرە ئاوێك/ کەمەئاوێك.

(مافي البِئر زُبالَةُ): چاڵاوەکە کەمەکە ئاوێکیشی تێدا نییە.

(ألزَبيل (ج) زُبُل وزُبْلان والزِّبيل (ج) زَبابيل والزَنبيل والزِنبيل (ج) زَنابيل): ١-هەمانەی توێشەبەرە ٢-قاپ ٣-قوڵینەی قیرین.

٣-(ألزابِل والزابَل): کورت.

الملحق:

زبل: (ألزَبَّال): خۆڵرێژ/ کرێکارێکە خۆڵو خاشاکی شەقامەکانو ماڵان کۆدەکاتەوەو دەیرێژێت.

---

زبن: ١-(زَبَنَ- ه زَبنا): ١-پاڵپێوەنا ٢-خۆی پێدادا ٣-لایداو دووریخستەوە.

(-تِ الناقَةُ): مێحوشترەکە لە کاتی دۆشیندا لەقەیهاویشت.

(«زَبَنَ عَنا مَعروفَهُ»): چاکەکەی لێبڕین.

(زابَنَ- ه. مُزابَنَةً): ململانێی لەگەڵدا کردو خۆی پێدادا.

(أزبَنَ- بَيتَهُ عَنِ الطَّريقِ): خانووەکەی دووری ڕێگە دروستکرد.

(تَزَبَّنَ- ه): بەسەریدا زاڵ بوو.

(تَزابَنَ- القَومُ): پاڵیان بەیەکەوە نا.

(إنزَبَنَ- القَومُ): لاکەوتن/ لاچوون.

(بَيتٌ زَبنٌ عَنِ البُيوت): خانوویەکی تەریك لە خانووەکانیتر/ لاکەوت.

(مَقامٌ زَبنُ): شوێنێکی تەسکی لێژ کە پیاو خۆی پێوە نەگرێتو جێیتێدا نەبێتەوە.

(ألزَبَن): کەنار.

(ألزَبن والزُبُنّ): زۆر لێژو تەسك.

(زُبُنّتا- الناقَةِ): هەردوو پێی مێحوشتر.

(ألزَبُون- مِنَ النوقِ): مێحوشترێك کە کاتی دۆشینی لەقە زۆر بهاوێت.

(حَربٌ زَبُون): شەڕێکی سەخت کە یەکتری بهێننو ببەن.

(ألزَبُّونة والزُبُّونَة): مل/ گەردن.

(فيه زبونَةٌ): فیزنە/ لووتبەرزە.

(زُباني العَقرَب (ج) زُبانَيات): چزوی دووپشك.

(زُبانَيا العَقرَب): دوو شاخەکەی دووپشك.

(ألزِبنِيَّة (ج) زَبانِيَّة): ١-توند/ قایم ٢-پۆلیس ٣-جنۆکەو مرۆڤی یاخی.

(ألزَبانِيَّة عند العَرَب): پۆلیس. هەندێك فریشتەیشیان ناوناوە چونکە دۆزەخییەکان دەهاونە دۆزەخەوە.

٢-(زَبَنَ- الثَمَرَ. زَبْناً): (میوەکەی/ بەرەکەی) بە دارەکەوە فرۆشت/ بە سەلەم فرۆشتی.

(ألمُزابَنَة): لە گوتره بێژمارەو کێشانو پێوان فرۆشتن.

(ألزُّبُون (ج) زُبُن وزُبُونات): کڕیار (بەزمانی خەڵکی بەسرە).

(اَلزَّبون) (آرامية): بــە زمانى ئەمرۆو تازە بە یەكێك دەڵێن كە سـەودا هەر لای یەكێك بكات/ مەعمیل.
٣-(الزَّبون) (فارسـیة): گەمژەی گێل (ئەم وشەیە عەرەب بەو واتایە بەكاری ناهێنێت).
زبی: ١-(زَبَــی وازدَبی- هُ زَبْیاً): ١-هەڵیگرت ٢-دایە پێشخۆی.
(زَبَّی- فُلاناً): فیساری دایە پێشخۆی.
(أزبی- هُ- إزباءً): هەڵیگرت.
(اَلأُزبِــيُّ (ج) أَزابِــيّ): ١-جۆرە ڕۆیشـتنێكە ٢-خێرایــی/ گورجیــی ٣-گورجوگۆڵیــی/ چابوكیی.
٢-(زَبَی- هُ بِشَرٍّ. زَبیاً): تووشی خراپەیكرد/ گرفتاری خراپەیكرد.
(زَبَّی- اللَّحْمَ): گۆشـتەكەی لە ئاگردانەكەدا بڵاوكردەوە.
(-الزُّبْیَــةَ): ئاگردانەكــەی هەڵكەندو ئامادە كرد.
(تَزَبَّی- الزُّبیَةَ): ئاگردانەكەی هەڵكەند.
(-فِي الزُّبْیَــةِ): خۆی بۆ ڕاو لە چاڵی ڕاوەكەدا (نایەوە/ شاردەوە).
(اَلزُّبْیَــة (ج) زُبیً): ١-چاڵێكە گۆشـتو نانی تێدا دەبرژێنرێت/ ئاگردان ٢-چاڵی ڕاوكردنی درنــدەكان/ چاڵــەڕاو ٣-تەپۆڵكەیــەك/ بەرزاییەك كە ئاوی لافاو نەیگاتێ.
(«بَلَــغَ السَّــیلُ الزبی»): كار لــە كار ترازاو گەیشتە ئەوپەری خراپی.
(اَلأَزبِــيّ (ج) أَزابِــيّ): ١-كۆسـتی گـەورە/ لێقەومانی سەخت ٢-خراپەكاریی.
٢-(تزابَی. تَزابیاً): فیزینواند/ لووتبەرزییكرد.
زجّ: (زَجَّ- هُ. زَجّاً): بنی نێزەكەی پێداكرد.
(-بالشَّيءِ): شتەكەی فڕێدا.
(-هُ بالرمحِ): نێزەكەی پێداكرد.
(زَجَّ وازدَجَّ- حاجِبُــهُ. زَجَجــاً): برۆكـەی تەنكو درێژبوو.
(اَزَجّ): برۆ تەنكو درێژ.
(الحاجِــب أَزَجّ (م) زَجَّــاء (ج) زُج): برۆی تەنكو درێژ.
(زَجَّــجَ- الحاجِــبَ): برۆكـەی تەنــكو درێژكرد.
(-المَوْضِعَ): شوێنەكەی تەختو چاككرد.
(«نَقَرَ خَشَــبَةً ثم زَجَّجَ مَوضِــعَ النَّقرِ»): تەختەیەكی كونكرد پاشان شوێنی كونەكەی ڕێككرد/ تەختو چاككرد (ئەمە لە چاككردنی برۆوە هاتووە كە مووە زیادەكانی لادەبرێت).
(أَزَجَّ): بنی نێزەكەی لێكردەوە.
(-الرمــحَ): بنــی بــۆ نێزەكــە كــرد/ بنی پێوەكرد.
(اَلــزُّجّ (ج) زِجاج وأَزِجَّــة وزِجَجَة): ١-ئەو ئاسنەی دەكرێت بە بنی نێزەوە.
(«جَعَــلَ الزُّجَّ قُدّامَ الســنان»): ژێرەوەی لە سەرەوەی بە باشتر دانا ٢-نووكی تیر.

(الزجاج): نێزەکان ٣-سەری ئانیشك.
(اَلزُجج): نێزەی سونگی پێوەکراو.
رِمْحٌ مُـزَجَّ: نێزەی نوکی ئاســندار/ نووکی ئاسنپێوەکراو.
(اَلمِزَج): نێزەی کورت.
(اَلمِزَجَّــة): ئـەوەی بــرۆی پێهەڵدەگیرێت/ مووکێش.
٢-(زَجَّ، زَجاً): رایکرد.
اَلأَزَج: لۆقن/ لۆقدرێژ.
٣-(اَلزُجج): کەرانــی گوێتەپ کە ڕاهێنراوی کارپێکردنن.
(اَلزُجاج والزَجاج والزِجاج): شووشە. تەنێکی ڕوونی ڕەقەو ناسـکە لە لەو گەچو هەندێك مادەی کیمیایی وەك کاربۆناتی ســودیۆم یان هی پۆتاس دروستدەکرێت.
(زُجاجــة وزَجاجَــة وزِجاجَــة): پارچــە شووشەیەك.
(اَلزجاجَة): ١-شوشەگەریی ٢-شووشەفرۆشی.
(اَلزَجَّاج): شووشەگەر.
(اَلزُجاجيّ): شووشەفرۆش.
زجــر: ١-(زَجَرَ- هُ عَن کذا): ١-نەیهێشـــتو دەستی گرت ئەو کارە بکات/ قەدەغەیکرد ٢-پێداهەڵشاخاو دەریکرد.
(-تِ الریــحُ السَّــحابَ): باکــە هەورەکــەی ورووژاندو ڕایفراند.
(-الکَلْبَ وبالکَلْبِ): جغەی لە سەگەکە کرد.
(-الطَیرَ): باڵندەکەی هەڵفراند. ئەگەر بەلای ڕاستدا بفرێت گەشبینی لێدەبینێت خۆ ئەگەر بەلای چەپدا بفرێت ڕەشبینی لێدەبینێت.
(-الرَجُل): پێشبینیکرد.
(«زَجَــرتُ أَن یَکونَ کذا وکذا»): پێشــبینی ئەوەو ئەوەمکرد/ وتم ئەوە ڕوودەدات.
(تَزاجَــرَ- القَــومُ عَنِ الشَــرِّ): خوێشـــگەل یەکتریــان لــە خراپــە دوورخســـتەوە/ ڕێی خراپەو خراپەکارییان لە یەك گرت/ بەست.
(إِنْزَجَــرَ): لێدوورخرایـــەوە بــەری لێگیراو کارەکەی نەکرد/ لێی قەدەغەکرا.
(إِزدَجَرَ): نەهێڵرا/ قەدەغەکرا.
(-هُ): ١-ڕێپێلێبەست/ نەیهێشت ٢-پێداهەڵشاخاو دەریکرد.
(زاجِرُ الإنسان): بەرلێگری مرۆڤ/ ویژدانی مرۆڤ.
(أَبو زاجر): قەلەرەشکە.
(اَلزَجّــار): زۆر هەڵشــاخێنو بەرلێگــرو دەرکەر.
(ناقَةٌ زَجُور): مێحوشترێکە تاپێداهەڵنەشاخێیتو دەنگی لێنەکەیت شیرەکەی دانادات.
(اَلمَزْجَر): شــوێنی قەدەغەکراوو بەرلێگیراو لێدەرکراو.
(اَلمَزجَرَة): هۆکاری دەرکردنوپێداخەڵشاخانو بەرلێگرتنو قەدەغەکردن.
(«ذِکرُ اللهِ مَزجَرَةٌ لِلشَّــیطان»): ناوهێنانی

خودا دەرکەری شەیتانەو نەهێڵی هاتنیەتی.
٢-(ألزَجْر والزَجَــر (ج) زُجُور (ح): جۆرە ماسییەکی درکاویی گەورەیە.
زَجْر:١-پێداهەڵشاخان٢-دەرکردن٣-بەرلێگرتن ٤-قەدەغەکردن.
زجل: ١-(زَجَلَ- هُ وبِهِ):١-تێیگرت و بۆیهەڵدا ٢-پالێپێوەنا.
(-هُ بِالرمحِ): نێزەی پێداکرد.
(-الحَمــامَ): کۆترەکــەی نــاردە دوور ڕەوانەیکرد.
(حَمامُ الزاجِل أَو الزَجّال): کۆتری نامەبەر.
(ألزاجِل والزاجَل (ج) زَواجِل):١-فەرماندەی سەربازەکان/ سەرلەشکر ٢-قوڵفەی بنی نێزەکە ٣ دارێکە خڕ بەسەری گوریسەکەوەیە.
(-ألزَجّالَة): کورتە نێزە هاوێژەکان.
(مَسافَةَ زَجُول): ماوەیەکی دوور.
(ألمَزْجَــل): شــوێنی ڕەوانەکردنــی کۆتــری نامەبەر.
(ألمَزْجَل والمِزْجال): کورتەنێزە.
٢-(زَجِــلَ. زَجَــلاً): کەیفی هەســتاو کەوتە گۆرانی.
(«هُوَ زَجِلٌ وزاجِلٌ»): کەیفخۆشەو گۆرانیی دەچرێت/ گۆرانیبێژە.
(-القَومُ): گەمەیانکرد.
(ألزَجــل): جۆرە هۆنراوەیەکی/ شــیعرێکی تازەگەرییە.

(سَحابٌ ذو زَجَلٍ): هەورێکی بەگرمە.
(زَجَلُ الجِنِّ): ورتەورتی جنۆکان.
(ألزُجْلَــةُ (ج) زُجَــل): دەســتە خەڵکێــك/ کۆمەڵە خەڵکێك.
(ألزَجْلَــةُ (ج) زَجَــلات): غەڵبەغەڵــب و ژاوەژاوی خەڵك/ هــات و هاوار و دەنگەدەنگی خەڵك.
٣-(ألزُجْلَــةُ) (ج) (زُجَل):١-پارچەی هەموو شتێك ٢-پێستی نێوان هەردوو چاو ٣-ڕەوش/ بار.
زجم: (زَجَمَ. زَجماً): بە چرپە ورتەیەکیکرد.
(«سَكَتَ فَما زَجَمَ بِحَرفٍ»): بێدەنگبوو هەر وشەیەکی نەچرپاندو نەوت.
(ألزَجمَة والزَجْمَة): ورتەیەك بە چرپە.
(هُــوَ لايُخالِفُهُ بِزَجْمَةٍ): تا بە وشــەیەکیش سەرپێچی ناکات.
(قَــوسٌ زَجُــومٌ): کەوانێکــی کەمکێــش/ دەنگکز..
(ألزُجَّــم) (ح): باڵندەیەکــە، پەرەســێلکەی دەریا.
(زَجــا وزَجّــي وأَزجّي وازْدَجــي- هُ. زَجْواً وتَزجِيَةً وإِزجاءً):١-دایە پێشخۆی/ لێیخوڕی ٢-لەسەرخۆ/ بە هێواشی پالێپێوەنا.
(«كَيف تَزجّــي أَيامَكَ»): چــۆن ڕۆژەکانت بەسەردەبەیت.
(أَزجى — الأَمرَ): کارەکەی دواخست.

(تَزَجَّى بِالشَّيءِ):شتەکەی بەسبوو/ بە شتەکە داکەوت.
(اَلأَزجى):بۆ لە پێشترگرتن.
(فُلانُ أَزْجى من فُلانٍ بهذا الأَمر):فیسار لە فیسارکەس باشتر لە کارەکە هەڵدەچێتو دەیکات.
(اَلمُزجى (م) مُزجَاة):شتی کەم یان گەن/ خراپ.
(اَلمُزَجَّى):بێتوانای بێتابوشت کە لە کاروباردا پێویستی بە هاندانو پاڵپێوەنان هەیە.
٢-(زَجا- الخَراجُ. زَجْواً و زُجُوّاً وزَجاءً): کۆکردنەوەی باجەکە ئاسانبوو.
(-الأَمرُ):کارەکە ئاسانو سەرکەوتوو بوو.
(زَجّى- فُلانٌ حاجَتي. تَزجِيَةً)دەستگیربوونی پێداویستیەکەمی ئاسانکرد.
(أَزجى- الدِرهَمَ):رەواجی بە پارەکە دا.
٣-(زَجا- فُلانٌ. زَجْواً وزُجُوّاً وزَجاءً):لە پێکەنینکەوت/ پێکەنینەکەی بری.
زَحّ: (زَحَّ- هُ. زَحّاً): خێرا پاڵینا یان بەکێشیکرد.
(-عَن مَكانِهِ): لە شوێنی خۆی لایدا/ ترازاندی.
٢-(زَحْزَحَهُ- عَن مَكانِهِ فَتَزَحْزَحَ):لە شوێنەکەی ترازاندیو بزواندی/ جووڵاندی/ لەقاندیو لایدا. ئیتر بزواو لەقی/ جووڵا/ ترازێنراو لاکەوت.

(اَلزَحْزَح):دووریی.
(«هُوَ بِزَحْزَحٍ مِنْهُ»):ئەو لێوەی دوورە.
(اَلزَحزاح):دوور.
زَحَبَ: (زَحَبَ- إِلَيهِ زَحْباً): لێوەی نزیکبووەوە.
زحر: ١-(زَحَرَ- زَحيراً وزُحاراً وزُحارَةً): ١-زەحیر بوو/ تووشی زەحیربوو ٢-کاتی هەناسەدان یان کارکردن یان ماندوێتیو تەنگەتاویی دەینکاند.
(-ت بِهِ أُمُّهُ):بە گرانو هەناسەتوندیو نرکەو ناڵەوە دایکی بووی.
(زُحِرَ):تووشی زەحیربوو.
(تَزَحَّرَ):تووشی زەحیربوو.
(زَحَّرَت عَنهُ أُمُّهُ):بە زەحمەتو ناڵەو نرکەوە دایکی بووی.
(اَلزُحَر والزَحَّار والزَحْران):چرووك (وەکو بناڵێنێت کە سواڵی لێبکەن).
(اَلزُحار والزَحير= دیسنطاریا) (طب): زەحیری/ دیزانتری. شۆربوونو خوێن دەرچوون بە پیسایەکەوە لەگەڵ ئازاردا.
٢-زَحَرَ-هُ بِالرمحِ زَحيراً وزُحاراً وزُحارَةً): بە نێزە برینداریکرد.
(زاحَرَ-هُ):دوژمنایەتیی لەگەڵدا کرد.
زحف: (زَحَفَ. زَحْفاً وزَحَفاناً وزُحُوفاً): بە قنگەخشکێ یان بە ئەژنۆ هێواش هێواش خۆی خشاندو رۆیشت.

(-إِلَيهِ): بۆی خشا.

(زَحَــفَ العَسْــكَرُ إِلى العَدوِّ): ســەربازەکان لەبەر زۆریی هێمن هێمن بۆ دوژمن کشــان‌و ڕۆیشتن.

(زَحَــفَ- الشَّــيءَ): وردە وردە شــتەکەی ڕاکێشا.

(-البَعيرُ): حوشترەکە شەکەتبوو پەکیکەوت.

(زاحِــف وزاحِفَــة): حوشــتری شــەکەت پەککەوتە ئەو(ة) یە بۆ زیادەڕەوییە (م).

زاحِفَة (ج) زَواحِــف وزَحوف (ج) زُحُف): خۆبەکێشکەر/ خشۆك.

(-السَّــهمُ): تیرەکە نەگەیشــتە نیشــانەکەو کەوت پاشا بەرەو ڕووی کشا/ خشا.

(زاحِف (ج) زَواحِف): خشاو/ کشاو.

(زاحَفناهُم): هەردوولامــان بۆ لای یەکتری کشاین.

(أَزحَفَ): گەیشتە ئامانجەکەی خۆی.

(-هُ طــولُ السَّــفَرِ): درێژیــی گوزارەکــە/ سەفەرەکە شەکەتیکردو پەکیخست.

(-البَعيرُ): حوشترەکە شەکەتبوو.

(-الرَّجُلُ): حوشــتر یان چارەوێــی پیاوەکە شەکەتبوو.

(-بَنو فُلان): فیسار بەرە بوون بە سوپایەك‌و بەرەو دوژمن کشان.

(تَزَحَّفَ وازدَحَــفَ- إِلَيهِ): بەرەو ڕووی ئەو ڕۆیشت.

(تَزاحَــفَ- القَــومُ في الحَربِ): لــە جەنگدا لــە یــەك نزیکبوونــەوەو ســاردبوونەوەو تەمەڵییانکرد.

(أَلزَحْــف (مص) (ج) زُحوف): ســوپایەکی گەورەی بەرەو دوژمن کشاو.

(أَلزُحْفَــةُ): گەرۆکێك کە دوور نەکەوێتەوەو نزیك بگەڕێت.

أَلزِحاف- في العَروض): لە کێشی هەڵبەستدا گۆڕانێکە بەســەر دووەم پیتی سەروبۆرداردا سووکبێت یان قورسبێت دێت.

(أَلزَحّــاف (م) زَحّافَــة): خشــۆك/ کە زۆر دەخشێت.

(«أَلجَــرادُ الزَحّــاف»): کوللەی خشــۆك کە بەسەر زەویدا بخشێت‌و بڕوات بەرامبەرەکەی

(الطَيّار): فڕیو.

(أَلزَحّافــات) (ح): زیندەوەرێکن کە لەســەر سك دەخشێن وەك، مار، کیسەڵ.. هتد.

(أَلمِزحَف): خشــگە. لێژگەیەکــە لە فڕۆکەدا بــۆ بەربوونــەوەی بۆمبــای نــاو فڕۆکەکە دروستکراوە.

(أَلمَزحَــف (ج) مَزاحِف): خشــگەو خزگەو هێرشگە.

(مَزاحِفُ الحَيّات): خشــگەی مار/ شــوێنی خشینی مار.

(مزاحِــفُ السَّــحابِ): کاروانگــەی هەور کە تیایدا دەبارێنێت.

(بَعـيرٌ مِزحافٌ (ج) مَزاحِـف ومَزاحِيف): حوشترێك كه زوو شهكهت بێت.

زحــك: ١-(زَحَـكَ- بِالَمـكانِ زَحْــكاً): لــه شوێنهكهدا نیشتهجێبوو.

(-مِنهُ (ضد): ١-لێینزیكبووهوه ٢-لێیدووركهوتهوه.

(تَزاحَــكَ- القَــومُ) (ضـــد): ١-لهیــهك نزیكبوونهوه ٢-لهیهك دووركهوتنهوه.

٢-(زَحَلَ- عَنهُ) (ضــد): ١-لێیدووركهوتهوه ٢-لێینزیككهوتهوه.

(زاحَــكَ- هُ عَن نَفسِــهِ) (ضــد): ١-خۆی له دهروونی نزیككردهوه ٢-دووریخستهوه.

(تَزاحَــكَ القومِ): له یــهك دووركهوتنهوهو نزیككهوتنهوه.

٣-(زَحَــكَ- البَعــيرُ. زَحْــكاً): حوشـــترهكه شهكهتبوو.

(أزحَكَ الرجلُ): وڵاخی پیاوهكه شهكهتبوو.

زحــل: ١-(زَحَلَ- عَــن مَكانِــهِ زُحُولاً): له شوێنهكه لاچوو/ نهماو دووركهوتهوه.

(زاحِــل وزَحِل): كهنارگــیرو دووركهوتهوهو لاچوو.

(زَحَّلَ- هُ): دووریخستهوه.

(أزْحَلَ- هُ): دووریخستهوه.

(-هُ إلَيهِ): پهنای بۆ ئهو پێبرد.

(تَزَحَّــلَ- عَــن مَكانِــهِ): كهنارگــیری شوێنهكهیبوو لێیدووركهوتهوه.

(زُحَلْ (فك): ههسارهی كاروانكوژه/ كهیوان. ههسـارهیهكه ناوچهیهكی رووناكی به دهوردا ههیــه بــهرزیو دوورییهكــهی كــراوه بــه نموونه.

(رَجُـلٌ زُحَــل): پیاوێكــه كهنارگــیری كارهكهیدهبێت چاك یان ناشیرینبێت.

(ألزُحْلَةُ): ١-پیــاوی دوورهپهرێزو كهنارگیری كاروبــاری ٢-كابرایــهك شــوێنه نزیكــهكان بگهرێــت نــهك گهرۆكــی وڵاتو شــارانبێت ٣-جانهوهرێكه كلكی له پێش سهریهوه دهباته كونهكهیهوه.

(مسافَةٌ زَحُولٌ): ماوهیهكی دوور.

(ألزُحْلُول): شوێنی تهسكی خز.

(ألزِحْلِيل): ١-لاكهوتوو/ كهنارگرتوو ٢-شوێنی تهسكو خز.

(ألمَزْحَل): شوێنێكه بۆیدهخزێن/ دهچن.

٢-(زَحَلَ. زَحْلاً): شهكهتبوو.

٣-(ألزُحْلُول): لهشسووك.

(ألزِّحليل): خێرا/ گورج.

٤-(زَحْلَــفَ- الشَــيءَ): ١-شــتهكهیتلكردهوه ٢-كهنارگیریكرد.

(-فِي الــكلام): پهلــهی له قســهكردنهكهیدا كرد.

(تَزَحْلَفَ): ١-تلبووهوه ٢-كهنارگیر بوو.

(-تِ الشَّــمسُ): خــۆر بــهرهو ئاوابوونبوو/ بهرهو خواربووهوه یان له ناوهراستی ئاسماندا نهماو سهرهوخوار بووهوه.

أَلزُحْلوفَـة (ج) زَحالِـف وزَحاليـف): لێژگەیەکـی خـزمو لووسـه کـه خۆیانـی لێدەخزێنن/ خزگه.

أَلزَحالِـف) (ح): میرووچەیەکی ورده وەك مێرووڵەیەو لە مێرووله دەچێت.

-(زَحْلَفَ. الإِناءَ): قاپەکەی پرکرد.

-(زَحْلَقَ وزَحْلَكَ وتَزَحْلَقَ وتَزَحْلَكَ): خزاو خۆی خزاند/ پێخزمیکرد.

«تَزَحْلَقَ على الجَليدِ»): لەسەر سەهۆڵەکە خۆی خزاند/ پێخزمیکرد.

أَلزُحْلوقة والزُحلوكة): ماینچەقەڵ دارێکە درێـژ دەخرێته سـەر شـوێنێکی بـەرز بە مەرجێك دارەکە بجووڵێتو منداڵێك سواری سـەرێکی دارەکە دەبێتو یەکێکیتر سـواری سەرەکەیتر دەبێت جارێك ئەم بەرزدەبێتەوە جارێکیش ئەو.

زحـم: (زَحَمَ- هُ زَحْمـاً وزِحاماً): ١-تەنگی پێهەڵچنی/ تەنگەتاویکرد ٢-جێی پێلێژکرد/ لە شوێنێکی تەسکدا پاڵیپێوەنا.

(زاحَمَ- هُ): تەنگی پێهەڵچنی.

(-الخَمسينَ): تەمەنی نزیکی پەنجا بووەوە.

(تَزاحَـمَ وازدَحَـمَ- القَـومُ): ١-تەنگیان بە یەکهەڵچنـی ٢-پاڵەپەسـتۆیانکرد/ پاڵیـان بەیەکەوەنا/ جەنجاڵییانکرد.

(-الأَمواجُ): شەپۆلەکان بەیەکیاندادا.

(أَلزَحْـم) (مـص): قەڵەباڵغیـی/ چڕیـی خوێشـگەل/ بەیەکدادانـی خوێشـگەل/ جەنجاڵیی.

(أَلزَحْمَـة= أَلزِحـام): بەیەکداچـوون/ قەڵەباڵغیکردن/ جەنجاڵی/ چڕیی.

(يَومُ الزِحام): ڕۆژی حەشر/ ڕۆژی قیامەت/ ڕۆژی زیندووبوونەوە.

(أَلمِزحَـم): زۆر بەیەکداچوون/ زۆر چڕیی/ قەڵەباڵغییەکی زۆر.

٢-(زَحْمَرَ- القِربَةَ): کوندەکەی پڕکرد.

زحن: ١-(زَحَنَ. زَحْناً): خاوەخاویکرد/ خۆی خایاند/ سستیکرد.

(تَزَحَّنَ): سستیکردن/ خاوەخاویکرد/ خۆی خایاند.

(-على الشَـيءِ وعَنـهُ): بەنابەدڵیو بەزۆر کارەکەیکرد، کە حەزی لە کردنی نەدەکرد.

(أَلزَحْنَـةُ): ١ کاروان بـه بـارو بنـەوە هەیتوهوتیەوە ٢-گەرمایەکی تیژ.

(«لَهُـم زَحْنَـةٌ»): کارێکـی هێـواشو لەسەرخۆیانەیە.

٣-(تَزَحَّنَ): کرژبوو/ چووەیەك.

(رَجُـلٌ زُحَنٌ (م) زُحْنَـةٌ): پیاوێکە کورتو ورگن/ کرگن.

٣-(زَحَنَ- هُ عَنِ المَكانِ زَحْناً): لە شـوێنەکە دووریخستەوە.

(تَزَحَّـنَ- عَـن مَكانِـهِ): لـە شـوێنەکەی دوورکەوتەوە/ جوولا.

٤-(اَلزُخْنَةُ): پێچی دۆڵ.

زخ: (زَخَّ- بالإبل. زَخَّـاً): خێرا لێیخوڕین/ حوشـترەکانی ڕەفرانـد(-ەُ): ١-پاڵییپێوەنا ٢- خستیە کەندەڵانێکەوە.

(-الجمرُ. زَخّاً وزَخيخاً): پشکۆکە قلەقلیهات/ تیژ شەوقیدایەوە.

(«زَخَّ- المَطَـرُ») (عاميـة): بارانەکـە توند دایرشت/ تاوەبارانێك دایکرد.

(الزُخَّةُ) (ح): بەرخ.

(اَلزَخَّـةُ والمَزَخَّـةُ والمِزَخَّـةُ): ١-ژنی هەوێ ٢-تاوەبارانێکی توند(عامية).

٢-(زَخَّ- زَخّاً): زۆر تووڕە بوو.

(اَلزَخ) (مص): قینو ڕقو تووڕەیی.

(اَلزَخَّةُ): قینو ڕقو تووڕەیی.

زخـر: ١-(زَخَرَ- البَحـرُ زَخْـراً و زُخُوراً وتَزخاراً): دەریاکە هەستاو کەوتە شەپۆلدان/ لیورێژبوو و لیتەی بەملاولادا، دا.

(-الـوادي): ئـاوی دۆڵەکـە بەرزبـووەوە/ هەستا.

(-النَباتُ): گیاکە یان ڕووەکەکە باڵایکرد.

(-القَـومُ): بۆ بەرەنگاریی دوژمن یان جەنگ خرۆشان.

(-تِ الحَربُ أوِ القِدرُ): جەنگەکە گەرمبوو/ توندبوو/ مەنجەڵەکە هەڵچوو.

(-ە): ١-پڕیکـرد ٢-قەڵەویکرد ٣-ڕازاندیەوەو جوانیکرد.

(تَزَخَّرَ- البَحرُ أوِ الوادي): دەریاکە هەسـتا لێوانڕێژ بوو یان ئاوی دۆڵەکە بەرزبووەوە.

(اَلزاخِر) (فا): ١-بەخشـندە/ دەستواڵا ٢-پڕ ٣-لێوانلێو/ لێوڕێژ.

(-مِنَ الشَّرَفِ): شکۆباڵا/ ڕەسەنتەواو/ تەواو خانەدان.

(زَواخِرُ – الوادي): گژوگیای دۆڵ.

(اَلزَخّار): زۆر پڕ لێوانلێو.

(اَلزُخريُّ): زۆر بڵندو بەپەکداچوو.

(نَبـاتٌ زَخُورٌ وزَخْـوَرِيّ): ڕووەك یان گیای باڵاکردووی تێکئاڵاو.

(نَبـاتُ زُخـارِيٌّ): گژوگیـای یـان ڕووەکی باڵاکردووی تێکئاڵاو.

(زُخاريُّ النَباتِ): تەڕو ناسـکییو شـکۆفەی گژوگیای تێکئاڵاو گوڵکردوو.

(«قد أخَذَتِ الأرضُ زُخاريَّها»): زەوی سەوز بووەو خۆی نەخشاندووە بۆتە گوڵزار.

٢-(زَخَـرَ- بمـا عِنـدَهُ. زَخْـراً وزُخُـوراً وتَزخاراً): شانازیی بەوەوە کرد کە هەیبوو.

(زاخَرَ- ەُ): شەرەشانازیی لەگەڵدا کرد.

(زاخَـرَهُ فَزَخَـرَهُ): شەرەشـانازیی لەگەڵدا کردو بەزاندی.

(تَزَخْوَرَ- بما عِندَهُ): شـانازیی بەوەوە کرد کە هەیبوو.

(كَلامٌ زَخْوَرِيٌّ): قسەی قەبەو خۆبەزلزانینو هەڕەشە شێوە.

٣-(زَخَرَ- هُ. زَخْراً وزُخُوراً وتَزخاراً): شادو كەیفخۆشیکردو خستیە گۆرانی.

(ألزَاخِر): كەیفخۆش/ گوشاد.

٤-(زَخْرَفَ- هُ): رازاندیەوەو جوانیكرد.

(-الـكلامَ): قسـەكەی بـە فیشـاڵو درۆ رازاندەوە.

(تَزَخْـرَفَ- الرَجُـلُ): خـۆی رازانـدەوەو ڕێكخست.

(ألزُخْـرُف (ج) زَخارِف): ١-زێـڕ ٢-جوانیی شت ٣-نیگار.

(زُخْرُفُ الكَلام): فیشـاڵو درۆو دەلەسـەی هەڵخەڵەتێن/ پێرازێنراو.

(زُخْـرُفُ الأرضِ): ڕوومەكـی هەمەگـوڵو هەمەڕەنگەی زەوی.

(ألزَخارِف): ١-پاپۆر ٢-(ح) جۆرە مێروجەیەكە نیو باڵە وەك مێش بەسـەر ئاوەوە دەفڕێت/ ئاوڕۆشنكەرەوە.

(زَخارِفُ الماءِ): ڕێرەوەكانی ئاو.

زخف: (زَخَفَ. زَخْفاً وزَخیفاً): فیزینواند/ لووتبەرزیكرد.

(زَخَّفَ- في القَولِ): زۆربوت/ قسەی زۆركرد/ درێژدادڕیكرد.

(تَزَخَّفَ): خۆی ڕازاندەوەو ڕێكخست.

(ألمِزْخَف): شانازیكەری لووتبەرز.

زخم: ١-(زَخَم- هُ زَخْماً): توند پاڵیپێوەنا.

(إزدَخَمَ —الحِملَ): كۆڵەكەی یان بارەكەی بۆ هەڵگیرا.

(ألزَخْم) (عامية): هێزو توندی.

(ألزَّخیم) (عامية): بەهێزو توند/ بەزەبرو زەنگ.

٢-(زَخِمَ وأزخَمَ- اللَّحْمُ زَخماً): گۆشتەكە بۆ گەنبوو.

(زَخِم): بۆگەن.

(ألزَخَمَةُ): گۆشتی خراپبووی زۆر بۆگەن.

(ألزَخْماء): زۆر بۆگەنو بۆنناخۆش.

(ألزَخیم- مِنَ الرَّوائح) (عامية): بۆگەنێكی زۆر تیژو ناخۆش.

زدب: (ألزَدْب (ج) أزْداب): بەش/ بەركەوت.

زدر: ١-(زَدَرَ وأزدَرَ): دەرچـوو/ پەیدابـوو دەریكردو پەیداكرد.

(ألأزدَران): هەردوو سەرشان.

(«جـاءَ يَضـرِبُ أزدَرَیهِ»): هـاتو هەردو سەرشانی هەڵدەتەكان، واتە: بە دەستی بەتاڵ هاتەوە.

٢-(إزدَرَمَ): قوتیدا.

زدف: (أزْدَفَ- اللَّیـلُ): شـەوتاریكداهات/ تاریكبوو.

زدا: (زَدا- الصَبيُّ الجَوزَ وبالجَوزِ): منداڵەكە بە گوێـز چاڵچاڵێنیكرد/ گوێزەكەی هەڵدایە چاڵەكەوە.

(ألمِزداة والمِزداء): چاڵی چاڵچاڵێن.

(أزدی إزداءً): چاكەیەكیكرد.

زرّ: ١-(زَرَّ- القَميـصَ زَرّاً): قۆپچەكانـی كراسەكەی داخست/ كردنی بە كونەكانیاندا.
(-الشيءَ): شتەكەی كۆكردەوەو بەستی.
(-عَينَهُ): چاوی هێنايەوە يەك.
(-هُ): هێندەی لەگەڵدا وتو سەريكردە سەری تا تووڕەيكرد (عامية).
زُرَّ- (الرجُـلُ زَرّاً): قۆپچەكەی/ دوگمەكەی قايمكرد.
(زَرَّرَ- ثوبَهُ): ١-قۆپچەكانی داخست/ دوگمەی كراسـەكەی توندكرد ٢-(قۆپچەی/ دوگمەی) لە جلەكەدا.
(أزَرَّ- القَميصَ): قۆپچەی لە كراسەكەدا.
(تَزَرَّرَ- القميصُ): ١-كراسەكە قۆپچەدار بوو/ قۆپچەی لێنرا ٢-قۆپچەكانی داخرا.
(اَلـزِرّ (ج) أزرار وزُرُور): ١-قۆپچـە/ دوگمە ٢-دار يـان تەختەيەكـی دەوار ٣-(ع ا) چاڵی تێداگەڕانـی سـەری ئێسـكی شـان ٤-(ع ا) تۆپی ئێسـقانی كولۆت كە لە چاڵی ئێسقانی كولۆتـدا دەگەڕێت دوانن پێياندەڵێن (زرّان)، واتـا دووتۆپـی ئێسـقانی كولـۆت ٥-( ع ا): ئێسـقانۆچكەيەكە لە ژێـر دڵدايە ٦-(مص) بەرزەيەكە لە دواوەی سنوقی كەمانەكەدايە.
(زِرّ- الشـيءِ): مايەی هەستانی ئەو شتە يان كردنی.
(«هُوَ زِرُّ مالٍ»): ئەو خەمڵێنەری سامانە.
(«جاءَ فُلانٌ بِزِرِّه»): فيسار كەس خۆی هات.
(أعطاهُ الشيءَ بِزِرِّه») سەرتاپای شتەكەيدايە/ شتەكەی گشتدايە.
(اَلـزُرارَة): هـەر شـتێك كـە بـە ديواريدا بكێشيتو پێوەی چەسپببێت/ بلكێت.
٢-(زَرَّ- المَتاعَ. زَرّاً): كەلوپەلەكەی هەڵتەكان/ ڕاوەشاند.
(-الشَعرَ): تووكەكەی هەڵكێشا.
(- الرَجُلَ): كابرای دەركرد.
٣-(زَرَّ- الرَجُلَ): پياوەكەی گەست.
(-هُ بالرمْح): نێزەی پێداكرد.
(-الرَجُـلُ. زَرّاً): دەسـتدرێژيی كردە سـەر نەيارەكەی.
(زِرُّ السَّيفِ): تيژيی دەمی شمشێرەكە.
(الزَرَّة): ١-گەستن ٢-برينێكی دەمی شمشێر.
(الزِرَّةُ): شوێنگەستن.
(حِمارٌ مِزَرّ): كەری گازگر.
(اَلـزارَّة) (ح): مێشـەكەرانە كـە بـە كەرو حشوترو ئەوانەوە دەنيشێتەوە.
٤-(زَرَّ- الرَجُـلُ زَرّاً): كارامەيـیو ئـاوەزو ژيريیو ئەزموونی پتر بوو.
(الزِرَّةُ): ئاوەز/ ئەقڵ/ ژيريی.
٥-(زَرَّ- سِـنانُ الرمحِ زَريراً): سەری نێزەكە بريسكايەوە.
-تِ العَينُ: چاوەكە سوورهەڵگەڕا/ گرپگرت.
(اَلـزُرّار والزَريـر): زيـرەكو چابـوك/ سووكەڵە.

٦-(زَرْزَرَ- الزُرزُورُ):ريشۆڵەكە جريواندی.

(-الرَجُلُ):هەر خەريكی ريشۆڵەخواردنبو.

(-بالمَكان):لە شوێنەكەدا نيشتەجێبوو.

(أَلزُرْزور والزُرْزُر (ج) زرازير وزَرازِر) (ح): ريشـۆڵە. هەيانە رەشن هەيشـيانە كونجن/ رەشنو خاڵی سپييان هەيە.

(ألزُروريّ):رەنگريشۆڵەيی.

٧-(تَزَرْزَرَ):بزوا/ جووڵا.

(أَلزَرْزار (ج) زَرازِرة والزُرازِر) (فارسـية): زرنگێكی چابوك/ سووكەڵە.

زرأ: (إزْرَأَمّ وازرامّ كَلامُـــهُ أَو دَمُّـــهُ أَو بَولُهُ. إزرئمامــاً وإزريمامــا):قسـەكەی بـڕا يان خوێنەكەی بڕا يان ميزەكەی براو نەهات.

زرب: (زَرَبَ- المَواشِـيَ. زَرْبـاً)ئاژەڵەكـەی كردە گەوڕەكەوە/ پشتيرەكەوە.

(-لِلغَنَم):گەوڕێكی بۆ مەڕەكان دروستكرد.

(إنْزَرَبَ):چووە گەوڕەكەوە.

(أَلــزَرْب) (مــص)١-دەرگای گـــەوڕ ٢-بنەی ڕاوكەر.

(أَلزَرْب والزِرْب (ج) زُرُوب)پشــتير/ گەوڕ/ تەويلە/ كۆز.

(أَلــزارُوب) (عنــد العامة)كۆڵانــی دوورو درێژو تەسك.

(وفَصيحُهُ: أَلزَقَب) (آرامية) كۆڵانی دوورو درێژو تەسك.

(أَلزَريبَــة (ج) زِراب وزَرائِــب):١-گـــەوڕ/ تەويلــە/ كۆزی ئــاژەڵو وڵاخ ٢-لانەی شــێر ٣-بنەی ڕاوكەر/ ڕاوچی.

٢-(إزْرَبَّ- النَّبــاتُ)١-گياكــە يان ڕووەكەكە زەرد بوو ٢-سوورهەڵگەڕاو سەوزيی تێدابوو/ پێوەمابوو.

(أَلزُربِــيُّ (ج) زرابِــيّ):فــەرشو ڕايــەخو پشتی.

(-مِــنَ النَبات):ڕووەكــی زەردهەڵگەڕاو يان سوورهەڵگەڕاوو سەوزيی پێوەمابێت.

(أَلزَرْبِيَّــة (ج) زَرابِيّ):١-ڕايەخو پاڵپشــتی ٢-كەســانێكن كــە چوونــە لای كاربەدەســت هەرچــی وت بــە چــاكو خراپــەوە هەر لە ئەســتۆی بۆ بدەن بە گژوگيای ڕەنگاورەگيان چواندوون (فارسية)

(أَلزَرْبِيَــة- مِنَ النَبــتِ):ڕووەكی زەرد يان ســوورهەڵگەڕاو كــە هێشــتا ســەوزيی پێوە مابێت.

٣-(زَرِبَ- المَاءُ. زَرَباً)ئاوەكە كشــا/ ڕۆيشت/ ئاوەڕۆبوو.

(أَلزِرب)ئێراب/ ئاوەڕۆ.

(أَلمِزراب (ج) مَزاريب= الميزاب)بلووسك.

زرج: (أَلمُــزَرَّج)ئەمســتو كەيفخــۆش. لــە (زَرَجون)ەوە وەرگيراوە. واتا مەی.

٢-(زَرجَنَ- هُ)لە خشتەيبرد/ فێڵيلێكرد.

(-القَــومُ):خوێشــكەل بەيەك شــتەكانيان فرۆشتو وازيان بۆ يەك لێهێنا.

(اَلزَرْجون الواحِدَةُ زَرجونة):١-پەلی مێو ٢-بویەی سوور ٣-مەی؛ (فارسية)

زرح: (زَرِحَ. زَرَحـاً):لـە شـوێنێکەوە بـۆ شوێنێکیتر گوریزیکرد.

(اَلزارح (فا) (ج) زُرّاح):گورجوگۆڵ.

(اَلزَروح والزَرْوحَة (ج) زَراوِح):گردۆڵکە.

(اَلمَزرِح):زەویی نزم/ نەویو.

زرد: زَرَدَ- هُ زَرْداً:خنکاندی.

(«زَرَدَ عَينَهُ علـى صاحِبِهِ»):لە ڕقاندا بە چـاو هاوڕێکەی قووتدا/ ڕقی لێهەڵسـتاو لێی گرژ بوو.

(زَرِدَ وزَرَدً وازدَرَدَ- اللُقمَـةَ زَرداً):خێـرا پاروومەکەی قووتدا/ لرفیدا.

(«تَـزَرَّدَ اليَمـينَ»):بێگوێدانـە گوناه بە بندەستی سوێندەوە نووسا/ سوێندیخوارد.

(اَلـزَرد):خـۆش و خێـرا قووتـدەر/ خێرا هەڵلووش و لرفێدەر.

(اَلزَرْدَةُ):جارە خواردنێك.

(اَلـزراد والمِـزرَد):پەتێکە لە ملی حوشـتر گیردەکرێـت بـۆ ئـەوەی کاوێژکـەی دەمی خاوەنەکەی پیسنەکات.

(اَلزَرّاد):خنکێنەر.

(اَلمَزرَد):گەروو و سووریێچك.

(اَلمُزدَرَد (مفع):قووتدراو.

(«اَخذَهُ بِمُزدَرَدِهِ»)دەستی نایە بینەقاقەی/ تەنگی پێهەڵچنی.

٢-(زَرَدَ- الدِرْعَ. زَرْداً):زرێکەی چنی.

(-اَلعُقْـدَةَ) (عاميـة):گرێکـەی تـەواو وا شەکەتدا کە نەکرێتەوە (عامية).

(اَلزَرَد (ج) زُرُد):زرێی قوڵفەبەیەکداچوو.

(حِمـارُ الزَرَد) (ح):کەرە کێویی کە لەشـی میلدارە.

(اَلزَرّاد):زرێچن/ زرێکەر.

(اَلزِرادة):زرێکەریی.

٣-(زَرْدَبَ وزَرْدَمَ- هُ):خنکاندی.

(-الطَعامَ):خواردنەکەی قووتدا.

(اَلزَردَمَة= الغَلْصَمَة):قورقوراگە.

زرط: (زَرَطَ- اللُقْمَـةَ. زَرْطـاً):پاروومەکەی قووتدا.

(زَلَطَ= زَرَطَ)

(عامية):

زرع: ١-(زَرَعَ. زَرْعاً):تۆویچەند/ کشتوکاڵیکرد.

(-الأَرضَ): ١-تـۆوی بەزەوییەکـەوە کـرد ٢-زەوییەکـەی بە کشـتوکاڵکرد ٣-زەویەکەی کێڵا.

(-اللهُ النَّبـاتَ):خـودا کشـتەکەی ڕوانـدو گەورەیکرد.

(«زُرِعَ لَـهُ بَعْدَ شـقاوَةٍ»):خوداوەند پاش هەژاریی و ڕەزەڵخوایی فەڕو سامانی بەسەردا باراند.

(زارَعَ. مُزارَعَـةً)١-کشـتوکاڵیکرد ٢-تـۆوی چاند.

(-فُلاناً): بە نیوەکاریی کشتەکەی بۆ فیسار کرد بە مەرجێك تۆو لەسەر خاوەنزەوی بێت.
(أَزرَعَ- الزَرعُ): کشتەکە دووپەلە بوو بالآیکرد. ٢-هاتەبەرو کاتی دروێنەیهات.
(-القَومُ): توانیان‌و دەسەلاتیانبوو کشتوکاڵ بکەن.
(إزْدَرَعَ- الرَجُلُ): کابرا کشتوکاڵیکرد.
(-الأَرضَ): زەوییەکەی چاندو کردی بە کشت.
(اَلزارع (ج) زارعون وزُرّاع): (فا): جوتیار/ کشتکار.
(اَلزَرع (مص) (ج) زُروع= المَزروع): ١-کشتوکاڵ/ روێنراو/ چێنراو ٢-فرزەند/ زارۆڵە.
(اَلزُرعَةُ): تۆو/ توخم/ تۆمە.
(اَلزُرعَةُ والزَرعَةُ والزِرعَةُ والزَرَعَةُ): دێمەر/ شوێنێك بە کشتوکاڵ بکرێت.
(«ماقِي هذه الأَرضِ زُرعَةٌ»): لەم خاکەدا شوێنێکی تێدا نییە بە کەڵکی کشتوکاڵبێت.
(اَلزِراعَة): ١-کشتوکاڵکردن. پیشەی جوتیاری/ کشتکاریی وەرزێری.
(اَلزَرّاع (ج) زَرّاعون وزَرّاعَة): کشتیاری چابوك کە کشتوکاڵی زۆر بکات ٢-قسەچن‌و دوو زمان/ ئاشووبگێر وەك قین لە دڵدا بچێنێت.

(اَلزَرّاعَة (ج) زَرّاعات): ١-مێی وشەی (اَلزَرّاع): ٢-شوێنی کشتوکاڵکردن.
(اَلزَريع): کشتی دێمی/ کشتی بەرباران.
(اَلزَريعَة): ١-شتی چێنراو/ روێنراو ٢-زەویی چێنراو/ بە کشتکراو.
(اَلزِرِّيع): ئەو تۆوەی لە دروێنەدا دەوەرێت‌و دەروێتەوە.
(اَلمَزْرَعَة والمَزْرُعَة (ج) مَزارِع): کێڵگە.
اَلمُزدَرَع): کێڵگە/ کشتگە.
٢-(تَـزَرَّعَ- إلى الشَـرِّ): هەڵپەوپەلەی خراپەکاریکرد.
٣-(اَلزارِع) (ح): ناوی سەگە.
(أَولادُ زارِع): وەچەی سەگ.
زرف: ١-(زَرَفَ- إلَيهِ زُرُوفاً وزَرِيفاً): ١-لێینزیکبووەوە ٢-پەلەیکرد ٣-سستیکرد (ضد).
(زَرَّفَ- الرمحَ فيه): نێزەکەی پێچەقاند.
(أَزرَفَ): ١-پێشکەوت ٢-لە هەلآتن‌و شکستیدا تیژو خێرا تێیتەقان/ هەلآت.
(-الناقَةَ): مێحوشترەکەی هانداو پەلەی رۆیشتنی لێکرد.
(إنْزَرَفَ- القَومُ): بۆ حەوانەوەو خۆشیی رۆیشتن.
(-تِ الريحُ): باکە تێپەری/ رابورد.
(الشَيءُ): شتەکە تەواو بوو/ برایەوە.
(اَلـزُرُوف والزَروَف والمِزراف- مِنَ النوق):

مێحوشتری خێرا/ گورج/ چابوك.

٢-(زَرَفَ. زَرْفاً): بازیدەدا.

(-في الـكَلامِ): درێژەی بە قسـەكەداو درۆی پێوە هەڵبەست.

(زَرَّفَ- الشَّيءَ): شـتەكەی زۆر كرد/ هیتری خستە سەر شتەكە.

(-في الكَلامِ): هیتری بە قسـەكەوە ناو درۆی خستەسەر.

(«زَرَّفَ- في السـتين»): لـە شەسـت زۆرتر بوو.

(اَلزُرافَة): درۆزن.

٣-(زَرِفَ- الجـرحُ. زَرَفـاً): برینەكـە پاش خۆگرتنی هەڵیدایەوەو خراپتر بوو.

(أَزْرَفَ- الجـرحُ): برینەكـە پاش خۆگرتنی هەڵیدایەوەو خراپتر بوو.

(اَلزَرّافَـة والزَرافَـة (ج) زَرّافات وزَرافات): ترومپای ئاو.

٤-(زَرَّفَ)- هُ: كەنارگیریكردو دووریخستەوە.

(-القَومَ): خوێشـكەلی كرد بە دەستەدەستو جیایكردنەوە.

(اَلزَرافَـة والزَرّافَـة (ج) زَرافات): دەسـتە خەڵكێك لە دە كەسەوە تا بیست كەس بێن.

(«طـارو إِلَيـهِ زُرافـات ووحدانــا»): دەستەدەستەو تاكەتاكە بۆی چوون.

٥-(أَزْرَفَ- الرَجُلُ): پیاوەكە وشتر بەڵەكێكی كڕی.

(اَلزُرافَـة والزَرافَة والزَرّافَـة والزُرَّفَة (ج) زَرافِيّ وزَرافى وزَرائِف) (ح): وشـتر بەڵەك زیندەوەرێكـە سـەدار هێندەی حوشـترێكە كاوێژكـەرە قاچەكانـی كورتو دەسـتەكانی درێژن پێستەكەی بەڵەكە وەك هی پڵنگ ملی وەك ملی ئەسپە، بەڵام درێژترو ڕاسترەو دوو شاخی بچوكیشی هەیە.

٦-(زَرْفَنَ- شَعَرَهُ): قژەكەی هەڵپێچكرد.

(زُرفين (ج) اَلزَرافين (فارسـية): هەڵپێچی ورد.

زرق: ١-(زَرَقَ- الطائِـرُ زَرْقاً): پەلەوەرەكە/ باڵندەكە جیقنە/ ڕیقنەیكرد/ بەردایەوە.

(اَلزَرّاقَة): پەمپی ناوپرژێن یان هی دەرمانی مێشو مەگەز.

٢-(زَرَقَ- الطائِـرَ. زَرْقاً): نێزەیەكی كورتی گرتە باڵندەكە.

(«زَرَقَ النَجمُ») (عامية): ئەستێرەكەكشـا (سريانية).

(إِنْزَرَقَ- السَّـهمُ): تیرەكە تێچەقی/ چوو بە ناودا.

(اَلمِزراق (ج) مَزاريق): كورتەنێزە.

٣-(زَرَقَ- ت عَينهُ نَحوي زَرْقاً): ڕووی چاوی وا كـردە من تا سـپێنەی چـاوی دەركەوت/ چاوی لێ زەقكردمەوە.

(-الرَجُلَ بِبَصَرِهِ): چاوی بڕییە پیاوەكە.

(زَرِقَ- الرَجُلُ. زَرَقاً): كابرا كوێر بوو.

(أَزرَقَ-ت عَينــهُ نَحوي): تيلــەی تێکردمو سپێتی چاوی دەرکەوت.

(إِزْرَقَ وازْراقَّ-ت عَينُــهُ نَحــوي. إزرِقاقــاً وازريقاقــاً): ڕووی چــاوی وا کــردە مــن تا سپێنەی چاوی دەرکەوت.

(أَلــزُرَّق): ١-چاوتیــژ ٢-ســپێتی ناوچەوانی ئەسپ/ ئەسپەکە ناوچەوان مارۆیە.

(-(ج) زَرارِق) (ح): باڵەندەیەکی گۆشتخۆرە هەڵۆی سپی لە نێوان بازو واشەدایە.

(ألأَزرَق): باز.

-(زَرْقاءُ اليَمامَة): ئافرەتێکی چاوتیژ بووە بە نموونە ناویان هێناوە.

٤-(زَرَقَ-تِ الناقَةُ الرَحلَ زَرْقاً): مێحوشترەکە کورتانەکەی بە پاشدا خست.

(أَزرَقَ-تِ الناقَةُ حَمْلَها): بارەکەی بە پاشــدا خست.

(إِنْزَرَقَ)١-بەدوادا خزا ٢-لەســەر گازپیشــت درێژبوو/ ڕاکشا.

(ألِــزراق (ج) مَزاريــق مِــنَ الأَباعِــر): مێحوشــترانێك كــە بارەكانیــان بە پشــتدا دەخەن.

٥-(زَرِقَ-ت عَينُهُ زَرَقاً): چاوی شینبوو.

(-الشيءُ): شتەکە ڕەنگشینبوو.

(إِزرَقَّ وازراقَ. إِزْرِقاقاً إِزْرِيقاقاً): شینبوو.

(ألزَرَق والزُرقَة): ڕەنگی شینی ئاسمانی.

(ألزُرقَة): مووروە شــینکەی ئەفسووناوی کە گوایا خەڵك بەکێشەدەکات.

(ألزُرَيق وأَبو زُرَيق) (ح): بۆرەك. باڵندەیەکە لە چۆلەکە گەورەترە.

(ألأَزرَق (م) زَرقــاء (ج) زُرْق): شــینرەنگ/ کەوە/ خومی.

(عَدُوّ أَزرَق): دوژمنێکی شین/ دوژمنێکی قین لە دڵی سەرســەخت/ دوژنمنــی خوێنەخوێ (چاوی شــین لەنــاو ڕۆمو دێلەمەکاندا زۆربە بــوو/ دوژمنایەتییەکــی قــورس لــە نێوان عــەرەب و ئەواندا هەبوو/ لەبەر ئەوە هەموو دوژمنێکی سەرســەختیان بە دوژمنی شــین ناوناوە. ســەرنجێکی ســەیر: لای ئێمەش وا وتراوە چاو شینەکان توێشودزی پێغەمبەرن.

(نَصــلٌ أَزرَق): دەمــی تیغی زۆر ســاف یان نووکی تیری زۆر ساف.

(ماءٌ أَزرَق): ئاوی ڕوونی شین.

(ألزُرْق): بە دەمی تیغو سەری نێزە دەوترێت کە زۆر سافو بریقەدارە.

(ألأَزارِقَــة): تیپێکی خەوارج بوون ســەر بە ( نافــع بــن الأَزرَق) بون کــە ڕێیاندا ئەوەی لەگەڵیاندا نەگونجاوبێت بکوژرێت و ژنەکانیان بە تالان ببرێت.

(ألزَرقــاء (ج) زُرْق):١-مێی وشــەی (أَزرَق) شین ٢-ئاسمان ٢-مەی.

(ألزُرَيقاء) (ج):گیاندارێکە لە سیفید دەچێت بەڵام لەشــی درێژتــرەو پەلەکانــی کورتترە

٤- (ط)تریتی ماستو رۆنیشل.

٦-(أَلزُرْقُـم (ج) أَلزَراقِـم)شـینی تێر (بۆ نێرو مێ).

(أَلزَراقِم) (ح)مارەکان.

زرك: (زَرِكَ. زَرَكاً)بەدرەشوتبوو/ بەدخوو بوو رەشە خەڵكەكە دەڵێن (زَرَكَه)واتا تەنگی پێهەڵچنی (سريانية)

الملحق

زَرْكَش (زَرْكَـش)بەتاڵی زیوین بەرگەكەی تێهەڵكێشكرد یـان بەتاڵـی شـتیتر. یـان رەنگیكــردو نیگارچنیكرد تاڵی رەنگینی تێدا چنیو تێهەڵكێشكرد.

---

زَرْكَش الثوبَ:بەرگەكەی رەنگینكرد.

زرم: ١-(زَرَمَ- هُ. زَرْماً)بڕی.

(«زَرَمَت بِهِ أُمُّهُ»)دایكی مندالەكەیبوو.

(زَرِمَ- الشَيءُ. زَرَماً)شتەكە بڕرا/ پچڕا.

(زَرَّمَ- هُ وأَزرَمَ- هُ): قرتانــدی/ بــڕی/ پچڕاندی.

(«زَرَّمَهُ الدَّهرُ»)رۆژگار خێری لێبڕی.

(أَلأَزرَم):١-بـڕراو/ پچـڕاو/ قرتـاو ٢-(ح) پشیلە/ كتك.

(أَلزَرِم)١-سەرشـۆڕو كەساس ٢-كەمخوێنو بێپشتیوان ٣-ڕژد ٤-تەنگەتاوكراو.

(أَلزَريم)١-سەرشۆڕوكەســاس ٢-بێپشتیوانو بێكەس.

٢-(إِزْرَأَمَّ)١-كرژبوو ٢-تووڕە بوو.

٣-(إِزدَرَمَ- هُ)قووتیدا.

زرن: (أَلزَرنَب) (ح)گاكێوی.

٢-(أَلزَرنیـخ) (ك) (یونانیـة): زەرنیـخ مەرگەموش: تەنێكی سـادەی بریسـكەدارەو خۆڵەمێشـییە ئاسـان ورد دەكرێـت ئەگەر لەگەڵ گەچدا تێكەڵكرێت تووك هەڵدەگرێت ئاوێتەكانی زەهرێكی كوشندەیە لە پزیشكیدا بەكاردەهێنرێتو بۆ قەلاچۆكردنی زیندەوەرە زیانبەخشەكان بەكاردێت وەك مشكو هیتر.

٣-(زَرْنَقَ- فُلاناً اللبـاسَ زَرنَقَةً):جلەكەی لەبەر قیساركرد.

(تَزَرْنَـقَ- بالثِيـاب):جلەكـەی لەبەركردو خۆی پێداپۆشی.

٤-(زَرنَــقَ- الأَرضَ. زَرنَقَــةً)بە ئاوی چەم زەویەكەی ئاودا.

(زَرنَـقَ):بــە مەسـینەكە ئاویخـواردەوەو ئاوەكەی هەڵنەمژی (عامیة)

(تَزَرْنَـقَ- الرجُـلُ):لە چەمەكـە بە پارە ئاویكێشا.

(أَلزُرْنُوق):چەم.

٥-(تَزَرنَقَ):بە سەلەم كڕی/ سەلەمیكرد.

(أَلزَرنَقَة= العينَة)سەلەمكردن/ سەلەم.

(بَيــعُ العينة)بەســەلەم فرۆشــتن ئەوەیە شتێك بفرۆشرێت پارەكەی دوابخرێتو پارەی ئەو دواخستنەی بخرێتە سەر ٢-زیادە/ پتر.

٦-(أَلزَرْنَقَةُ)جوانیی تەواو.

(اَلزرنيق) (ك)= الزرنيخ: زەرنیخ.

زرى: (زَرَى وتَزَرَّى- عليه عَمَلَه. زَرْياً و زُرِياً و زَرايَةً ومَزْرِيَةً ومَـزارَةً): گلەیی کارەکەی لێکردو خەوشی لە کارەکەیگرت.

(زارا- هُ مُزاراةً): گلەیی لێکرد.

(أزرى- بالأمـرِ): بەتەنگ کارەکەوە نەهاتو ساردی تێداکرد.

(أزرى- بـهِ وأزرا- هُ): خەوشـی لێگرتو لە مافەکەی بری.

(-عَلَيهِ عَمَلَهُ): خەوشـی لـە کارەکە گرتو گلەیی لێکرد.

(إزدَرى واسْتَزرى-هُ): بە سووک تەماشایکردو گاڵتەی پێکرد.

(اَلزَرِيّ): ناشیرینی ڕەزاتاڵی ڕسوا کە کەس بە هیچی نازانێت.

(اَلمِـزراء): کەسـێکە کـە بە چاوی سـووک تەماشای خەڵک بکاتو گاڵتەیان پێبکات.

زطّ: (زَطَّ- الذُبـابُ زَطـاً): مێشـەکە وزەوزێکرد/ وزەیهات.

زعّ: (زَعْزَعَ- ه. زَعْزَعَةً): بنکەندیکرد/ توند هێنایو بردی.

(-الإبِلَ فِي السَّـيرِ): تەکانی بە حوشترەکەداو هانیدا خێرا بڕوات.

(تَزَعْزَعَ): کەوتە جووڵەو لەقەلەق.

(اَلزَعْزَعَـةُ (ج) زَعازِع) (مـص): جووڵەو لەقەلەقکردن/ بنکەندبوون.

(اَلزَّعازِع): وەیو گرفتاریی ڕۆژگار.

(ريـحٌ زَعْـزَعٌ وزُعْـزُعٌ وزَعْـزاعٌ وزَعازِعُ وزَعْزَعـانٌ): بایەکی تونـدی وا لەقەلەق بە شت بکاتو بنکەندیبکات.

(جَرْيٌ زَعْزَعٌ): ڕۆیشتنێکی (توند/ بەگوڕ).

زعـب: ١-(زَعَـبَ- الإناءَ زَعْبـاً): قاپەکەی پڕکرد.

(-القِربَةَ): هیزەکەی بە پڕی هەڵگرتو بۆی هەڵگیرا.

(-تِ القِربَـةُ): هیزەکـە ئاوەکـەی (دەردا/ دەرکرد).

(-السَـيلُ): لێشـاوەکە ڕژایـە دۆڵەکـەوەو پڕیکرد.

(-الوادي): دۆڵەکە پڕبوو.

(تَزَعَّـبَ فِي أَكْلِهِ أَو شُـربِهِ): زۆریخوارد یان خواردەوە.

(سَـيلٌ زاعِبٌ وزَعُـوبٌ): لێشـاوی پڕکەری دۆڵو دەرە.

٢-(زَعَبَ- الشَـيءَ. زَعباً): شـتەکەی بڕی/ لەتکرد.

(-لَهُ مِنَ المالِ. زَعْباً وزَعْبَةً وزُعْبَةً): بڕێکی دارایەکەی بۆ بڕییەوەو دایە.

(تَزَعَّبَ- القَومُ المالَ): دارایەکەیان/ سامانەکەیان بەشکرد.

(إزدَعَبَ- الشـيءَ): پارچەیەکی لە شـتەکە کردەوە.

(اَلزَغْبَةُ والزُغْبَةُ والزغْبُ): برێك/ كوتێك/ پارچەیەكی دڕاكە/ ماڵەكە.

٣-(زَغَــبَ- الغَرابُ زَغيباً): قەلەڕەشــكەكە قیراندی.

٤-(تزَغَّبَ): ڕقیهەستا.

٥-(تَزَغَّبَ): چابوكبوو/ گورجوگۆڵبوو.

٦-(الأزْغَــب (م) زَغْبــاء (ج) زُغْــب): ١-مرۆڤی ڕەقو قســەناخۆش/ قســەنەكوڵۆك ٢-كورتەبنەی زمانبەد/ قسەچن.

(اَلزُغْبُوب): كورتەبنەی زمانبەد/ قسەچن.

٧-(زَغْبَقَ- القَومَ): خوێشكەلی پەرتپەرتكرد لێكیكردن.

(-الشَــيءَ): شــتەكەی پەرش‌و بلاوكردەوە/ لەبەردیدا.

(تَزَغْبَــقَ- الشَــيءُ مِــن يَدي): شــتەكە بە دەستمەوە هەڵوەری‌و پەرش‌و بلاوبووەوە.

٨-(زَغْبَلَ): لەشــی قەڵەوو نەســتوور و ملی باریكبوو.

(اَلزَغْبــل (ج) زَعابِــل): ١-ورگنــی ملباریك ٢-(ح) مار ٣-دولكە/ سەتڵ ٤-(ح)خۆرپەرست/ تیرتیرە.

زغج: ١-(زَغَجَ- هُ): وەڕسیكرد/ بێزاریكرد/ جەرگاوســیكرد/ بۆڕۆیكردو لە شــوێنەكەی دەرپەڕاند ٢-دەریكرد.

(أزْغَــجَ- هُ): ١-بێزاریكــردو لــە شــوێنەكەی دەریفرتاند ٢-دەریكرد/ پەستیكرد/ وەڕسیكرد.

(-هُ إلى المَعْصِيَةِ):بۆ خراپەو لە خودایاخیبوون بەكێشیكرد.

(إنزعَجَ): دڵخوردو/ بێزارو بێتابوشتبوو ٢-لە وڵات‌و شوێنەكەی هەڵكەنراو ڕۆیشت.

(اَلزَعَج)دڵخوردیی/نائارامیی/دڵنەسرەوتیی/ بێتابوشتیی ٢-وەڕسیی/ بێزاریی.

(اَلزعاج): ئافرەتێــك ماخۆلانیگرتبێت‌و لە هیچ شوێنێك ستارەی نەبێت/ وەڕس/ بێزار.

٢-(زَعَــجَ- الرَجُــل. زَعْجــاً): هاواریكــرد/ بانگیكرد.

زعــر: ١-(زَعِــرَ وازْعَــرَّ وازْعارَّ- شَــعْرُهُ أو ريشُهُ. زَعَراً): قژی یان تووكەكەی هەڵوەری‌و كەمبووو جێ جێبوو تا پێستەكەی دەركەوت.

(-الرَجُلُ): قەری كەمبوو.

(اَلزَعِر والأزْعَر): كەم توك‌و جێ جێ بوو.

(مَوضِــعٌ زَعِرٌ وأزْعَرُ (م) زَعِــرَةٌ وزَعراء): شوێنێكی كەمگیا/ كەمڕووەك.

(اَلزُعْرُور) (ن): گۆیژ.

زُعْرورَة (ن) گۆیژێــك. درەختێكی بەردارە لــە ناوچەی دەریای ســپی ناوەندیــدا زۆرە. بەرەكەی ســوورە یــان زەردە. تۆوێكی ڕەقی هەیــە شــوێنی زۆری بەرەكــەی دەگرێــت‌و كاكڵەكەی كەمدەبێت.

(اَلزَعْرور الجَرْمانيّ أَو البُســتانِيّ): گۆیژی باخیی. (ن) درەختێكــە دەروێنرێت بەردارە لــە وڵاتــە فێنــك‌و ســاردەكاندا دەروێنرێت

بەرەكەی لە سـێوێكی بچووك دەچێت. پاش تـەواو پێگەیشـتنی دەخورێـت دارەكە كەم بـڵاوەو بەرامبـەر ئافاتـی درەخـت قایمەو بەرگەی گۆڕانی كەش دەگرێت.

(رَجُـلٌ زُعْـرُور (ج) زَعارِيـر): پیـاوی بەدرەوشتو بێفەڕ یان كەمفەڕ وەك گۆیژ.

٢-(اَلزُعْرَةُ) (ح): كلكەلەسەنگێنە.

(اَلأَزْعَـر (م) زَعِـرَةٌ وزَعـراء (ج) زُعْـر وزُعْران): گیرفانبڕ/ دزی شتفڕێن.

(اَلزُعْران): ڕووداوەكان/ قەوماوەكان.

(اَلزَعـارَة والزَعـارَّة): دڕ سروشـتیی/ سەرسەرێتیی/ شڕودڕیی.

(«أهل الزَعارَة»): سەرسەریی‌و خوێڕیی كە بێكارانە دەسووڕێنەوەو هەوەسبازییدەكەن.

(اَلزَعارِيـر): خلێنكـە. ڕیخـە بـە خوریی مەرەكەوە دەنوسێت‌و وشكدەبێتەوە.

زعـط: (زَعَـطَ- هُ. زَعْطـاً): خنكانـدی، تاساندی.

(مَوتٌ زاعِط): مردنێكی كوتوپڕ.

زعـف: ١-(زَعَفَ- هُ زَعْفاً): هەر لە شـوێنی خۆیدا دەسبەجێ كوشتی.

(-الجَريحَ): هەڵیكوتایە سـەر بریندارەكەو كوشتی.

(إزْدَعَفَ- هُ): لە شـوێنی خۆیدا دەستبەجێ هەڵیكوتایە سەری‌و كوشتی.

(-علـى الجَريـح): هەڵكیوتایـە سـەر بریندارەكەو كوشتی.

(سُـمٌّ زُعاف): ژەهرێكە دەسـتبەجێ مرۆڤ دەكوژێـت/ ژەهری هەلاهەل یان هەلایل واتە شوێنی مەرگ.

(اَلزُعُوف): مەرگەگا.

(مَوتٌ مُزعِف): مردنی دەستبەجێ/ لەناكاو.

(سَيفٌ مُزعِف): شمشێری كوشندە.

٢-(زَعِفَ- الحَديثَ. زَعْفاً): فیشاڵ‌و درۆی بە قسەكەوە ناو درێژەی پێدا.

٣-(زَعْفَرَ- هُ): بە زەعفەران ڕەنگیكرد.

(-الطَعامَ): زەعفەرانی كردە خواردنەكەوە.

(تَزَعْفَـرَ): بـە زەعفەران بۆنی خۆشـكردو ڕەنگكرد.

(اَلزَعْفَران) (ن): ڕووەكێكی پیازییە گوڵەكەی سـوور یان زۆری زەردە بۆ خۆشكردنی بۆن‌و زەردكردنی شلە یان شیرینییەكان بەكاردێت.

(زَعْفَرانُ الحَديدِ): ژەنگی ئاسن.

٤-(اَلزُعافِـق (ج) زَعافِـق): ١-چرووك/ ڕژد ٢-بەدرەوشت/ بەدخوو.

زعق: ١-(زَعَقَ): زیقاندی/ قیژاندی.

(-بالدَّابَّة): بەسـەر چوارپێكاندا گرماندی/ قیژاندی‌و دانیە پێشخۆی/ لێیخوڕین.

(اَلزَعْقَـةُ): گرمـە/ زیقە/ قیـژە/ دەنگ‌و هاوارلێكردن/ قیرە بەسەرداكردن.

(اَلزَعَّاق): كەسـێك كە دەنگ لە وڵاخ بكات‌و لێیخوڕێت، دەریانبكات.

٢-(زَعَقَ- هُ وبِهِ. زَعْقاً): تۆقاندی.
(زَعِــقَ وزُعِــقَ وانْزَعَقَ- الرَجُــلُ. زَعَقاً): بە شەو تۆقییو ترسا.
(أَزْعَقَ- هُ): ١-تۆقاندی ٢-ترساندی.
(اَلزَعِق): ١-شەوترســنۆك/ بەو شــەو ترساو ٢-گورجوگۆڵێك كە بەو شەویش بترسێت.
(اَلزَعیق): تۆقیو.
٣-(زَعَقَ- القِدرَ. زَعْقاً): خوێی مەنجەڵەكەی زۆركرد.
(زَعُقَ- الماءُ. زَعاقَةً): ئاوەكە هێندە تاڵ بوو نەدەخورایەوە.
(أَزعَقَ- القِدرَ): خوێی مەنجەڵەكەی زۆركرد/ زۆر سوێریكرد.
(اَلزُعاق): ئاوی تاڵو تفت كە نەخورێتەوە.
(اَلزُعوقَةُ): تاڵو تفتیی.
٤-(زَعَــقَ-تِ الریــحُ التُرابَ. زَعْقــاً): باكە خۆڵەكەی ورووژاندو هەستاند.
(زَعِقَ. زَعَقاً): گورجبوو/ چابوكبوو.
(أَزعَقَ- السَّیرَ): پەلەی لە ڕۆیشتنەكەدا كرد.
(إِنْزَعَــقَ- الفَرَسُ): چارموێكە پێشــكەوتو پەلەیكرد/ خێرایكرد.
(اَلزَعّاق- مِنَ الخَیلِ): ئەسپی فرە ڕەوو خێرا لە ڕۆیشتندا.
٥-(زَعَــقَ- تْهُ العَقْرَبُ زَعْقاً): دووپشــكەكە پێوەیدا.
زعل: ١-(زَعِلَ. زَعَلاً): چالاكبوو/ چابوكبوو/ گورجوگۆڵبوو.
(أَزعَلَ- هُ): گورجوگۆڵیكرد/ چالاكیكرد.
(تَزَعَّــلَ): چابوكبــوو/ گورجوگۆڵبــوو/ چالاكبوو.
(اَلزَعِــل والزَعْــلان والإِزْعِــل): چابــوك/ گورجوگۆڵ/ چالاك.
٢-(زَعِــلَ- مِنَ المَــرَضِ وغَــیرِهِ. زَعَلاً): لە نەخۆشــییەكە وەڕس بوو بێزاربوو دڵتەنگو بێتابوشتو شپرزە بوو.
(«زَعَلَ- مِنهُ») (عامیة): لێیزویر بوو/ زیز بوو/ دڵگرانبوو.
(زَعْــلان): زویر/ زیــر/ دڵگــیر/ نیگەران/ دڵگران.
(أَزعَلَ- هُ مِن مَكانِهِ): جێگەكەی پێلێژكردو دڵخوردیكردو دڵگرانیكرد.
(اَلزَعِل): لە برساندا ژانكردو تلدەر.
زعــم: ١-(زَعَــمَ. زَعْمــاً وزِعْمــاً و زُعْمــاً ومَزعَمــاً): گوایــە وایوت/ وایپیشــاندا/ لای وایە/ پێی وایە/ وایدەرخســت/ قسەیەكیكرد گومانی لێدەكرێت ئیتر ڕاستبێت یان درۆ. بە زۆری بۆ قسەی ناڕاست دەوترێت.
(«زَعَمَ فُلانٌ»): فیســار گوایــا وا دەڵێت. بە یەكێك دەوترێت كە درۆی زۆر لێبوەشێتەوە.
(تَزَعَّم): كۆمەڵێك درۆی هەڵڕشت.
(تَزَعَّم-القَومُ على الأَمرِ): كەوتنە قیشــاڵو درۆ لە كارەكەدا.

(اَلزَغْمَةُ (ج) زَغَمات): جاره درۆیەك.
(«هذا ولا زَغمتك أو زَغماتِك»): ئەمە، نەك درۆو فیشاڵەكانی تۆ.
(اَلزَغَمات): قسەی گومانلێكراو/ هەڵبەستراو.
(اَلزُغمِيُ) (ضد): ١-درۆزن ٢-ڕاستگۆ
(اَلمَزْعَم) (مص): فیشاڵ.
(هذا أمرٌ مَزعَم): ئەمە كارێكە فیشاڵكرد/ ناڕاستە/ جێی بڕوانییە.
(اَلمَزاعِم): فیشاڵو درۆ.
(هذا أمرٌ فيهِ مَزاعِم): ئەمە كارێكە جێی بڕوا نییە.
٢-(زَعَمَ- على القَوم. زعامَةً): بوو بە گەورەو فەرمانڕەوای خوێشكەڵ.
(زاعَمَ- هُ): كێشمەكێشی لەگەڵدا كرد.
(أزعَمَ- إليهِ): ملی بۆ داو جڵەوگیربوو/ بەگوێیكرد.
(-على القَوم): بوو بە سەرداریان.
(تَزَعَّمَ- القَومَ): سەركردایەتیو سەرداریی نەتەوەكەی گرتەدەست/ بوو بە سەرۆكیان.
(-حِزباً أو نَحوَهُ): بوو بە سەرۆكی پارتەكە یان شتیوەها.
(اَلزَعيم (ج) زُعَماء): ١-سەرۆك/ پێشەوا/ سەردار/ گەورە ٢-(ا ع): سەرهەنگ (پلەیەكی ئەفسەرە).
(اَلزَّعامة) (مص): ١-شكۆیی ٢-سەركردایەتی/ سەرۆكایەتیی/ پێشەوایی/ ڕابەریی ٣-باشترین دارا یان زۆرترینی ٤-چەك ٥-زرێ.
٣-(زَعَمَ- بالمال. زَعْماً): سەرپەرشتیی سامانەكەیو داراكەی گرتە ئەستۆی خۆی.
(اَلزَعْمُ والزَعامة): داراو سامان گرتنە ئەستۆ.
(أزعَمَ- هُ المالَ): داراكەی سامانەكەی كردە قەبەڵی ئەو/ ئەستۆی ئەو.
(-الأمرُ): كارەكە سازدەبێتو دەكرێت.
(تَزاعَمَ- القَومُ على الأمرِ): لە كردنی كارەكەدا كۆمەكی یەكتریانكرد.
(اَلزَعيم (ج) زُعَماء): دەستەبەر.
٤-(زَعَمَ- اللبنُ. زَعْماً): ماستەكە خەریكبوو خۆشدەبوو.
(أزعَمَ- اللبنُ): خەریكبوو خۆشدەبوو.
(-تِ الأرضُ): سەرەتای گیای زەویەكە سەریدەرهێناو سەوز بوو.
(اَلزَعِم- مِنَ الشّواء) (ط): گۆشتی چەوری زووو ڕۆنەر لە برژانندا.
٥-(زَعِمَ- فيه. زَعَماً): چاوی تێبڕیو مرخی لێخۆشكرد.
(اَلمَزعَم): چاوتێبڕاو/ مرخلێخۆشكراو.
(أزعَمَ- هُ): بەتەمایكرد/ تەماعی نایەبەر.
٦-(اَلزَعوم): لاڵەپەتە/ كەسێكە كە قسەی باش بۆ نەكرێت.
(اَلمِزعامَة): (ح): مار.
زعن: (زَعْنَفَ-تِ الماشِطَةُ العَروسَ):

ئارایشتەکەرەکە بووکەکەی ڕازاندەوەو جوانیکرد.

(ألزَّعْنَفَة والزِّعْنَفَة (ج) زَعانِف): ١-کورت/ کورتەبنە ٢-بڕێکی/ بەشێکی هەموو شتێك ٣-کورتە ٤-سەری پێستی دەستو پێ ٥-پەلێك یان پارچەیەکی خێل لە خێڵەکەی جیابێتەوە یان بچێتە سەر خێڵێکیتر ٦-پارچەیەکی جلێك یان دامێنی شڕی جلەکە ٧-بێکەڵك‌و خراپی هەموو شتێك ٨-وەی/ چورتوم ٩-پەرەکەی ماسی‌و باڵی ماسی ١٠-کۆمەڵێك کە ڕەسەنیان پەکنەبێت.

زعـا: (زَعا. زَعْواً): بە داد بوو/ دادپەروەر بوو.

زغّ: ١-(زَغْزَغَ- الكَلامَ): قسەکەی بەسەریەکداداو ناتەواو بوو.

(-بالرَّجُلِ): گاڵتەی بە پیاوەکە کرد.

(ألزَّغْزَغ): ١-کەسێکی سووکی گاڵتەجاڕی خەڵك ٢-تیزپێوەکراوی ڕەسەن‌و ڕەچەڵەکی/ بەناڕەسەن‌و ناکەسبەچە دانراو.

٢-(زَغْزَغَ- الشيءَ): شتەکەی ونکردو شاردەوە.

٣-(ألزُّغْزُغ): ١-گچکەی کورتەبنە ٢-(ح)باڵندەیەکە.

(ألزُّغْزُغِيَّة): زمانی میللەتێکە کە عەرەب نین.

زغب: ١-(زَغِبَ وزَغَّبَ وازغابَّ- الصَبِيُّ أوِ الفرخ. زَغَباً): منداڵەکە گەندەتووکی دەرکردو جوچکەکە گەندەپەری وردی دەرکرد.

زَغِب: گەندەتووکدەرکردوو یان جوچکی گەندەپەڕ دەرکردوو.

(أزْغَبَ- الكَرْمُ): مێوەکە کەوتە گەڵاکردن.

(ألزَّغَب. الواحِدَةُ زَغْبَة): ١-سەرەتای موو یان پەڕ کە تازە دەربچێت ٢-گەندە موو یان گەندەپەڕ/ وردەپەڕ.

(زَغَبُ البَراعِم) (ز): تووکی سەرگۆپکەی درەخت کە تازە دەردەچێت بە تایبەتی تازە گۆپکەی مێو. عەرەب‌و هیندییەکان لە تووکی دارخورما هەندێك جۆرە کووتاڵیان دروستدەکرد.

(ألزَّغَب): تووکی چروپڕی هەندێك زیندەوەر وەك مانگاو نەسپ کە دەکرێت بە ناواخنی زین‌و کورتان.

(ألأزْغَب (م) زَغْباء (ج) زُغْب): ١-تووکدار ٢-بەچکەقەتێ/ کوڕکوڕ.

(ألزُّغْبَة) (ح): جۆرە قرتێنێکە لە مشك دەچێت‌و لەو گەورەترەو لەناو درەختدا دەژی‌و زستان دەنوێنێت‌و نایەتە دەرەوە.

(ألزُّغابَة والزُّغابِي): وردەپەڕ یان نەرمەموو/ گەندەموو/ گەندەپەڕ.

«ماأصبتُ مِنهُ زُغابَة»: تا، تاڵە گەندەموویەکیشم لێدەستنەکەوت.

(ألزُّغْبُب): کورتەبنەی چرووك/ ڕژد.

٢-(زَغْبَرَ- الثَوبُ): بەرگەکە تووکیهەڵدا یان شۆکەی لیبۆوە.
(أَلزَغْبَر): تووکی یان شۆی جلی تازە.
(«أَخَـذَ الشـيءَ بِزَغْبَـرِه»): هەمـوو شتەکەیبرد.
أَلزُغبـر والزِغْبُر: أَلزَغْبَـر): ١-تووکی جلی تازە یان شۆی.
(أَلزُغْبُرة): ١-تووکە وردە (عامية) وشەکەیش لە (الزَغَب)ەوە بەلادانی وەرگیراوە ٢-تیسـکی قەیفە، زمانە ڕەستیەکەیشی (أَلزئبَرَة)یە.
زغد: ١-(زَغَدَ- السَـقاءَ زَغداً): مەشکەکەی گوشـی تا کەرەکە لـە دەمە تەسـکەکەیەوە بێتەدەرێ.
(-فُلاناً): قورگی فیساری گوشی.
(-البَعيرُ): حوشترەکە توند بۆڕاندی.
(-النَهرُ): ڕووبارەکە پڕبوو سەریکرد.
(أَزغَدَ- تِ المَـرأَةُ وَلَدَها): ژنەکە کوڕپەکەی دانا/ بووی.
(أَلزَغيـد والزَغيـدَة): کـەرە کە لـە دەمی مەشـکەوە دەردێـت کاتـی گوشـینی دەمی مەشکەکە.
(نَهرٌ زَغّادٌ): ڕووبارێکی لێوانلێو/ ئاوزۆر.
٢-(زَغَـدَ- هُ بِالـكَلامِ. زَغْـداً): بـە قسـە ڕقیهەستاندو تێژە تێژەیدا/ جووڵاندی.
زغـر: ١-(زَغَرَ- الشـيءَ زَغْراً): شـتەکەی داگیرکرد/ چنگی بە شتەکەدا گرت.
٢-(زَغَرَ- الشَـيءُ): شـتەکە بێئەندازە زۆر بوو/ زۆر زۆر بوو.
(-البَحرُ): دەریاکە هەستاو کشاو پڕبوو.
(أَلزَغـر والزَغـر- مِن كُلِّ شـيءٍ): زۆریی بێئەندازەیی هەموو شتێك.
٣-(زَغْرَبَ): پێکەنی.
(أَلزَغْرَب): ئاوێکی زۆر.
(بِئـرٌ زَغْرَب وزَغْرَبَـةٌ): چاڵاوێکی فرەئاو/ ئاوزۆر.
٤-(زَغْـرَدَ- البَعـيرُ. زَغْـرَدَةً): بۆڕەبـۆڕ بۆڕاندی.
(زَغْـرَدَةُ النِسـاءِ في الفَـرَحِ (ج) زَغاريد): تلیلیلی ژنان لە شاییو خۆشیدا.
زغـف: ١-(زَغَفَ- الماءُ. زَغْفـاً): ئاوەکە زۆر بوو.
(-في حَديثِهِ): زۆری وتو درۆی تێداکرد.
(«زَغَفَ كَلاماً كثيراً»): قسەیەکی زۆریکرد/ زۆربڵێیەکی زۆریکرد.
(«زَغَف لَنـا مالاً كثيراً»): سـامانو ماڵێکی زۆری بەسەردا داین.
(إِزدَغَـفَ- الشَـيءَ): شـتەکەی وەرگـرتو هەمووی ڕاماڵیو بردی.
(أَلزَغْف) (مص): هەورێك ئەستبکاتو ڕووی ئاسمانی گرتبێت.
(أَلزَغّاف): زۆربڵێ/ چەنەباز، قەرەچەن.
(أَلمِزغَف): لرفلێدەرێکی تێرنەخۆر کە هەموو

شتێك بماشێتەوەو بیخوات.

٢-(زَغَـفَ- هُ بِالرمـحِ. زَغْفـاً): نێـزەی پێداکرد.

(ألزَغْف) (مص): زرێی فراوانو درێژ.

(دِرعٌ زَغیـفٌ): زرێیەكـی فراوانـی قایمی زنجیرپتەو.

دروعٌ زَغْفٌ وزَغَـفٌ وأزغاف وزُفُوف: زرێی فراوانی قایمی زنجیرپتەو.

(ألزَغْفَـةُ والزَغَفَةُ): زرێـی فراوانی قایمو تۆکمە.

٣-(ألزَغَف): ١-تەلاشـەدار/ وردەدار ٢-سەری پەلە بێهێزەکان.

زغل: زَغَـلَ- الماءَ. زَغـلاً): ئاوەکەی جۆرە جۆرە ڕۆکرد/ بە چەند جارێك ڕۆیکرد.

(-الشَرابَ): شـەربەتەکەی/ خواردنەوەکەی تفکردەوە.

(-الصَبيُّ أُمَّهُ): کۆرپەکە دایکی مژی.

(«زَغَـلَ الذَهَـبَ وغَـیرَهُ»): دەغەڵیـی لە زێڕەکەدا یان شتیوادا کرد (عامیة).

(أزغَلَ- الماءَ): ئاوەکەی ڕۆکرد/ ڕشت.

(أَزْغَـلَ-ت الأُمُ وَلَدَها): دایکەکە شـیری بە منداڵەکەیدا.

(-الطائـرُ فَرْخَـهُ): باڵندەکە بـە دەنووکی خواردنی بە بەچکەکەیدا.

(-الشَـرابَ): شـەربەتەکەی هێنایـەوە/ تفکردەوە.

(ألزَغَل): دەغەڵیی/ گزی/ ساختەکردن.

(ألزُغْلِيُّ): سـاختەباز/ گزیکەر/ ساختەچی/ دەغەڵیکەر.

(ألزُغْلَـةُ): ١-تفکردنـەوەو هێنانـەوەی خواردنـەوە بـە دەم ٢-پڕ گوپێـك ڕۆکردنی ئاو.

(ألزُغْلـول (ج) زَغالیل): ١-منـداڵ/ کۆرپە ٢-بەچکە کۆتر (عامیة). ٣-پیاوی سووکەڵەی خێرا.

زغم: تَزَغَّمَ- الجَمَلُ): حوشترەکە دەنگەکەی بە کاکیلە دایەوە.

(«تَزَغَّمَ- الرَجُلُ»): کابرا بە تووڕە بوونەوە قسەیکرد.

(ألزُغوم والزُغْموم): لاڵەپەتە کەسێکە زمانی بیگرێتو قسەی باش بۆ نەکرێت.

زفّ: ١-(زَفَّ. زَفّـاً وزُفُوفـاً وزَفیفـاً): خێرایکرد.

(-تِ الریحُ): باکە هێواش هەڵیکرد.

(-الطائرُ. زَفّاً وزفیفـاً): باڵەکانی کردەوەو خۆی هەڵدا.

(-البَـرقُ زَفّاً وزفافـاً): هەورەتریشـقەکە شەوقیدایەوە.

(أَزَفَ- الرَجُلُ): پەلەیکرد/ خێرایکرد.

(-هُ): خێراییپێکرد.

(إسْـتَزَفَّ- هُ السَـیلُ): لافاوەکە/ لێشـاوەکە بەکێشیکردو بردی.

(-ه السَيرُ): ڕۆیشتنەكەی هێواش بووەوە.
(أَلزُفَّةُ): دەستە/ تاقم.
(أَلزَفَّةُ): جارێك.
(«جئتهُ زَفَّـةً أو زَفَّتَين»): جارێك یان دوو جار بۆ لای هاتم.
(ألأزَف): خێرا/ گورج.
(أَلزَفیـف والزَفّـان والزَفّاف): سـووكەڵەی خێرا.
(أَلزَفُوف): حوشترمرخ.
(-مِـنَ النُوق): مێحوشـتری جـوانو خێرا ڕۆیشتو.
(قَوسٌ زَفوف): كەوانی خۆشلەرە.
٢-(زَفَّ- العَروسَ إلى زَوجِهـا. زَفّاً وزِفافاً): بووكێی بۆ زاوا گوێزایەوەو خەڵاتیكرد.
(أَزَفَّ- العَروسَ إلى زوجِها): بووكێی بۆ ماڵی زاوا گوێزایەوەو خەڵاتیكرد.
(إزْدَفَّ العَروسَ): بووكێی گوێزایەوە.
(-الحِملَ): بارەكەی هەڵگرت.
(زَفَّةُ العَروسِ) (عامیة): گوێزانەوەو گێڕانی بووكێو شایىو زەماوەند بۆكردنی (عامیة)
(المِزَفَّـةُ): ئەو هۆیەی بووكێی بـۆ ماڵی زاوا پێدەگوێزرێتەوە نەسپ بێت یان ئوتوموبیل یان كەژاوە یان هەر هۆیەكیتر بێت.
٣-(أَلزِف): وردەپەڕ.
أَلزِفَف: وردەپەڕی تێكئاڵاوی باڵندە.
(ألأزَف): ١-توند/ خێرا ٢-هەر شتێك تێكئاڵانی تێدابێت.
٤-(زَفْـزَفَ- الرَجُـلُ): ١-خێـرا ڕۆیشـت ٢-ڕێكوپێك ڕۆیشت.
-الطائِرُ: باڵندەكە باڵەكانی فشكردەوە.
(-تِ الریحُ الحَشیشَ): باكە پوشەكەی ڕاداو وژەی لێهێنا.
(-المَركَبُ): دەنگی هۆسوارەكە بیسترا.
(أَلزَفْزَف والزَفْزاف): بای توندی سـەرومڕو بێپشوو.
(أَلزَفْـزاف): ١-بـای توندی سـەرومڕ ٢-(ح) وشترمرخ ٣-سووك.
زفـت: زَفَـتَ – الإنـاءَ. زَفْتـاً): قاپەكەی پڕكرد.
(-الرَجُـلَ): ١-پیاوەكـەی تـووڕە كـرد/ ڕەقهەسـتان ٢-ڕێپلێگرت ٣-دەریكرد ٤-ماندوو شەكەتیكرد.
(«زَفَتَ الحدیثَ في أُذُنِ الأَصَمّ»): قسـەكەی بە گوێی كەڕەكەدا كرد/ قسەكەی بە فیڕۆ ڕۆیشت.
(زَفَّتَ السَفینَةَ): قیری لە پاپۆڕەكە هەڵسوو.
(أَلزِفت (لك) (یونانیة): قیر.
زفـد: (زَفَـدَ –الإنـاءَ. زَفْـداً): قاپەكەی/ دەفرەكەی پڕكرد.
(-فَرَسَهُ شَعیراً): ماینەكەی تێر جۆ كرد.
(-تِ المالَ): داراكەی هەموو برد.
زفر: ١-(زَفَرَ-تِ النارُ زَفْراً وزفیراً): ئاگرەكە گڕیگرتو كەوتە گڕپەگڕپ.

(-الرَجُلُ): هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.
(-الحِمارُ):کەرەکە دەستی بە زەڕینکرد.
(أَلزَفــر (ج) أَزفــار): کۆڵــی گــران (چونکــە هەڵگرەکەی هەناسەی قوڵ قوڵ هەڵدەکێشێت).
(أَلزَفــرَة (ج) زَفَــرات): ١-هەناســەی قووڵ هەڵکیشــان ٢-زەڕینی کەر (دەشــێت شــاعیر بیکات بە (زَفَرات).
(أَلزُفُـــرَةُ): ١-هەناســـەی قووڵــی هەڵکێشــان ٢-هەناسەی گەرم (بە کڵپەی ئاگر دەچوێنرێت).
(أَلزافِــرَةُ (ج) زَوافِــر): کــەوان (لەبــەر دەنگدانەوە).
(أَلزَفــیر) (مــص): ١-ســەرەتای زەڕەی کەر. والشَهیق: دوایی زەڕینی کەر.
أَلشَهیق): هەناسەوەرگرتن.
(أَلزَفیر): هەناسەدانەوە.
(أَلمَزفَر والمُزدَفَر): ١-هەناســەی قووڵوەرگرتن ٢-شــوێنی هەناســەلێوەرگرتن‌و هەناســەی قووڵدان‌و پشوودان.
٢-(زَفَرَ-تِ الأَرضُ زَفــراً وزَفیراً): زەویەکە گیای دەرکرد، سەوز بوو.
٣-(زَفــرَ- المــاءَ. زَفــراً): ئــاوی هەڵکێشــا، هەڵێنجا.
(-الشيءَ): شتەکەی هەڵگرت.
(إزدَفَرَ- الشيءَ): شتەکەی بۆ هەڵگیرا.
(أَلزِفــر (ج) أَزفــار): ١-کونــدە ٢-کەلوپەلی کۆچکەر/ گوزارکەر.

أَلزُفَر: ١-بەهێزێك کە کوندەی پێهەڵبیگرێت ٢-دەریــا ٣-روباری گەورە کە ئــاوی زۆر بێت ٤-ســەردارو گــەورە ٥-بەخشــندەو دڵفراوان ٦-بەخشــینێکی زۆر ٧-شــێر ٨-دلێــر/ ئــازا، نەبەرد.
(أَلزَفَنُ): راگری درەخت، شــتێك بدرێتە بەر درەخت.
(زَفرَةُ و زُفرَةُ الدابَّــةِ): لاورگی دەرپەڕیوی چوارپێ.
(فَرَسٌ أَزفَر): ئەسپی لاورگدەرپەڕیو.
(أَلزافِرَةُ (ج) زَوافِر): ١-سەرشان‌و خوارەوەی تا ژێر مل ٢-ئاغا/ سەردار/ گەورە.
(زافِرَةُ الرَجُلِ): کەسوکارو خێڵ‌و لایەنگرانی پیاو چونکە پشتیدەگرن.
(زافِرَةُ البِناءِ): راگری خانوو.
(أَلزَوافِــر): ١-کەنیزەکــی کونــدە هەڵگــر ٢-داربەستی مێو ٣-پەراسوو.
(«فَرَسٌ شَدیدُ الضُلوعِ»): ئەسپێکی پەراسوو قایم. واتا قایم‌و بەهێز.
(«زَوافِــرُ المَجدِ»): هــۆو کۆڵەکــەی راگری شکۆیی‌و سەروەریی.
(أَلمَزفور- مِــنَ الــدَواب): چوراپێی جومگە قایم‌و پتەو.
٤-(تَزَفَّرَ): بە دەستووری دیانەکان خواردنی گۆشــت‌و شــیرو ئــەو بابەتانە (ســریانیة) بەرامبەرەکــەی نەخواردنیانــە لــە کاتــی

دياريكراودا.
٥-(أَلزِفْـر (ج) أزفـار): ١-كۆمەڵە ٢-دەسـتە سەربازی سوپا.
(أَلزُفَر): دەستە سەربازی سوپا.
(زَفْرَةُ وزُفْرَةُ- الشَيءِ): ناوەندی/ ناوەراستی شتەكە.
(أَلزافِرَةُ (ج) زَوافِـر): ١-قەوماوی جەرگیر/ وەی/ چورتـوم. ٢-خوارپـەری تیرەكـە یـان خوار سـێیەكی نووكەكەی ٣-كۆمەڵە ٤-دەستە سەربازی سوپا.
(أَلزَفير): وەی/ چورتووم، بەڵا، ئاپۆرە.
زفن: ١-(زَفَـنَ. زَفْنَاً): ١-سـەمایكرد ٢-توند پاڵینـاو لەقەی وەشـاند وەك سـەما بكاتو هەڵپەرێت.
(«دَنَوتُ مِنْهُ فَزَفَنَني»): لێینزیكبوومەوەو لەقەیلێدام/ شەقی تێهەڵدام.
(أَلناقَةُ الزافِنَة والزَفُون): مێحوشتری شەل.
(أَلزَفّان): سەماكەر/ هەڵپەر.
(أَلإِزفَنَّة): جووڵە/ بزوە.
(رَجُلٌ إِزفَنَّة): پیاوێكی بزێو.
٢-(أَلزِفْن (ب): چەترێكە لەسـەر سـەربان هەڵیدەدەن.
٣-(أَلزَيزَفـون) (ن): أَخلامـور): سـنجوو/ پارزی. درەختێكی جوانە گوڵەكەی سـپییەو وردە بە شـێوەی هێشـووە بۆنی زۆر خۆشە بەرەكـەی وشـكە داخـراوە تاكـە ناوكە. بۆ جوانیی دەروێنرێت. گوڵەكەی لە پزیشـكیدا بەكاردێت لەگەڵ چادا دەكوڵێنرێت بۆ ئازاری سەرێشە باشە.
(ناقَةٌ زَيزَفون) (ح): مێحوشترێكی خێرا.
زَفی: ١-(زَفَـىـ-ت القَوسُ زَفْيـاً و زَفَيانا): كەوانەكە دەرنگەیهات.
(-تِ الرِيحُ السَّحابَ والتُرابَ ونَحْوَهما): باكە هەورەكەو خۆڵەكەی راداو دایە پێشخۆی.
(أَزْفی- الشَـيءَ): شتەكە لە شـوێنێكەوە بۆ شوێنێكیتری گوێزایەوە.
(«أَزفيـتُ العَروسَ»): بووكێـم بۆ ماڵی زاوا گوێزایەوە.
(أَلزافي): سووكەڵەی گورجوگۆڵ.
(أَلزَفَيان) (مص): ١-سووكەڵەیی ٢-سووك.
ناقَةٌ زَفَيان: مێحوشترێكی خێرا/ چابوك.
(أَلمُزفِيّ والمُنْزَفِي والمُتَزَفِيّ»): تۆقێنراو.
٢-(زَفَی- الرَجُلُ بِنَفسِـهِ زَفْيـاً و زَفَياناً): خۆی كرد بە قوربانیی.
زقّ: ١-(زَقَّ- الطائِرُ. زَقّاً): ریقنەیكرد.
(-فَرخَـهُ): بـە دەنووكـی خواردنـی بـە بەچكەكەیدا.
(أَلـزَقّ): خواردندان بە باڵندەو بە زۆریی بۆ زوو قەڵەوكردنیان/ دابەستن.
(أَلزَقَقَة): ١-كۆتـری میلدار كە گمەگمیەتیو بە دەمی بەچكەكەیدا دەرشـێتەوە، خواردنی دەداتێ ٢-كەسانێكی بە سۆزو میهرەبان لەگەڵ

منداڵی وردا.

٢-(زَقَّ- الكَبشَ. زَقّاً): بەرانەكەی كەوڵكرد لە سەریەوە بۆ قاچی پێستەكەی داماڵی.

(زَقَّقَ- الكَبشَ): بەرانەكەی كەوڵكرد.

(-الجِلدَ): تووكی پێستەكەی داماڵی/ لێكردەوە.

(اَلزِقّ (ج) أزْقاق وزِقاق وزُقّاق وأزُقّ): كونەكە تووكەكەی دەبرێتەوەو هەڵناكێشرێت بۆ ئاو هێنانە.

(زِقُّ الحَدّاد): مووشەدەمەی ئاسنگەر.

(ألزُقّ (ج) زِقَقَة): مەی.

(اَلزَقّاق): مەیگرو شەرابگر.

٣-(اَلزُقاق (ج) أزِقَّة زُقّان): ١-هێڵی شەمەندەفەر ٢-كۆڵان/ كووچەو تەسكەرێ (دەكرێ بە مێو بە نێر).

(ألزُقَّةُ والزُقَق) (ح): مریشكە ڕەشە. باڵندەیەكی ئاوییە تا دەستی بۆ نەبەیت ناڕوات. ئەوسا خۆی بە نوقوم دەكات و دووردەكەوێتەوە.

٤-(زَقْزَقَ- الطائِر. زَقْزَقَةً و زِقْزاقاً): ١-پەلەوەرەكە/ باڵندەكە ڕیقنەیكرد ٢-جیواندی. جووكاندی. قووقاندی. خوێندی. گماندی قیراندی (بە هەموو دەنگێكی باڵندە دەڵێن).

٣-(-الرَجُلُ): وردەپێكەنینێكیكرد/ كەمێك پێكەنی.

(-فَرخَهُ): بە دەنووك خواردنی بە بەچكەكەیدا.

٥-(زَقْزَقَ- الصَبِيَّ. زَقْزَقَةً وزِقزاقاً): منداڵەكەی هەڵپەڕاند.

(-الرَجُلُ): سووكەسەنگبوو.

(ألزَقْزاق): ١-پێسووك لە ڕۆیشتندا ٢-(ح)جۆرە مێروولەیەكە.

زقب: ١-(زَقَبَ- الجرذُ في جُحرِهِ. زَقْباً): مشكەكە خۆی بە كونەكەیدا كرد.

(-هُ في الجُحرِ): مشكەكەیكرد بە كونەكەیدا.

(إنْزَقَبَ- الجرذُ في الجُحرِ): مشكەكە چووە كونەكەیەوە.

٢-(زَقَّبَ- المُكّاءُ): (كلاوكوره/ پەپووە) كە خوێندی.

٣-(ألزَقَب): ١-باریكەرێ ٢-نزیكی.

(«رَمَیتُهُ مِن زَقَبٍ»): لە نزیكەوە تێمگرت.

زقح: (زَقَحَ-القِردُ. زَقحاً و زُقاحاً): مەیمونەكە قیژاندی/ قیراندی.

زقع: (زَقَعَ- الدیكُ. زَقعاً و زُقاعاً): كەڵەشێرەكە قوقاندی/ خوێندی.

(- الحمارُ): كەرەكە كەوتە تركەندنێكی توند.

زقف: ١-(زَقَفَ- الشيءَ زَقْفاً): دەستی بە شتەكەدا گرت/ شتەكەی داگیركردو تالانكرد یان فڕاندی.

(تَزَقَّفَ وازْدَقَفَ- الشيءَ): جنگی بە شتەكەدا گرت/ تالانیكرد یان فڕاندی.

(-اللُّقمَةَ): پاروومكەی قووتدا.

(«تَزَقَّفَ الكـرةَ بالصولجان»): تۆپەكەی بە داردەستە سەرنوشتاوەكە فڕاند.

٢-(زَقَّفَ) (عامية): چەپڵەیلێدا. چەپڵەیكوتا.

زقل: (زَوقَلَ- العَمامَةَ): ئەمسەرو ئەوسەری سەروبەسـتەكەی/ مێزەرەكـەی داهێشـت/ دانیشان.

(زَواقيلُ- العَمامَـةِ): قژی دەركەوتووی ژێر مێزەرەكە.

زقم: (زَقَمَ وازْقَمَ- هُ. زَقْماً): كردی بە پاروو قووتیدا.

(زَقَّمَ- هُ): زەقنەمووتی دەرخواردا.

(أزقَمَ- هُ الشيءَ): شتەكەی پێقووتدا.

(تزَقَّـمَ): ١-كـردی بـە پـاروو خـواردی ٢-زەقنەمووتی خوارد.

(-اللبن): شیری زۆر خواردەوە.

(الزَقْمَةُ): ١-تاعون ٢-جارێك پارووگرتن.

(الزَّقُوم): زەقنەمووت/ هەموو خواردنێك كە بكوژێت.

زقـن: (زَقَـنَ- الحِمْـلَ. زَقْنـاً): كوڵەكەی هەڵگرت.

(أزْقَـنَ- هُ): یاریـدەی هەڵگرتنـی دا/ باركردنیدا.

زقا: ١-(زَقا وزَقى- الطائِرُ زَقْواً وزُقاءً وزُقِيّاً وزِقِيّاً وزُقُـوّاً وزَقْيـاً): باڵندەكە/ مەلەكە/ پەلەورەكـە خوێندی/ زیقانـدی/ قیراندی/ قووقاندی/ جریواندی.

(زاق (ج) زَواق )م) زاقِيَة (ج) زَواقٍ): باڵندەی قیڕەكردو/ خوێندو/ دەنگ لێوەهاتوو.

(«هـوَ أثقَلُ مِـنَ الزَّواقي»): لە كەڵەشـێر سـەنگینترە (گوایـا شـەوان بۆ قسـەكردن كۆدەبوونـەوەو پێـوەی خەریكدەبـوون ئەگەر كەڵەشـێر بیخوێندایەبە ئاگادەهاتن‌و دەیانزانـی كە شـەو دەرەنگبـووەوو بڵاوەیان لێدەكردو دەرۆیشتن.

(-الصَبيُّ): منداڵەكە لە تك‌و تاسـەوە چوو/ زۆر گریا.

(أزقى- هُ): گریاندی/ خستیە گری.

(الزِّقِيَّة): هاوارو دەنگەدەنگ.

٢-(الزُقيَة): تۆپەڵە پارە یان شتێكی ئاوەها.

زكّ: (زَكَّ- الشَـيخُ. زَكّاً و زَكَكاً و زَكيـكاً): پیرە كورگـە لۆقەیكرد یان لەبـەر بێهێزیی هەنگاوەكانی كورتكردنەوە.

(-الغُلامُ زَكّاً): مێردمنداڵەكە ڕایكرد.

(زُكَّ-الرَجُـلُ): ١-زۆر پیر بـوو/ ئیفتادە بوو ٢-بەهۆی نەخۆشییەوە لاوازو بێهێز بوو.

(الزُكّ) (ح): بەچكەی كۆترەباریكە.

٢-(زَكَّ- القربَةَ. زَكّاً): كونەكەی پڕكرد.

(-هُ الماءَ): ئاویدایەو تینوێتی شكاند.

(إزدَكَ- الزَرعُ): كشتەكە تێرئاو بوو.

٣-(زَكَّ- على فلان زَكّاً): لە فیسار گەرمبوو/ تووڕە بوو.

(تـــزَكَّكَ): چەکەکەی لە خۆیدا، هەڵگرت یان کەرەسەکەی هەڵگرت.

(اَلزُكَّةُ): داخ/ خەفەتو توورەیی.

(اَلزِكَّةُ): چەك.

٤-(زَكَّ- بَسَلْحِهِ. زَكّاً): ڕیقنەیکرد.

٥-(أزَكَ- على الأمرِ): لەســـەر کارەکە ســـوور بوو/ پێیداگرت.

بِرَأيِهِ: لە ســـەر ڕاکەی خۆی سوور بوو. گوێی نەدایە ڕای کەس/ پێیداگرت.

٦-(زَكْزَكَ- الشَّيخُ): پیرەمێردەکە لە بێهێزیدا هەنگاوەکانی کورتکردەوە.

(زَكْـــزَكَ- هُ فَتَزَكْزَكَ) (عامية): ختووکەیدا ئیتر ختووکەیهات.

(تَزَكْزَكَ): چەکەکەی هەڵگرت.

زكأ: ١-(زَكَأَ- هُ الدَراهِـــمَ زَكْأً): پارەیدایە یان پەلەی لە پارەدانەکەدا کرد.

(-هُ حَقَّهُ): مافەکەی خۆی پێدا.

(إزدَكَأَ- حَقَّهُ مِنهُ): مافەکەی خۆی لێسەند/ لێوەرگرت.

(رَجُلٌ زَكَأٌ وزُكَأَةٌ وزُكاءُ النَّقدِ): پیاوێکی سەر ڕاستە.

٢-(زَكَأَ- إلَيهِ. زَكْأً): پەنایبۆبرد.

(اَلمَزكَأُ): پەناگا.

٣-(زَكَأَ- هُ. زَكْأً): لێیدا.

زكب: (زَكَبَ- الإناءَ زَكْباً وزُكوباً): قاپەکەی پڕکرد.

(-تِ المَــــرْأةُ وَلَدَهـــا): ژنەکـــە منداڵەکەی بە ژانو نقەکردنێك بوو.

(إنزَكَـــبَ- البَحـــرُ): نـــاوی دەریاکـــە ڕژایە شوێنێکی نزمەوە یان لەبەری ڕۆیشت.

(اَلزُكْبَةُ): منداڵ/ کورپە/ ساوا.

زكت: (زَكَـــتَ وزَكَّـــتَ وأزْكَـــتَ — الإناءَ): قاپەکەی/ دەفرەکەی پڕکرد.

زكر: (زَكَّرَ وتَزَكَّرَ- الإناءُ): قاپەکە پڕبوو.

(اَلزُكْـــرَةُ (ج) زُكَر): دەفرێکە لە پێســـتە بۆ مەی یان سرکەو شتیوەهایە.

زكم: (زَكَـــمَ وأزكَمَ القربَةَ. زَكْماً): کوندەکە یان مەشکەکەیپڕکرد.

(-هُ): تووشـــی هەڵامەتیکـــرد (لـــە بنچینەدا لـــە وشـــەی (اَلزُكـــام)ەوە هاتووە کـــە واتای بێتاقەتییە.

(زُكِمَ): تووشی هەڵامەتبوو.

(مَزْكوم): هەڵامەتگرتوو/ هەڵامەتاوی.

(اَلـــزُكام (طب): هەڵامەت (ئاوبەلووتدا دێتە خوارێ لەبەر هەوکردنی پەردەی ناو لووت).

٢-(زَكَـــمَ وأزكَمَ- بِهِ أُمُّهُ زَكْماً): دایکی ئەوی بوو/ ئەوی خستەوە.

(اَلزَكْمَةُ): وەچە/ تۆو/ توخم.

(«لِفُلان زَكْمَةُ ســـوءٍ»): فیســـار وەچەیەکی ناجسنو نارەسەنو بەدی خستۆتەوەو هەیە.

(اَلزُكْمَةُ): منداڵی پاشەبەرە.

(هُـــوَ زُكْمَـــةُ وُلدِ أبيـــهِ): ئەو پاشەبەرەی

منداڵانی باوکیەتی/ دوایینیانە.
٣-(اَلزُكْمَةُ): چارەگرانی نەزاندوو.
زكــن: ١-(زَكِنَ- الأمرَ زَكَنــاً): پەیبەكارەكە برد/ مێشكی بۆ كارەكە چوو ٢-لێیوردبووەوە ٣-تێیگەیشت ٤-مێشكی بۆیچوو.
(«زَكِنتُ أَنَّهُ رجُلٌ سوءٍ»): زانیم كە پیاوێكی خراپە.
(-مِنهُ عَداوَةً): دوژمنایەتیی لێبینی.
(زَكَّنَ): وایبۆچوو.
(-عَلَيــهِ): كاركــەی لێتێكچــوو/ ســەری لێدەرنەكرد.
(أَزكَنَ- هُ الأمرَ): فێریكردو تێیگەیاند.
(-الشَيءَ): بیری بۆ شتەكە بە شێوەیەك چوو راستیش دەرچوو.
(رَجُلٌ زَكَنٌ): پیاوێكی زیرەكو هوشیار.
(اَلزَكانَــة والزَكانِيَّــة): بــاش بۆچــوونو هەڵهێنانی شت.
٢-(زَكِــنَ- إِلَيــهِ زُكونــاً): پەنایبۆبــردو تێكەڵاویبوو.
(زاكَنَ- هُ): ١-لێینزیكبووەوە.
(«هــذا جَيــشٌ يُزاكِــنُ الأَلفَــين»): ئەمە ســوپایەكە نزیكەی دوو هــەزار كەس دەبێت ٢-لێینزیكبووەوە لەگەڵیدا دانیشت.
زكا: ١-(زَكا وزَكِــيَ- الــزَرعُ. زَكاءً وزُكُــوّاً وزَكِيّ): كشتەكە گەورە بوو و گەشەیكرد.
(-تِ الأَرضُ): زەویەكە خۆشبوو.
-الرَجُلُ): خۆشگوزەرانبوو/ پێگەیشت/ بەناز بوو.
(زَكَّى): گەشەیكردو زۆر بوو.
(-هُ اللهُ): خودا گەشەی پێكردو پێیگەیاند.
(أَزكَى- الزَرعُ): كشتەكە گەشەیكرد.
(-هُ اللهُ): خودا گەشەی پێكردو زۆریكرد.
(تَزَكَّى- الشيءُ): گەشەیكردو زۆر بوو.
(اَلزاكــي (فــا) (ج) زُكاة): گەشــەكردووی خۆشبوو.
اَلزَكِيّ (ج) أزكياء (م) زَكِيَة: گەشــەكردووی خۆشبوو.
(«أَرضٌ زَكِيَّــة»): زەوییەكــی بەپیــتو گۆشتەزەوی.
٢-(زَكا وزَكِيَ- الرَجُــلُ زَكاءً وزُكُوّاً وزَكَىً): ١-پیاوەكــە چــاكو جوانكردە بــوو ٢-بوو بە پیاوچاكو پاكو راستبوو.
(«هذا لايَزكو بِكَ»): ئەمە شایانی تۆ نییە.
(زَكّى- هُ اللهُ): ١-خودا پاكیكردەوە ٢-چاكیكردو خســتیە ســەر رێــی راســت ٣-زەكاتەكــەی وەرگرت.
(-نَفسَهُ): ١-خۆی هەڵنا ٢-خۆی پاككردەوە.
(- مالَــهُ): زەكاتــی داراكەیــدا/ داراكــەی پاككردەوە.
(تَزَكّى): ١-خێریكرد ٢-پاكبووەوە.
(اَلــزَكاة (ج) زَكاً وزَكَــوات): ١-زەكات كــە ســامانەكەی پــێ پاكدەكرێتــەوە ٢-خێــرو

سەدەقە ٣-خاوێنیو پاکی ٤-پوختەی شت.
(اَلزَكِـيّ (ج) اَزْكِيـاء (م) زَكِيّـة): ١-ئەوەی کە باشـبێت ٢-پاکو بێگەرد ٣-خێرەوەمەندو پیاوچاک ٤-دەروونو داوێنپاکو بێگوناح.
(اَلتَزكِيَة): ١-بەباشـدانان/ بە چاك ناوهێنان ٢-زەکات ٣-پـاکو پوختەکـردن ٤-پـاکو بێگەردیی.
(تَزْكِيَةُ الشُهود): بەباشـدانانی شایەتەکانو هێنانە پێشەوەیان.
٣-(زَكّى): تینوویبوو.
٤-(اَلزَكا): جووت (هی ژمارە).
(«اَخَسـاً هـذا أم زَكا»): ئەمـە تاکـە یـان جووت.
زلّ ١-(زَلّ. زَلاً وزَلَـلا و زُلولاً وزَليلاً ومِزَلّةً وزُلّيلى وزُلّيلاء): خلیسکاو کەوت.
(-عَـنِ الحَقّ أو الصَوابِ): لە ڕاسـتیو هەق لایدا/ گومڕا بوو.
(-عُمْرُهُ): تەمەنی کۆتاییهات.
(-زَليلاً و زُلولاً): زوو تێپەڕی/ ڕابورد.
(-زَلّلاً): کەفەڵی سووکەڵەو لاواز بوو.
(اَزَلّ (م) زَلاّء (ج) زُلّ): سـمتو کەفـەڵ سووکەڵەو بچووکو لاواز.
(اَزَلّ- هُ): ١-هەڵیخزاند هەڵیخیسکاند ٢-تووشی گوناح یان هەڵەیکرد.
(اِسْـتَزَلّ- هُ): ١-هەڵیخلیسـکاند/ خزانـدی ٢-گوناهی پێکرد ٣-داوای لێکرد گوناهبکات.

(اَلـزُلّ): شـوێنی خلیسـك/ ئەو شـوێنەی خلیسـکێنەی لێدەکرێت (بـۆ نێرو مێ وەك یەکە).
(«مـكانٌ زُلٌّ وأرضٌ زُلٌّ»): شـوێنێکی خزەو زەوییەکی خلیسکە.
اَلزَلل (مص): ١-شـوێنێکە خلیسکێنەی تێدا دەکەن یان تێـدا دەخزێن (بۆ نێرو مێ وەك یەکە). ٢-گوناهکردن کەوتنە گوناهەوە.
(«اَسْـتَغْفِرُ اللهَ مِـن زَللي»): لێخۆشـبوونی گوناهەکانم لە خودا دەخوازم.
(اَلزَلّـة (ج) زَلاّت): ١-گونـاه، هەڵەی خراپ/ خراپەکـردن ٢-جارێـك پێخلیسـکان بەرەو خراپە ٣-کەوتن.
(اَلزِلّة): بەردی لووس.
زِلّ: بەردێکی لووس.
(مـاءٌ زَلـول وزُلازِل): ئاوی شـیرینی پاکی روون/ ئاوی زوڵاڵ.
(اَلزُلال): زۆر خز/ زۆر خلیسك.
(ماءٌ زُلال): ئاوی شیرینو پاکو روون.
(اَلزَليل): سووك ڕۆیشتن.
(ماءٌ زَليل): ئاوی شیرینی روونی پاك.
(اَلاَزَلّ (م) زَلاّء (ج) زُلّ): ١-کەفـەڵو سـمت سووك ٢-خێرا.
(قَـوسٌ زَلاّء): کەوانێکی تونـد کە تیرەکەی خێرا لێدەردەچێت.
(اَلمَزَلّة والمَزِلّة (ج) مَزالّ): خلیسکە. خزگە.

٢-(أَزَلَّ- هُ إلى القَــوم): پێشكەشــيكردن/ خستيە بەردەميان.

(«أزَلَّ- إلَيــهِ نِعَمــةً»): چاكەو پياوەتييەكى لەگەڵدا كردو پێشكەشكرد.

(«أزَلَّ إلَيــهِ مِن حُقِّهِ شــيئاً»): شــتێكى لە مافەكەى خۆى پێشكەشكرد/ دايە.

(ألزُلَّةُ): چاكەو پياوەتى.

(ألزَلَّــة (ج) زَلاَّت): ١-نــان بــۆ خەڵكــردن/ ميوانداريى ٢-شــايى و زەماوەند ٣-نانخواردن يان بردنى خواردن لەســەر خوانى دۆست يان خوێشێك.

ألمُزِلّ: نانبدەو چاكەكار.

٣-(زَلَّ- الدِرهَمُ. زُلولاً): پارەكە كەمسەنگبوو.

(زال (ج) زَوالّ): پارەى كەمســەنگ/ سەنگ ناتەواو.

(دَراهِــمٌ زَوالّ): پەنجايــى/ پارەى ســەنگ ناتەواو.

(ألزَلَل): ناتەواو/ كەمبوو.

(«في ميزانِهِ زَلَلٌ»): شايەنەكەى/ ترازووەكەى سەروخوار دەكات/ ناتەواوە/ دەخوات.

٤-(ألزُلَّة): تەنگەنەفەسى/ هەناسەتوندىى.

(ألزَليــل) (ط): حەڵواى نــاردو هەنگوين = (ألفالوذ) (فارسية).

٥-(زَلــزَلَ- اللهُ الأرضَ زَلْزَلَةً وزِلْزالاً وزَلْزالاً وزُلْــزالاً): خودا لــەرزەى بــە بوومەكە/ بە زەوييەكە خست.

(-هُ): ترساندى و ئاگاداريكردەوەو هەرەشەى لێكرد.

(تَزَلْزَلَ- تِ الأرضُ): بوومەلەرزە بوو/ زەويى هاتە لەرزەو شپرزەيى و لەرينەوە.

(ألزَلْزَلَة (مص) (ج) زَلازِل): بوومەلەرزە.

(ألــزَلازِل): تەنگانەيگــران و چورتوم/ وەيى سەخت و گۆران.

ألزُلْزُول): جەنگ و بەدو خراپە.

٦-(زَلْــزَلَ- الإبِــل. زَلْزَلَةً وزِلْــزالاً وزَلْزالاً وزُلْــزالاً): تونــدو دڵرەقانــە حوشــترەكانى لێخورى و دانيە پێش.

(ألزُلْزُل): تەپلژەنى كارامە/ شارەزا.

(غُلامٌ زُلزُل): مێردمنداڵى سووكەڵەو گورج.

(ألزُلْــزول): ١-رۆحســووكى بــە دەمو لفتو رووخۆش/ رۆحسووكى/ ئازايەتى.

(ألزَلزِل): كەلوپەل و كاڵاى ماڵ/ ناوماڵ.

ملحق:

(زلّ: ألزِلــزال أو الزِّلــزال (ج) زَلازِل): بوومەلەرزەكە لــە قووڵايى و پنتێكى ديارەوە دێت.

---

زلأ: (إزلأمَّ): كرايەوە/ پانبووەوە.

زلب: (زَلِبَ- بە زَلَباً): پێوەيلكاو لێينەبووەوە.

(ألزُلْبَةُ): پارو/ بابۆڵە.

(ألزَلابيَة) (ط): زلوبيا (فارسيە).

زلــع: ١-(زَلَــعَ. زَلْجــاً وزَلِيجــاً وزَلَجاناً): سووكەڵانەو خێرا رۆيشت.

(-البابَ زَلْجاً): دەرگاکەی بە سورگی داخست/ دەرگاکەی کۆلۆمکرد.
(-فُلاناً. زَلَجاً): پێش فیسار کەوت.
(زَلِجَ. زُلوجاً): خزا.
(-الكَلامُ مِن فيهِ): قسەکەی لە دەم دەرچوو.
(-الماءُ عَنِ الحُنجَـرَةِ): ئاوەکە لە قورگیەوە خزایە گەدەی.
(زَلَّجَ- الكَلامَ): قسەکەی بەناو خەڵدا جاڕداو بڵاوکردەوە.
(-عَيشَـهُ): بـە پێبژێیەکی کـەم داکەوت/ قنیاتیکرد.
(أزلَـجَ- البـابَ): بـە سـوورکی دەرگاکەی داخست/ کۆلۆمیکرد.
(تَزَلَّجَ): خزا.
(- الشَيءُ): شتەکە خزا.
(«تَزَلَّـجَ السَـهمُ عَنِ القَـوسِ»): تیرەکە لە کەوانەکە دەرپەری.
(تَزَلَّجَ على الجَليدِ وغَيرِهِ): بەپێخزێن لەسەر سەهۆڵەکەو شتیوا خلیسکێنەیکرد.
(ألزَلاّجَة): پێخزێن.
(تَزَلَّـجَ – النَبيـذَ): مەیـی زۆر خواردەوە/ سەریکردە سەر مەیخواردنەوە.
(مَكانٌ زَلْجٌ وزَلَجٌ وزَليجٌ): شوێنێکی خز.
(ألزالِـج) (فـا): ١-ڕزگاربـووی گرفتاریـیو چورتوم ٢-کەسـێکە کە مەی زۆر بخواتەوە/ سەربکاتە سەرخواردنەوە.
(سَهمٌ زالِج): تیرێك بەسەر زەویدا بخشێتو بەرەو نیشانەکە بڕوات.
(ألزَلوج): خێرا.
(سَـهمٌ زَلُـوج): تیرێك کـە تیژ لـە کەوان دەرپەرێت.
(قِـدحٌ زَلُـوج): سـنجوقێك زوو لەدەسـت بخزێت/ دەرچێت.
(عَقَبَـةٌ زَلُـوج): باریکە ڕێـی دوورو درێژ ناوشاخ.
(ألزُلُج): تاوێرە لووسەکان.
(ناقةٌ زَلَجى وزَليجَة): مێحوشترێکی تیژڕەو.
(ألزلاج والمِزلاج): کۆلۆم/ سورگی.
(ألزَلاّجه): پێخزێن. ئامێرێکە لە تەختە یان ئاسـنەپێی پێدادەکرێتو لەپێ دەبەسترێتو لەسەر سەهۆڵ یان شـوێنێك قیراوی کرابێت خزکێنـی پێدەکرێـت پێشـی دەوترێـت («سكي»).
ألمَزلَج (ج) مَزالِج: سوار هۆی بێپێچکە لەسەر سەهۆڵ خلیسکێنەی پێدەکەن.
٢-(ألمُزَلَّج): ١-کەم ٢-چرووك/ ڕژد ٣-کەسـێك خۆی بە خوێشـکەلێکەوە لکانبێتو لەوانیش نەبێـت ٤-کەمنی هەمـوو شـتێك ٥-نامەردی بێویژدان.
زلح: ١-(زَلَحَ وتَزَلَّحَ- الشيءَ. زَلْحاً): شتەکەی چەشت.
(ألزَلْح): پووچ/ نارەوا/ نادروست.

(أَمرٌ زَلْخٌ): كارێكی پووچ/ نادروست.
٢-(تَزَلحَبَ- عَنهُ): لێیلادا/ لێیدووركەوتەوە/ خزا.
٢-(زَلْحَفَ- هُ): كەنارگیریكرد دووریخستەوە.
(تَزَلحَفَ وازْلَحَّفَ): دوركەوتەوە/ كەنارگیربوو.
(اَلزِلْحَفَة) (ح): وەرگێڕانی وشەی (السلحفاة)ە. رەقە/ كیسەڵ.
زلخ: ١-(زَلَخَ- الرَجُلُ. زَلْخاً وزَلَخاناً): كابرا خشا/ له رۆیشتندا پێشكەوت.
(-ت رِجْلُهُ): پێی خزا.
(زَلَّخَ- هُ): لووسیكرد/ خزیكرد.
(أزلَـــخَ- البـــابَ): دەرگاكـــەی كولۆمكرد/ به سوورگی دایخست.
(تَزَلَّخَ): خۆیخزاند/ خۆیخلیسكاند.
(مَـــكانٌ زَلِـــخٌ وزَلَـــخٌ): شـــوێنێكی خـــز/ خلیسكێنەی لێدەكەن.
(اَلزَلوخ): خزو خێرا.
(بِئـــرٌ زَلُوخ): دەمبیرەكه خزه هەرچی چووه سەری دەخلیسكێت.
(اَلزُلَّخَـــة): لێژگـــەی خـــز كـــه منـــدالآن قنگەخلیسكێنەی لێدەكەن.
(اَلمِزْلاخ= المِزْلاج): سوورگی/ كولۆم.
٢-(زَلَخَ- فُلانـــاً بِالرمحِ زَلْخاً): نێزەكەی به فیساردا كرد.
(-رَأسَهُ): سەری قرنجاند.
٣-(زَلِخَ. زَلَخاً): قەڵەو بوو.

زلز: (زَلِزَ. زَلَزاً): دڵخورد بوو.
(اَلزَلَـــز والزِلز): ١-كەلوپـــەل ٢-ئەو ڕێگەیەی لێوەی هاتوویت.
زلع: ١-(زَلَعَ- الشيءَ زَلْعاً): به فێڵو دزییەوە شتەكەیبرد.
(-الشَجَرَةَ): درەختەكەی بڕییەوە.
(-المـــاءَ مِـــنَ البِئـــرِ): ئـــاوی لـــه چاڵاوەكه هەڵێنجا.
(«زَلَعْـــتُ لَهُ مِن مالي زَلْعَةً»): بەشـــێكم له داراكەم بۆ بڕییەوە.
(أَزلَعَ- هُ في الشـــيءِ): شتەكەی لا شیرینكردو چاوی پێ تێبری.
(تَزَلَّعَ- ریشُهُ): پەڕەكەی لێبووەوە.
(إزدَلَعَ- الشيءَ): به دزه دزەو فێڵ شتەكەیبردو دەستی بەسەردا گرت.
(-حَقَّهُ): له مافەكەی بڕی.
٢-(زَلَعَ- رَأسُهُ زَلْعاً): سەری قڵیشاند.
(-رِجْلَهُ): قاچی سووتاند.
(زَلِـــعَ- ت/ قَدَمُـــهُ. زَلَعاً وزُلُوعاً): پێســـتی قاچی قڵیشا.
(تَزَلَّعَ-ت قَدَمُهُ): قاچی قڵیشا.
(-ت كَفُّهُ): بەری دەستی قڵیشا.
(اَلزَولَع): پاژنه قڵیشاو.
(اَلمُزَلَّع): كەسێكه كه تووشی قڵیشانی دەستو پێ بووبێت.
٣-(زَلَعَ- تِ الشَمسُ. زُلُوعاً): خۆرهەڵهات.

(-تِ النارُ)گڕی ئاگرەکە بەرزبووەوە/ ئاگرەکە کڵپەیسەند.

٤-(زَلِعَ وتَزَلَّعَ- الجرحُ زَلَعاً وزُلُوعاً): برینی پیسبوو.

(الزَلِعَةُ): برینی بیستوو.

٥-(اَلزَيْلَع)مووورووی سپی ورد کە لە دەریا دەرهێنرێت.

زلـغ: ١-(زَلَغَ- النَجمُ. زُلُوغاً): ئەستێرەکە هەڵهات.

(-النـارُ): ئاگرەکـە کڵپەیسـەند/ گـڕی بەرزبووەوە.

٢-(تَزَلَّـغَ-ت رِجلُهُ)قاچـی قلیشـا/ قلیش قلیشبوو/ باشتر وایە بوترێت: تَزَلَّعَت.

٣-(إزلَغَبَّ- الفَرخُ): جووچکەکە پەریدەرکرد.

(-الشَـعْرُ): تووکەکـە پاش تاشـینی هاتەوە دەرێ.

زلـف: ١-(زَلَفَ. زَلْفاً و زَلَفـاً وزَلیفاً): خۆی بردە پێشەوە خۆی نزیککردەوە.

(-الشَيءَ): شتەکەی هێنایە بەرەوە/ پێشەوە.

(زَلَّفَ -الشيءَ): شتەکەی پێشخست.

(-في الکلام): درێژەی بە ئاخاوتنەکەدا.

(أزْلَفَ- هُ): نزیکیکردەوە.

(-الأشیاءَ): شتەکانی کۆکردەوە.

(-الدَلیلُ القَومَ): ڕێنوماکە خوێشکەلی قۆناغ بە قۆناغ بردنە پێشەوە.

(تَزَلَّفَ وازْدَلَفَ): خۆی تێهەڵسوو خۆی بردە پێشەوە/ خۆی نزیککردەوە/ مەراییکرد.

(اَلزَلْـف والزَلَـف والزُلْفـی): ١-نزیکیـی ٢-پلەوپایە ٣-شوێن و جێ.

(اَلزُلْفَة (ج) زُلَف وزُلُفات وزُلَفات وزُلْفات): ١-پلەك ٢-پلەوپایە ٣-نزیکیی ٤-بەشێکی شەو.

(اَلزَلَف): کازیوە/ ئەو دەمانەی نێوان شـەوو ڕۆژە.

(اَلعُقبَةُ الزَلُوف): دواییەکی دوور.

(اَلمَزْلَفَـة (ج) مَزالِف): دێیەکی نێوان لادێ و دەشت و چۆڵ.

(اَلمَزالِف): قۆناغ.

مُتَزَلِف: خۆبەرەپێشەوە/ مەراییکەر.

٢-(اَلزَلْف): باخچە.

(اَلزَلْفَـة (ج) زَلَـف وزُلَفات وزُلُفـات وزُلْفات): لەگەنێکی پێنجکەسیی/ قەزعەیەکی پێنجکەسیی.

(اَلزَلَفَةُ (ج) زَلَف): ١-گۆلـی پڕ ٢-لەگەنێکی گـەورە ٣-تەشـت/ سـوێنە بۆ جلشـتن یان هەویرشـێلان ٤-زەویی ڕەقەن یان گەسکدراو ٥-تاوێری سـاف و لووس ٦-گوڵزار/ مێرغوزار ٧(ح) گوێچکەماسی.

زلق: (زَلَقَ- هُ زَلْقاً): ١-خزاندی/ خلیسکاندی ٢-لایدا/ دووریخستەوە.

(-رَأسَهُ): سەری پاك تاشی.

(-هُ عَـن مکانِـهِ): لـە شـوێنەکەی لایداو دووریخستەوە.

(زَلِـقَ وزَلَـقَ -تِ القَدَمُ): قاچەکـە/ پێکە

هەڵخیسکاو خۆی نەگرتەوە.

(-بِمَكانِـــهِ): لـــە شـــوێنەکەدا دڵتەنگبـــوو و لێیلاچوو/ کۆچیکرد.

(زَلَّقَ- هُ): ١-خزاندی/ خلیســکاندی ٢-توشوی گوناهو خراپەیکرد.

(المَوضِعَ): شوێنەکەی خزکرد/ لووسکرد.

(-رَأسَهُ): سەری پاك تاشی.

(-بَدَنَـــهُ): لەشـــی بـــە ڕۆن تـــەواو هەنـــوو چەوریکرد.

(-هُ بِبَصَرِهِ): تیژ چاوی تێبڕی.

(-عَـــن مَكانِـــهِ): لـــە شـــوێنەکەی لایـــداو دووریخستەوە.

(أزْلَقَ- هُ): خزاندی.

(-رَأسَهُ): سەری تاشی.

(-تِ الفَـــرَسُ): ماینەکـــە بەراویتـــە بـــوو/ بەرەکەی بەچکە نەبەکامەکەی فرێدا.

(-هُ عَـــن مَكانِـــهِ): لـــە شـــوێنەکەی لایدا/ خزاندیو دووریخستەوە.

(-هُ بِبَصَرِهِ): تیژو بە ڕقەوە چاوی تێبڕی.

(«أنَّهُم يُزلِقونَكَ بِأبصارِهم»): ئەوان وا تیژو بە ڕقەوە چاوت تێدەبڕن نیازیانە لەو شوێنو پایە بەرزەدا داتخزێنن کە خودا داویتێ.

(تَزَلَّـــقَ): خـــۆی تـــاسو لووســـداو کاڵای جوانـــی پۆشـــی تـــا ڕووی بریـــقو باقبێتو بدرەوشێتەوە.

(الزَلْق والزَلاَّقة): شـــوێنێکی وا خز کە پێی لەسەر بەند نەبێت.

(الزَلَق): شوێنی زۆر خز.

(أرضٌ زَلَـــقٌ): زەوییەکـــی لووسو ســـاف کە هیچی تێدا نەبێت.

(الزَلِق): ١-زۆر خز ٢-کەســـێك زوو هەڵچێتو توورە بێت.

(الزَلَقَةُ): ١-تاوێری لووسو خز ٢-ئاوێنە.

(ناقَةٌ زَلُوق): مێحوشترێکی گورج/ خێرا.

(عَقَبَـــةٌ زَلـــوق): ڕێیەکـــی درێـــژی دووری ناوشاخ.

(الزَليق): کورپەی لەبارچوو.

(الأزْلَق): ئەوەی تووکی تازەی هاتبێتەوە.

(الزُلَّيْـــق. الواحِـــدَةُ زُلَّيقَـــة) (ز): ١-قۆخی لووس ٢-خزەماسی/ جۆرە ماسییەکە کە زوو لە دەست دەخزێت.

(المَزلَـــق والمَزلَقَـــةَ): خزگە کە پێـــی پێوەند نەبێت.

(المِزلاق): ١-سوورگیی دەرگا/ کوڵۆم ٢-ماینێك کە زۆر جار بەراویتە ببێت.

زلم: ١-(زَلَمَ. زَلْماً): هەڵەیکرد.

٢-(زَلَمَ- الإناءَ. زَلْماً): قاپەکەی پڕکرد.

٣-(زَلَـــمَ- الأنفَ زَلْمـــاً): لووتەکەی قرتاند/ بڕی.

٤-(إزدَلَمَ- الشيءَ): ١-شتەکەی بڕی ٢-شتەکەی لە بنو بێخ دەرهێنا/ هەڵکەند.

(الزَلَمَةُ): پارچەیەك پێســـتی گوێی بزنەکە

بررابێت‌و شۆڕکرابێتەوە.
(ألأَزلَـم (م) زَلمـاء): سـەری گـوێ بـڕراو هەڵهێنراوە. جاران عەرەب سەری گوێی حوشترە چاکەکان‌و مەڕە باشەکانیان هەڵدەهێنایەوەو پارچەیەکیان لێبەردەدایەوە.
(ألمُزَلَّم= الأَزلَم): سەری گوێ بڕراو.
٤-(زَلَـمَ- العَطـاءَ. زَلمـاً): بەخشـشـەکەی کەمکردەوە.
(زَلَّمَ- العَطاءَ): بەخشینەکەی کەمکردەوە.
(-غِذاءَهُ): خۆراکەکەی خراپکرد.
٥-(زَلَّـمَ- هُ): ١-نەرمیکـرد ٢-تەختیکـردو چاکیکرد.
(-الرحـى): دەسـتاڕەکەی سـووڕاندەوەو ئەملاولاکەی گرت.
(ألزَلَـم (ج) أزلام):١-تیری بێپـەڕ (لە پێش ئیسـلامدا بـۆ دابەشـکردنی شـت بەکاریان دەهێنا ٢-سم یان پاشی سم.
(ألزُلمَةُ والزَلمة والزَلَمَةُ): شێوەو قەد.
(ألمُزَلَّـم): ١-سـووکەڵەو ناسـك (بـە تـیری بێپەڕچوێنراوە) وەك تیر سـووکەڵەو ئازایە ٢-کورت.
(ألمُزَلَّم والزَليم- مِنَ السِهام): تیرێك کە چاك دروستکرابێت.
٦-(إزلَأَمَّ-تِ الضُحـى. إزلِئماماً): خۆر تەواو بەرزبووەوە/ نزیکی نیوەڕۆ بوو.
(-الشَيءُ): شتەکە قیتبووەوە/ ڕاست هەڵسا.
(-القَومُ): بە پەلە کۆچیانکرد.
٧-(ألزَلَم) (ن): بادەمی زەوی/ سـەڵی شیرین رووەکێکـە بێگـوڵ‌و تۆو لـە ڕەگەکانیدا کە لەژێـر زەویدایە تۆوێکی جـەوری قێلکەیی هەیە. خەڵکـە ڕەشـۆکەکە پێیدەڵێن (حب العزیز).
(ألزَلمة) (عامية): پیاو/ زەلام/ پیاوی پیادە/ زەلامی پیادە.
(ألزَلمـاء) (ح): ١-مەرەکێویی‌و بەرانەکێویی ٢-(ح)مێی هەڵۆ.
(زَلُّومَة): مەسـینە و (عند العامة): لوولەی مەسینە (وفَصيحها البُلبُل).
زمّ: (زَمَّ- هُ. زَمّاً): گرێیدا/ بەستی‌و شەتەکیدا.
(-الجمالَ): حوشترەکانی ڕەشمەکرد.
(-النَّعلَ): ئاوزەنگی بە سۆلەکەوە کرد.
(زَمَّمَ- الجمالَ): حوشترەکانی ڕەشمە کرد.
(أزَمَّ- النَّعلَ): سۆلەکەی ئاوزەنگیدارکرد.
(إنزَمَّ): بەستراو شەتەکدرا.
(ألزمام (ج) أزِمَّة): ١-پێبەستە/ هەر هۆیەك کە شتی پێببەسترێت ٢-جڵەو.
(«هـو زمـامُ قومـهِ»): جڵـەو بەدەسـتی خوێنگەلیمتی پێشەوایانە.
(«هو زمامُ الأمر»): ئەو کارە هەڵسـووڕێنە/ کاربەدەستە.
(«ألقوا في يدهِ زمام الأمر»): جڵەوی کارەکەیان داوەتە دەسـت ئەو چۆنی هەڵدەسـووڕێنێت

هەڵیبسوورێنێت.
(«هو علی زمام أمرِهِ»): شـكۆیی كارگێڕانو كاربەسەربردنی وەرگرتووە.
(زمــامُ النَّعلِ): ئاوزەنگیی سـۆڵو پێڵاو یان قەیتانی پێــڵاو..٢-(زَمَّ- البَعیرِ بِأَنْفِهِ زَمّاً): لووتی لەبەر ئازار بەرزكردوە.
(-الرَجُلُ بِرَأسِهِ): سەری بەرزكردەوە.
(-بِأَنْفِهِ): لووتیكردە ئاسمان/ فیزی نواند.
(-القَــومَ): لە ڕۆیشــتندا پێش خۆیشــكەل كەوت.
(-الذِئبُ السَخْلَةَ): گورگەكە بزنەكەی بە دان سەر بەرزكردەوە.
(-ت نابُ البَعیرِ زُموماً): كەڵبەی حوشترەكە دەركەوت/ دەرهات.
(زامَّ. مُزامَّةً): فیزینواند/ لووتبەرزیكرد.
(زامَمْتُ فُلاناً): بەربەرەكانیی فیســارەكرد/ بەرهەڵستیمكرد.
(إزْدَمَّ): بە فیزەوە سەری بەرزكردەوە.
(-الذئبُ السَخْلَةَ): گورگەكە سەری بزنەكەی بەرزكردەوە.
(الزُمَّام): گیای باڵاكردو/ بەرز.
٣-(زَمَّ- القُربَةَ. زَمّاً): كوندەكەی پڕكرد.
(-تِ القُربَةُ): كوونەكە پڕبوو.
٤-(زَمَّ- الزُنْبُـورُ. زَمیمــاً): زەردەواڵەكــە ویزەویزیكرد/ گیزەگیزیكرد.
٥-(رَجُلٌ زامٌّ (ج) زُمَّمٌ): پیاوێكی تۆقیو.
(اَلزَمَم): نزیك.
(«داری مِــن دارِهِ زَمَمٌ»): خانووەكەی نزیك خانووەكەیەتی.
(«امرُ القَومِ زَمَمٌ»): كارەكانیان خواستەكانیان لە یەك نزیكە.
(«وَجهي زَمَمَ بَیتِــهِ»): ڕووم لە خانوەكەی ئەوە/ بەرامبەریەم.
(اَلإزْمیم): مانگی دەمەداسی كۆتایی مانگ.
٦-(زُمْزَم- الشيءُ. زَمْزَمَةً): دەنگی شتەكە لە دورو بیسترا و ناڵەی هەبوو.
(-تِ النارُ): ئاگرەكە گڕیەگڕیبوو دەبیسترا.
(-المُغَنّــي): گۆرانیبێژەكــە لەبــەر خۆیەوە گۆرانیوت.
(-العُلوجُ): كەرە كێوییەكان بە دەم خواردنەوە بێدەنــگ لەگــەڵ یەكــدا بــە مرقەمــرق و منگەمنگ دەدوان و لە یەك دەگەیشتن.
(-الكأسَ): پەرداخەكەی هەڵداو خواردیەوە/ هەڵلوشی (عامیة).
(تَزَمْــزَمَ- الجَمَلُ): حوشــترەكە بــە قورگ بۆڕاندی.
(-ت بِهِ شَفَتاهُ): لێوی بە بۆڕەكەی بزوا.
(اَلزَمْزَمَــةُ (مص) (ج) زَمــازِم): ١-گرمەی هەور ٢-كڵپەی ئاگر ٣-نەرەی شێر.
٧-(زَمْزَم-هُ): كۆیكردەوەو ئەوەی لەملاولایشیەوە بوو هێنایەوە.
(-الشَيءَ): شتەكەی هەڵگرت و پاراست.

٨-(مـاءُ زَمْزَم وزَمْـزام وزُمَـزِم وزُمازِم): ١-ئاوێكی زۆر/ مشه ٢-ئاوێك نەشیرین و نە سوێر.

(«زَمْزَمٌ»): چاڵاوێكە/ بیرێكە لەلای كابەوەیە.

(اَلزِمْزِمَـةُ (ج) زَمـازِم وزُمْـزِم): كۆمەڵە حوشترو خەڵكێك.

(اَلزُمْـزُوم والزِمْزِيـم- مِـن الإبـلِ (ج) زَمازِيـم): ١-حوشـتری چاك یان حشـوتری هەڵبژاردە ٢-كۆمەڵە حوشـترێكی لەو جۆرە/ رەسەن و چاك.

(زمــت: زَمَــتَ وتَزَمَّــتَ زَماتَةً): ســالارو سەنگین و مەزنبوو.

(زَمِيت (ج) زُمَتاء وزِمِّيت): سالارو سەنگین و مەزن.

(«فُلان أزمَتُ النّاس»): فیسار سەنگینترین و سالارترینی خەڵكە.

(زَمَتَ-هُ. زَمْتاً): خنكاندی.

زمج: ١-(زَمَجَ- القربَةَ): كوندەكەی پڕكرد.

(-عَلَيهِم): بێرێدان و بانگكردن خۆی لە لایان داكوتاو دەستی بە خواردنكرد.

(اَلزامِج): هەمووی/ سەراپای.

(«أَخَذَهُ بزامِجِه»): سەراپای برد.

٢-(-زَمِجَ. زَمَجاً): توورە بوو.

زمج: توورە.

(اَلمُزَمِّج): توورە/ ڕقهەستاو.

٣-(اَلزُمَّج (ج) زَمامِيج (ح): شمقار.

(زُمَّيــجُ المــاءِ= النَــورَس) (ح): ماسـیگرە باڵندەیەكی ئاوییە سـپییە هێندەی كۆترێكە خواردنی تەنها ماسییە.

(اَلزمجِّى): بنكلكی باڵندە.

(زِمجَّةُ الظليم): دەنووكی وشترمرخ.

٤-(زَمْجَـر. زَمْجَرَةً): كەوتە گرمەو شـیڕەو هات و هاوار.

(زَمْجَرَ وتَزَمْجَرَت الأَسَـدُ): شـیرەكە كەوتە نەڕەو نەعرەتەلێدان.

(اِزمَجَّرَ): گرماندی و دەنگی لێبەرزكردەوە.

(اَلزَمْجَرَة (مـص) (ج) زَماجِر وزَماجِير): زورناو بلوێرو شمشاڵ و نەی.

(زَمْجَرَةُ كُلُّ شيءٍ): دەنگی هەموو شتێك.

زمح: (اَلزُمَّح والزَومَح): ١-بەدزمان/ ناپاك/ موخەنەت ٢-كورتەبنەی بەدفەسـاڵ ٣-قولی ناشیرینی شڕودڕ.

(اَلزامِح): دوومەڵ.

زمــخ: ١-(زَمَــخَ. زَمْخــاً): لووتبەرزییكرد/ فیزینواند.

(زامِــخ (ج) زُمَّــخ): بــە فیـزو دەعیــە، لووتبەرز.

(عَقَبَــةُ زَمَخٌ وزَمـوخٌ): ئەنجامێكی دووری نارەحەت و سەخت.

٢-(زَمْخَــرَ- النَمرُ): پڵنگەكــە دەمارگیر بوو زریكاندی.

(-الصَّوتُ): دەنگەكە توند بوو.

(اِزْمَخَرَّ): توند بوو.

(تَزَمْخَــرَ- النَّمرُ): پڵنگەكــە دەمارگیر بوو زریكاندی.

٢-(زَمْخَرَ- العُشــبُ): گیاكە ســەریدەرهێناو بالآیكرد.

(اَلزَمْخَــر): ١-درەختی چــڕی بەیەكداچوو/ زەبەنگ ٢-بلوێری گەورە/ كەرەنا.

(اَلزَمْخَــر والزَمْخَرِيّ): هەموو ئێســقانێكی بۆش كە مۆخی تێدا نەبێت.

(«رجُــلٌ زَمْخَــرٌ»): پیاوێكــی پایەبــەرز/ پایەدار.

(زَمْخَرَةُ الشَبابِ): نەوپەڕی گەنجێتی.

(-الشَجَرِ): پەلهاویشتن‌و كۆكبوونی درەخت‌و بەیەكداچوونی.

زمــر: (زَمَرَ. زَمْراً وزَمــيراً): بلوێرو زوڕناو جووزەلەو ئا لەو بابەتانەی لێدا.

(زَمَّــرَ): ئاخاوتنەكــەی بلاوكــردەوو وەك خەرەك هەر لێیدایەوە/ جاریدا.

(-النَّعامُ زِماراً): وشترمرخەكە قیراندی.

(زَمَّــرَ): بلوێرو زوڕناو جووزەلەو شــتی لەو بابەتەی لێدا.

(اَلزَمْر (مص) والزَمَر (ج) زُمُور): دەنگ.

اَلزَمِر (م) زَمِرَة): بلوێرژەن‌و جووزەلەژەن‌و شمشاڵژەن.

(غِناءٌ زَمِرٌ): گۆرانییەكی خۆش‌و چاك.

(اَلزِمّار) (مص): دەنگی وشترمرخ.

(اَلزِمــارَة): بلوێرژەنــی‌و جووزەلــەو نای‌و شمشاڵژەنیی.

(اَلزَمّار): بلوێرژەن‌و نەیژەن‌و شمشــاڵژەن‌و جووزەلەژەن.

(اَلزَمّارَة (مو): جووزەلەو زوڕناو بلوێرژەنیی.

(اَلمِزمــار والمَزمور والمُزمُــور (ج) مَزامیر): سروورد.

٢-(زَمِرَ. زَمَراً): ١-كۆســتە بــوو كەممو بوو ٢-نامەرد بوو/ كەمپیاوەتیبوو.

(تِ الشاةُ): مەڕەكە كەمخۆریبوو.

(اِسْتَزمَرَ- الرَجُلُ عِندَ الهَوانِ): لە كەساسیدا چوو و خۆی بە بێدەسەلآت‌و توانا پیشاندا.

(اَلزَمِر (م) زَمِــرَة): ١-كەمموو یا كەمخۆری ٢-كەمپیاوەتی.

(عَطِيَّةٌ زَمِرَةٌ): بەخشینێكی كەم.

(اَلزَمارَةوالزُمورَة): نارمەردیی/كەمپیاوەتیی/ بێویژدانیی.

(اَلزَمیر (ج) زِمار): كورت.

(اَلزُمَّیر والزُمَّیر) (ح): ماسییە دڕكە/ جۆرە ماسییەكە دڕكێكی بەرزەی لەسەر پشت هەیە بە زۆریش لە ئاوی شیریندا‌و لە ڕووبارەكاندا دەبێت.

٣-(زَمَرَ- الظَبيُ. زَمَراناً): ئاسكەكە رەویكرد.

(اِزْمَارَّ): وا تووڕە بوو چاوی سوور هەڵگەڕا.

٤-(زَمَرَ وزَمَّرَ- القِربَــةَ. زَمْراً): كونەكەی پڕكرد.

٥-(زَمَــرَ- فُلاناً بِفُلانٍ زَمْراً): فیسـاری بە فیسار لاسدا/ لە خشتەبرد.

(اَلزَمُور والزَمیر): مێردمنداڵی جوان.

٦-(اَلزمِرّ): زۆر سەخت/ ڕەق.

(اَلزُمْــرَ (ج) زُمَر): ١-دەســتە/ گروە/ تاقم ٢-كۆمەڵە خەڵكێك.

اَلزومَر): كۆمەڵە خەڵكێك.

٧-(اَلزُمُرُّد والزُمُرُّذ) (فارسیة): زمروت.

زُمُــرُّدَة: پارچەیــەك زمــروت. بەردێكــی گرانبەهایە ڕوونەو زۆر سەوزە ئەوەی كە زۆر سەوزیشە ڕوونترین بەنرخترینیەتی.

زمز: (زَمْزَرَ- الوِعاءَ): قاپە پڕەكەی ڕاوەشاند تا زۆرتر بگرێت.

زمــع: ١-(زَمِعَ- مِنــهُ زَمَعاً): ١-حەپەســا/ واقیوڕما ٢-لێیتۆقی.

(اَلزَمَــع (مص) (ج) أزمــاع): ١-موچڕك كە بــە پیاودا دێت كاتێك نیــازی كردنی كارێكی گرنگــی هەبێــتو بڕیــاری كردنــی بــدات ٢-دڵخوردیی.

(اَلأزمَــع (ج) لَزامِع): كاری خراپو بێرعەتو ناشیین/ كاری نەشیاو.

٢-(زَمَــعَ- الأرنَبُ. زَمْعــاً وزَمَعاناً) (ضد): ١-كەروێشــكەكە خێرایكــرد/ گورپیدایە خۆی ٢-سستیكرد/ هێواش ڕۆیشت.

(لَزمَعَ- تِ الأرنَبُ): كەروێشــكەكە سووكپێو خێرابوو.

(اَلزَمَع (مص) (ج) أزْماع): ١-مرۆڤی سووكو رِســوا/ خوێڕیی/ هەرچیو پەرچی ٢-خاوەن شەشپەنجەو زیاتر.

(اَلزَمَعَةُ (ج) زَمَع وزِماع): ١-قنچكێكی بەرزەو زیادەیە لە دوای سمەوەیە ٢-تووكی شۆڕەوەبوو بە پشتی قاچی مەڕ یان ئاسكەوە.

(اَلزَمْعِي): لەچەر/ هیچو پووچ.

(رَجُلٌ أزمَع): پیاوێكە پەنجەپتر.

(اَلزَمیــع (ج) زُمَعَــاء والزَمُــوع): خێــرا/ چابوك/ گورج.

٣-(زَمَّــعَ- الأمــرَ وعَلَیهِ وبِهِ): لەســەر بە ئەنجامگەیاندنی كارەكە ســوور بوو/ هەتەر بوو.

(أزمَعَ): سوور خواستبوو.

(اَلزَمَع والزَماع): سوورخواستی/ ئەنجامدانی كارو هەتەربوون.

(اَلزُمَّع): بە تەنگەوە نەهاتوو/ دەماغنەسووتێن.

(اَلزَمیع (ج) زُمَعاء): ١-بێباكو سوورخواست ٢-ڕا دروست.

(اَلزِمْعِيّ): مرۆڤی فوشقی/ زوو تووڕە بوو.

(اَلأزمَع (ج) أزامِع): پیاوی زۆرزانو فێڵاوی.

(اَلمُزْمِــع) (فــا): ســوورنیاز/ ســووربڕیار/ سوورخواست.

٤-(زَمَّــعَ- الــزُنْــبُورُ) (ج): زەردەواڵــەكــە گیزەگیزی كرد.

(اَلزُمَّع) (ح): زەردەواڵەی بێهەزوو.

٥-(أَزمَــعَ- الكــرمُ): پەلی مێوەكــە لە خوار هێشووەوە گرێیدەركرد.

(ألَزَمَــع): ١-گرێی خوار هێشــوو ٢-جۆگەلەی بچووكی تەسك ٣-لێشاوێكی كەم.

(ألَزْمَعَةُ): پەلە/ پارچە.

(«أَرضٌ فيها زُمْعَــةٌ مِنَ النَبات»): زەویەكە پەلەیەك گیای تێدایە.

(ألَزَمَعَةُ): تەپۆلكەیەك/ بەرزاییەكی بچووك.

زمق: (زَمَقَ- القِفلَ): قفلەكەی كردەوە.

(-اللِحْيَةَ): ریشەكەی مووكێشكرد.

(اللحيــة الزَميقَة والمَزموقَة): ریشــی موو هەڵكێشراو.

(«ماأغنى عَنهُ زَمَقَةً»): هیچ دادینەدا.

زمك: ١-(زَمَكَ. زَمْكاً): پێدەنگبوو.

٢-(زَمَــكَ- هُ عَلَيَّ. زَمْكاً): لێیهاندام تا تەواو لێم تووڕە بوو.

(إزماكٌ): زۆر تووڕە بوو/ دەمارگیر بوو.

(ألَزَمَك): قوشقیبوون/ تووڕەبوونێكی زۆر.

(ألَزَمَكَةُ- مِنَ الرِجال): ١-پیاوی قوشقی/ زوو هەڵچوو/ كەمچیكڵدانە ٢-گەموج.

٣-(زَمَــكَ. وزَمَّــكَ- القِربَــةَ): كوندەكــەی پڕكرد.

(«زَمَّكَ- الثَوبَ»: جلەكەی واتەســككرد تا بە لەشدا بچەسپێت (عامية).

ألَزَمَكُ: شت بەیەكداچوون.

٤-(ألَزَمَكَة مِنَ الرِجالِ (ج) ألَزَمَكُون): پیاوی كورتەبنە/ كورتەبالا.

(ألَزِمكَّــى والزِمِكُّ): كلكی باڵندە یان بنكلكی باڵندە.

زمل: ١-(زَمَلَ- الأَعْرَجُ زِمالاً): شــەلەكە بە لەنگینەوە بە شەلەشەل رایكرد.

(-تِ الدابَّــةُ زَمْلاً وزَمَلاً وزِمــالاً وزَمَلاناً): چوارپێكــە لە رۆیشــتندا لەنگەی بۆ دەكردو هێواش دەڕۆی.

٢-(زَمَــلَ- الرَفيــقَ. زَمْــلاً): هاوڕێكەی لە پاشكۆی خۆیەوە سواركرد.

(-الرَجُلَ): شوێن پیاوەكە كەوت.

(زامَلَ الرفيقَ): لە سواری حوشترەكەدا هاوتای هاوڕێكەیكــرد، ئەم لە تایەكی كەژاوەكەو ئەو لە تایەكەیتر.

(ألَزمل): ئەوەی لە پاشكۆوە سواردەبێت.

(ألَزَمَــل والزَمَلَةُ والأَزمَلَةُ): مــاڵو منداڵ/ خێزان.

(ألَزُمْلَةُ): ١-هاوڕێیەتیی/ برادەریی/ هاوەڵیی ٢-كۆمەڵ.

ألَزميل: ١-هاوەڵ/ هاوڕێ/ برادەر ٢-هاوپیشە.

(ألأَزمَل (ج) أزامِل وأزاميل): هەموو شتەكە.

(«أَخَذَ الشــيءَ بأزمَلِــهِ وبأَزمُلِهِ»): هەموو شتەكەیبرد.

(ألأَزمَلَةُ): شتەكە هەمووی.

(«إِاخَــذَهُ بأَزمَلَتِهِ»): بــە كەلوپەلو هەموو شتێكەوە بردی.

(«لَهُ عيالٌ أَزمَلَـةٌ»): خێزانی زۆره/ عەلەو جەلەی زۆریهەیە.

(زَمَلَ- الشَيءُ. زَمْلاً): شتەکەی هەڵگرت.

(إزدَمَلَ- الحِمْـلَ): بارەکەی بە جارێك برد/ کۆڵەکەی یەکسەر هەڵگرت.

(اَلزمل=الحِمل): بار یان کۆڵ.

(اَلزامِلَة): ١-مێی وشەی (الزامِل) ٢-حوشترو وڵاخی بارەبەر/ بارهەڵگر.

(اَلزامِل): بارهەڵگر/ کۆڵهەڵگر.

(اَلإزْمِيل): پیلوی بەهێزو پتەو.

(اَلمُزَمِّلَـةُ): گـۆزە یـان مەرکانـەی نـاو ساردکردن.

٤-(زَمَـلَ-تِ القَـوسُ. زُمـولاً): کەوانەکـە درەنگەیهات.

(اَلأَزمَل (ج) أَزامِل وأَزاميل): دەنگی ئاوێتە/ ژاوەژاو.

(اَلأَزمَلَة): درنگەی کەوان.

(اَلأُزمولَـة والإزمُولَـة): کەڵەکێوی و ئەوەی وەك ئەوە کە دەبارێنێت و دەمرقێنێت.

٥-(زَمَّلَ- الشَيء): شتەکەی شاردەوە.

(-الشَـيءَ بِثَوبِهِ أَو في ثَوبِهِ): شـتەکەی بە کراسـەکەی شـاردەوە یان لە کراسـەکەیەوە پێچایەوە.

(تَزَمَّـلَ وتَزَمَّلَ وإزدَمَـلَ- بِثَوبِهِ): جلەکەی لـە خۆیەوە پێچایەوە/ خـۆی بە بەرگەکەی داپۆشی.

(اَلزَمِل والزُمَّـل والزُمَيل والزُمَيْلَة والزُمَّل والزُمَّـال والزُمّالَـة والزُمَّيـل والزُمَّيلَة): بوودەڵـەی زیرەکردوو (بۆیـە وای پێدەڵێن وەکو لە تۆقین و ترساندا خۆی لە جلەکەیەوە بپێچێتەوەو بنوێت).

(اَلإزمَـل): ١-زۆر ترسـنۆك/ زیرەکـردو ٢-بوودەڵە.

(اَلإزميل): بوودەڵە.

اَلمُزَمَّل (م) (اَلمُوَزَمَّلَة والمُتَزَمِّل): خۆداپۆشیو (ئیدیۆمە) بە یەکێك دەڵێن کە کەمتەرخەمو گوێنەدەر بێت و کەموکوڕ بێت لە کاروباردا.

٦-(اَلإزميل) (یونانیــة): ١-گازنەی پینەچی ٢-سـمۆ/ قەڵەمی ئاسن بۆ کونکردنی ئاسن و ئەسکەنە بۆ کونکردنی دار ٣-چەکوش.

الملحق:

زمل: (الزِّمالَـة: هاوەڵێتیی لـە کارکردندا. لـە خوێندندا یـان هاوپیشـەیی. هاوەڵێتیی کە میانەو دۆسـتایەتیی گەرمو پتەوو خۆش پەیدادەکات.

---

زمـن: ١-(زَمِنَ. زَمَنـاً وزُمْنَـةً): گرفتاری ناتەواویی لەشبوو یان کەمئەندامبوو.

(أَزمَـنَ- هُ اللهُ): خـودا تووشـی ناتەواویـی لەشیکرد، کەمئەندامیکرد.

(اَلزمانَة): ١-کەمئەندامیی ٢-ناتەواویی لەش ٣-پەککەوتنـی هەندێـك ئەنـدام یـان لەش پەککەوتـن و بێتوانایـی ٤-خۆشەویسـتیی/

ئەڤین/ دڵداریی/ حەزلێکردن

(اَلزَمِــن (ج) زَمِنون والزَمِــين (ج)( زَمنى وزَمَنَة):١-دەردەدار/ لەشناتەواو ٢-کەمئەندام ٣-پەککەوتەو بێتوانا.

(«فُلان زَمِنُ الرُغبَة»):ئارەزوو پەککەوتەیە/ ئارەزوو مردووە.

٢-(أزمَنَ- الشَــيءُ): شــتەکە دەمێکی زۆری بەسەردا تێپەڕیوە.

(«أزمَنَ عَني عَطاءَكَ»):دەمێکە بەخشینەکەتم وەرنەگرتووە.

(-بالمَكانِ):دەمێکە لە شوێنەکەدا نیشتەنییەو ماوەتەوە.

(اَلزَمَن (ج) أزْمان وأَزْمُن والزَمان (ج) أزمِنَة والزَمَنَة):١-سەدە/ چاخ ٢-کاتو دەم درێژبێت یان کورت ٣-زەمان/ سەردەم/ ڕۆژگار.

(أزمِنَةُ السَّـنَة): چوار وەرزی ســاڵ: بەهارو هاوینو پایزو زستان.

(زَمَنٌ زامِنٌ): سەردەمێکی سەخت.

(عامَلَـهُ مُزامَنَــةً): بەپێــی کات لەگەڵیــدا جووڵایەوە یان ڕەفتاریکرد.

(مَرَضٌ مُزْمِن) (فا): دەردی درێژخایەن.

زمه: (زَمِهَ- الحَرُّ. زَمَهاً): گەرما تاویسەند.

(-الرَجُــلُ بالحَرِّ): گەرمــا زێفی لە پیاوەکە سەند.

(-تِ الشَمسُ الرَجُلَ): گەرمای خۆر زۆری بۆ پیاوەکە هێنا.

٢-(زَمْهَــرَ-تِ العَينُ): لــە تووڕەییدا چاوی سوورهەڵگەڕا.

(إزمَهَرَّ- الوَجهُ): ڕووی ڕەشداگەڕا.

(-تِ العَــينُ): لــە تووڕەییــدا چــاوی سوورهەڵگەڕا.

(اَلمُزَمْهِرّ): زۆر تووڕە.

٣-(إزْمَهَرَّ- اليَومُ): ڕۆژەکەی زۆر سارد بوو.

(اَلزَمْهَرِيــر): ســەرمای تــووش/ ئەوپەڕی سەرما/ سۆڵەی سەرما.

٤-(إزمَهَرَّ- تِ الكَواكِبُ):هەسارەکان بریسکانەوە/ ورشەورشیانبوو.

(اَلمُزَمْهِرّ): مرۆڤی دەمبەپێکەنین/ ڕووخۆش.

٥-(إزمَهَلَّ- المَطَرُ): باران باری.

(-الثَلــجُ): بەفرەکــە توایەوەو ئــاوی لەبەر هەڵنیشت.

زنّ: ١-(زَنَّ- عُصبُــهُ. زَنّــاً): دەمارەکــەی وشکبوو.

(-الرَجُلُ): جومگەکانی شلبوو.

٢-(زَنَّ-ُ بِخَيرٍ أو شَــرٍّ. زَنّاً): بە باش یان بە خراپ ئەوی هاتە بەرچاوو بیر.

(-هُ بِكَذا): بەوە گومانباریکرد.

(أزَنَّ- هُ بخَــيرٍ أو شَــرٍّ): وا بــۆی چــوو کە چاکبێت یان کە خراپبێت.

٣-(زَنَّــنَ- الرَجُــلُ): پیاوەکــە خوویدایــە ماشخواردن.

(اَلزِن) (ن): ماش.

(حنْطَةُ زَنَّةٌ): گەنمێك هی بەراوبێت.
(اَلعُــذِي): گەنمی دێمیی. كە هــەر بە باران
ئاوبدرێت.
٤-(اَلزَنَن): تەسك/ تەنگ.
(ماءٌ زَنَنٌ): ئاوێكی كەم.
(ظِلٌ زَنانٌ): سێبەرێكی كەم.
(اَلزِنِّين): كەسێك كە میزی خۆی یان پیسایی
خۆی بگرێت.
زنــأ: ١-(زَنَــأَ- فِي الجَبَلِ زَنْأً وزُنُــوءاً):١-بە
شاخەكەدا سەركەوت هەڵزنا.
(-الرَجُلُ): خێرایكرد/ پەلەیكرد.
(-إلَيه): خۆی دایە پاڵی/ پەنایبۆبرد.
(-بَولَه. زَنْأً): میزەكەی راگرتو نەیكرد.
(-بَولُهُ زُنُوءاً): میزەكەی گیراو بۆی نەكرا.
(زَنّــأَ- عَلَيهِ): تەنگەتاویكــرد/ بەگیرپهێنا/
تەنگی پێهەڵچنی.
(اَزنَأَ- هُ إزناءً):١-گرتی/ بەستی ٢-هەڵیزنان/
سەریخست ٣-پەناپێبرد.
(اَلزَنــاء): ١-میزراگرتــوو ٢-تەنگ/ تەســك
٣-گۆڕ.
(اَلزَنيء): جەوەندەی بچووك.
٢-(زَنَــأَ الظِلُّ. زَنْــأً وزُنوءاً): ســێبەرەكە
كشایەوە كورتبووەوەو چووەیەك.
(-الرَجُلُ): بە زەویەكەوە نووسا.
(اَلزَناء): كورت.
٣-(زَنَأَ- الرَجُلُ. زَنْأً وزُنوءاً): كەیفخۆشــبوو
و كەوتە گۆرانی.
زنب: ١-(زَنِبَ. زَنَباً): قەڵەو بوو.
(اَلأَزْنَب): كورتەبنەی قەڵەو/ گرگن.
(اَلزَيْنَب): زیرەكردوو/ زۆرترسنۆك.
(- (ن): جــۆرە نێرگزێكــی بــۆن خۆشــە
درەختێكە دیمەنجوانو بۆنخۆشە.
(اَلزَئنَبَى): لەسەرخۆ رۆیشتن.
(زُنابَةُ العَقْرَب): چزوی دووپشك.
٢-(تَزَنْبَــرَ- عَلَيهِ):١-فیزی بەســەردا نواند
٢-رووی گرژ كرد.
(اَلزُنْبُر) (ح): شێر.
(اَلزَنْبَــرِيُّ):١-پیاوی قورسو گران ٢-پاپۆڕی
مەزن.
(سَفِينَةٌ زَنْبَرِيَّةٌ): پاپۆڕێكی مەزن.
(اَلزُنْبُر):١-رۆحسووكو زمانشیرین/ بەوێڵ/
بەدەموپل ٢-گورج وەڵامدەر.
(اَلزُنبور): زەردەواڵە.
(- (ج) زَنابِير اَلواحدة زُنبورَة) (ح):زەردەواڵە/
مێروجەیەكە باڵتەنكە ڕەنگ زەردو ڕەشە نێوان
ســنگیو ورگی باریكــەو وەك هەنگ شــانەیان
هەیەو شاریانهەیە بەڵام هەنگوین دروستناكەن.
نەوعیان هەیــە گەورەیەو پێوەدانیان ئازار زۆر
دەدات زیانیان بۆ كوورەی هەنگ زۆرە.
(اَلزَنْبِر والزِنبار) (ح): مێشەگەزە.
(اَرضٌ مَزْبَرَة): خاكێكو شوێنێك زەردەواڵەی
زۆر بێت.

٣-(اَلزُنْبُـرُك) (فارسـية) (النابـض): زەمبەلەك كە چەرخـی کاتژمێر دەگێڕێت‌و دەسووڕێنێتەوە.

٤-(اَلزنباعَة): قەراغی پێڵاو یان سۆل.

٥-(اَلزَنْبَـق (ج) زَنابِق): ١-ڕۆنی یاسـەمین ٢-بلوێر، نای، زورنا.

(زَنْبَقَة): بلوێرێك، نایەك زورنایەك.

(زَنْبَقَة (ج) زَنابِق (ن): گوڵەشلێر/ پەلەزی/ جوانترین گوڵەو بۆنی خۆشـەو سـەرچاوەی بوونـی خۆرهەڵاتی ناوەڕاسـتە بـە تایبەتی لوبنان سـپیەکەی هێمـای پاکییەو گوڵەکەی زۆر ڕەنگی هەیە.

(أُمُّ زَنْبَق): مەی.

٦-(اَلزُنْبُل): پیاوی کورتەبنە.

زنت: (تَزَنْتَرَ): بە خۆبادانەوە ڕۆیشت.

(اَلزَنْتَـرَةُ): تەنگانەو نەبونی‌و سـەختیی/ خاکەساریی.

زنج: ١-(زَنِـجَ. زَنَجاً): لە تینواندا ڕیخۆڵەی کرژبوو.

(زانَجَ- هُ): پاداشتی دایەوە یاسا بە چاکە یان بە خراپە.

(تَزَنَّـجَ- علیه): بە گژیدا چوو زماندرێژیی لەگەڵدا کرد.

(اَلزَنْـجُ والزِنْـجُ (ج) زُنـوج): قولـەڕەش نەتەوەیەکن لە سوداندا.

زِنجي أو زَنْج: قولە ڕەشێك.

٢-(اَلزَنْجَبيل): مەی.

(- (ن)): ڕووەکێکـی گیاییـە سـەرچاوەکەی هندسـتانە ڕەگی بەژێر زەویدا درێژدەبێت‌و گرێی تێدا پەیدا دەبێت کە دەم دەچووزێنێتەوە ئەم ڕەگانە لە ڕووەکێك جیادەبێتەوە کە وەك قامیشە (فارسية): زەنجەفیل.

٣-(زَنْجَـرَ): چەقەنـەی بـە پەنجەلێدا بە پەنجە گەورەو پەنجە درێژە.

(اَلزَنْجير): لەتی نینۆك کە لێیدەکرێتەوە.

(اَلزِنْجير والزنجيرَة): پەڵەی سـپیی نینۆك کە لە هی منداڵدا دەردەکەوێت.

٤-(اَلزِنْجار) (ك) (فارسية): ژەنگی مس.

(اَلزنجير) (فارسية) (= السِلسِلَة): زنجیر.

(زَنْجَرَهُ): بە زنجیر بەستییەوە.

(تَزَنْجَرَ): زنجیرکراو.

(جنزير) (عامية): زنجیر.

٥-(اَلزِنْجَفـر والزُنْجُفر) (ك): بۆیەی ژەنگ کە ئاسنی پێ‌بۆیە دەکرێت تا ژەنگ نەگرێت (فارسية).

زنح: (زَنَحَ- هُ. زَنْحاً): پیایدا هەڵدا.

(زانَحَ- هُ): بەیەکتریاندا هەڵدا.

(تَزَنَّـحَ الرَجُلُ): ١-ئەوەی لـە دڵیدا بوو بە ئاشکرا دەریبڕی ٢-خۆی هەڵکێشا.

٢-(زَنَـحَ- هُ): ١-پاڵپێوەنا ٢-خراپ ڕەفتاری لەگەڵدا کردو تەنگی پێهەڵچنی.

(زَنَّحَ- اللهَ): جار لە دوای جار ئاوی‌خواردەوە.

(تَزَنَّخَ- الماءَ): خۆش خۆش ئاویخواردەوە.

(-الرَّجُلُ): لە کڕین و فرۆشتندا یان لە قەرزدا تەنگی بە مرۆڤێك هەڵچنی و وەڕسیکرد.

زنخ: ١-(زَنَخَ- القُرادُ زُنُوخاً): گەنەکە توند خۆی قایمکرد بەوەی کە پێوەیبوو.

(زَنِخَ- الدهنُ. زَنَخاً): ڕۆنەکە خراپبوو/ بۆگەنبوو.

(زَنِخٌ): ڕۆنی بۆگەن/ خراپ.

(زانَخَ- هُ): پاڵیپێوەنا.

(تَزَنَّخَ): ١-لووتبەرزیی نواند ٢-بێپەروا قسەیکردو خۆیشی هەڵکێشا.

(إبلٌ زَنِخَةٌ): حوشتری لە تینواندا تێقوپاو.

٢-(زَنْخَرَ بِمِنْخَرِهِ): بای بە لووتدا کرد.

زند: ١-(زَنَدَ- الإناءَ. زَنْداً): قاپەکەی/ دەفرەکەی پڕکرد.

(-النارَ): چەرخەکەی داگیرساندو ئاگری لێدەرهێنا.

(زَنَّدَ- السِّقاءَ): کوندەکەی پڕکرد.

(أوري زَنْدَه): ئاگری بە چەرخەکە کردەوە.

(«مايَزنِدُك أَحدٌ عَليه»): کەس وەك تۆ ئاگری پێناکرێتەوەو لە تۆ زیاترینییە.

(ألزَنْد (مص) (ج) زِناد وأزْنُد وأزناد): چەکوشی چەرخ کە ئاگری چەرخەکەی پێدەکرێتەوە/ ئەستێ.

(ألزَنْدَة): بەشی خوارەوەی چەرخەکە کە تێزی بەسەروەیەو ئاگرەکەی پێدەکرێتەوە/ بەردە چەرخ/ بەردەئەستێ بە هەردووکیان دەڵێن (ألزَندان).

«فلان واري الزَندِ»: فیسار بەدەست و بازووە. واتا لە کاردا سەرکەوتووە.

(«كابِي الزَند»): دووراوە/ سەرنەکەوتووە.

(«هُما كَزَنْدَين»): هەردووکیان لە تای ترازوویەکدان، وەك یەکن (بۆ خراپی و پیسی بەو دوانە دەڵێن بۆ دوانی وەك یەکی فریاگوزاریش دەوترێت).

(ألزِناد): کەسێکە بەفریابکەوێت و یاریدەبدات.

(«وَرَت بِكَ زِنادي»): واتا: ئاگرەکەم بە تۆ کرایەوە پێداویستیەکەم بە تۆ جێبەجێبوو.

٢-(زَنِدَ الرَجُل. زَنَداً): تینوبوو.

(زَنِدَ- في الأمرِ): لە کارەکەدا بێتابوشت و وەڕسبوو.

(-على أهلِهِ): لەگەڵ خێزان و ماڵ و منداڵەکەیدا توندو تیژیی نواند.

(أزنَدَ- الرَجُلُ في وَجعِهِ): ئاگری ئازاری تێبەربووەوە/ ئازارەکەی بۆ گەڕایەوە.

(تَزَنَّدَ): ١-تووڕە بوو ٢-زمانی بەسترا و وەڵامی بۆ نەدرایەوە.

(«سَألْتُهُ مَسألَةً فَتَزَنَّدَ»): پرسیارێکم لێکرد وەڵامی بۆ نەدرایەوەو لێی چووە بەست.

(-في أمرِ كذا): لەو کارەدا دۆشداماو دڵی تەنگبوو هیچی بۆ نەکرا.

(ألمُزَنَّد): ١-تەنگ ٢-چرووك/ ڕژد ٣-بەرگی تەسك.

(عَطـاءٌ مُزَنَّــد): بەخشــینێكی چرووكانەو كەم.

٣-(زَنَّدَ): درۆیكرد.

(اَلْمُزَنَّد): بەخێوكراو یان رەسەن نەزانراو.

٤-(اَلزَنْــد (ج) زِنــاد وأزْنُد وأزْنــاد) (ع ١): بازوو.

اَلزَنْــد أو المِغْــلاق (ن): پەڵە گوڵە هێشــوو پەلێكــە چەنــد گوڵێــك هەڵدەگرێــت هەر گوڵەیشی لاسكی خۆی دەبێت.

(تَزَنْدَقَ): بوو بە زندیق.

(زِنديق (ج) زَنادِقَة وزَناديق) (فارســية): كەسێكە بە سەر زاریی موسڵمان‌و لە دڵیشەوە كافرو بێبڕوابێت.

(اَلزِنديق): مرۆڤی پیسی زۆرزان‌و كەڵەكباز (عامية).

اَلزَنْدَقَــة: بەســەر زاریی موســوڵمانیی‌و لە دڵەوە كافریی‌و بێبڕوایی.

(رَجُــلٌ زَنْــدَقٌ وزَنْدَقِــيٌ): پیاوێكــی زۆر چرووك.

زنر: (زَنَرَ- الإناءَ. زَنْراً): قاپەكەی پڕكرد.

(-الغُلامَ): پشتێنی بەستە پشتی كوڕەكە.

(زَنَّرَ- إلَيَ بِعَينِهِ): چاوی تێبڕیم.

(تَزَنَّرَ): پشتێنی بەستە ناوقەدی.

(-الشيءُ): شتەكە باریكبوو.

(اَلزُنّــار (ج) زَنانــير (یونانية): پشــتێن/ ئەوەی بە كەمەرەوە دەبەسترێت.

(اَلزَنانير): وردەچەو.

زنزر: (اَلزَنْزَلَخت= الأزادَرَخت (ن): درەختێكە جوانە لە وڵاتی فارسەوە هاتووە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاســتدا بۆ جوانیی دەروێنرێت هێشووە گوڵەو دارەكەیشی باشە/ درەختی ژارماسی.

زنف: (زَنِفَ وتَزَنَّفَ. زَنَفاً): تووڕە بوو.

زنق: (زَنَــقَ- الفَرَسَ. زَنْقــاً): چەرمی ژێر چەنەی ســەركەلەكەی خســتە ژێر چەنەی ئەسپەكەوە.

(-البَغْلَ): چوارپەلی ئێســترەكەی بە پەتێك بەستەوە.

(-علــى أولادِهِ): كەموكوڕیــی بەرامبــەر منداڵەكانیكــرد ســا یا لە چرووكیــدا یان لە نەدارابیدا.

(زَنَّــقَ- الفَــرَسَ): چەرمی ژێــر چەنەكەی خستە ژێر چەنەی ئەسپەكەیەوە.

(-البَغْلَ): چوارپەلی ئێســترەكەی بە پەتێك بەستەوە.

(-علــى أولادِه): چروكیكــرد لــە بژێویــی منداڵەكانیدا یان لــە نەبوونیدا كەموكوڕیی هەبوو.

(اَزنَــقَ- على أولاده): لــە چرووكیدا یان لە نەبوونیدا كەموكوڕیی لە منداڵەكانیكرد.

(اَلزَنَق (ج( زُنُوق): ١-لووسی‌و سافیی نووكی نێزە ٢-جێی قایشی ژێر چەنەی وڵاخ.

(اَلزَنَقَةُ): ١-ڕێی تەخت‌و تەسك ٢-شەقام.

(اَلزناق (ج) زُنُق): ١-قایشی ژێر چەنەی وڵاخ ٢-پەتی بەستنەوەی پەلی ئێستر ٣-گەردنبەند: جۆرە خشڵێکە دەکرێتە مل.

(اَلزناقة): ئەڵقەیەکە لە چەرمۆکەیەکدایەو لەژێر چەنــەی وڵاخەکەدایە پەتێکی پێوەیە بــە سـەری وڵاخەکــەوە دەبەســترێتو بــۆ ڕاگرتنیەتی.

(اَلزَنیق): قایم دامەزراو.

(رأیٌ زَنیق): ڕایەکی دروستو دامەزراو.

(اَلمَزنوق (مفع): میزگیراو.

زنك: (اَلزِّنك (ك): تۆتیا (اَلمانیة).

زنــم: ١-(زَنَّــمَ – لَهُ الخَصْــمَ): نەیارەکەی نیشانەی بەگژداچوونی بۆ نارد.

٢-(اَلزَنِم- مِنَ الجمال (م) زَنِمَة): حوشترێکە لەتێکی گوێی بڕراوەو پێوەی شۆڕکراوەتەوە.

(اَلأَزنَــم مِنَ الجِمال (م) زَنمــاء (ج) زُنم): حوشــترێك لەتێکی گوێــی بــڕراوەو پێوەی هێڵراوەتەوەو شۆڕکراوەتەوە.

(اَلزَنَمة): ١-ئەو پارچەیەی کە لە گوێی حوشتر یان مەڕ دەبڕرێتو پێوەی دەهێڵرێتو پێوەی شۆڕدەکرێتەوە (ئەمە لە حوشترە ڕەسەنەکان دەکرێــت) ٢-گــوارەی بــەر گەردنی ئــاژەڵ ٣-نیشانە.

(«فِي کَلامِــهِ زَنَمَةُ خَیرٍ أَو زَنَمَةُ شَــرٍّ»): لە قســەکەیدا ئامارژەو نیشانەی خێرو چاکە یان خراپەی تێدایە.

(زَنَمَتــا الأُذُنِ) (ع ا): دوو برگەی گوێ/ دوو بەرزی بەر کونە گوێیەو بەرامبەر سەرەوەی کرکراگەی گوێیە.

(اَلزُنام): زۆرزانی فێڵباز.

(اَلزَنیم): ١-بەدزمان/ موخەنەت ٢-ناکەسبەچە.

(اَلزَنیم والمُزَنَّم): کەســێکی پێوە لکاو. خۆی بە تاقمێکدا هەڵواســێت کە نە لەوانبێتو نە پێویســتیان پێیبێت وەکو پارچەیەکی بڕاوی گوێ کە پێوەی بەربووبێتەوە.

(ناقَةٌ مُزَنَّمَة): مێحوشترێکی گوێ پارچەکراو کە پارچەکەی پێوەبێت.

(زَنا: زَنا زُنُوّاً): تەسکبوو/ تەنگبوو.

(زَنِيّ): تەنگ/ تەسك.

زَنَّــی عَلَیهِ تَزنِیَــةً): تەنگەتاویکرد/ تەنگی پێهەڵچنی.

زنی: ١-زَنَــی وزَانی. زِنــاً وزَنــاءً ومُزاناةً وزِناءً): زینایکرد/ داوێنپیسیکرد.

(زان (ج) زُناة (م) زانِیَة (ج) زَوان): زیناکار. داوێنپیس/ شەرواڵپیس.

(زَنَّــی- هُ): بەداوێنپیســی دانــا. پێیــوت: زیناکەر.

(أَزنَی- هُ. إزناءً): زینای پێکرد/ داوێنپیسیکرد.

(اَلزانِیَة= الزاني): زۆر داوێنپیس (ئەو (ة)یە بۆ زیادرەوییە).

(اَلزَنّــاءَة): پیــاوی زۆر داوێنپیــسو ژنــی قەحبە/ گاندەر.

٢-(أَلزَنَّاءَة) (ح): مەیمون.

زە. زە: ئیف وشـەیەکە بـۆ ئافەرینکردن بۆ گاڵتەپێکردنیش دەوترێت کە شتێك ناڕێكو نابەجێبێت.

زهد: ١-(زَهَدَ وزَهِدَ وزَهُدَ- فِي الشيءِ وَعنهُ زُهداً وزَهادَة): ئارەزووی بۆ ئەو شتە مراندو نەویست لێیدورکەوتەوە.

(«زَهِــدَ فِي الدُنيا»): وازی لە دنیا/ لە جیهان هێناو کەوتە خوداپەرستیی رووت.

(زاهِد): دنیا نەویستو خوداویست/ سۆفی.

(الشــيء المَزهُــود (فيــه وعَنــهُ): شــتی وازلێهێنراوو نەویستراو.

(زَهَّدَ- هُ فِي الشَــيءِ وعَنهُ) حەزی شــتەکەی مراندو وایلێکرد نەیەوێت.

(تَزَهَّدَ): وازی لە دنیا بۆ خوداپەرستی هێنا.

(تَزاهَدَ- القَومُ فُلاناً): خوێشــگەل بە چاوی سووك تەماشای فیساریانکردو سوکیانکرد.

(إِزْدَهَدَ- الشَيءَ): بە هەرزانو بێبایەخیدانا.

(أَلزُهْــد والزَهادَة) (مص): واز لە شــتهێنان لەبەر بێبایەخیو خۆلێدووره پەرێزگرتن.

(«شيءٌ زَهيد»): شــتێکی بێبایەخو هەرزان یان کەم.

(أَلزَهَد (ج) زِهاد): زەکات.

(أَلزاهِــد (فا) (ج) زُهَّد وزُهَّــاد وزاهِدُون): ١-دنیانەویســت/ کەســێك کــە جیهــانو خۆشــییەکەی بە ئــەوە دنیــا بگۆڕێتەوە ٢-کەسێکی کەمچیکڵدانە.

(أَلزَهيد (م) زَهيدَة (ج) زُهدان): ١-کەم.

«هُوَ زَهيدُ الخُلْق»: ئەو کەمچیکڵدانەیە.

«هوَ زَهيدُ العَين»: ئەو بە کەم دادەکەوێت/ چاوی زووتێردەبێت.

(وادٍ زَهيــد): دۆڵێــك ئــاو کەمدەگرێــت ٢-کەمنرخ/ سوکبەها.

(أَلمُزهِد): کەمسامان/ کەمدارا.

(أَرضٌ زَهــاد): زەوییەك کە بــە بارانی زۆر نەبێت ئاوی لەبەر نەڕوات.

أَلزَهيد: زۆر گۆشەگیرو دنیانەویستو ڕوو لە خوا.

٢-(زَهَدَ- النَخلَةَ زَهْــداً): ئەو بەرەی کە بە دارخورماکەوە بوو قەبلاندی.

(زَهَّدَ وأَزهَدَ النَخلَــةَ): بەری دارخورماکەی کە پێوەیبوو خەملاندی.

(«خُذْ زَهْدَ مايَكفيك»): چەندت بەشدەکات بیبە.

زهر: ١-(زَهَرَ- السِــراجُ أَو القَمَرُ أَو الوَجْهُ): زُهُــوراً): چراکــە یان مانگەکە یــان ڕووەکە شەوقیدایەوەو درەوشایەوە.

(-الشَيءُ): شتەکە ڕەنگی سافو ڕوونبوو.

(-الزَنْدُ): ئاگری چەرخەکە شەوقیدایەوە.

(«زَهَرَت بِكَ زَنادی أَو ناری»): بە تۆ پشتم قایمبوو سەروەریم پەیداکرد.

(زَهِرَ وزَهُرَ- الرَجُل. زَهراً وزُهوراً): پیاوەکە

تەختیکرد.

(-البَیتَ):١-سەری خانووەکەی گرت/ سەری خانووەکەی تەختو لووسو سافکرد.

(-الناقَةَ): مێحوشترەکەی خەواند/ پخدا.

(تَسَطَّحَ):١-تەختبوو/ کەوت بە زەویدا ٤-هەڵخرا.

(إنسَطَحَ):لەسەر گازپیشت ڕاکشاو جووڵەی لە خۆی بڕی. ٢-پانبووەوە.

(السَطْح (مص) (ج) سُطُوح):١-ڕووبانی خانوو ٢-هەموو شتێك بەرزبێتو سەرەکەی تەختبێت ٣-لای دانـاکان ئەوەیـە هەمـوو شوێنێکی ئەو شتە تەختبێتو بەرزیو نزمییان نەبێتو دەوترێت ( بسیط): تەختی ڕاخراو.

(سَطحُ الجِلد) (طب):دەرەوەی پێستی لەش.

(اَلسَطیح):١-تەخت ٢-کەسێکە لەبەر بێهێزییو نەخۆشی/ هەڵسوکەوتی باش پێنەکرێت.

(اَلسَطیحَة والسَطیح):جەوەندە.

(اَلسُطاح الواحـدة سُطاحَة):ڕووەکێکە بەسەر زەویدا ڕاکشابێتو پانبووبێتەوە.

(اَلمِسْطَح):١-بانگردێن ٢-تیرۆکی نانکردن ٣-کۆڵەکەی/ ستوونی دەوار ٤-شوێنی هەڵخستنو وشکردنەوەی خورما.

(اَلمِسْطَح والمِسْطاح): حەسیری گەڵای دارخورما ٥-مستاخ/ شوێنی هەڵخستنی میوە بۆ وشککردنەوەی.

("رأَیتُ الأَرضَ مَساطِح"):زەویەکەمدی وشكو برنگو تەخت بێگیاو پاوەن.

(اَلمُسَطَّح) (هـ):ڕوویەکی تەخت بە هێڵ دەورە درابێت.

(أَنفٌ مُسَطَّح):لووتی پان.

سطر: ١-(سَطَرَ- ُه. سَطْراً):نووسی.

(سَطَّرَ):ئەفسانەی داهێناو نووسی.

(-القِرطاسَ):هێڵی لەسەر پەڕاوەکە کێشا تا ڕاست لەسەری بنوسرێت.

("سَطَّرَ العِبارَةَ") (عامیة):دەربڕەکەی نووسی.

(سَطَّرَ القارِئُ): دێڕ لە دوای دێڕ خوێندیەوە.

(- عَلیهِ)قسەی بۆ هەڵبەستو بۆ هۆنییەوەو ڕازاندەوە کە وەك ئەفسانە بوو.

(أَسْطَرَ):بە هەڵە خوێندیەوە.

(سَیطَرَ):١-دەستی بەسەرداگرتو زاڵبوو ٢- چاودێریکرد.

(إستَطَرَ):نووسی.

(اَلسَطْر):هێڵو دێڕو نووسین.

(اَلسَطْر والسَطَر (ج) أَسْطُر وسُطُور وأَسْطار و (جج) أَساطیر):دێڕی نوسراو یان ڕیزی درەخت.

("کَتَبَ سَطْراً"):دێڕێکی نووسی.

("غَرَسَ سَطْراً"): ریزێك داری رواند.
("بنــى سَــطراً مِــن بنائِــهِ"): چینێکی له دیوارەکە یان خانووەکە نا.
السـطر: قسـەی هەڵبەسـتراوی ڕازاوەی ڕێکوپێك.
(اَلسُطرة): ئاوات.
(اَلإسطار والأُسطار): ئەوەی کە دەنوسرێت.
(الأُسْطور والأُسْـطير (ج) أساطير): ١-ئەوەی کە دەنوسرێت ٢-ئەفسانەو داستان (ئاخاوتنێك کە بنچینەی نەبێت).
("إنْ هذا إلاّ أَساطيرُ الأَوَّلين"): ئەمە ئەفسانەو قسـەی سـەیرو سـەمەرەی هەڵبەسـتراوی پێشینانە.
(اَلمَسْطَرَة والمِسْطَرَة (ج) مَساطِر): ڕاستە.
(-) (عنـد العامــة): لای ڕەشـە خەڵکەکە نموونەی کوتاڵو کەلوپەلە بۆ زانینی جۆری ئەو شتە پیشاندانی.
(اَلمُسْتَطَر): نوسراو.
(اَلمِسْطار): پەرگاڵ.
٢-(سَـطَر- هُ بِالسَّـيفِ): بـە شمشـێرەکە لەتیکرد، بڕی.
(-الرَّجُلَ): بەزەوییدادا بەزاندی.
(اَلساطِر والسَطّار): سەربڕ، قەساب.
(اَلسـاطور (ج) سَـواطير): قیمەکێـش یان کێردی گەورە.
(اَلمُسْـطار والمُسْطارَة والمِسْـطار والمِسْطارَة): ١-مەیــی کەلەپچە کــە مەیخۆرەکەی زوو بە زەویــدا دەدات ٢-ناوی ســەرەتای مەی پێش کولاَنی ٣-تۆزو گەردی هەستاو.
الملحق:
(ســطر: أَلمُسْــطَرين): ماڵــە کە قــوری پێ بڵاودەکرێتەوەو پێی سواغدەدرێت.

سطع: ١-(سَطَعَ- الغُبارُ أو الرائِحَةُ أو النُورُ. سَــطْعاً وسُــطوعاً وسَــطيعاً): تۆزەکە یان بۆنەکە بەرزبووەوەو بڵاوبووەوە ڕووناکییەکە شەوقیدایەوە.
("سَــطَعَت رائِحَــةُ المِسْـكِ"): بۆنی مسـك پەخش‌و بڵاوبووەوە.
("سَــطَعَتني رائِحَةُ المِسْـكِ"): بۆنی مسـك (کاری زۆر تێکردم:/ کاسیکرم).
(-سَطْعاً): ملی درێژ بوو.
(اَسْطَع (م) سَطْعاء): ملدرێژ.
(-رَأسَهُ): سەری بەرزکردەوەو ملی درێژکرد.
(سَطَّعَ- هُ): سەری پــێ بەرزکردەوەو ملی پێ درێژکرد.
(اَلسَطْع) (مص): هەموو شتێك کە بەرزبێت‌و بڵاوبێتەوە وەکو تۆزو ڕووناکی‌و بروسکە.
(اَلسِــطاع (ج) سُــطُع وأَسْــطِعَة) (ح): ١-حوشــتری درێژ ٢-درێژترین کۆڵەکەی دەوار یان خانوو.
(اَلسَــطيع): ١-ڕۆژ بوونەوە/ ڕووناکبوونەوە/ بەیان ٢-درێژ.

(اَلمِسْطَع): رِهوان/ زمان پاراویی.
("خَطیبٌ مِسْـطَع ومِصْقَــع"): وتەبێژێکی زمانپاراوو زمانتیژ/ رەوانبێژ.
٢-(سَـطَعَ- بِيَدَيـهِ. سَـطعاً وسُـطوعاً و سَطیعاً): بە هەردوو دەستی چەپڵەی لێدا.
(-الشَيءَ) (عامية): دەستی لە شتەكەدا.
(اَلسَـطَع): ١-چەپڵـە ٢-دەنگی پێداكێشـان/ تەپە/ زرمـە یان دەنگی هەڵـدانو فرێدان/ گفە/ وژە.
٣-(سَـطَعَ- البَعيرَ. سَـطْعاً): حوشـترەكەی نیشانەكرد/ داخكرد.
(سَـطَّعَ- البَعـيرَ): بـە داخ حوشـترەكەی نیشانەكرد.
(اَلسِـطاع (ج) سُـطُع وأَسْـطِعَة): داخ یان نیشانەیەكی درێژی مل یان تەنشتی حوشتر.
سطل: ١-(سَطَلَ- هُ الدَواءُ سَطْلاً): دەرمانەكە گێژیكرد/ وریكرد/ كاسیكر.
(-هُ): سەرسامیكردو حەپەساندی.
(إنْسَطَلَ واسْـتَطَل) (عامية): سەرسامبوو/ حەپەسا.
(تَسَیطَلَ): حۆلبوو.
("جاءَ يَتَسَيْطَلُ"): هات وەك حۆل دەسووڕایەوەو هیچی پێنەبوو.
(اَلساطِل- مِـنَ الغُبـار): تۆزی هەسـتاوو بەرزەوەبوو.
(اَلسَطل): پیاوی بالأبەرز/ درێژ.

(اَلسَطْلَة والمَسَطول) (عامية): گێل.
٢-(اَلسَطْل (ج) أَسْطال وسُطول) (فارسية): سـەتڵ لە مـس یـان فافـۆن یـان كانزایتر دەكرێت.
(اَلسَیطَل- اَلسَطل= یان تەشت.
(الأُسْطول (ج) أَسـاطیل) (یونانیة):سوتۆڵ كۆمەڵە پاپۆڕ یان فڕۆكە.
(أُسْطول بحري): نوستۆڵی دەریایی.
(أُسْطول جَوي): نوستۆڵی ئاسمانی.
سطم: ١-(سَـطَمَ- البابَ سَطماً): دەرگاكەی پێوەداو دایخست/ كۆڵۆمیكرد.
(سَـطَمَ فـاه وسَـطَمَ الثُقـبَ) (عاميـة. سـریانیة): دەمی نایەوە/ دەمی داخسـت/ كونەكەی گرت.
(اَلسِـطام): قەپاغی قاپی شووشـە/ سـەری شووشە دەمەڵبێنی شوویە/ سەرقاپ.
٢-(السُطُم): بنچینەكان.
(اَلسِطام): ئاسنێكە ئاگری پێخۆشدەكەیت.
(اَلسِطام والسَطم): دەمی شمشێر.
(الإسْطام): ئاسنێكە ئاگری پێخۆشدەكەیت.
(الأُسْـطُمّ والأُسْـطُمَّة- مِن كُلِّ شـيء (ج) أَسـاطِم): ئاوەڕاسـتو بەشـی زۆری هەموو شتێك.
(-مِـنَ البَحـر): نیرینەی دەریـا/ قووڵترین شوێنی دەریا.
("وَلیـلٌ طما أُسْـطُمُهُ"): تاریكو نووتەكیی

شەو درێژەی کێشاو قوولبووەوە.

(أُسْـطُحَّتُهُ القَـوم):١-کۆمەڵی خوێشـگەل ٢-خانەوادانی خوێشگەل.

("هوَ فِي أُسْـطُمَّةِ قَومِهِ"):ئـەو لە ناوەندی خوێشگەلەکەیدایە/ نەتەوەکەیدایە.

سطن: (أَلسـاطِن):بەد/ پیس/ گلاو/ گەن/ ناجسن.

(الأُسطون- مِنَ الجمال):حوشتری ملدرێژ.

(الأُسـطوانَة (ج) أَساطين وأَسـاطِنَة):١-پێ یان دەستێکی ئاژەڵ ٢-قەوان.

(أَلمُسَطَّن):هەردووپێ درێژ یان لاقدرێژ.

(أَلمُسَطَّنَة):دامەزراوو پتەو دەرکەوتوو.

(أَساطينُ مُسَـطَّنَة) (فارسية):دەرکەوتوو/ بنجبەسـتو دامەزراو لە زانیاری یان زانستی یان وێژەو شتیتردا.

سـطا: (سـطا-بِهِ وعَلَيهِ سَـطواً وسَطْوَةً): هەڵیکوتایە سەری/ پەلاماریدا زاڵیبوو.

(-الفَرَسُ)ئەسـپەکە سەری هەڵگرتو ئاوی دایە خۆی/ سەرکێشییکرد.

(-الماءُ)ئاوەکە زۆر بوو سەریکرد.

("ماسَطَوتُ فِي طَعامِ أَحَدٍ")هەڵنەمکوتاوەتە سەر خواردنو خوانی کەسو نەمخواردووە.

(ساطى- الرَجُلَ) (ضد)١-لەگەڵیدا توندوتیژیی نواند ٢-لەگەڵیدا نەرمبوو دڵی پێسووتا.

(أَسطى- عَلَيه. إِسطاءٌ)هەڵیکوتایە سەریو زاڵیبوو.

(أَلسـاطي) (فـا):١-پەلامـاردەرو زاڵبوو ٢-چارەوێـی سـەرهەڵگرتووی بـە هەنگـاو ٣-چارەوێـەك لە غاردا کلـك بگرێت واتا: کلك بەرز بکاتەوە.

سعّ: ١-(سَعْسَعَ وتَسَعْسَـعَ- فُلانٌ):ئیفتادەو پەککەوتە بوو.

(-الشَـيخُ):١-ئیفتادەکـە لەبـەر تەمەنـی زۆری لەشـی کەوتە لەرزیـن ٢-هەنگاوەکانی کورتبوو.

٢-(سَعْسَعَ- رَأسَهُ):ڕۆنی لەسەر هەڵسوو.

٣-(أَلسُعْسُع):گورگ.

سـعب: (تَسَـعَّبَ- الشـيءُ):شـتەکە کشاو لینجبوو.

(إِنْسَعَبَ- الماءُ)ئاوەکە کشا/ ڕۆیشت.

سـعت: (أَلسَـعْتَر والصَعْتَـر) (ن)هەزبیە کێویلە. ڕووەکێکە بۆنخۆش. گوڵەکەی سپییەو مەیلەو بـۆرە هەندێك جۆری لە پزیشـکیدا بەکاردێتو بۆ دروسـتکردنی بۆنی خۆشیش بەکاردێت.

(أَلسَعْتَرِي أَو الصَعْتَرِيّ)١-جوامێرێکی ئازا/ مرۆڤێکی بەخشندە ٢-چابوك.

سعد: ١-(سَعَدَ- اليَومُ سَعْداً وسُعُوداً)ڕۆژەکە پیرۆز بوو/ ڕۆژێکی شاد بوو.

(سَـعِدَ وسُـعِدَ. سَـعادَةً)بەختیـار بـوو/ کامەرانبوو/ بەختەوەر بوو/ دڵشاد بوو.

(سعيد (ج) سُعَداء ومَسْعُود (ج) مساعيد):

شاد/ کامەران/ بەختیار/ بەختەوەر.
(أَسْعَدَ-ەُ اللّهُ): خودا بەختەوەریکرد/ دڵشادیکرد/ کامەرانیکرد.
(مَسْعُود): بەختەوەر/ دڵشاد (ناوترێت (مُسْعَد).
(تَسَعَّدَ): رووناکبینبوو.
(إِسْتَسْعَدَ- بِالشَيءِ): شتەکەی بە شانسەوەر دانا/ بە پیرۆز دانا.
("إِسْتَسْعَدَ فُلانٌ بِرُؤيَةِ فُلان"): بینینی فیساری بە فەرو شانسی دانا/ بە بەختداریی دانا.
(اَلسَّعْد (ج) أَسْعُد وسُعود): شانسداریی بەختباشی.
(سَعْدَيْكَ): شانسدارتدەکەم، بەختەوەرتدەکەم.
("لَبَّيكَ وسَعْدَيْكَ"): جار لە دوای جار بەختەوەرتدەکەم.
(اَلسَّعادَة): بەختیاری/ کامەرانیی/ بەختەوەریی/ شادمانیی/ شادیی.
(اَلسَّعادَة): وشەیەکە بە خاوەن پایەی بەرزو پیاوی گەورە دەوترێت. دەوترێت ("سَعادَةُ فلان وصاحِب السعادَة وأَصحابُ السَّعادَة): جەنابی فیسار.
(سُعدان): شادمانکردن/ بەختیارکردن.
("سُبحانَ الله وسُعدانَهُ"): ناوی خودا بە گەورە دەگرم و سەری نەوازشی بۆ شۆردەکەم.
(اَلسُّعُودَة): بەختەوەریی/ پیرۆزیی.

٢-(ساعَدَ- ەُ علی الأَمرِ): لە کارەکەدا یاریدەیدا.
(أَسْعَدَ- ەُ علی الأَمرِ): بۆ ئەنجامدانی کارەکە کۆمەکیکرد/ یاریدەیدا.
(اَلساعِد (فا) (ج) سَواعِد): سەرۆک.
("مالَهُم ساعِد يَعْتَمِدونَهُ"): سەرۆکێکیان نییە پشتی پێببەستن.
(شَدَّ اللّهُ علی ساعِدِكَ): خودا دەست بە باڵتەوە بگرێت/ یاریدەت بدات.
(ساعِدا الطَيرِ): دوو باڵی باڵندە.
(طائِرٌ شَديدُ السَّواعِد): باڵندەیەکە شاپەڕەکانی بەهێزو گەورەن.
(اَلساعِدَة): تەختەیەکە بەکرە رادەگرێت.
(ساعِدَة (ج) سَواعِد): ١-لقێکی رووبار یان چەمێك کە دەرژێتە رووبارەوە یان دەریاوە ٢-دەمار لە مۆخی ئێسقاندا یان دەماری شیر لە گواندا/ شیرەڕۆ ٣-بازیبەندی زێڕینی یان ئاسنین.
٣-(تَسَعَّدَ- الراعي): شوانەکە بۆ لەوەڕگای درکە حوشتر گەڕا.
(اَلسُعْد (ن) اَلسُعْد (ن): جۆرە ڕووەکێکە گەڵاو لاسکەکەی لە هی ( نَجلیات) دەچێت جۆرێکی هەیە سەلك دەکات کە بە کەڵکی خواردن دێت.
(اَلسعادی): بۆنێکە لە پەکگرتنەوەی بریندا کەڵکی هەیە.

(اَلسُعْدِيَّات): کۆمەڵە ڕوومکێکە لە کۆمەڵەی تاکخەپلەیە ڕوومکێکی زۆر دەگرێتەوە کە لە شوێنە شێدارەکاندا دەڕوێت(اَلسَعْدان): درکە حوشتر ڕوومکێکە درکاوی. خۆشترین ڕوومکە کە حوشتر حەزی لێدەکاتو لای خۆشە.

٤-(سُعُود النجوم) (فك): بەختە ئەستێرەکان دە ئەســتێرەن بەهەر یەکەیان دەڵێن: سَعد: بەختە ئەستێرە.

(اَلسَعْدان) (ح): مەیموون.

(اَلسعدانَة) (ح): کۆتر.

(سَــعدانَةُ الثَّــدي): گۆی مەمك یان ڕەشــی دەوری/ خولی گۆی مەمك.

سعر: (سَعَر- النَّارَ سَعْراً): ئاگرەکەیکردەوە/ گراند.

(سَــعَرناهُم- بِالنَّبــلِ): تیرەبارانمان کردنو ئاگرمان تێبەردانو ژیانمان لێتاڵکردن.

(سُعِرَ – الرَجُلُ): گڕی سەبوون لێیدا.

(سَــعَّرَ وأَسْــعَرَ- النَّارَ): ئاگرەکەی کردەوەو خۆشکرد.

(تَسَــعَّرَتِ النــارُ): ئاگرەکــە خۆشــبوو/ کڵپەیسەند.

(-الحَطَبُ): دارەکە گڕیگرت.

(إِسْتَعَرَ): گڕیگرتو گڕەکەی خۆشبوو.

(اَلسَعْر): گەرمی/ گەرما ٢-برسێتییەکی زۆر.

(اَلسُعْرَةُ) (ف): ١-یەکەی پێوانەی پلەی گەرما ٢-کۆکەیەکی توند.

(اَلسُــعار): ١-گەرمــا ٢-تینوێتیەیکی زۆر/ لە تینواندا گەروو وشــکبوو ٣-برسێتیەیکی زۆر سەخت.

(اَلسَعِير (ج) سُعُر): گڕی ئاگر.

(اَلساعُور): ١-ئاگر ٢-تەنوور.

(اَلساعُورَة): ئاگر.

(اَلمِسْعَر): ئاگردان.

("هُــوَ مِسْــعَر حَرْب"): ئــەو ئاگری جەنگ هەڵگیرسێنە.

(اَلمِسْــعَر) (ف): گەرمیپێــو ئامێرێکــە بــۆ زانینی پلەی گەرمیی بە بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای ئەو شــلەیەی وەك ئاو کە تیایدایەو کە بەرزیدەکاتەوە ٢-توند.

(كَلْبٌ مِسْعَر): سەگی هار.

(اَلمِسْــعار): ئاگــر خۆشــکەرە/ ئــەوەی کــە گــڕی ئاگری پێبەرز دەکرێتــەوەو ئاگری پێ خۆشدەکرێت.

(اَلمَسْعور): ورگدڕاو/ کەسێکە تیریشیخواردبێت هەر هەڵپەی خواردنیبێت.

٢-(سَــعَرَ-البَعيرُ الإِبلَ بَجُرَبِهِ): حوشترەکە گەڕییەکەی خۆی بە حوشترەکانیتر گەیاند.

(-القَومَ شَــرّاً): خراپەو بەدیی بە خوێشگەل گەیاند/ تووشی بەدییکردن.

(أَسْــعَرَ- البَعيرُ الإبلَ بَجَرَبِهِ): حوشــترەکە گەڕییەکەی خۆی بە حوشترەکانیتر گەیاند.

(إِسْــتَعَرَ الجَــرَبُ في البَعــيرِ): گەڕییەکە لە

حوشترەکاندا تەشەنەیکرد.
(-الشَرُّ): خراپە بڵاوبووەوە/ تەشەنەیکرد.
(ألسِعر) (عامية): بەو نەخۆشیانە دەڵێن کە تەشەنە دەکات/ نەخۆشیی پەتا.
(مَساعِرُ البَعيرِ): بنهەنگڵ و بنرانی حوشتر.
(أَخَذَ الجَرَبُ فِي مَساعِرِ البَعيرِ): واتا گەڕیی دایە بنهەنگڵ و بنرانی حوشترەکە.
٣-(سَعَرَ- اللَّيلَ. بِالمَطِيِّ. سَعْراً): بە سواریی وڵاخەکە ڕۆیشت و شەوی بردەسەر.
(سَعَرَ-تِ النَاقَةُ فِي سَيرِها): حوشترەکە تیژ ڕۆیشت.
(سَعور): پەلەکردوو/ تیژ ڕۆیشتوو.
(سَعَرتُ اليَومَ فِي حاجَتي سَعرَةً): بۆ پێداویستیەکەم بە درێژایی ڕۆژەکە/ گەڕام.
(سُعِرَ- البَعيرُ): حوشترەکە شێتبوو.
(مَسعور): شێتبوو.
سَعِرَ- الفَرَسُ. سَعَراناً): چارەوێکەی شێتانە دایە غارێکی توند.
(ألسُعْر والسُعُر): شێتیی.
(ألسَعِر (ج) سَعْرى): شێت/ تێکچوو.
ناقَةٌ مَسْعورَة): حوشترێکی سرەوت لەبەر براو.
٤-(سَعَّرَ- الشيءَ): نرخی بۆ شتەکە دانا یان نرخاندی.
(-القَومُ): لەسەر نرخێك ڕێککەوتن.
(ساعَرَ- هُ. مُساعَرَةً): بۆ نرخێك کەوتنە سەوا.
(ألسِعر (ج) أَسعار): نرخ.
٥-(أَلسَعَر والسُعْرَة): ڕەنگێکە مەیلەو ڕەش/ ڕەشبۆر.
(ألساعُور) (عامية): کارۆژڵە.
(ألأَسْعَر (م) سَعْراء (ج) سُعْر): ١-لاوازێکی دەمار دەرکەوتوو ٢-کەسێکە ڕەنگبۆر بێت.
(ألمِسْعَر): ملی درێژ.
الملحق:
سعر: (ألتَسعير) (مص): نرخ دانان/ نرخ دیاریکردن.
(تسعير السلعَة): نرخ بۆ کاڵەدانان. نرخدانان لە لایەن میرییەوە بۆ هەر شتێك بێت کە نابێت فرۆشیار لەوە گرانتری بفرۆشێت.
(ألتَسعيرَة): ١-یەکخستنی نرخ ٢-دەرخستن و بڵاوکردنەوەی نرخی کەلوپەلەکان و کاڵاکان.
(تسعيرة جُمْرُكِية): دانانی نرخی کەلوپەل و کاڵا بە پێی سەنەدنی باجی گومرگی.

---

سعط: (سَعَطَ وسَعَّطَ وأَسْعَطَ- هُ. الدواءَ. سَعطاً): دەرمانەکەی کردە لووتیەوە.
("أَسْعَطَهُ الرُمحَ"): نێزەکەی بە لووتیدا کرد.
("أَسْعَطَهُ عِلماً"): زانستیەکی زۆری تەواو تێگەیاندو فێرکرد.
(إِسْتَعَطَ- الدواءَ): دەرمانەکەی کردە لووتیەوە.

(إِسْتَعَطَ- هُ): داوای لێکرد دەرمانی بۆ بکاتە لووتیەوە.

(اَلسُّعاط): تیژیی بۆن/ کەسکوونیی بۆن.

(اَلسَّـعُوط) (طب):١-دەرمانێـك کە بکرێتە لووتەوە ٢-وردە تووتن/ بڕنووتی کە دەیکەنە لووتەوە (بۆ پژمین).

(اَلعَطـوس) (عامیـة): وردە توتـن کە بۆ پژمین دەیکەنە لووتەوە/ پژمێن.

(اَلسَّـعیط: السُّـعاط): تیژیی بـۆن ٢-بۆنی خۆشیی مەیو شـتیتر ٣-(ن) البان= درەختی بان ٤-ڕۆنی درەخنی بان ٥-ڕۆنی خەرتەلە.

(اَلمِسْـعَط والمُسْـعُط): قوتـووی بڕنووتـی/ بڕنووتیدان.

سعف: (سَعَفَ- هُ بِحاجَتِهِ): پێداویستییەکەی بۆ جێبەجێکرد/ بۆی ڕاپەڕاند.

(ساعَفَ- هُ): یارمەتیداو کۆمەکیکرد.

(أَسْـعَفَ- هُ بِحاجَتِهِ): پێداویسـتیەکەی بۆ جێبەجێکردو نەیهێشتو فریایکەوت.

(-هُ علـی الأمرِ): لـە ڕاپیکردنـی کارەکەدا یارمەتیداو کۆمەکیکرد.

(-بِالرَّجُلِ): لە پیاوەکە نزیکبووەوە.

(-الشيءُ): شتەکە نزیکبووەوە.

(-إِلَیهِ): ڕووی تێکردو نیازی ئەوی بوو.

(-لَـهُ الصَّیـدُ): ڕاوەکـەی بۆ چووە سـەرو توانی.

(-تِ الحاجَـةُ): دەمـی جێبەجێکردنـی/ کردنی پێداویستییەکەی یان نیازەکەی هات/ نزیکبووەوە.

(اَلمُساعِف (فا)): نزیك.

("مَکانٌ مُساعِفٌ"): شوێنێکی نزیك.

٢-(سَعِفَ. سَعَفاً): سەری پەنجەکانیو خولی نینۆکی شەقار شەقار بوو/ قڵیشا.

(سُعِفَ): زیبکـەی لەسەری یان لە دەموچاوی دەرهات/ سەری یان دەموچاوی هەڵزڵەپی.

(مَسْعُوف): زیبکاوی.

(تَسَـعَّفَ- ت أَظفـارُهُ): سـەری پەنجەکانی قڵیشاو شەقار بوو.

(اَلسَّعْفَةُ) (طب): زیپکەو دوومەڵۆ کە لەسەر یان دەمووچاو دەردێت.

(اَلسَّـعَف) (طـب): دەردێکـە وەك گەڕییە ناودەمی حوشتر دەیگرێت.

(اَلأَسْعَف- مِنَ الإبِلِ (م) سعفاء (ج) سُعْف): حوشتری ناو دەم گەڕ بوو.

(اَلسُّـعاف) (طـب): توێژ هەڵدانـی دەوری نینۆكو قڵیشانی.

٣-(سَعَّفَ- المِسْكَ) بۆنیمیسکەکەی بڵاوکردەوە سەری هەڵدایەوەو پەخشبوو.

٤-(اَلسَّـعْف):١-کاڵا/ کەلووپەلی فرۆشـتن ٢-پیاوی بێناموس/ نامەرد/ بیژ.

(اَلسَّـعَف (ج) (سُـعُوف):١-جیازیی بووك ٢-کەلوپەلی ناوماڵ ٣-پەلی بێگەڵای دارخورما.

(سَعْفَة): پەلێکی ڕووتی دارخورما.

(أَلسُــعُوف): ١ـگەپە جام ٢ـسروشــتی چاكی خەڵك وەكو جوامێریی‌و ئازادیی‌و شتیتر (ئەم وشەیە تاكی نییەو نەبیستراوە).
(أَلأَسْعَف- مِن الخَيل (م) سَعفاء (ج) سُعْف): ئەسپ‌و ماینی ناوچەوانمارۆ.
الملحق:
ســعف: (الإِســعاف) (مص): ١ـدەستگیرۆی‌و یاریدەدان/ كۆمەككردن.
("إِسعاف المُحتاج"): دەستگیرۆیی نەبوو.
٢-(إِسعافُ المَريض): بە فریاكەوتنی نەخۆش لــە ڕووی یاریــدەدان‌و كاری پزیشــكییەوەو چارەسەركردنی پزیشكیی.
(أَلإِســعاف العــام): فریــاوو چارەســەریی گشــتی/ دامەزراوێكــی پزیشــكیی میرییــە فریــای تووشــبووەكان دەكەوێــت‌و لە كاتی لێقەوماندا بە ئوتومبیلی تایبەتیی پزیشكیی دەیانگەیەنێتە مەڵبەندە تەندروستییەكان.

سعل: ١-(سَعَلَ. سُعالاً وسُعْلَةً): كۆكی.
(أَسْعَلَ- هُ): كۆكاندی.
(أَلسُعال) (طب): كۆكە/ كۆخە.
(قَصَبُ السُعال) (ع ا): بۆریی سییەكان.
٢-(حَشيشَةُ السُعال- أَلسُعالي) (ن): گیاكۆكە. ڕووەكێكی گیاییەو تەمەندرێژە گوڵە لاســك لوولەییە گوڵەكەی زەردە، كەڵكی پزیشــكیی هەیە.
(أَلســاعِل والمَسْــعَل): گــەروو یان شــوێنی كۆكین.
٢-سَعَلَ. سَعْلاً): چابوكبوو/گورجبوو.
(أَسْــعَلَ- هُ): چابوكیكــرد/ چالاكیكــرد/ گورجوگۆڵیكرد.
٣-(إِسْتَسْــعَلَ- تِ المَــرْأَةُ): ئافرەتەكــە وەك دەڵەدێو بەدو زۆرزان‌و پیس‌و بە هات‌و هاوار بوو.
(أَلسِــعلاء والسِــعْلاة والسِــعْلى (ج) سَعالى وسِعْلَيات): دەڵە دێو یان دێو.
سعم: ١-(سَعَمَ- البَعيرُ سَعماً): حوشترەكە لە ڕۆیشتنندا بە تەوژمبوو.
(سَعُوم): حوشتری بە تەوژم/ بە گور.
(سَيلٌ مِسْعامٌ أَو مُسْعامٌ): لافاوێكی/ لێشاوێكی بەگور/ بە تەوژم.
٢-(سَــعَمَ وسَــعَّمَ- هُ. سَــعْماً): خواردنی بە ئەمیەوە دا/ خواردنی دەرخوارددا.
سعن: ١-(أَسْعَنَ): چەتری هەڵگرت.
(أَلسُعْنَة (ج) سُعَن): ١ـچەتر ٢ـئەوەی لە لچی سەرەوەی حوشتر شۆڕدەبێتەوە.
س٢-(السُعْن (ج) سُعْنَة): نیوەی كوندەیەك وەك سەتڵی بیری لێبكرێت.
(أَلسَعْن): ١ـقەڵەوێكی بە غەزوبەز ٢ـشەرابی ڕووت‌و خەست كە هیچی تێكەڵ نەكرابێت.
(أَلسُــعْنَةُ): ١ـپیرۆز ٢ـناپیرۆز بە دووم/ شووم ٣ـ(ضد) خواردنی زۆر ٤ـخواردنی كەم.
("مالَهُ سَعْنَةٌ ولا مَعْنَة"): هیچی نییە.

(عيدُ السَعانين والمَشْـهور الشَعانين): رۆژی یەکشەممەی پێش جەژنی قوربانی جوولەکە (عبرانیە) لە (هو شیعە نا): واتا ڕزگاریکردین، وەرگیراوە.

سـعو: (ألسَـعْو و السَعْو والسِـعْوَة والسَعْواء والسُعْواء): کاتژمێرێکی شەو.

(ألأسْعاء): کاتژمێرانی شەو/ دەمانی شەو.

(ألسَعْوَةُ): ١-کاتژمێرێکی شەو ٢-مۆم.

(ألسُـعاوِيّ): بە تابوشتو ئارام لە نەنوستنو سەفەردا/ گوزاردا.

سـعی: ١-(سَـعی. سَـعیاً): کۆششـیکرد/ تەقەلایدا/ کاریکرد.

(-تِ الأمَةُ): کەنیزەکە کۆیلەکە داوێنپیسیکرد/ زینایکرد.

(-في حاجَـة الرَجُـلِ): بـۆ جێبەجێکردنی کاری پیاوەکە تێکۆشـا/ کاری بـۆ هێنانەدی نیازەکەیکرد.

(-لِلأمـرِ): بە تەنـگ ئەنجامدانی کارەکەوە هاتو تەقەلای بۆدا.

(-لِعیالِهِ): ڕەنجی بـۆ خێزانەکەیدا/ بژێوی بۆ پەیداکردن.

(-المُتَصَـدِّق سِـعایَةً): خێرکەرەکـە کەوتە خێرکردن/ چاکەو بەخشین.

(سـاعی- هُ): لەو کۆششی زۆرتر کرد/ ئەوی لەوەدا بەزاند.

("سـاعاني فُلان فَسَـعَیتُهُ"): پێشبڕکێی لە کۆششدا لەگەڵمدا کردو بەزاندم.

(أسْـعی- الرَجُلَ إسعاءً): کابرای خستە گەڕو کۆشش/ تەقەلا.

(إسْتَسْـعی- الرَجُـلَ إسْتِسْـعاءً): پیاوەکەی ڕاسـپارد سەرپەرشـتی کۆکردنـەوەی خێرو زەکات بکاتو لەوانە بسێنێت کە لە سەریانە.

(- العبدَ): بەڵێنی بـە کۆیلەکەدا ڕەنجی بۆ بدات، جا لە پاداشتی ئەوە ئازادیبکات.

(ألسـاعي (ج) سُـعاة) (فـا): ١-ڕەنجـدەر/ کۆششکەر/ تەقەلادەر لە کارێکدا کە کرابێتە قەبەڵـی بە زۆرییش بەوانـە دەڵێن کە کاتی خۆی باجو خەراجیان کۆکردۆتەوە.

(ألمَسْعی (ج) مَساعٍ): ڕەنج/ کۆشش/ تەقەلا/ هەڵسوکەوت.

(ألمَسْـعاة (ج) مَسـاعٍ): ١-جوامێری/ چاکەو خوازیی پیاوەتی.

٢-(سَعی- سَعْیاً): خۆی گوشیو ڕایکرد.

(-إلَیـهِ): هەوڵـی لای ئەویدا/ بـۆ لای ئەو ڕۆیشت/ کۆششی بۆکرد.

(-بِفُلان عِنْدَ الأمیرِ. سعایَةً وسَعْیاً): لای میر بوختانی بۆ کردو قسەی بۆ هەڵبەست.

(أسْعَو بِهِ): ئەویان خواست.

(ألسِـعایَة) (مـص): بوختـان بـۆ کـردن/ دووزمانییو قسە بۆ هەڵبەستن.

(ألساعي (فا): ١-پۆستەچی/ نامەبەر/ تەتەر ٢- سەرپەرشتیاری کۆکەرەوەی زەکاتو خێرو

کۆکەرەوەی ٣-پۆستە ٤-فرستادە.
سغ: (سَغسَغَ – الوَتَدَ): سنگەکەی شلۆقکرد/ جووڵاندی.
(-هُ فِي التُرابِ): بە زەویەکەدا چەقاندی.
(-رأسَهُ بالدِهن): سەری لە رۆن هەڵکێشاو بە هەردوو دەست هەڵیگلۆفت بۆ ئەوەی رۆنەکە بگرێت.
(-الدِهْنَ فِي رأسِــهِ): چەورییەکەی کردە ژێر بێخی قژەکەیەوە.
(تَسَغْسَغَ- مِنَ الأَمرِ): لە کارەکە رزگاریبو.
(-فِي الارض): چوو بە زەویدا/ تێیچەقی.
ســغب: (سَغَبَ وسَغِبَ. سَغْباً و سُغُوباً وسَغَباً و سَغابَةً ومَسْغَبَةً): برسیبوو.
(ساغِب و ســغِبٌ وســغْبان (م) سَغبی (ج) سِغاب): برسی.
(مَسْغَبَة): برسێتیی/ قاتو قڕیی.
(أَسْغَبَ- القَومُ): خوێشگەل کەوتنە گرانییو برسێتییەوە/ دووچاری برسێتیبوون.
(اَلسَغاب): برسێتیی.
(اَلمُسَغَّب): شیاوو رێپێدراو.
سغد: (سُغِدَ. سَغْداً): لووی لێهاتو هەڵاوسا.
(فِصالٌ ســاغِدَة ومُسْغَدَة ومُســاغَدَة): تێر شیری خرتو قەڵەو.
(اَلسَغْد) (مص): نەرمە باران.
سغل: (سَــغِلَ. سَــغَلاً): لەرپــوو گۆشتەکەی چرچیی تێکەوت.
(سَغِل): لاوازی چرچ تێکەوتوو.
سغم: (سَغَّمَ- هُ الماءَ): ئاوەکەی پێهەڵقوراند.
(-الوَلَدَ): ١-خواردنی باشی بە منداڵەکەیدا ٢-پەروەردەیکرد.
(ســغِّمَ وأُسْــغِمَ): خواردنــی باشــی پێدراو دەرخوارد درا.
(اَلمُسَــغَّم والمُسْــغَم): ١-خواردنی باش پێدراو ٢-مێردمنداڵــی قەڵەوی خرپن/ تێکســمڕاوو قولپن.
٢-(أَسْــغَمَ- هُ): ســزای زۆردا/ لــە ئەنــدازە بەدەردا.
ســغو: (اَلســاغو أَو دَقيــقُ النَخــل): ئاردی نیشاستە لە کورۆکی داری ساگۆ دەردەهێنرێتو خواردنێکی بەکەڵکە.
(اَلساغُونِيَّة): ساگۆ (ن) جۆرە دارخورمایەکە لە ســیامو ئەندەنۆســیا هەیە، لەهەر دارەی دەتوانرێت نزیکەی چوار سەد کیلۆگرام ئاردە نیشاستە لە کورۆکی قەدی دەربهێنرێت.
سف: ١-(سَــفَّ- الطائِرُ أَوِ السَّحابُ سَفيفاً): باڵندەکە یــان هەورەکە نزم بەســەر زەویدا تێپەڕیو رۆیشت.
(أَسَفَّ- الرَّجُلُ إِسْفافاً): ١-هەڵات ٢-دوای کاری نزمو شەرمندانە کەوت.
("أَسَــفَّ إِلى الأُمورِ الدَنِيَّــةِ): داخزایە کاری نزمو بێنابروانە.
(-الطائِرُ أَوِ السَّحابُ): باڵندەکە یان هەورەکە

داهاته خوارێو نزیك زەوی بووەوە.

(اَلسِفَّ والسُّفَّ (ح) = القَفّارَة والطَفّارَة): تیرەمار = کەومار مارێکە درێژو باریك بەسەر لەو تاوێردا بـازدەدا پێیدەڵێن ماری بازدەرو هەڵبەزیو عەرەب دەیانگوت گوایا دەفرێت.

٢-(سَفَّ- الخُوصَ. سَفیفاً): گەڵای دارخورماکەی چنی.

(اَسَفَّ- الخُوصَ إسفافاً): گەڵای دارخورماکەی چنی.

(-الشَيءَ): پارچەی شتەکەی بەیەکەوە لکاند.

(-الأمرَ): کارەکەی نزیککردەوە.

(-النَظَرَ): تیژ تێروانی/ تەماشایکرد.

(اَلسُّفَّة): چنراو لە گەڵای دارخورما (وەك حەسیرو سەبەتەو شتیتر) ٢-قژ بەستەی ئافرەت.

(اَلسَفیف) (مص): ١-ئەوەی بە گەڵای دارخورما دەچنرێت ٢-تەنگەی کەژاوەو کورتان.

(اَلسَفیفَة (ج) سَفائِف): قایشی پانی پێبەستەی کورتانو زین، قەیاسە.

(-مِنَ الخوصِ): چنراو بە گەڵای دارخورما.

٣-(سَفَّ- الماءَ. سَفیفاً): ئاوی زۆری خواردەوەو تینوێتیی نەشکا.

(اَلدَواءَ والسَّوِیقَ ونَحْوَهُما): دەرمانەکە یان ئاردەکەی بە وشکی خوارد هیچی بەسەردا نەکرد.

(اَسَفَّ- البَعیرَ. إسْفافاً): ئالیکی وشکی بە حوشترەکە دا.

(-الفَرَسُ اللِجامَ): لغاوی کردە دەمی چارەوێکە.

("ماأسَفَّ مِنهُ بِشَيءٍ"): هیچی لێدەستنەکەوت.

(أُسِفَّ وَجْهُهُ): ڕەنگی ڕووی تێکچوو سپیبوو وەك خۆڵەمێشت پێوەکردبێت.

(إستَفَّ الدَّواءَ): دەرمانەکەی بە وشکی خوارد.

(اَلسُفَّة): مشتە گەنمێك یان شتێکیتر.

(اَلسُفَّةُ والسَفوف): دەرمان یان شتیتری کوتراو/ هاڕراو.

٤-(سَفْسَفَ- الدَقیقَ): ئاردەکەی بێژایەوە.

(-العَمَلَ): کارەکەی باش دانەمەزراندو نەکرد.

(-تْهُ الریحُ): باکە بەسەر زەویدا ڕایفڕاند.

(اَلسَفساف): گەندەی هەموو شتێك.

("فُلانٌ سَفسافُ الکلام"): قسەکەی هیچی بەسەر هیچەوە نییەو بێواتایە.

(اَلسَفساف): کاری سووكو نزم.

(-مِنَ الدَقیقِ): تۆزی ئارد کە لێی بەرزدەبێتەوە.

(-مِنَ التُرابِ): خۆڵی وردکراو.

(-مِنَ الشِعرِ): هەڵبەستی/ شیعری خراپ.

(أَلْسُفِسَـفَةُ): بـاى ڕادەرو ڕافرێنــى شــتو تۆزهەڵسێن.

٥-(أَلسَفيف): شەيتان.

سـفت: ١-(سَـفِتَ. سَـفَتاً): ئـاوى زۆرى خواردەوەو تينوێتى نەشكا.

(أَلسِفت): خواردنێكى بێپيتو بێپێز.

٢-(سَفْتَجَ- هُ): سپاردەى لەگەڵدا كرد.

(أَلسُّفتَجة (ج) سفاتِج) (ت): سپاردە ئەوەيە دارا بـدەى بــە پياوێــك نووسـينێكت پێى بداتێ پێــى بتوانيت پارەكەت لــە يەكێكيتر وەرگريتــەوە كە ئەو پەيوەنديــى بازرگانيى لەگەڵدا هەبێت (فارسيە).

سـفح: ١-(سَـفَحَ الـدم أَو الدَّمــعَ. سَـفْحاً وسُفُوحاً): خوێن يان فرمێسكى ڕشت.

(-الدَمْــعُ. سَـفْحاً و سُـفوحاً و سَـفَحاناً): فرمێسكەكە هاتە خوارێ/ ڕژا.

(سافِح (ج) سَوافِح): فرمێسكرێژ/ هەڵرێژ.

(سَـفَّحَ- الرَجُـلُ) كارێكــى بێكەڵكيكرد كە سوودى بۆ خۆى نەبێت.

(سـافَحا وتَسـافَحا): پێكــەوە زينايانكرد/ داوێنپيسيانكرد.

(سَفْحُ الجَبَلِ (ج) سُفوح): ١-قەتپاڵو دامێنى كێو/ شـاخ ٢-شوێنى تەختى كێوەكە كە ئاوى تێدا كۆدەبێتەوە.

(أَلسَفاح) (مص): زينا/ داوێنپيسى.

("تَــزَوَّجَ المَرأَةَ سـفاحاً"): بێمارەبڕى چووە پاڵ ژنەكە/ كردى بە قەپاتمەى خۆى.

("بَينَهُم سِفاحٌ"): خوێنيان لە بەيندا هەيە.

(أَلسَّفاح):١-خوێنرێژ/ پياوكوژ٢-فرەبەخشندە جوامێرێكى گەورە ٣- زمانپاراوى بەتوانا.

٢-(أَلسَـفيح): ١-تيرێكــى دۆڕاوى قومــار ٢-جەواڵەكان ٣-بەرگى ئەستوور.

(أَلأَسْفَح): سەر ڕووتاوە.

سفد: ١-(سَـفَدَ وسَـفِدَ الذَكَرُ أُنثاهُ وسَفِدَ. عَلَيها وسـافَدَها. سِفاداً ومُسافَدَةً): نێرەكە/ كەڵەكە سوارى مێكەيبوو/ لەگەڵيدا جووتبوو/ گاى.

(أَسْفَدَ- هُ): ناچارى جووتبوونيكرد/ بە زۆر سواريبوو/ گاى.

(إِسْتَسْـفَدَ- البَعيرَ): لە پشـت حوشترەكەوە هاتو سواريبوو.

٢-(سَـفَّدَ- اللَّحمَ): گۆشــتەكەى بە شيشەوە كردو برژانـدى.

(أَلسَفُّود (ج) سَفافيد): شيشى گۆشتبرژاندن.

سفر: ١-(سَفَرَ. سُـفُوراً): بۆ گوزار ڕۆيشت/ گوزاريكرد.

(سَــفَّرَ- الرَجُـلَ): گـوزارى/ سـەفەرى بە پياوەكە كرد/ ڕەوانەى سەفەريكرد.

(سـافَرَ- الى بَلَدِ كذا. سِـفاراً ومُسافَرَةً): بۆ ئەو وڵاتە گوزاريكردو ڕۆيشت.

(-فُلانٌ): فيسار كۆچى دوايكرد/ مرد.

(تَسَفَّرَ): هات/ لە سەرەتاى ئێواريدا هات يان

ئاژەڵەکەی لەو کاتەدا لەوەڕاند.

(اِنْسَفَرَ- تِ الإِبِلُ): حوشترکان پەرەوازە بوون.

(اَلسَّفْر= مسافِر): کۆچکردوو/ گوزارکەر.

(رَجلٌ سَفْرٌ): پیاوێکی گوزارکەر/ سەفەرکەر.

(قَومٌ سَفْرٌ): خوێشگەلی کۆچکردوو/ بارکردو/ گوزارکەر.

(ناقَةٌ سَفْرٌ): مێحوشترێکی کاروانکەر.

(اَلسَّفْر): کۆی وشەی (سافِر).

اَلسَّفَر (ج) أسفار: بڕینی ماوەیەك.

(اَلسُّفْرَةُ (ج) سُفَر): ١-خواردنی کۆچبەر ٢-خوان/ سفره کە خواردنی لەسەر دادەنرێت.

(اَلسافِر (فا) (ج) أسْفار وسَفْر وسَفَرَةُ وسُفّار و (جج) أسافِر= اَلْمُسافِر): گوزارکەر/ سەفەرکەر/ کۆچکەر/ کاروانی/ کۆچبەر.

(اَلسافِرَة (ج) سَوافِر): گوزارکەرەکان/ سەفەرکەرەکان/ کۆچکردووەکان/ کاروانییەکان.

("كَثُرَتِ السافِرَةُ هُنا"): کاروانیی/ گوزارکەر لەم ناوەدا زۆر بوون.

(قَومٌ سافِرَة): خوێشگەلێکی ڕەوەندن/ کۆچەرین.

(اَلسَّفّارَة): ڕەوەند/ کۆچەریی.

(اَلمِسْفَر (م) مِسْفَرَة والمِسْفار): ١-گەڕیدە/ گەڕۆك ٢-بەتوانا لە گەڕان و کۆچ و گوزاردا.

(اَلْمَسْفُور): شەکەتی گوزارو کۆچ.

٢-(سَفَرَ- تِ المَرْأَةُ. سُفُوراً): ژنەکە ڕووی خۆی دەرخست/ بێپەچە بوو.

(سافِر): ڕوو ئاوەڵە/ بێپەچە/ ڕووبەرەڵا.

(سَفَرَ- الصُبحُ): ڕۆژ بووەوە/ دنیا ڕووناکبووەوە/ شەبەقیدا.

(-الحَرْبُ): شەڕ گوڕێژیکرد/ نەما.

(-البَيتَ. سَفراً): خانووەکەی ماڵی/ گەسکیدا.

(-تِ الريحُ الغَيمَ): باکە هەورەکەی ڕادا/ ڕاماڵی/ پەرش و بڵاویکردەوە.

(-الشيءَ): شتەکەی بڵاوکردەوە/ جیاجیایکرد.

(سَفَّرَ- النارَ): ئاگرەکەی خۆشکرد/ گڕی پێسەند.

(سافَرَ-ت عَنهُ الحُمّى): تاکە بەریدا.

(أسْفَرَ): ڕووی خۆی دەرخست.

(-الصُبحُ): ڕۆژ بووەوە/ گزنگیدا.

(-الوَجْهُ): ڕوومەکە جوان و گەش بوو.

(-تِ الحَرْبُ): جەنگەکە گەرمبوو.

(-مُقَدَّمُ رَأسِهِ): پێشی سەری ڕووتایەوە.

(-الشَجَرُ): درەختەکە ڕووتبوو/ گەڵاکەی وەری.

(تَسَفَّرَ- المَرأَةَ): داوایلێکرد ڕووی خۆی هەڵماڵێت/ پەچەکەی لادات.

(-شَيئاً مِن حاجَتِهِ) شتێکی لە پێداویستیەکەی دەستگیر بوو.

(اِنْسَفَرَ شَعْرُهُ عَن رأسِهِ): تووکی سەری ڕووتایەوەو کەمیکرد.

(-الغَيمُ): هەورەکە بڵاوبووەوە.

(إستَسفَرَ- المَرْأةَ): داوای لە ژنەکە کرد ڕووی دەرخات/ پەچەکەی لابات.

(ألسَـفَرَ (ج) أسْـفار): دەمـی نزیکی دوای خۆرئاوابوون.

(ألسُفارَة): گەسکدان.

(ألسَـفير): تووکی وەریو یـان گەڵای وەریوی درەخت.

(ألسَفيرَةُ (ج) سَفائِر): ملوانکەیەك کە شتێکی بەنرخی وەك زێڕ یان زیوی پێوە بێت.

(ألمِسْفَرَة (ج) مَسافِر= المِكْنَسَة): گەسك.

(مَسـافِرُ الوَجـهِ): ئـەو بەشـە ڕووە کـە دەردەکەوێت.

(ماأحْسَنَ مَسْفَرَ وَجْهِهِ ومَسافِرَ وجوهِهِم): چەنـد جوانە ئەو ڕووەی یان ڕووە یان کە بە دەرەوەیە.

٣-(سَـفَرَ- بَـينَ القَـوم سَـفراً و سَـفارَةً وسِـفارَةً): نێوانی خوێشـگەلی ڕێکخستەوە/ ناوبژییکردن/ تەبایکردنەوە.

(سَـفير (ج) سُـفَراء): نێـوان ڕێکخـەر/ ناوبژیکەر/ تەباکار.

(ألسَفير (ج) سُفَراء):١-نێرراو بۆ تەباکردن‌و ئاشـتکردنەوە ٢-نوێنـەری دەوڵەتێك لەلای دەوڵەتێکیتر.

(ألسَفارَة والسِـفارَة): ١-باڵوێزخانە ٢-پایەی باڵوێـز ٣-ئاشـتی بەرپاکردن، ڕێکخسـتن لە نێوان نەتەوەدا.

٤-(سَفَرَ- البَعيرَ. سَفْراً):١-ڕەشمەی کردە لووتی حوشـترەکەوە ٢-حوشـترەکەیکردە لەوەڕێکـی کورت‌و خراپ.

(سَـفَّرَ- البَعـيرَ): ڕەشـمەی کـردە لووتی حوشترەکە.

(أسْـفَرَ- البَعـيرَ): ڕەشـمەی کـردە لووتی حوشترەکە.

(تَسَـفَّرَ – الجِلدُ): شوێنکار لەسەر پێستەکە بەجێما/ پێستەکە کاری تێکرا.

(ألسِـفار والسَـفارَة (ج) أسْـفِرَة وسُـفُر وسَـفائِر): پارچـە ئاسـنێکە یـان پارچـە چەرمێکە دەخرێتە سـەر لووتی حوشـتر لە جێی ئاسـنی دەمی ئەسپ دەشێت‌و لەوانەیە پەتێکبێت‌و بە ڕەشمەکەیەوە ببەسترێت بەوە پێی وەردەگێردرێت‌و حوشترەکەی پێ بەرێوە دەبرێت.

(ألسَـفْر (ج) سُـفُور) (مص): شـوێنکار کە لەسەر پێستی مرۆڤ‌و هیتر دەمێنێتەوە.

(ألسَفِير): کشتەی زۆر کورت.

٥-(سَـفَرَ- الكِتـابَ. سَـفراً): کتێبەکـەی نووسی.

(ألسِفر (ج) أسفار):١-کتێبی گەورە ٢-بەشێکە لە تەورات.

(ألسافِر (ج) سَفَرَة): نووسەر.

(ألسافِرَةُ): مێی وشەی (السافِر)

٦-(اَلسَفُّور) (ح): ماسییە ژیشکە. ماسییەکی شێوە خڕەو دڕکێکی زۆری پێوەیەو هەیە پێشیدەڵێن (قُنفُذُ الماء): ژیشکی ئاوی.

٧-(اَلسَفَرجَل) (ن): درەختو میوەی بەهێ درەختێکە لە کۆمەڵەی گوڵانە لە بنچینەدا لە ئێرانەوە هاتووە، لە هەمو وڵاتە فێنکەکاندا دەروێنرێت بەرەکەی بە کاڵی دەخورێتو دەیشکرێت بە مرەبا.

سفس: (اَلسِفْسِير (ج) سَفاسِرَة وسَفاسير): ١-دەلاڵ ٢-نۆکەر/ خزمەتکار ٣-سەرپەرشتیاری لێهاتوو ٤-دەنگناس ٥-پیاوی ناسکو بەوێڵ ٦-ئاسنگەری کارامە ٧-بریکاریان سەرپەرشتیاری دەرامەتو بەختکردن/ خەرجکردن.

٢-(اَلسَفسَطَة والسِفْسِطَة (ج) سَفْسَطات) (یونانیة): بەڵگەو پێوەری بۆشو ناڕاست کە بۆ لە خشتەبردن ڕاستی شاردنەوە دەهێنرێت.

(سَفْسَطِي وسُفْسُطائِي): سەفسەتەباز کەسێکە کە ڕێڕەوی بەڵگەو پێوەری بۆشو ناڕاست بگرێت بۆ شاردنەوەی ڕاستیو لەخشتەبردنی ئەمو ئەو.

(اَلسُوْفِسْطائِيَّة) (یونانیة): تیپێکن بڕوایان بە هەستیارییو شتی بەڵگەنەویستو شتی وەها نییە.

٣-(سَفْسَقَ- الطائِرُ): باڵندەکە ڕیقنەیکرد.

(اَلسَفْسَقَة والسِفْسِقَة مِن السُيوف (ج) سَفاسِق): شمشێری بریسکەدار.

("طَرِيقُ واضِحُ السَفاسِق"): ڕێگەیەکی شوێنبیارە.

(اَلسُفاسِق): هەموو شتێکی درێژو درێژەوەبوو.

سفط: ١-(سَفَطَ السَمَكَة. سَفْطاً): ماسییەکەی پاککرد/ پوولەکەکانی لێکردەوە (یونانیە).

("سَفَطَ حَقَّهُ") (عامیة) (سریانیة): وازی لە مافەکەی خۆی هێنا (ئەمە ئەگەر بەجێیبهێڵێتو وازی لێبهێنێت).

(اَلسَفَط (ج) أَسْفاط): پوولەکەی ماسی کە بە پێستەکەیەوەیە.

(اَلسَفيط): خورمای سەوزی وەریو.

٢-(سَفُطَ. سَفاطَةً): دڵنەرمو دڵفراوانبوو/ بەخشندە بوو.

(اَلسَفيط) (ضد): ١-دڵنەرمو دڵباشو دڵفراوان.

("هُوَ سَفيطُ النَفس"): دەروونباشو کراوەو دڵفراوان ٢-سوکو ڕسواو ناکەسبەچەی بێڕێزو هەموو شتێکی بێبایەخو بێکەڵك.

٣-(سَفَّطَ- الحَوضَ): گۆلەکەی چاککردو جوانکرد.

٤-(تَسَفَّطَ- ه): لەسەرخۆ هەڵیمژی.

(إِستَفَطَ- الشَيءَ): شتەکەی وشککردەوە.

٥-(اَلسَفَط (ج) أَسْفاط): ١-دەفرێك وەك سەبەتە یان جەواڵ ٢-بۆنـدانو کەلوپەلی

ئارایشتدانی ژنان.
(اَلسَفّاط): سەبەتەچن یان جەوالدرو یان دروستکەری قوتووی ئارایشتو بۆنی ژنان.
(سُفاطَةُ البَیتِ): کەلوپەلی ناوماڵ.
(مُسَفَّطُ الرَاسِ): سەر زلی سەرسەبەتە.
سفع: ۱-(سَفَعَ- ـَ. سَـفْعاً): لێیداو دایە بەر زللە.
(-الشَيءَ): شتەکەی نیشانەو دیاریکرد.
(-بِناصِیَتِـهِ): قـژی پێشـی سـەری گرتو رایکێشا.
(سـافَعَ- ـَ): ۱-لە یەکتریانداو یەکتریان دایە بـەر زللـە ۲-راوینـاو لەگەڵیـدا جەنگی ۳-باوەشـیان بەیەکتردا کرد/ دەستیانکردە ملی یەك.
۲-(سَفَعَ-تِ السَمومُ وَجْهَهُ سَفْعاً): گرەی گەرما دەموچـاوی هەڵپروکاندو رەشـیهەڵگەراند/ رەنگی پێستەکەی گۆری/ گەرمابردی.
(سَـفِعَ. سَـفَعاً): رووی رەشو مەیلەو سوور بوو.
(تَسَفَّعَ- بالنارِ): خۆی بە ئاگرەکە گەرمکردەوە.
(إِسْتَفَعَ- الرَجُلُ): بەرگەکەی لەبەرکرد.
(أُسْتُفِعَ- لَونُهُ): رەنگی هەڵبزرکا. لە ترساندا یان لەبەر هەر هۆیتر.
(اَلسُفْع): تۆوی کاڵەکە مارانە.
(اَلسُفْعَةُ): ۱-تۆوی (کاڵەکە مارانە/ گووژاڵك) ۲-رەشیی سووربـاو.

(اَلسَـفْع (مـص) (ج) سُـفُوع): ۱-بەرگـی رەنگکراو ۲-هەموو بەرگێك.
(اَلسَفَع): رەشی سووربـاو.
(سُفَعُ الشَمس): لەکەی رەشی رووی خۆر.
(سُفَعُ الثَور): خاڵی رەشی روی گا.
(اَلسَوافِع): پەڵەی دەمووچاوی خۆربردوو.
(اَلسافِعَة): پەڵەیەکی دەمووچاوی خۆربردوو.
(اَلأَسْـفَع (م) سَـفْعاء (ج) سُـفع): ۱-رەشی مەیلەو سوور ۲-(ح)هەڵۆ ۳-(ح)گاکێوی.
(ثَورٌ مُسَفَّعٌ): گایەك خاڵی رەشی بە روویەوە هەبێت/ خاڵخاڵاویی رەشبێت.
(كَمِـيٌّ مُسَـفَّع): زرێیەکی رەشـداگەراویی ژەنگی ناسن.
(مَسْفُوعُ العَینِ): چاو بە قووڵداچوو.
سفق: ۱-(سَفَقَ-ـُ. سَفقاً): زللەی لێدا.
(-البابَ): دەرگاکەی پێوەدا.
(أَسْفَقَ- البابَ): دەرگاکەی پێوەدا.
(إِنْسَفَقَ-البابُ): دەرگاکە پێوەدرا.
(اَلسَفْقَةُ): زللەوەشاندنو شریخەلێهەستاندن.
(أَعطاهُ سَفْقَةَ يَمينَة): چەردەیەکی پێفرۆشتو لەسەری رێککەوتن.
۲-(سَـفُقَ- الثَـوبَ. سَـفاقَةً): بەرگەکـە سفتبوو.
(أَسْفَقَ- الحائِكُ الثَوبَ): جۆلاکە بەرگەکەی سفتکرد.
(رَجُلٌ سَـفيقُ الوَجهِ): پیاوێکی بێحەیایە/

بێنابڕووە/ چەرداوەڕوو.

(اَلسَــفِيقَةُ): تەختەیەكــی پــانو درێــژە حەسیرو ئەو شــتانەی تێوە دەپێچنو لەسەر هەڵدەكەن.

السقیف: سفتو چڕ.

سفك: (سَــفَكَ- المَاءَ أَوِ الدَّمَ سَفكاً): ئاو یان خوێنیڕشت.

(-الكَلامَ): قسەی هەڵڕشت.

(سَفَّكَ-هُ): شتێكی پێش خواردن دایە بیخوات بەرگولی پێكرد.

(اِنْسَفَكَ): ڕژا.

(اَلسُّفْكَةُ): خواردنی بەرگوڵ.

(اَلسَفُوك والسَــفَّاك): ١-خوێنڕێــژ/ ئاوڕێژ/ قسەهەڵڕێژ.

(هُوَ سَفوكٌ أَو سَفَّاكٌ بِالكَلامِ): ئەو لە قسەدا فشەكەرو درۆزنە.

(اَلسَفِيك): هەڵڕێژراو/ ڕێژراو.

(رَجُلٌ مِسْفَك): پیاوێكی زۆربڵێی فشەكەر.

ســفل: (سَفَلَ وسَــفِلَ. سُفُولاً وسَــفالاً): ١- نزمبووەوە ٢- سووكبوو/ ڕسوابوو.

(ســافِل (ج) سافِلُون وسَــفَلَة وسُفَّل وسُفَّال وسُــفَّلان): ڕســوا/ ســووك/ بێنابــڕوو/ بێناموس.

(سَفُلَ- سُفُولاً وسَفالاً): بێناموسبوو/ ڕسواو سووكبوو.

(-في عِلْمِــهِ أَو خُلُقِــهِ): كەمترین زانســتو بەدترین ڕەوشــتی هەبوو/ زانستو ڕەوشتی هاتەخوارەوەو پووچبوو.

(-في الشَــيءِ. سُفُولاً): لە سەرەوەی شتەكەوە هاتە خوارەوە.

(سَــفَّلَ- هُ): لەســەرەوە هێنایە خــوارەوە/ داینەواند/ تێی شكاند.

(ســافَلَ- هُ): لە بەدڕەوشــتیو بێناموســیدا پێشبڕكێی لەگەڵدا كرد.

(تَســفَّلَ): نزمبووەوە/ داكــەوت/ كەمیكرد/ هاتەخوارەوە.

(اِسْتَفَلَ): داكەوت/ كەمیكرد/ هاتەخوارەوە/ نزمبووەوە.

(اَلسِــفْل والسُــفْل): نزمیــی/ داكەوتــن/ كەمكردنو سووكبوون/ هاتنەخوارەوە.

(اَلسِفْلَةُ): ١-نزم/ كەم/ ڕسوا/ بەدڕەوشت.

(سَــفَلَةٌ وسِــفْلَةُ القَــومِ): بێنامــوسو ناكەسبەچەو سەرسەری ناو خوێشكەل ڕسواو هیچو پووچی ناو میللەت.

(اَلسُفالَة): نزمیی/ پایینی/ داكەوتوویی.

(سُفالَةُ كُلِّ شــيءٍ): بنی/ ژێری/ خوارەوەی هەموو شتێك.

(سُفالَةُ الريح): شــوێن پێچەوانەی هەڵكەی با.

(اَلسَفالَة): بێنابڕوویی/ سووكی/ نزمیی.

(اَلســافِلَة): بــن/ دواوە/ قنگ كە لەســەری دادەنیشن.

(-مِن الرمح): بەشی نیوەی دامێنی نێزە.
("ماعالِیَةُ الرمح كَسافِلَتِهِ"): سەرەوەی نێزە وەك خوارەوەی نییە.
(سافِلَةُ النَّهرِ): خوارەوەی دامێنی/ بنی ڕووبار.
(مررتُ بعالِیَةِ النَهرِ وسافِلَتِهِ): بە ڕووبارەكەدا هاتم لە سەرەوەی تا دامێنی.
(ألأَسفل (ج) أَسافِل): بن/ دامێنترین/ نزمترین/ خوارووترین.
("رَدَدناه أَسْفَلَ سافلین"): بۆ فەوتان و لەناوچوونمان گێڕایەوە یان بۆ ڕسواترین بارو خستمانە هەرە نزمترین شوێن و دۆخ.
(أَلسُفليّ والسُفلِيَّة والسُفول): بنی بنەوە/ خواری خوارەوە هەرە دامێن پێچەوانەی سەری سەرەوە/ سەری سەر/ پۆپەو بەرزی.
(أَلسَفیل= أَلسافل): ڕسوا/ نزم/ سووك/ ترۆ/ نامەرد ٢-بەدبەخت/ بەختڕەش.
(أَلمَسْفَلَة): دامێن/ خوارەوە/ پاین.
("أَنا أَسكُنُ فِي مَعَلاة المدینَة وفُلان في مَسْفَلَتِها"): من لە ژوورووی شارەكەدا دادەنیشم/ نیشتەنیم فیسار لە دامێنی شارەكەدایە.
سفن: ١-(سَفَنَ-تِ الریحُ سَفْناً): باكە بە ڕووی زەویدا هەڵیكرد.
(-الشيءَ. سَفْناً): توێكڵی شتەكەیگرت.
(سَفِنَ-ت الریحُ. سَفْناً): باكە هەڵیكردە سەر ڕووی زەوی.
(سَفَّنَ-هُ): ١-لێیتاشی، دایتاشی ٢-كڕاندی یان هەڵیكۆڵی/ نەرمیكرد.
(أَلسَفَن): هەرچی شت دەتاشێت/ هەڵدەكۆڵێت/ دەڕنێت، دەكڕێنێت وەك تەشوێ و سەمارتەو چەكوش و سوۆو شتیتر.
(أَلسافِنَةُ والسَفُون- مِنَ الریاح (ج) سَوافِن): بای هەڵكردوو بە ڕووی زەویدا.
(أَلسَفین) (یونانیة): پوازی ئاسن یان دار كە بۆ هەڵقڵیشانی دار بەكاردێت.
(أَلسَفینَةُ (ج) سُفُن وسَفین وسَفائِن): پاپۆڕ (بۆیە واناونراوە چونكە ڕووی ئاوەكە دەڕنێت).
(أَلسَفَّان): پاپۆڕساز/ پاپۆڕدروستكەر.
(السِفانَة): پیشەی پاپۆڕسازیی.
(سَفائِنُ البَرِّ): پاپۆڕی وشكانی كە بە حوشتر دەڵێن.
(أَلمِسْفَن): ئەوەی پێیدەتاشن و هەڵدەكۆڵن وەك چەكوش و سوۆو تەشوێ و شتیتر.
٢-(أَلسَفَن): چەرمێكی زبرە دەگیرێتە دەسكی شمشێر.
(أَلسافین (ع ا): ڕەگێكە لە ناوەوەی بڕبڕاگەی پشتەو بە درێژایی پشتە كە بە ڕەگی دڵەوە پەیوەستە.
(أَلسَفَّانَة): مرواری.
٣-(سَفَنَج): خێرایكرد/ پەلەیكرد.

(-لِفُلانٍ النَقــدَ): زوو ، به پەله پارەكەی دا به فلان.

(ألسَــفَنَّج (م) سَــفَنَّجة): ١-خێــرا/ چابوك ٢-درێژ.

(ألسَــفَنج و السِفَنج والسُــفِنج= الإسْفَنج) (يونانية): ئیسفەنج.

٤-(الإسْــفِنْط والإسْــفَنْط): ئــاوی ترێــی بۆنخۆشكراو.

الملحق:

ســفن: (ألإسْفين= السَفين): پوازی ئاسن یان دار بۆ هەڵقلیشانی دار.

---

ســفه: ١-(سَــفَهَ- الرَجُلَ سَــفها): ١-گاڵتەی پێكردو لە قسەی ســووك بەیەكــتری وتندا بۆریدا ٢-بۆ گاڵتەبازیی‌و قسەی بێجێ رایكێشا یان بە گەمژەو گەلۆریدانا.

(-نَفْسَهُ): خۆی سەرشۆڕو سووككرد.

(-نَصيبَهُ): بەشەكەی فەرامۆشكرد.

(سَــفِهَ سَــفَهاً): جووكیــی‌و هەڵەشــە بوو/ كەمچیكڵدانــە بوو یان نــادان‌و نەزانبوو یان بەدڕەوشت‌و خوێڕیبوو.

(سَــفيه (ج) سِفاه ســفهاء (م) سفيهة (ج) سِفاه وسُفَّه وسَفائِه وسَــفيهات): خوێڕی‌و بەدڕەوشــت یان قوشــقی‌و كەمچیكڵدانە یان دەمپیس یان نادات‌و كەرۆكەو بێهەست.

(سَفِهَ نَصيبَهُ) بەشەكەی خۆی فەرامۆشكرد/ لەبیرچووەوە.

(سَفُهَ. سَــفاهَةً وسَــفاهاً): ١-تێنەگەیشتوو نەفامبوو/ نادان‌و نەزانبوو ٢-قوشقی‌و هەڵچوو بوو ٣-بەرەڵاو خوێڕیبوو/ بەدڕەوشتبوو.

(سَــفَّهَ- الرَجُلَ): گاڵتەی پێكردو شێتیكرد/ هەســتی لێســەندو لەبەربڕی یان بە نادان‌و كەمئاوەزی دانا.

("سَفَّهَ الجَهلُ حِلْمَهُ): تێنەگەیشتن‌و نەفامیی هەڵەشەیكردو خستیە هەڵەوە.

(سافَهَ- هُ): شەڕەجنێوی لەگەڵدا كرد.

(تَسَــفَّهَ الرَجُــلُ): كابرا خۆی بــە بێئاوەزو هەڵەشە یان بەرەڵا نواند.

(-تِ الريحُ): باكە گێژیدا.

(-تِ الريــحُ الغُصــونَ): باكــە لــق‌و پۆپی دارەكەی راوەشاند/ هێناوبرد.

(-فُلاناً عَن مالِهِ): بە فێڵ داراكەی لەدەست دەرهێنا.

(تَســافَهَ- عَلَينا): ١-خۆی لە مافەكەمان لاداو مافەكەمانی پشتگوێخست ٢-لەگەڵماندا نادان‌و تێنەگەیشتوانە رەفتاریكرد/ خراپبوو.

(ألسَفَه) (مص): ١-تێنەگەیشتوویی/ نادانیی ٢-ناســەرەمەندیی/ هەڵەشەیی/ جرت‌و فرتی شــێتانە ٣-بەدڕەوشــتیی (كە بنچینەكەی لە شپرزەیی‌و كەمئاوەزیی‌و سووكییەوەیە).

(ألسافِه (فا)): گەوج.

٢-(سَفِهَ- ت الطَعْنَةُ. سَفَهاً) تێزە پێداكردنەكە خوێنی دەربەراندو فیچقەی پێكرد.

(- الشَرابَ): زۆری خواردەوەو لێیتێر نەبوو.
(ســافَهَ- الدَنَّ): لەپاڵ کووپەکەدا دانیشــتو هەر ساتەناساتێك دەیخواردەوە.
(-الشَــرابَ): زۆری خــواردەوە بێئەنــدازەو لێکدانەوە.
(أَسْــفَهَ- اللهُ فُلاناً الماءَ): خودا وا تووشیکرد هەر دەیخواردەوەو تینوێتیی نەدەشکا.
(ألسافِه) (فا): زۆر تینوو.
(وادٍ مُسْفَهٌ): دۆڵێکی پڕ.
(ألمَسْفَهَةُ): خۆراکی ئاوکێش.
(طَعامٌ مَسْفَهَةٌ): خواردنێکە ئاوکێشە.
سفا: ١-(سَفا. سُفُوّاً): لە ڕۆیشتندا یان فڕیندا خێرایکرد/ خێرا ڕۆیشت، خێرا فڕی.
(سَــفِيَ. سَــفاً وسَــفاءً): قژی پێشی سەری سووکبوو/ رووتایەوە.
(أَسْفى-تِ الناقَةُ): مێحوشترەکە لاواز بوو.
(-الريحُ): باکە هەڵیکرد.
(ألسَــفا): ١-تەنکبوونی قژی پێشیسەر ٢-گڵ/ خۆڵ ٣-لاوازیی/ لەڕیی.
(بَغلٌ أَسْفى (م) سَفْواء) ١-ئێسترێك کە تووکی ناوچەوانی کەمبێت ٢-خێرا گورج/ چابوك.
(ريحٌ سَفواء): زریانە با.
٢-(سَــفِيَ- الرَجُلُ. سَفاً وسَــفاءً): خوێڕیو گەوج و سووکبوو.
(سَــفِيّ= سَفيه): ســووك/ گەمژەو خوێڕی/ گەوج.

(أَسْفى=سَــفِهَ): هەڵەشــەو کەمچیکڵدانــە بــوو یان نادان یــان بەدکــردارو خوێڕیبوو/ گەوجبوو.
(-فُلانــاً): پاڵــی پێوەنــا کە هەڵەشــەبێت/ سەرکێشبێت.
(-بِهِ): خراپەی دەرباره کرد.
(ســافى- الرَجُلَ): لەگــەڵ پیاوەکەدا کەوتە شەرە جنێوو سووکیەتی: هەرزەییکرد.
(ألسَــفاهَةُ): ١-ســووکییەتیو هەرزەیــی ٢- نادانیو گێلیو نەفامیی.
٣-(سَفِيَ-تْ يَدُهُ. سَفاً وسَفاءً): دەستی قڵیشا/ شەقارشەقار بوو.
٤-(ســافى- الرَجُلَ): پیاوەکــەی تیمارکرد/ دەرمانکرد.
٥-(أَســفى- الزرعُ): گوڵی کشــتەکە شــیلەی تێکەوت.
(ألسَــفا الواحِدَةُ سَــفاةٌ): هەموو درەختێکی درکدار.
(سَفاةُ السُمْبُلَةِ): قەڵاسی گوڵە گەنمو جۆو لەو بابەتە.
سفى: (سَفى وأَسْفى-تِ التُرابَ): با خۆڵەکەی کرد بە تۆزو هەڵیگرتو بە ئاسماندا بردی.
(ســافِيَة (ج) ســافِيات وسَــوافٍ): بای تۆز هەڵکردوو بە ئاسماندا بردوو.
(سَفِيَ التُراب. سَفياً): گڵەکە بە تۆز بوو و بە ئاسماندا چوو، پەرش و بڵاوبووەوە.

(اَلسّافِياء): تۆز/ گەرد.

(اَلسَفی): ئەوەی با دەیکاتە تۆزو دەیبات.

(اَلسَفِيّ): خۆڵی پەرش‌و بڵاوە بوو.

(اَلأَســفى مِنَ الخَيلِ (م) سَفياء (ج) سُفْيٌ): ئەسپی پەرچەمتەنك.

(اَلمُسْفي): بەدزمان.

سق: (سَقْسَقَ-الطائِرُ): باڵندەکە جیقنەیکرد/ ریقنەیکرد.

سقب: ١-(سَــقِبَ-تِ الدارُ. سَقَباً و سُقُوباً): خانووەکە نزیکبوون.

(ســاقَبَ-تِ البيُــوتُ): خانــووەکان لە یەك نزیکبوون.

(اَسْقَبَ-تِ الدارُ): خانووەکە نزیکبوو.

(-الدّارَ): خانووەکەی نزیککرد.

(مَنزِلٌ سَقَبٌ): خانوویەکی نزیك.

(الساقِب) (فا) (ضد): ١-نزیك ٢-دوور.

٢-(اَسْقَبَ-تِ الناقَةُ): مێحوشترەکە بە زۆریی بەچکەی نێری دەبوو.

(اَلسَــقْب (ج) اَسْــقَب وسِــقاب وسُــقُوب وسُــقْبان): بەچکە حوشتری تازەبوو/ کۆرپە حوشتر.

("اَذَلُّ مِــنَ السُــقبانِ بَــينَ الحَلائِــبُ"): لە کــۆڕو کۆمەڵاندا لــە بەچکە حوشــتری تازە بێدەسەڵاتتر بوو.

(اَلمِسْقَب): دایکی کۆرپە حوشتر.

(اَلمِسْــقاب): ١-دایکــی کۆرپــە حوشــتر ٢-مێحوشترێك کە بە زۆریی بەچکە نێرەببێت.

٣-(اَلسَقْب (ج) سِقبان والسَقيبَة): ١-ستوونی دەوار ٢-لقی تەڕی ئەستووری درێژ.

سقد: (سَقَدَ وسَقَّدَ واَسْقَدَ- الفَرَسَ. سَقْداً): ئەسپەکەی چرووساندو لەڕکرد.

(اَلسُقْدَةُ (ج) سُقَد والسَقيدَةُ (ج) سُقَيْدات) (ح): سوورەباڵە باڵندەیەکی ڕەنگسوورە.

سقر: ١-(سَــقَرَ-تْهُ الشَّمسُ. سَــقْراً): خۆر بردی‌و مێشکی شــڵەقاند/ ئازاری پێگەیاند/ هەتاو بردی.

(سَقَرَ): ناوێکی جەهەننەمە.

(اَلسَــقْرَةُ (ج) سَــقَرات): گەرمابــردن/ خۆربردن/ هەتاوبردن.

(اَلســاقُور): ١-گەرما ٢-داخ/ پارچە ئاســنێکە ئاژەڵی پێداخدەکەن.

٢-(اَسْــقَرَ-تِ النَخَلَةُ): دارخورماکە دۆشاوی لێتکا/ دۆشاوی دەردا.

(اَلصَقْر): دۆشاوی دارخورما.

(نَخلَــةٌ مِسْــقار): دارخورمایــەك دۆشــاو دەربدات.

(اَلسَقْر (ح) = الصَقْر): هەڵۆ.

"جاءَ بالسُــقَرِ والبُقَرِ وبَنــاتِ غِيَرِ): کەوتە فیشاڵ‌و درۆی شاخدار.

(اَلسَقّار (ج) سَــقّارَة): ١-کەسێکە نەفرەت لە خەڵکانێك بکات کە شایســتەی ئەوە نەبن ٢-کافر/ بێبڕوا.

سـقط: ١-(سَـقَطَ. سُقُوطاً ومَسْـقَطاً): به زەویدا كەوت.
("سَـقَطَ مِن عَينِي"): لـه بەرچاوم كەوت/ لەبەرچاوم سووكبوو.
(سَقَطَ- الحَرُّ): گەرماكە هاتو (شكا/ نەما).
(-الحَرُّ عَنَّا): گەرما لە كۆڵمان بووەوە/ گەرما نەما.
(-النَجمُ): ئەستێرەكە ئاوابوو.
(-علـى ضالَّتِهِ): بە ئاواتی خۆی گەیشـت/ ئەوەی بۆیدەگەڕا كەوتە بەردەستی.
("على الخَبيرِ سَـقَطْتَ"): تووشـی (شارەزا/ لێزان)ی خۆت بوویت.
("حَيثُما سَـقَطَ لَقَطَ"): فێڵبازەكە لە كوێدا خۆی بە زەویدا دا دەستگیربووە.
(-القَومُ إلَيَّ): خوێشـكەل بەسەرمدا كەوتن‌و واتا: لای من دابەزین.
(-الوَلَـدُ مِن بطنِ أُمِّهِ): كۆرپەكە لە سـكی دایكی دەرچوو/ هاتەدەرێ/ كەوتەخوارێ.
(سـاقَطَ-هُ سِـقاطاً. مُسـاقَطَة): بەرێدایە خوارەوە یان وردە وردە بەرێدایە خوارەوە.
(-هُ الحَديث): یەكێك قسەیكردو بێدەنگبوو تا ئەویتر قسە بكات/ بەسەرە قسەیانكرد.
(أَسقَطَ- هُ): خستی.
(-تِ المَـرأَةُ السِـقْطَ): ژنەكـە منداڵەكـەی لەبارچوو.
(السِقط): منداڵی لەبارچووی ناتەواو.
(أَسْـقَطَ أَو طَرَحَ أَو أَلغى) (ن) من (ك) (ع ح): لێیلاخست یان لێیدەركرد یان لێیلابرد/ داشـكاند ژمارەیەكـی تـازە دەردەچێت (ف) ئەگەر ئـەو ژمـارە دەرچووە بخرێتە سـەر (ن) دەكاتــەوە ژمــارەی (ك). دەڵێین ك – ن = ف: دەڵێــن (ن) (المطروح): دەركراوو (ك) المطـروح مِنــه): لێدەركـراو (ف) (حاصل الطــرح): ئەنجامی لێدەركردن یـان زیادەو جیاوازی/ جیاكاریی نێوانیان.
(مَسْـقط) (هـ): خاڵـی یەكتربەركەوتی دوو هێڵ.
(مسقط- الرأس): شوێنی لەدایكبوون.
(أَسقَطَ لَهُ بِالكلام): جنێوی بەسەردا باراند.
(تَسَقَّطَ): شوێن هەڵەو نەنگیی‌و كەوتنەكانی كەوت.
(-الخَبَـر): هەواڵەكەی كەم كـەم هەڵچنی‌و وەرگرت/ كۆیكردەوە.
(تَساقَطَ واسَّـاقَطَ- الشيءُ): شـتەكە وردە وردەو سەروەر هاتەخوارێ.
(السُقْط): منداڵـی لەبارچوو كە ناتەواو بێت یان تەواو بێت بە مردوویی ببێت.
(السَقْط= السُـقط): ١-منداڵی لەبارچوو یان بـە كردوویی بوو ٢-ئاورنگ یان بەفری باریو ٣-بەدزمان.
(السَقْطَةُ): ١-كەوتنە خوارەوەیەكی خراپ ٢-هەڵنوتان/ هەڵخلیسكان ٣-بەهەڵەداچوون یان

زمان تەتەڵەكردن.
(أَلسِقط): ١-منداڵی لەبارچوو ٢-باڵی باڵندە.
(رَفَع الطائِرُ سِـقْطَيْه"): باڵندەكە هەردوو باڵی بەرزكردەوە ٢-لووتی هەور كە دەنیشێتە سەر زەوی ٤-كەناری ڕەشماڵ/ دەوار.
(أَلسَـقَط (ج) أَسْـقاط): ١-شـتی بێفـەرو كەوتوو/ بێكەڵكی هەموو شتێك ٢-كەلوپەلی پەككەوتە/ خراپ‌و بێكەڵك/ شركەو پركە ٣-نابرووچوون.
(أَلسـاقِط (ج) سُقّاط وسَقاط (م) ساقِطَة): بەدزمان/ ناپاك.
(أَلساقِطَةُ (ج) سَواقِط): ١-بەدزمانی كەمناوەز ٢-میوەی كاڵی وەریو.
أَلسِقاط: كۆی وشەی (الساقط)ە: ١-هەڵنووتاو ٢-كەوتوو ٣-سـووكبوو ٤-میوەی كاڵی وەریو ٥-باڵی پەلەور.
(أَلسُـقاط والسُـقاطَة): ئـەوەی لە شـتێك دەوەرێت‌و دەكەوێت.
(أَلسَقُوط): ١-كەوتوو ٢-ڕسواو بەدڕەفتار.
(أَلسَـقيط): وەریو. بەفرو تەرزەو شـتیوای وەریو.
(أَلسقيط (م) سَقيطة): ١-گەوج ٢-كەمناوەز.
(أَلإسقاط عمودياً) (هـ): داهێڵانە خوارەوەی ستوونیی.
(إسقاط مائِل): داهێڵانە خوارەوەی لار.
(أَلسَقّاط): زۆر هەڵنوتـوو ٢-زوو زوو كەوتوو ٣-شمشێرێكی تژی بڕەر كە بە یەك پێداكێشان لەتبكات‌و ببخات.
(أَلسَـقّاط والسَقَطِيّ): فرۆشیاری كەلوپەلی/ كاڵای بێكەڵك‌و گەندە/ كۆنەفرۆش.
(أَلسَـقّاطَة): مێی وشەی (أَلسَقّاط): زوو زوو كەوتوو.
(سَقّاطَةُ الباب): سوورگیی پشتدەرگاكە پێی قایمدەكرێت‌و دادەخرێت.
(أَلمَسْقَط (ج) مَساقِط): شوێنی كەوتنە سەر/ شوێنی كەوتنەخوارەوە.
(أَلمُسْـقَطَةُ): هـۆكاری ١-كەوتنە خـوارەوە/ وەرین، بەربوونەوە ٢-كەوتن.
(أَلمَسْقِط (ج) مَساقِط): ١-شوێنی بەروبونەوە/ شوێنی گلان ٢-باڵی مەل/ پەلەور/ باڵندە.
(مَسْـقِط رأسُ الرَجُل): شـوێنەزا شـوێنی لەدایكبوون.
(مُسْـقِطَةُ —الأَحبال): داوپسێن/ پەتپسێن: زۆرزان‌و فێڵبازێكی مەزن.
(أَلأُم المِسقاط): دایكێك كە منداڵی زۆر لەبار بچێت.
٢-(سَـقَطَ- في الكَلام. سُقُوطاً ومَسْقَطاً): لە قسەكەدا تێكەوت‌و هەڵەیكرد.
(-عَلَيهِ الأَمـرُ): كارەكەی لێونبوو/ كارەكەی لەدەستچوو.
(-في يَدِهِ): پەشیمانبووەوە.
(سُقِطَ — في يَدِهِ): ١-زمانی تەتەڵەیكردو كەوتە

هەڵــەوە ٢-پەشــیمانبووەوە ٣-سەرســامبوو/ حەپەسا.

(أَسْــقَطَ- الرَّجُلَ): کارێکیکــرد کە پیاوەکە تێکەوێتو بکەوێتە هەڵەوە یان درۆ بکات یان ئەوەی لە دڵیدایە بیدرکێنێتو دەریبڕێت.

("ماأُسْــقِطَ في کَلِمَــةٍ"): لــە وشەیەکیشــدا هەڵەینەکردو تێنەکەوت.

(أُسْــقِطَ- في یَــدِهِ): ١-زمانــی تەتەڵەیکردو کەوتە هەڵەوە ٢-پەشیمانبووەوە ٣-حەپەسا.

(اَلسَــقَط (ج) أَســقاط): تێکەوتنو هەڵە لە نووسینو قسەو ژمێرەدا/ بە هەڵەدا چوون.

٣-(ساقَطَ- الفَرَسُ الخَیلَ سِقاطاً ومُساقَطَةً): ماینەکە پێش ئەسپەکان کەوت/ پێشیدانەوە.

(-الفَــرَسُ العَــدوَ): چارەوێکــە غارەکــەی هێواشکردەوە.

سقع: (سَقَعَ-ـَ. سَقْعاً): ١-بە قسە بەرەنگاریبوو ٢-بــە خراپــە ڕوبەڕوویبــووەوە ٣-دایە بەر زللە.

("ماأدري أَینَ سَــقَعَ"): نازانــم بۆ کوێ ملی شکاندو ڕۆیشت.

(أُسْــتُقِعَ- لَونُهُ): ڕەنگی هەڵبــزڕکاو پەڕی/ گۆڕا.

(اَلسُــقْع (ج) أَســقاع): ١-کەناری/ لای زەوی ٢-خانوو.

(اَلأَسْقَع): لە دوژمنو ئیریە بەر/ لە حەسوود دوورەوە کەوتوو.

٢-(سَــقَعَ- الدیكُ. سَــقعاً): کەڵەشــێرەکە خوێندی.

(اَلسَقاع والمِسْقَع): قووقاندنی کەڵەشێر.

٣-(اَلسِــقاع): ١-بەرکۆش ٢-پەچە/ ڕووپۆش ٣-شــتێکە بە لووتی مێحوشــترەوە دەکرێتو پێوەی دەبەسترێت.

(اَلأَسْــقَع (ج) أَســاقِع (ح): باڵندەیەکە وەك چۆلەکە پەرەکەی ســەوزباوەو سەری سپییە هەمیشە لە کوێ ئاودایە.

(اَلسَــوقَعَةُ): ســەرەوەی تریــت کــە چەور دەبێت.

(-مِنَ الرِّداء أَو الخِمار أَو العِمامَة): پێشەوەی ســەربەرگ یان پەچە یان مێزەر کە لە خوار سەرەوەیەو زوو پیسدەبێت.

ســقف: ١-(سَــقَفَ- البیتَ. سَــقفاً): سەری خانووەکەیگرت.

(سَقِفَ): درێژو خوار بوو.

(أَسْــقَف (م) سَــقفاء (ج) سُــقْف): درێژی لوولخواردوو.

(سَــقِفَ- الرجــلُ): پێکــە بــەلای ڕاســتدا وەرگەڕا.

(سَقَّفَ- البَیتَ): سەری خانووەکەیگرت.

(اَلسَّــقْف- مِــنَ البَیت (ج) سُــقُوف) (ب): سەری خانوو/ میچی خانوو.

(اَلسَقیف (ج) سُقُف وسُقْف): سەری خانوو.

(اَلسَقیفَة (ج) سَــقائِف): ١-هەموو تەختەو

بەردێکی پان کە بە کەڵکی ئەوە بێت سەری خانووی پێبگیرێت ٢-هەموو خانوویەک بینایەک شتێک لەو بابەتە سەری گیرابێت وەک کەپر ٣-توولی زێڕ یا زیوی کوتراوو باریک ٤-پەراسووی حوشتر.

("هَدَمَ السَّفر سَقائِفَ البَعیرِ"): کاروان پەراسووەکانی حوشتری تێکدا.

(اَلأسْقَف): ئێسقانی ئەستوورو درێژ.

(-مِنَ الجمال): حوشتری بێتووک/ ڕووت.

(مِن الظُّلْمان): نێرە وشترمرخی ملخوار.

(اَلْمُسَقَّف) (مفع): ١-درێژ ٢-سەری خانوو/ میچی خانوو (لەبەر بەرزیی و درێژیی دیوارەکانی واناوەنراوە).

٢-(سَقَفَ وتَسَقَّفَ. سَقِّیفی): بوو بە سەر قەشە.

سَقَّفَ: بوو بە سەر قەشە.

(-هُ عَلَیهِم): کردی بەسەر قەشە بەسەریانەوە.

(اَلأُسْقُف والأُسْقَفّ (ج) أَساقِفَة وأَساقِف): سەرقەشەکە پلەی لە قەشە بەرزترە.

(اَلقَس (ج) القَسیس): قەشە.

(اَلْمطران) (یونانیة): مەتران.

(اَلأُسْقُفیَّة): پلەی سەرقەشەیی.

(رَعیَّةُ الأُسقُف): ئەوانەی لەژێر دەستی قەشەدان.

سقل: ١-(سَقَلَ. سَقْلاً): سوویەوەو لووسیکرد.

(سَقِلَ- البَعیرُ. سَقَلاً): بنی پێی بەلای ڕاستدا خواریی هەبوو.

(اَلسُقُل): کەمەر.

(اَلسَقِل- مِنَ الرجال): پیاوی غالیگە تێقوپاو.

(مِنَ الخَیْل): ئەسپی پشتلەر.

(اَلسَقالَة والإسْقالَة والصِقالَة) (عند العامة) (ایطالیة): داربەست کە دەبەسترێت بۆ گەیشتنە شوێنی بەرز.

٢-(سَقْلَبَ-هُ): هەڵیگێڕایەوە دایبەزەویدا.

(اَلسَقْلَب الواحِدَةُ سَقلَبيّ (ج) سَقالِبَة= صَقالِبَة): بەرە خەڵکێکن لە دورگەی صقلیە.

سقم: (سَقِمَ وسَقُمَ سَقَماً و سُقْماً و سَقاماً و سَقامَةً): نەخۆشکەوت یان نەخۆشیەکەی درێژەی کێشا/ کەنەفتە بوو.

(سَقیم (ج) سِقام وسُقَماء): نەخۆش یان دەردەدار/ کەنەفت.

(سَقَّمَ- هُ): نەخۆشیخست یان دەردەداریکرد.

(أَسْقَمَ- هُ): نەخۆشیخست/ دەردەداریکرد.

(-الرَجُلُ): ١-ماڵەوەی پیاوەکە نەخۆشکەوت ٢-گرفتاری گەلێک دەردو نەخۆشیبوو.

(اَلسَقَم والسُقْم (ج) أَسْقام والسَقام): نەخۆشیی.

(اَلسَقِم والسَقیم): نەخۆش/ خەستە.

(کَلامٌ سَقیم): ناخاوتنێکی ناخۆش/ ناتەواو/ نادروست.

(مَکانٌ سَقیم): شوێنێکی پڕ مەترسیی.

("هُوَ سَقیمُ الصَدرِ علی أخیهِ"): دڵی لە

براكەی پڕە، واتا ڕقی زۆر لێیەتی.
(اَلمِسْقام):زۆر نەخۆش/ زۆردەردەدار.
(أرضٌ مَسْقَمَة): خاكێكی دەرداوی/ نەخۆشیی دەردی زۆر تێدایە.
سقن: (اَلسَقَنْقور) (یونانیة):گیرنگرکی دەشتەکی/ تیمساحی دەشتەکی.
سقی: ١-(سَقی- الرَجُلَ سَقیاً):١-ئاوی بە پیاوەکە دا بیخواتەوە ٢-پێیوت خودا ئاوت بدات/ تینوێتیت بشکێنێت یان نۆشیگیانتبێت.
(سَقی- الثوبَ):بەرگەکەی تێر ڕەنگکرد.
(-ەُ اللهُ الغَیثَ):خودا بارانی زۆری بۆ باراند.
(-بَطْنُهُ):تووشی ئاوبەند بوو.
(سُقِیَ- قَلْبُهُ عَداوَةً):دڵی پڕ لە دوژمنایەتیی بوو.
(- بَطنُهُ):ئاوبەندیگرت.
(سَقّی- الرَجُلَ. تَسْقِیَةً):١-ئاوی زۆرپیدایە ٢-پێیوت نۆشیگیانتبێت.
(-الثَوبَ):جار لە دوایجار بەرگەکەی بە ڕەنگەکەدا کرد.
(ساقی- ەُ):هەریەکەیان ئەویتریانی تێر ئاو کرد.
(-ەُ فی أرضِهِ):کردی بە نیوەکارو هاوبەش لە بەرهەمی زەوییەکەیدا.
("شرکة المُساقاتِ"):هاوبەشیی نیوەکاریی.

(أَسْقی- الرَجُلَ):١-ئاویدایە بیخواتەوە ٢-ڕانومای سەر ئاوەکە کرد ٣-ئاژەڵەکەی یان زەویەکەی ئاودا ٤-پێیوت خودا تێرئاوت بکات. یان نۆشیگیانتبێت.
(أسقی- ەُ اللهُ الغَیثَ):خودا بارانی بۆ باراند.
(تَسَقّی. تَسَقّیاً): ئاوەکەی وەرگرت‌و خواردیەوەو تێرئاو بوو.
("تَسَقّی الصِبغَ"): ڕەنگەکەی گرت‌و ڕەنگبوو.
(تَساقَیا):یەکتریان ئاودا/ تێرئاو کرد.
(إسْتَقی- مِنهُ. إستِقاءً):داوای خواردنەوەی لێکرد/ داوای شتێکی لێکرد بیخواتەوە.
(-مِنَ النَهرِ):ئاوی لە ڕووبارەکە برد.
(إستَسقی مِنهُ. إستِسْقاءً):داوای لێکرد شتێکی بداتێ بیخواتەوە.
(-الرَجُلُ):ڕشایەوە ٢-ئاوێکی زۆر لە گەدەیاو لەشیدا کۆبووەوە/ تووشی ئاوبەند بوو.
(-الرَجُلَ):پێیوت: خودا ئاوت بدات یان نۆشیگیانتبێت.
(اَلسَقی (ج) أسْقِیَة):نەخۆشیی ئاوبەند/ ئاو لە سکدا کۆدەبێتەوە.
(سَقیاً وسُقیاً لِفُلان):خودا فلان تێرئاوبکات/ تینوێتی بشکێنێت.
(اَلسِقی (ج) أسْقِیَة):١-ئاوبەند ٢-ئاودان/ ئاودلشتن ئاوەدانی کشتوکاڵ/ جاری ئاوخواردنەوە یان ئاودان.

("كَم سِـقيُ أَرْضِكَ): جـاری چەندھەمینی ئاوداشتنی زەویەکەتە.

(اَلسِقي): ھەور.

(اَلسِقاء (ج) اَسْقِيَة واَسْقِيات واَساق): مەشکە یـان کوندە یان جەوەندە کـە بۆ ئاو یان دۆو ماست بەکاردێت.

(اَلسِـقايَة والسَـقايَة): ١-شـوێنی ئاودان ٢-دەفرێك ئاوی پێبدرێت.

(اَلسُـقايَة): ئـەوەی بـۆ کۆکردنـەوەی ئاو دروسـتدەکرێت وەك گۆل/ حەوزو ئەستێلو بەند لەو بابەتە.

(اَلسـاقي (ج) سُقاة وسـاقون وسُقَّاء وسُقِيّ (فا): ئاودێرو ئاوگێڕو ئەو کەسە خواردنەوە ھەرچییەکبێت بەمو بەوی بدات.

(اَلسـاقِيَةُ (ج) سَـواقٍ وسـاقيات): ١-مێـی وشەی (السـاقي) ٢-جۆگەلەو چەمو ڕووباری بچووك.

(اَلسُـقيا): ١-ئاودێریی ٢-ئاوگێـڕانو ئاودان ٣-ئاوخواستن.

(اَلسَـقِيّ الواحِـدَةُ (سَـقِيَّة): ١-دارخورماو باشـترین خورما ٢-کشـتی ئاوەنیـا/ ئەوەی بـە ئاوی ڕووبـارو چەمو کارێـز ئاودەدرێت ٣-ھەورێکی باران بە لێزمە/ پرباران.

(اَلسَـقَّاء (م) سَقَّاءَة وسَقَّايَة): ئاوگێڕێك یان ئاودێرێك کـە ئاو زۆر بگێڕێـتو بە خەلك بدات یان ئاو زۆر بدێرێت.

(اَلاَسْتِسقاء): ١-ئاوخواستن.

(-شَـرعاً): نزاو پاڕانەوە لە خـودا کە باران ببارێنێـت. بـە تایبەتی کاتی زۆر پێویسـت ٢-(طب) ئاوبەند/ ئاو کۆبوونەوە لە بۆشـای یان خانەکانی لەشدا.

(اَلمَسْقى) (ز): دەمی ئاوداشتنی کشتوکاڵ.

(اَلمَسْقَوِيّ) (ز): کشتی ئاوەنیا/ ئەوەیە بە ئاوی ڕووبارو کارێز ئاودەدرێت/ کشتوکاڵی بەراو.

(اَلمَظمَـاِيّ): کشـتی دێـم کـە بـە بـاران ئاودەدرێت.

(اَلمِسْقاة والمَسْقاة): شوێنی ئاوداشتن/ ئاودان.

٢-(سَـقَى- الرَجُـلَ. سَـقياً): کەموکووڕیی لێدەرھێنـا/ لەکەداریکـردو لە پاشـملە بە خراپە ناویبرد.

(اَسقى- فُلاناً): تەشەری لێداو لەکەداریکردو غەیبەتیکرد.

سـكّ: ١-(سَـكَّ- البابَ. سَـكّاً): ١-دەرگاکەی داخسـت ٢-بە ئاسـن قایمیکرد/ ئاسنی دایە پاڵی.

(-اُذُنَيـهِ): ھەردوو گوێی لە بندا بڕی.

("ماسَكَّ سَـمعي مِثلُ ذلك الكلام"): قسەی وام بەرگوێ نەکەوتووە.

(سَكَّ- سَكَكاً): گوێکورتو بچووکبوو.

(اَسَك (م) سَكَّاء (ج) سُكّ): گوێی قوت/ گوێی مشك.

("کُلُّ سَـكَّاءٍ بَيـوضٌ وکُلُّ شَـرفاءٍ ولودٌ"):

والسَيهُوج- مِنَ الأَرياح): بای توند.

(اَلمَسْــهَج): ١-دەرەبیا ٢-شـوێنێك كە با تیایدا توند دەبێت.

(اَلمِسْــهَج): ١-كەســێكە كە لە هەق و ناهەقدا هەڵدەداتــێ‌و تێهەڵدەچێــت ٢-قســەترنێك هەمیشە لە خۆیەوە هەڵدەداتێ.

٢-(سَــهَجَ- القَومُ لَيْلَتَهُمْ سَهْجاً): شەویان بە رۆیشتن بردە سەر.

سهد: ١-(سَــهِدَ وتَسَهَّدَ. سَهَداً): ١-خەوی زڕاو بێداربوو ٢-خەوی كەمبوو.

(سَــهَّدَ- هُ): خــەوی زڕانــدو بێداریكــرد/ نەیهێشت بنوێت/ لەخەویكرد.

("سَهَّدَهُ الهَمُّ"): خەم‌و مەراق خەوی لێزڕاند/ بێداریكرد.

(اَلسُهْد والسُهاد): خەوزڕان/ بێخەوی.

اَلسُهُد: كەمخەو.

(رجلٌ ستُهُد وعَينٌ سُهُدٌ"): پیاوێكی كەمخەو چاوێكی كەمخەو.

(اَلسَهْدَةُ): هوشیاریی/ بەخەبەربوون/ بێداریی.

(مارَأَيتُ مِنهُ سَهْدَةً): لێمنەدی بەلای چاكەو خێردا لابكاتەوە یان حەزی لێبكات.

(اَلأَسْهَد): هوشیارترو بەبرشتر.

("هُوَ اَسْــهَدُ منــكَ رأياً"): ئــەو ڕاكەی لەتۆ وریاترانەو سوور حەزترانەیە.

(اَلمُسَهَّد): كەمخەو.

٢-(اَلسَهود): زۆر درێژ بالاقووچ.

("غلامٌ سَهودٌ"): میرمنداڵێكی بالاّ هەڵچوو.

سهر: ١-(سَهِرَ. سَــهَراً): شەو بێداربوو/ شەو نوخونیی چێشت.

(ســاهِر وسَــهران): بێدار/ شــەو بــە ئاگا/ ئێشكگرتوو.

(لیلَة ســاهِرَة): شــەوارە شــەوێك كە تیایدا نەنوون.

(ســاهَرَ- هُ): لەگەڵیدا/ شــەوی لەگەڵدا ڕۆژ كردەوە/ شەو بێداربوو.

(اَسْهَرَ- هُ): شەونخونیی/ پێچێشت/ نەیهێشت بنوێت/ شەوبێدرایكرد.

(اَلساهِرَةُ): ١-مانگ ٢-زەویی دەڵێن ڕووی زەوی چونكە كاری لە ڕوومكدا شەوو ڕۆژە ٣-كانیی/ سەرچاوە كە خاو نابێتەوەو ناوەستێت ٤-مێی وشەی (اَلساهِر).

(الساهُور): ١-السَهَر: شەوبێداریی/ ئاهەنگی شــەویی تا بەیانی/ شەوارە ٢-خەرمانەیمانگ ٣-مانگ.

(دَخَلَ القَمَرُ فِي الساهُور"): مانگ گیرا.

(ســاهور عَــينِ المــاءِ): ســەرچاوەی ئــاوی كانییەكە.

(اَلسُهار والسُهَرَة): كەســێكە زۆر شەو بێــدار بێت. شەوارەی زۆر بێت.

(اَلمِسْهار): قایم‌و ڕاهاتوو لە شەوبێداریدا/ لە نوستندا/ لە ئێشكگرتندا.

٢-(سَــهِرَ- البَرقُ): شەو هەر هەورە بروسكە

بوو.
٣-(الساهور): فرمێی/ زۆرێی.
(اَلاَسْـهَران) (ع ا): ١-دووڕەگـن لـە چاودا ٢-دووڕەگن لە لووتدا.
سـهف: (سَهَفَ- القَتيلُ. سَـهْفاً): کوژراوەکە لـە گیانەڵادا کەوتـە پەلەقـاژێ/ پەلکوتان، شپرزەبوون.
(سَهِفَ. سَهَفاً): فەوتا/ مرد.
(اَلساهِف) (فا): فەوتاو لەناوچوو/ مردبوو.
٢-(سَـهِفَ. سَهَفاً): زۆر شپرزەی تینوێتیبوو. زۆر تینووبوو.
(اَلساهِف): کەسـێکی زمانشکاوی تینوێتی لە کاتی بەگژداچووندا.
(اَلسُهاف): زمانشکاوی تینوێتیی کە دەردێکە تینوو تێرناو نابێت.
(طَعامٌ مَسْـهَفَةٌ): چێشـتێکی ئاوکێشـە یان خواردنێکی ئاوکێشە.
(رجلٌ مَسْهُوف): پیاوێکە تێرناو نابێت و ئاو زۆر دەخواتەوە.
٣-(اِسْـتَهَفَ-هُ): بـە سـووکی دانـاو گاڵتەی پێکرد.
٤-(ساهِفُ الوَجهِ): ڕوو گۆڕاو/ ڕووتێکچوو.
(اَلسَهْف): پوولەکەی ماسی.
سهق: (اَلسَـهوَق): ١-درۆزن ٢-لۆقن/ لۆقدرێژ ٣-هەرچـی ئاوبدرێت و ئـاو وەربگرێت وەک قەدی دارو شتیتر.

(اَلسَهوَق): هەنگاو گەورە.
(سهك: سَـهَكَ-تِ الريحُ. سَـهْكاً): باکە تیژ ڕۆیشت.
(-تِ الريحُ التُـرابَ عَن وَجْهِ الأَرض): باکە خۆڵی زەویەکەی برد بە ئاسماندا.
(-الشَيءَ): شتەکەی هاڕی.
(-تِ الدابَةُ سُهُوكاً): وڵاخەکە کەوتە ڕەوت.
(ريحٌ ساهِكَةٌ (ج) سِواهِك وساهكات): زریانە بای توند.
(اَلسَهاك): زمانتیژێ کە وەک بابە گور بێت/ دەمگورج.
(ريحٌ سَـهُوك وسَيْهوك ومَسْهَكَة): زریانێکی توند.
(اَلسَيهَك): خۆڵ کە با هەڵیبسێنێت.
(ريـحٌ سَـيْهَك): زریانـە بایەکـی تونـدی خۆڵهەڵسێن.
(اَلمِسْهَك):زمانتیژی دەمگورج.
(-مِنَ الخَيل): ئەسپی تیژڕەو.
(اَلمَسْهَك والمَسْهَكَةُ): دەرەی زریانە با.
٢-(سَهِكَ. سَهَكاً): ژەنگاویبوو.
(سَهك): ژەنگاویی.
(يَدي سَهِكَةٌ مِن السَمَكِ): دەستم بۆ ماسیبوو/ بۆنی ماسیی گرت.
(اَلسَهَك): ژەنگی ئاسن.
(اَلسَهَك والسُهَكَةُ والسُهُوكَةُ): بۆنـی ناخۆش. بۆمچك/ بۆنی ئاقەری لەش یان بۆنی گۆشتی

بۆگەن یان بۆنی ماسی.

ســهل: (سَــهُلَ- المَكانُ. سُــهُولَةً): شوێنەکە نەرمانو تەختبوو.

(-الأَمرُ. سُــهُولَةً وسَــهالَةً): کارەکە ئاسانو خۆشبوو.

(سَهُلَ وسَهِلَ): ئاسانو سووكو خۆش.

(سَهَّلَ- الأمرَ له وعَلَيهِ): کارەکەی بۆ ئاسانو سووكو خۆشکرد.

(-المَوضِعَ): جێگەکەی نەرمو تەختکرد.

(ساهَلَ- هُ. مُساهَلَةً): لەگەڵیدا نەرمو هێواش بوو ئاسانکاریی لەگەڵدا کرد.

(أَسهَلَ): لە شاخەکە بۆ پێدەشتەکە داپەڕییە خوارەوە.

(-هُ الدَّواءُ): دەرمانەکە ڕەوانیکرد.

(-الرَّجُــلُ): ١-پیاوەکە لەگــەڵ خەڵکدا نەرم جووڵایەوە ٢-ڕوانبوو.

(-الأَمرَ): کارەکەی لا ئاسانبوو.

(تَسَهَّلَ- الأَمرُ): کارەکە ئاسانو خۆشبوو.

(ماتَسَــهَّلَ لي أَن أَفْعَلَهُ): کارەکەم بۆ ئاســان نەبوو، بۆم نەلوا بیکەم.

(تســاهَلَ- الرجــلان): دوو پیاوەکە لەگەڵ یەکدا نەرمو لێبوردوو بوون.

(-الأمرُ عليه): کارەکەی بۆ ئاسانبوو.

(إِسْــتَهَلَّ- المَكان): بە ئاســانی لە شوێنەکەدا مایەوەو جێگیر بوو.

(إِسْتَهَلَّ- هُ): لای ئاسانو بە سوکیدانا/ سووکبوو.

(اَلسَّهْل (ج) سُهُولا وسُهُولَة): دەشتو پانتایی تەخت.

(سُهْلي): دەشتەکی.

("بَعيرٌ سُهلِيٌّ"): حوشترێك لە دەشتدا بلەوەڕێت.

(أَرضٌ سَــهْلٌ): زەوییەکــی پان/ دەشــتێکی تەختو ڕێك.

(سَــهلُ الوَجــه): ڕوویەکــی/ دەموچاوێکی کەمگۆشت.

(سَهْلُ الخُلُق): نەرمڕەوشتو ڕەفتار. سروشت نەرم.

(أَهلاً وسَهْلاً): خۆشهاتیت (بۆ پێشوازیکردن) هاتیتە لای کەسوکارو بۆ خۆشی هاتیت.

(السِهل): لە وردەیەك کە ئاو بیهێنێت.

(اَلسِــهْلَةُ): ١-أَلسَّــهل ٢-ڕەوانیی/ شــۆڕیی/ سکچوون.

(الإِسْــهال) (طب): ڕادانی ئــەوەی لە گەدەدا هەیە بە شــێوەیەکی ناسروشتیی یان بە هۆی دەرمانەوە/ شۆڕبوون/ ڕەوانبوون/ سکچوون.

(اَلسَّهول): دەرمانی (ڕەوانیی/ ڕەوانکردن).

(اَلدواءُ المُسْهِل): دەرمانی ڕەوانیی.

٢-(سُــهَيْل) (فك): ئەستێرەی سیوەیل کە لە دوادوای گەرمای هاویندا لە وڵاتی عەرەبستاندا دەردەکەوێت.

الملحق:

سهل: (اَلتسْهيل): ئاســانکردنو خۆشکردنی ڕێی کارکردن.

(″تَسهيلُ الأُمورِ): كارئاسانكردن/ ئاسانكارى.
(اَلتَّسْهِيل عِندَ القُرّاء): ئەوەيە كە (هەمزە) لە نێوان هەمزەو هێدا بخوێنیتو بلێیت.
(اَلتسـهيل عِنـد الصرفيـين): ئەوەيە كە هەمزەكە لە نێوانیداو نێوان پیتێكی دەنگداردا كە لە پێشیەوەیە بیلێیت وەك (اَلخَطيئَة) كە دەبێتە (اَلخَطيَّة).

سهم: (سَـهَمَ وسَهُمَ. سُـهُومَةً وسُهوماً): لە لاوازیـدا ڕەنگـی پەڕیـوەو گـۆڕاوە، ڕەنگی هەڵبزڕكاوە.
(-وَجْهُهُ): گرژو مۆن بوو/ دەموچاوی ترشو تاڵبوو.
(اَلساهِمَةُ – مِـنَ النـوقِ (ج) سَـواهِم): مێحوشتری تێقوپاو.
(اَلسُهام): لە ڕێیو ڕەنگپەڕین.
(اَلسُهام والسُّهام): دەردێكە دەداتە حوشتر.
(رَجُلٌ مُسْـهَمُ الجِسْـمِ): پیاوێك چرووساوو پەككەوتەی دڵداربێت.
(اَلمُسَـهَّم والمَسْـهُوم- مِنَ الإبلِ): حوشترەكە تووشی دەردە حوشتر بووبێت.
٢-(سَهَمَ- هُ. سُهُومَةً وسُهُوماً): لە بەشداریدا زاڵبوو/ بەسەریدا سەركەوت.
(ساهَمَ- هُ): لەگەڵیدا بەشداریكرد.
(-فِي الأمرِ): لە كارەكەدا بەشداریكرد.
(أسْهَمَ- بَيْنَ القَومِ): شتەكەی بۆ پشكخستن.
(لَهُ فِي كَذا): بەشـی لەو شـتەدا بۆ تێخسـت كردی بە هاوبەش.
(تسـاهَمَ – القَومُ): شتەكەیان لەناو خۆیاندا پشكخست.
(-القَومُ الشـيءَ): شـتەكەیان لەناو خۆیاندا بەشكرد.
(إسْتَهَمَ- القَومُ): لەناو خۆیاندا پشكیانخست.
(اَلسَهْم (ج) سـهام): ١-تیری قومار كە پشكی پێدەخەن ٢-تیرێك كە دەیهاون.
٣-(ج) أسْـهُم وسُـهْمَة وسُـهمان): بـەش/ بەركەوتو بەخت/ شانس.
(″أصابَـهُ فِي القِسـمَةِ سَـهمانِ″): لـە بەشـكردنەكەدا دوو بەشی بەركەوت ٤-شەش گەز/ باڵ لـە كڕینو فرۆشـتنداو لە پێوانی ڕووبەردا.
٥-(سَهمُ الرامي) (فك): هەسارەیەكە.
(سـهمُ قَوس الدائرة): تـیری كەوانی بازنە ئەو هێڵە ڕاسـتەیە كە ناوەڕاستی كەوانەكەو ناوەڕاستی تیرەكە بە یەك دەگەیەنێت.
(سَـهم المخروط الدائِر عنـد العرب): تیری قووچەكی بازنەیی -لەلای عەرەب- ئەو هێڵە ڕاسـتەیە كە سەری قووچەكەكە دەگەیەنێتە ناوەڕاستو چەقی بازنەكەی.
(اَلسُهْمَة): ١-خزمایەتـی ٢-بەشكردن ٣-بەش/ بەركەوت.
(اَلسَـهيم): پشـكخەر/ بەشـكەری شتێك بۆ خەڵك.

(اَلْمُسْهَم): چارەوێــی دوورەگ کــە ئەســپە باوکەکە عەرەبــی بێتو دایکەکەی عەرەبیی نەبێت.

(اَلْمُسَهَّمَة- مِنَ الثیاب): بەرگێکی میلدار کە میلەکان تێهەڵکێشو لە شێوەی تیردا بێت.

٣-(سُهِمَ): بــەر شــەرای گەرمــای هاویــن کەوتووەو بردوویەتی.

(اَلسَّهام): ١-گەرمای بای شــەرای ســەبوون ٢-تینی تیژی گەرمای هاوین.

(اَلسُّهُم): تیشکی تیژی تۆپی خۆر/ هەتاو.

٤-(أَسْهَمَ -فِي الكَلام): درێژەی بە ئاخاوتنەکەداو زیاد گۆییکرد.

(مُسْــهِم ومُسْهَم): کەســێکە درێژە بە قسە بدات/ درێژدادر.

(اَلْمُسْهَم): درێژە بە قسەدەر. یان بەخشندەیەکی چاك.

٥-(اَلسُّهُم): پیاوە ژیرو داناکان.

(اَلسِّهَام): تەناقی شەیتان.

الملحق:

(اَلْمُساهِم): بەشدار.

(اَلْمُســاهِم فِي النَفَقــات): بەشــداری پــارەی بەختکراو/ خەرجکراو.

(الْمُســاهِم): خاوەنبــەش لــە کۆمپانیایەکی هاوبەشیی.

(دَعوَةُ المُســاهمین اِلى الإِجتماع): بانگکردنی بەشدارەکان بۆ کۆبوونەوە.

(اَلْمُساهَمَة): بەشداریکردنو بەشداربووون لە شتێکدا.

(اَلْمُســاهَمَة فِي النَّفَقات): بەشــداریکردن لە تێچووندا.

---

سَــها: ١-(سَــها- فِي الأَمرِ وعَنِ الأَمر. سَــهْواً وسُــهُوّاً): بیریچۆو/ لەبیریکــرد/ بێئاگابوو/ هۆشی بەلایتردا رۆیشت.

(ساهٍ وسَهوانُ): لەبیرکردوو/ فەرامۆشکردوو/ بێئاگا/ بێهۆش.

(-إِلَیه): بێئاگا چاوی تێبڕیو چاوی لەســەر لانەدا.

("مالٌ لایُســهی ولا یُنهی"): سامانێکە هێندە زۆرە ئەوپەڕی نابینرێتو کۆتایی نایەت.

(سَهُوَ- الفَرَسُ سَهاوَةً): چارەوێکە لێخوڕینی خۆشو سووکبوو.

(سَهُوٌ): چارەوێیەکی بە جڵەو/ جڵەوخۆش.

(ساهی- الرَجُلَ فِي المُعاشَرَة): لەگەڵ پیاوەکە هەڵسوکەوتی بە ڕەوشتو ڕەفتار خۆشبوو.

(-ەُ): ١-چاوەڕێی بێئاگاییکردو بە ئارەزوویش وایکرد ٢-گاڵتەی پێکرد.

(اَلسَّــهُو (ج) سِــهاء) (مــص): مەنگیــیو نەرمیی.

("جَمَــلٌ سَــهُوٌ"): حوشــترێکی هێمنــی خورەوشت.

(ماءٌ سَهُوٌ): ئاوێکی خۆش.

(أَمرٌ سَهُوٌ): کارێکی ئاسانو سووك.

(رِيحٌ سَهْوٌ): بایەکی نەرم.

(اَلسُّهَی والسُّهَا) (فك): هەسارەیەکی شاردراوەی حەوتەوانە بچووکەکەیە. خەڵکی بۆ تیژیی چاو خۆیانی پێ تاقیدەکەنەوە.

(اَلسَّهْوَة): ١-مێی وشەی اَلسَّهْو ١-جارێك فەرامۆشکردنو لەبیرچوون/ جارێك بێئاگایی.

(اَلسَّهْوَة (ج) سِهاء): کەوانی ئاسانکارو بە دەستەوە هاتوو.

(اَلسَّاهِي) (فا): ١-لە بیرەوە بەر ٢-بێئاگا/ بێهۆش.

("بَعيرٌ ساعٍ راهٍ"): حوشترێکی نەرمەڕۆ وەك بێئاگابێت لە سەرنشینەکەی/ سوارەکەی هیلاك نەکاتو وەك لە بیری خۆی بەرێتەوە.

(اَلساهي): بێهۆشو خەوبردەی گێلیی یان سەراسیمەبوون (عامیە).

٢-(سَهِّيَ- هُ): لە تاوەکەدا گەرمی کرد تا وشکبووەوە.

٣-(أَسهى- الرَجُلُ): کابرا نیمچە ڕەفەو تاقی دروستکرد.

(اَلسَّهْوَة (ج) سِهاء): ١-نیمچە ڕەفەو تاق کە شتی تێدەخرێت ٢-کەلەبەر/ درز ٣-پەردەیەك بەسەر پێشی خانوەکەوە دەگیرێت ٤-کەپرۆکە بۆ سێبەری ئاو کە عەرەب دەیکات ٥-پاوانەی بووك.

٤-(اَلسِهو والسَهواء): بەشێکی شەو.

(اَلسَّهْوَةُ (ج) سِهاء): تاوێر.

(اَلأَساهي): ڕەنگەکان (ئەم وشەیە تاکی نییە).

٥-(سَهْوَكَ- هُ): ١-دایبەزەویدا ٢-فەوتاندی/ مراندی.

(تَسَهْوَكَ): ١-بەزەویدا درا ٢-فەوتا ٣-ڕایکردو هەڵات ٤-لەسەرخۆ ڕۆیشت.

ساء: (ساءَ. الأَمرُ فُلاناً. سَواءً وسَوْءً وسَواءَةً سَوايةً وسوائيةً ومَساءً ومَساءَةً ومَسايَةً ومَسايَةً ومَسائِيَّةً): کارەکە دڵی تەنگکرد/ دڵیگریکرد وەزندی پێکەیاند.

(-بِهِ ظَنّاً): لێی بەدگومانبوو/ گومانی لێیەیداکرد/ خراپ لێی تێگەیی.

(-الشيءُ): شتەکە ناشیرینبوو.

("ساءَت سيرَتُهُ"): ڕەفتاری ناشیرینبوو.

(سَوَّأَ- هُ. تَسوِئَةً وتَسويئاً): گەنیکرد/ گەنەڵیکرد.

(-عَلَيهِ عَمَلَهُ): لەسەر کارەکە سەرزەنشتیکردو خەوشی لە کارەکە گرت/ کەموکووڕی لێدەرهێنا.

(أَساءَ- الشيءَ. إِساءَةً): شتەکەی گەنکرد/ خراپکرد.

(-إِلَيهِ): خراپەی دەرباره کرد.

(-بِهِ الظَنَّ): گومانی لێیەیدا کرد/ گومانی خراپی لێکرد.

(إِستاءَ): دڵتەنگبوو/ دڵگیربوو زیانی

پێکەیشت.
("ساءَهُ فاســتاءَ"): ١-خراپەی دەربارە کرد ٢-پێناخۆش بوو و دڵگیر بوو.
(ألسَوء): گەنیی/ بەدیی/ خراپیی.
("رَجُــلُ سَـوءٍ ورَجُلُ السُــوءِ): پیاوخراپ/ پیاوی بەد.
(ألسُــوء (ج) أسـواء): ١-خراپــە/ بەدیــی/ گەندەڵیــی ٢-هەمــوو دەردێــك ٣-گەندەڵیو خراپیی/ بەدیی.
(ألسَوءة (ج) سَوءَات): ١-داوێنپیسیی/ زینا ٢-خووی دزێو/ ناشیرین ٣-شوێنی شەرم.
(ألسَــوءَاء): ١-خــووی ناشــیرین/ دزێــو ٢-ناشیرین.
(ألسَيّئ): ناپەسەند/ ناشیرین/ خراپ.
("هُوَ ســيئُ الظَنِّ"): ئەو گومانی لە هەموو کەسێك هەیەو دڵی خراپە دڵکرمێیە.
(ألسَيِّئَةُ (ج) سَيِّئات): ١-مێی وشەی (ألسَيّء): ٢-بەدیی/ خراپە/ ناپەسەندیی/ گوناه.
ألأسْــوَأ (م) سُــوأى): بەدترین/ خراپترینو ناشیرینترین ٢-دزێوترین/ ناشیرینترین.
(ألمَســاءَة (ج) مَســاوِئ): کردەوە یان قسەی دزێو.
(ألمَساوِئ): خەوشو کەموکوورپی ناتەواویی/ نەنگیی.
٢-(ألسَوْء): ١-ئاگر ٢-کزیی چاو.
(ألسُوأى): ئاگری دۆزەخ/ جەهەنەم.

ســاج: ١-(ساجَ. سَوجاً وسُــواجاً وسَوَجاناً): لەسەرخۆ هاتووچۆیکرد.
٢-(سَــوَّجَ وسَــيَّجَ- الكَــرْمَ ونَحْــوَهُ أو على الكَرْم): پەرژینی بۆ مێوەکە کرد.
(ألســياج (ج) ســياجات وأسْــوِجَة وسُوْج): پەرژین/ تەلبەند یان دیواری دەوری باخ.
٣-(ألساج): ١-بەرگێکی فشی سەوزە کە پیاوی تایبەتی وەك شــێخو زانــاکان لە بەریدەکەن ٢-(ن)درەختی ســاج. درەختێکی مەزنو پانە دارەکەی باشــترین تەختەی لێدەردەهێنرێت کە سەختو قایمە. شوێنی پەکەمی خوارووی ئاسیاو ئەندەنۆسیایە.
(كَساء مُسَوَّج): بەرگێکە لە خۆوە دەپێچرێتەوە.
ساح: (ألساحَة (ج) ســاح وسوحٌ وساحات): ١-مەیــدان/ گۆڕەپان ٢-پانتاییو بۆشــایی ناو نێوان خانووەکانی گەرەك ٣-کەنار/ لا.
ساخ: ١-(ساخَ في الطِينِ سَوخاً): لە قوڕەکەدا نوقومبوو.
(-الشَيءَ في الماءِ): لە ئاوەکەدا نیشت.
(-ت بِهِمُ الأَرضُ سُيُوخاً وسُؤوخاً وسَوَخاناً): زەویەکە هەڵیلووشین، قووتیدان.
(تَسَوَّخَ في الطينِ): چەقییە قوڕەکەوەو تیایدا نوقومبوو ونبوو.
(ألسُواخ الســوَّاخ والسَــوَّاخي والسُواخِيَة): قوڕێکی زۆر.
("مُطِرنــا حتى صارتِ الأرضُ سُــوَّاخى"):

هێنــده بارانمان لێباری تــا زەویەکە بوو بە قورێکی تەواو.
("بَطحـاءُ سُــواخي"): شــوێنی لافاوێك کە قاچی تێدا دەچەقێت.
(اَلسُــوْخِيَّة) (عنــد العامــة): چڵی وشــك (سریانیه).
ساد: ١-(سادَ. سِیادَةً وسُودَداً وسُؤْدداً سَیدودَةً وسُوداً): بوو بە سەرگەورەو سەروەر.
(-قَومَــهُ): بوو بە ســەردارو ســەرگەورەی نەتەوەکەی‌و دەستڕۆیشتوو بەسەریاندا.
(-هُ): لە ســەروەریی‌و گەورەبووندا لەنگیندا لەو پێشتر بوو.
(سائِد (ج) سادَة و (جج) سادات): زەبربەدەست سەروەر، سەرگەورە، فەرمانڕەوا.
(سَوَّدَ): بوێر بوو/ بێباکبوو.
(-هُ): زەبر بەدەست‌و بە دەسەڵاتیکرد/ کردی بە ئاغاو گەورە.
(-الرَّجُلُ): کابرا گەورەکانیکوشت.
(ســاوَدَ- هُ): ١-فریویدا/ لە خشــتەیبرد ٢-لە تاریکی شــەودا پێیگەیشت ٣-لە پایە بڵندیی‌و گەورەییدا. بەزاندی‌و لەو پێشتر بوو.
(أَســادَ وأَسْــوَدَد-تِ المَرأَةُ إِســادَةً وإِسْواداً): ئافرەتەکــە کوڕێکــی ڕەشــیبوو یــان سەروەرێکیبوو.
(إِســتادَ- القَومَ): گەورەی ئــەو قەومگەلەی کوشت یان بەدیلیگرت.
(-فِي بَنِــي فُلان): لە گەورەی فیســار بەرە ژنێکی لێخواستن/ ژنێکی لێمارە کردن.
(الســائِد (ج) ســادة و (جــج) ســادات): زەبردەبەست/ گەورە/ سەروەر.
(اَلسُــود) (مص): ١-ســەروەریی‌و گەورەیی/ ئاغایی ٢-پێشەوایی.
(اَلسُــوْدَ والسُــؤْدُد): ١-پلەوپایــە بەرزیــی ٢-زەبربەدەســتیی/ ســەروەریی/ نگــین ٣-گەورەیی.
(اَلســيادَة) (مص): ١-نازناوێکی ڕۆژهەڵاتییە ٢-دەسەڵاتدارێتیی.
(اَلسَيِّد (ج) أَسياد وسادَة وسَيائِد): سەرگەورە/ سەروەر، خاوەندەسەڵات/ دەسەڵاتدار (وشەکە ســووکدەکرێت دەبێتــە) (ســێد): ١-لــەلای عیســاییەکان نازناوی حەزرەتی عیســایە ٢-لەلای موســوڵمانەکان بە ئــەوەی حەزرەتی محمد (ص) پێغەمبەر دەوترێن.
(اَلسَــيِّدان): حەسەن‌و حوســەین کە کوڕی حەزرەتی عەلین.
(اَلسَــيِّدَة): ١-نازناوی حەزرەتــی مریەمە ٢-بانــوو/ خانم/ خاتوون/ خاتــوو/ کەیبانوو/ ڕەشــە خەڵکەکــە دەڵێن: (ســتي) لە جیاتی (سَيِّدَتي): خانم/ بانوو/ خاتوون/ خاتوو.
(اَلأَسوَد- مِنَ القوم): مەزنترین‌و بەرزترینی پیاوی نەتەوەکە.
("هُوَ أَسوَدُ من فُلان"): ئەو لە فیسار باڵاترو

مەزنترە.

(أُسَيود وأُسَيِّد): بچووككراوەی وشەی (أسوَد)ە.

٢-(سَوِدَ. سَوَداً): ڕەشبوو.

(سَوَّدَ- الشيءَ): شتەكەی ڕەشكرد.

(ساوَدَ- هُ): ١-لە تاریكی شەودا پێیگەیشت ٢-لەو ڕەشتر بوو.

(أسادَ-تِ المَرأةُ): ژنەكە منداڵێكی ڕەشیبوو.

(تَسَوَّدَ): ڕەشبوو.

(إسوَدَّ. إسْوِداداً): ڕەشبوو/ ڕەشداگەڕا.

(إسْوادَّ. إسْوِيداداً): ڕەشبوو/ ڕەشداگەڕا.

(ألسَوْد (ج) أسْواد): زەوییەكی تەختی پڕ لە بەردی ڕەش.

(سَوْدَة): پارچە زەوییەكی تەختی پڕ لە بەردی ڕەش.

(ألسَوْدَةُ): زەوییەك دارخورمای تێدابێت.

(ألسَواد (ج) أسْوِدَة و (جج) أساوِد): ١-ڕەشایی/ ڕەشیی ٢-تارمایی ٣-سامانێكی زۆری بێئەندازە ٤-ژمارەیەكی زۆر.

٥-(عِنْدَ الكُتّاب والطَبّاعين المُسَوَّدَة): لای نووسەرانو چاپكەران: ڕەشنووس.

(سَوادُ اللَّيل): تاریكیی شەوو درێژایی شەو.

(-البَلْدَة): باخو باخاتو دێهاتی دەوری شار.

(سوادُ العراق): نێوان بەسرەو كوفە/ باخو باخاتو دێهاتو ئاوایی دەورو پشتیان.

(سوادُ الناسِ): ڕەشە خەڵكەكە.

(-العَسكَر): دەوارو ئامێرو كەرەسەی شەڕو پێویستیی سوپا.

(-العَين): ڕەشێنەی چاو.

(سَوادُ القَلْب): خوێنی دڵ یان ناڵەیەك كە لە سۆزی دڵەوە بێتە دەرێ.

(ألسُواد) (طب): ڕەشبوونەوەی دان.

(ألسَوادِيَّة والسُودانِيَّة): چۆلەكەیەكە ترێو خورما دەخوات.

(ألأَسْوَد (ج) سُود وسُودان (م) سَوْداء): ڕەش/ ڕەنگڕەش.

(ألأَسوَد (ح) الخَنَش): ڕەشمارێكی زلە.

(-مِنَ العَين): بیلبیلەی چاو.

("فلان أَسْوَدُ الكَبِد"): فیساركەس دوژمنە/ دڵڕەشە.

(هُم سُودُ الأكباد): ئەوان دوژمنن/ دڵڕەشن.

(ألسَهْمُ الأسوَدُ): تیری پیرۆز (بە پیرۆزی دادەنێن وەكو بەوە ڕەشبووبێت كە دەستاودەستی زۆر كردبێت).

(ألأَسْوَدان): ١-خورماو ئاو ٢-(ح) مارو دووپشك.

(ألحَيَّة السَوداء= حَيَّة البَرَكَة): ڕەشمار كە بە پیرۆز دادەنرێت.

(ألسَواء والسُوَيداء) (طب): ١-تێكەڵبوونێك كە لە جگەردایە ٢-(طب) (ألماليخوليا): ماخۆلان. كە لە تێكچوونی مێشكەوە بە هۆی مەراقو خەفەتەوە پەیدا دەبێت.

(سَواءُ وسُوَيداءُ القَلْبِ): خوێنیدڵ/ ناخیدڵ.
(اَلسُودان): ڕەشپێستان/ ڤولەکان.
(سُودانِيّ): ڕەشپێستێك/ ڤولێك.
(ج) أَسوَد. اَلْمُسَوَّدَةَ عِند الكُتاب والطَبَّاعين: ڕەشنووس. ڕەشچاپ کە نوسینی یەکەمجارە کە پێداچوونەوەی تێدا دەبێت بەرامبەرەکەی دەڵێن (اَلمِبَيَضَّة): پاکنووس.
(اَلْمُسَوَّدَة): ڤاپێکی/ بوتڵێکی ڕەش شووشە (عامیە).
(اَلْمُسَوَّدَة والْمُسَوَّدَّة – مِنَ الأَيام): ڕۆژانی ڕەشی گرانی پڕ خەفەت.
٣-(سادَ- الرَجُلَ. سِيادَةً وسُودَداً وسُؤدَداً وسُؤدُداً وسَيْدودَةً وسُوْداً): نهێنی خۆی لا درکاند/ نهێنییەکی پێوت.
(ساوَدَ- هُ): بە چرپەو نهێنی قسەی لەگەڵدا کرد (چونکە ئەو کەسەی کە بە نهێنی شتێك بە یەکێك بڵێت خۆی بەلای کەسەکەیتردا دەکێشێت تا بە چرپە شتەکەی پێبڵێت.
(تَسَوَّدَ): ژنی هێنا.
(اَلسُّوَاد): بە نهێنیو چرپە قسەکردن.
(اَلسَواد (ج) أَسوِدَة و (جج) أَساوِد): کەس.
(رأيتُ سَواداً): کەسێکمدی/ زەلامێکمدی.
٤-(سادَ- الرَجُلُ سُواداً): ئاوێکی خواردەوە کە زەردوویی پێبگرێت.
(اَلسُوَاد) (طب): زەردوویی.
(ماءُ مُسَوَّدَة): ئاوێکە زەردوویی پێ دەگیرێت کە نەخۆشیی زەردوویيە.
(اَلمَسؤود): زەردووییگرتوو.
٥-(ساوَدَ- الأَسَدَ): شێرەکەی دەرکرد.
(اَلسِيْد (ج) سيدان) (ح): ١-گورگ ٢-شێر.
(اَلسِيْدَةُ): مێگورگ/ دەڵە گورگ.
(اَلسِيْدانَة) (ح): گورگ.
٦-(اَلسَوْدَق والسَوذَق والسَوذانِق والسَوْذَنيق) (ح): شا هەڵۆ یان شەهێن/ پاڵەوان (فارسیە).
سار: ١-(سارَ- الحائِطَ سَوْراً): بە دیوارەکەدا هەڵزناو سەرکەوت.
(سَوَّرَ- المَدينَةَ): شوورای بۆ شارەکە کرد.
(-المَرْأَةَ): بازنی کردە دەستی ژنەکە.
(-الحائِطَ): سەرکەوتە سەر دیوارەکە.
(تَسَوَّرَ): بازنی لەدەستکرد.
(-الحائِطَ وعَلَيهِ): بەسەر دیوارەکەدا سەرکەوت.
(اَلسُور (ج) أَسوار وسيران): شورای سووری/ دەوری شار.
(اَلسُورَة (ج) سُوَر وسُوْر وسُورات وسُوَرات): ١-خانەی جوانی بەرزو چاکی ڕوو لە ئاسمان ٢-پلەوپایە/ جێگەی بەرز.
("لَهُ عِندَكَ سُورَةٌ"): پایەیەکی بەرزی لەلات هەیە.
("لَه سُورَةٌ في المَجدِ"): شکۆیەکی بەرزی لەسەروەریدا هەیە ٣-چاکە/ پیاوەتیی.

("لَهُ عَلَيْكَ سُــورَةٌ): ئەو پیاوەتییو چاكەی بەسەرتەوە هەیە ٤-نگینیی ٥-نیشانە.
(-مِنَ الكِتابِ): بەشێكی سەربەخۆی كتێب.
(اَلسُــؤرَة= الســورة): بەشێكی ســەربەخۆی كتێب.
(سُوْرَةُ المَجدِ): شوێنو بڵندیی نگینیی.
(اَلسوار والسِوار والأُسْــوار (ج) سُوْر وأساور وأَساوِرَة وسَــؤور): بازن كە ئافرەت دەیكاتە دەستی.
(اَلسُوَّارَى): بەرزیی/ بڵندیی.
(اَلِمسْوَر والِمسْوَرَة (ج) مَساوِر): پاڵپشتێك كە لە چەرم دروستكراوە.
(اَلُمسَوَّر): شوێنی بازنیدەست.
(مَلِــكٌ مُسَــوَّر): شــایەكی بە زەبــرو تواناو دەسەلات.
٢-(ســارَ إليهِ. سَوْراً وسُــؤوراً): ئامبازیبوو پەریپەسەری.
(-الشَرابُ في رأسِهِ): مەیەكە سەری گەرمكردو كاری تێكرد.
(ســاوَرَ- هُ. سِواراً ومُساوَرَةً): ئامبازیبوو یان لێراپەڕی.
("ســاوَرَتِ الحَيَّةُ الراكِبَ"): مارەكە ئامبازی سوارەكە بوو.
(-هُ الشَّــرابُ): مەیەكــە سەرخۆشــیكرد/ مەستیكرد.
(اَلسَــوْرَةُ): ١-جارێــك بە دیــواردا هەڵزنانو سەركەوتن ٢-جارێك سەرخۆشبوون.
(سَوْرَةُ الخَمرِ): توندوتیژیی كاری مەی.
(سَــورَةُ السُــلْطانِ): زەبرو زەنگی ســوڵتان/ پاشا.
(سَورَةُ البَردِ): سۆڵەی/ سەختی سەرما.
(سُوارُ الخَمرِ): توندوتیژی كاری مەی.
(اَلسَــوَّار): ١-كەســێكە زوو بــە مــەی سەرخۆشدەبێتو خراپ دەیگرێت ٢-كەسێكە بەدمەســت بێت. كە سەرخۆشبوو پەلاماری هاورێكانی بدات.
("كَلْبٌ سَوَّار"): سەگی دڕ/ سەگی نەهێنگر.
٣-(اَلسُور): حوشتری ڕەسەن.
("عِندَهُ ســورٌ مِن الإبِلِ"): ڕەوە حوشترێكی ڕەسەنی هەیە.
(اَلأَسْــوار والإِسْــوار (ج) أَســاوِر وأَساوِرَة): ١-ســوارچاك. كە خۆی باش بەســەر پشــتی ئەسپەوە ڕادەگرێت ٢-تیرئەنداز.
(-عِندَ الفُرْسِ): لای فارســەكان بە سەردارو سەرۆك وا دەڵێن.
٤-(اَلسُــوْرَنجان): ســووره جانە، زەعفەرانی دەشــت (ن) گیایەكــە/ ڕووەكێكــە پیازیــی تەمەندرێژ گوڵەكانی سپین یان سووری كاڵن لە پایزو بەهاردا دەردەكەون.
ساس: ١-(ساسَ- الدَّوابَّ سِياسَةً): ١-وڵاخەكەی ڕامكردو ڕاهێنا ٢-مەیتەرییكرد.
(-القَــومَ): كاری ڕابەریــیو بەڕێوەبــردنو

ڕامیاریی نەتەوەکەی گرتە دەست.
(-الأمرَ): کارەکەی هەڵسووراند.
(سـائِس (ج) ساسَـة وسُـوَّاس): ڕامکردە/ کارهەڵسـووڕێنو بـە ئەنجـام گەیەنــەر/ کاربەڕەسەر.
(سَـوَّسَ فُلانٌ أمْرَ القَـوم): کاری ڕامیاریی‌و تەگبیری کاروباری نەتەوەکەی گرتە دەست.
(أسـاسَ- ه النـاسُ): خەڵکەکـە کردیان بە ڕابەرو سەردارو کاربەڕێوەبەری خۆیان.
(الساسُ): مەیتەرەوان.
(السِياسَــة) (مص): ١-ڕامیـاری‌و ڕانوماییو ڕامکردنــی خەڵـك لەسـەر ڕێگـەی چاكو ڕزگاربوونی ئێستا، یان هی ئایندەیان ٢-هونەری بە دەستەوەگرتنی کاری وڵاتو بەڕێوەبردنی کاری ناوەوەو دەرەوەی دەوڵەت.
(السِّیاسَة الداخلیة): ڕامیاریی ناوەوە.
(السیاسة الخارجیة): ڕامیاری دەرەوە.
(السیاسـة المدنیة): ڕامیاریی شارسـتانیی‌و کارکـردن بۆ بژێویی هەمـووان بە پێی دادو ڕاستیی.
(السیاسـة الاقتصادیة): ڕامیاریی ئابوریی. زانسـتییەکە باس لە چۆنیەتی خەملاندنو پێگەیاندنی سامانی گشتیی دەکاتو هونەری هەڵسووراندنی ئەو سامانەیە.
(الحُقُوق السیاسـیة): مـافی ڕامیاریی: مافی بەشـداریی بەڕێوەبردنـی کاروباری وڵات بۆ

هەموو نیشتمانییەك.
(السِیاسِيّ): ڕامیار. کەسێکە کە ڕامیاریەدەکاتو دەیکاتە پیشەی خۆی.
(سائِس): ڕامیار، سەرکار، بەڕێوەبەر.
٢-(ساسَ. یَسـاسُ وَسَوِسَ یَسْـوَسُ وسِیِس یُسـاسُ- الطَعامُ. سَوسـاً): خواردنەکە کرم تێیدا.
(-تِ الشاةُ): مەڕەکە گەنەوزجی زۆری تێدا.
(سَوَّسَ- الطَّعامُ): خواردنەکە کرم تێیدا.
(أساسَ الطعامُ): کرم تێیدا.
(-تِ الشاةُ): مەڕەکە گەنەوزنجی زۆر تێدا.
(السّاسُ): خـۆرە لێدراو. لە بنچینەدا وشەکە (سائِس) بووە.
(السوسي) (ح): مۆرانە/ خۆرە.
(سووسـە): یەك مۆرانـە، کرمێکـە دەداتە خوری یـان دار یان بەرگو گەنمو دانەوێڵەو شـتیتر هەموو خۆرەیەك کـرم بێت یان هەر جۆرێك بێت ئەوە پێیدەڵێن: (سوسة).
٣-(سَـوَّسَ- لَـهُ أمـراً): کارێکـی لا جوانو شیرینکردو بۆی هانیدا.
٤-(السُوس): ١-ڕیشە/ بنچینە/ ڕەگەز ٢-سروشت.
("الفَصاحـة مِـن سوسِـهِ"): زمانپاراویـی سروشتیەتی.
(السوس) (ن): گیابەڵەك. ڕووەکێکی گیاییەو لاسکرەقە تەمەندرێژە گوڵەکەی شینباوە ڕەگی درێـژەو قووڵەو لە خۆرهەلاتی ناوەڕاسـتدا

زۆرە، سـوریا لێیدەنێرێتە دەرەوە، دەجورێت وەك خۆی چۆنە وا. بەڵام ڕەگە شەکرییەکەی دەهارێت‌و لە پزیشکیدا بەکاردێت هەروەها شەربەتی لێدروستدەکرێت کە کوهولی تێدا نابێت.

(اَلسَوَس): شـەلکە. دەردێکە دەداتە پاشووی چوارپێ‌و وڵاخ.

(اَلاَسْـوَس- مِن الدَّواب): چوارپێی شـەلکە لێدراو.

(اَلسُوَاس): دەردی گەرووی ئەسپە کە گەرووی وشکدەکات.

٥-(اَلسَوسَـن) (ن): گوڵە سەوسـەن ڕەگەزە گوڵێکـی بەناوبانگە. جۆری زۆرە لە بەشـی سەرەوەی گۆی زەویدا بوە. بە زۆری گوڵەکەی گەورەو بە ڕەونەقە گوڵەکەی بنەوشـەییەو مۆرەو سپییەو زەردە بە زۆریی لە باخچەکاندا دەروێنرێت جۆریشی هەیە دەشتەکییە.

٦-(اَلسُّوسْـيولوجيا) (يونانية): زانسـتیی باری کۆمەڵایەتیی کۆمەڵانی خەڵکە.

سـاط: ١-(ساطَ- الشيءَ. سَـوْطاً): شتەکەی تێکەڵکرد.

(-الأَمرَ): کارەکەی سـەرەوژێر کرد هەڵگێڕو داگێڕیکرد.

(-هُ): دایە بەر قامچی.

(سَـوَّطَ- الأَمـرَ): کارەکەی چەواشـە کرد/ تێکدا.

(-الكُرَّاثُ): کەوەرەکە لاسکی دەرکرد.

(اِسْـتَوَطَّ- الأَمـرُ): کارەکـە چەواشـە بوو تێکەڵ‌و پێکەڵبوو.

(اَلسَـوط (مـص) (ج) اَسـواط وسِـياط): ١-قامچـی (بۆیـە وا ناونـراوە چونکـە بـە لێدانەکـەی گۆشـت‌و خوێن تێکەڵـدەکات) ٢-بەش/ بەرکـەوت/ شـانس ٣-توندوتیژیی ٤-چاڵی ئاو.

("هُما يَتَعاطَيان سَوطاً واحداً"): هەردووکیان یەك ڕێبازو یەك ئامانجیان هەیە.

("وَعْـدُهُ سَـوطُ باطِلٌ"): گفتەکەی فشـەو ناپاتەسەرو پێوەی بەند نابێت.

(اَلسِـياط): لاسـکی کـەوەر (بـە قمچـی چوێنراوە).

(اَلسَـوَّاط): پۆلیسـی قامچـی بەدەسـت/ قامچیدار.

(اَلسَويط (م) سَويطَة): ناوێتە/ تێکەڵ.

("اَموالُهم سَـويطَةٌ بَينَهُم"): داراو سامانیان تێکەڵە.

(اَلمِسْواط): ئەسپی قامچیخۆر/ ئەسپێکە هەر بە قامچی دەڕوات.

(اَلمِسْواط والمِسوَط): چیلکە یان شیش‌و شتی پێتێکەڵدان.

(اَلمِسـياط): ئـاو کـە لـە بنـی گۆلەکـەدا بمێنێتەوە.

٢-(ساطَ- الحَرْبَ. سَوطاً): جەنگیی/ دەستی

بە شەڕ کرد.
(سَوَّطَ- الحَربَ): دەستی بە شەڕ کرد.
٣-(ساطَ-ت نَفسُهُ. سَوَطاناً): ڕشایەوە. هێڵنجیهات/ دڵی تێکچوو ڕشایەوە.
("ساطَ اللَّبَنَ ونَحوَهُ") (عامیة): شیرەکە ڕوونبوو.
سائِط: شیری ڕوون.
٥-(سَوطَرَ): دەستی بەسەردا گرت/ خستیە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.
ساع: ١-(ساعَ- الشَيءُ سَوعاً): شتەکە ونبوو/ نەما/ لەناوچوو.
(-تِ الإبلُ): حوشترەکان بەرەڵاو بێشوانبوون.
(أساعَ- الشَيءَ. إساعَةً): بەتەنگ شتەکەوە نەهاتو ونیکرد/ فەوتاندی.
(السائِع (ج) ساعَة): فەوتاو/ لەناوچوو.
(رجلٌ مِسياعٌ ومُسيعٌ لِلمال): ماڵلەدەستدەر/ دارابەفیڕۆدەر/ بە تەنگەوەنەهاتووی لەدەستدەر.
(هُوَ مِضياعٌ مِسْياعٌ وهُوَ مُضيعٌ مُسيع): ئەو دار لە دەستدەرو سامانفەوتێنە.
٢-(ساوَعَ- هُ. مُساوَعَةً وسِواعاً): بۆ کارکردن بە پێی کاتژمێر لەگەڵیدا ڕێککەوت. وەکو (یاوَمَهُ): واتا بە پێی ڕۆژ لەگەڵیدا ڕێککەوتو پارەیدایەو کاری پێکرد.
(-الرَجُلَ): کاتژمێر بە کاتژمێر گوێزایەوە.
(أسْوَعَ إسواعاً): ١-کاتژمێرێک دواکەوت ٢-کاتژمێر بە کاتژمێر گوێزایەوە.
(السَاعَة (ج) سِياع وساعات): کاتژمێرێک/ شەست چرکە.
(سُوَيعَة): بچووککراوەی کاتژمێرێکە.
(أَلسَّاعَة): ئێستا.
("أقضِني حَقّي السَاعَةَ"): هەر ئێستا مافەکەم بدەرێ/ بدەرەوە.
(أَلساعَة): ئامێری کاتژماردن/ کاتژمێر.
(الساعة الرَمْلِيَّة): لە کاتژمێر.
(الساعَة الشَمسيَّة): خۆرە کاتمژێر.
(أَلساعة= القيامَة): کاتی زیندووبوونەوە/ ڕۆژی حەشرو قیامەت.
(أَلسَوْع والسُوَاع): بەشێکی شەو.
(ساعَةٌ سَوعاء): کاتێکی تووش و سەخت و ڕەش.
(أَلسَواعِيَّة): کتێبی نوێژکردن لەلای ڕۆمەکان.
ساغ: ١-(ساغَ- الأمرُ. سَوغاً وسَواغاً وسَوَغاناً): کارەکە شیا بکرێت.
(سائِغ): شیاو/ ڕەوا.
(ساغَ- الشَرابُ): خواردنەوەکە شەربەتەکە خواردنەوەی بە دەم خۆشبوو ئاسان بە گەروویدا ڕۆیشت.
(سائِغ وسَيِّغ وأَسْوَغ): بە دەم و بۆ خۆش و تووشی گیانبوو/ باش بە گەروویدا ڕۆیشت.
("ساغَ لي الشرابُ"): شەربەتەکەم بە دەم

خۆشبوو ئاسان قوتمدا.

(ساغَ الشَرابَ. سَوغاً وسَيْغاً): خواردنەوەی شەربەتەکەی خۆشکردو خۆشمەزە دروستیکرد.

(سَوَّغَ- الأمرَ): کارەکەی شیاوو ڕەوا کرد.

(-لَهُ كذا): ئەوەی پێبەخشی/ ئەومیدایە/ بۆ خۆیدایە.

(أَساغَ- الطَّعامَ أَوِ الشَرابَ): خواردن یان خواردنەوەکەی وا دروستکردن خۆشبێت دڵ بچێتە سەری بە ئاسانی بخورێت.

("أَسِغ لي غُصَّتي"): پشوومبدە/ بوارمبدە.

(إِسْتَساغَ- الشرابَ): شەربەتەکەی لاخۆشبوو/ بە دەم خۆشبوو.

(ألسَيِّغ- مِنَ الشَرابِ= السائِغ): شەربەتی بەچێژو خۆش.

(ألسِواغ): خواردنو خواردنەوەی خۆشقووتو بەچێژ.

("الماءُ سِواغُ الغُصَص"): ئاوخۆشقووتە/ بە ئاسانی بە گەروودا دەروات.

٢-(ساغَت بِهِ الأرضُ. سَوْغاً): زەویەکە قووتیدا/ هەڵیلووشی.

٣-(أَسْوَغَ- الصَبِيُّ أَخاهُ إِسْواغاً): منداڵەکە بە دوای براکەیدا هات یان دوانەنو هیچیان بە بەینداێ هات.

(هُوَ سَوغُهُ وسَوغَتُهُ و سَيِّغُهُ): بەرو دوایی یەکترین/ لە دوای یەك لەدایکبوون.

(هو وهِي سَوغُهُ وسَوغَتُهُ وسَيِّغَتُهُ): ئەو کوڕە یان ئەو کچە بە دوای ئەودا هاتووەو بەرودوای یەکترن.

("هذا سَوغُ هذا"): ئەمە برایەتیو بە دوای ئەودا هاتووە.

("هُوَ اَخوهُ سَوغُهُ"): ئەو برای بەرودوایەتی.

(هِي أُخْتُه سَوغَهُ): ئەو کچە خوشکێتی لەگەڵیدا بەرودوان (یان دوانەن) ئەگەر منداڵیتریان لە بەیندا نەهاتبێت.

ساف: ١-(سافَ- المالُ سَوْفاً): ١-ماڵەکە فەوتا/ لەدەستچوو ٢-ماڵیاتەکە دەردی تێکەوتو فەوتا.

(أَسافَ. إِسافَةَ): ١-ماڵیاتەکەی مرداربوونەوە/ فەوتان ٢-کوڕەکەی مرد.

(مُسيف): کوڕمردوو/ جەرگسووتاو/ زارۆڵە مردوو.

(ألوَلَدُ المُساف): زارۆڵەی مردوو/ لەدەستچوو.

(-هُ اللهُ): خودا فەوتاندی/ لەناویبرد.

(ألسَوَاف والسُوَاف): دەردی ماڵیات/ ئاژەڵو فەوتانی/ قڕتێکەوتنی/ مرداربوونەوەی/ تۆپینی.

(وَقَعَ في المالِ سَوافٌ): ماڵیاتەکە دەردی تێکەوتو قڕیهات.

("أَساف حتى مايشتكي السُوَاف"): تووشی نەهامەتیبوو ڕاهاتوو بوو هاواری لەدەست نەکرد.

(المِسْياف): جەرگسووتاو/ زارۆڵەمردوو.

٢-(ساف- عَلَيهِ. سَوفاً): ئارامی لەسەرگرت/ بەرگەیگرت.
(سَوَّفَ- هُ): خایاندی/ خلافاندی دەستیدەستی پێکرد.
(-هُ الأمرَ): ئەویکردە سەرپشکی کارەکە چی دەکات بیکات.
(ساوَفَ-ه مُساوَفَةً): خایاندی/ دەستیدەستی پێکرد.
(سَوفَ): پیتی کردنی کارە لە دوارۆژ دووردا، بەڵام پیتی (س) کردنی کارە لە دوارۆژی نزیکدا (سوفَ) یەکسەر ئەچێتە سەر کارەکە نابێت هیچ شتێك بکەوێتە نێوان «سوف» و کارەکەوە بۆیە ناوترێت (سوف لایَفعَل) لە جیاتی ئەمە دەبێت بڵێین (لَن یَفعَل) چونکە لن = سوفَ + لا
("فلان یَقتاتُ السَّوفَ"): فیسار بە ئومێد دەژی.
(اَلمُسَوِّف) (فا): ١-بە ئارامو خۆراگر ٢-کەسێکە سەربەستە چی دەکات کەس دەست نانێتە بەری.
٣-(ساف- الشيءَ. سَوفاً): بۆنی شتەکەیکرد.
(ساوَفَ-هُ. مُساوَفَةً): ١-بۆنی شتەکەی پێکرد ٢-خایاندی/ دەستیدەستی پێکرد.
(إستافَ- الشيءَ. إستِیافاً): بۆنی شتەکەیکرد.
(اَلمَساف): لووت. چونکە بۆنی پێدەکرێت.
(اَلمَساف والمَسافَة (ج) مَساوِف والسِیفَة): ماوە/ دووریی (لە بنچینەدا لە بۆکردنەوە هاتووە).
("كَم مَسافُ هذه الأرض ومسافَتُها وسيفَتُها"): ماوەی/ دووریی ئەم زەویە چەندە.
("بَينَهُم مَساوِفَ ومراحِلَ"): نێوانیان چەند دووریی و چەند قۆناغە.
(اَلمُستاف): ١-شوێنی بۆنکردن ٢-کەسێکە کە دوورییەکی زۆر بپێت/ ماوەیەکی زۆر بڕوات.
٤-(ساوَفَ-هُ. مُساوَفَةً) ١-بۆنیکرد ٢-نهێنیەکی لادرکاند ٣-خایاندی/ ئەمڕۆبەسبەیی پێکرد.
٥-(اَلساف) (ح)): باڵندەیەکە ڕاودەکات.
(اَلساف (ج) آسُف وسافات): چینی دیوار.
("بنی سافَین وثلاثَة آسُف"): دوو چین و سێ چینی قوڕ یان خشتی کاڵ لە دیوارەکەدا.
(اَلسافَةُ (ج) آسُف وسافات): چینی قوڕ یان خشتی کاڵ.
(السافَةُ والسُوفَةُ (ج) سُوْف وسُوَف): زەوییەك نە لمی بێت و نە ڕەقەن.
(اَلسافِفَةُ): ١-وردەلم ٢-زەوییەك نە لمییەو نە ڕەقەنە. لە نێوانیاندایە.
٦-(اَلسوفیات): وڵاتی سۆڤێت وشەیەکە، ناوێکە پیاوانی شۆڕشی ڕوس و ئۆکتۆبەر، لە ئەنجومەنی کرێکاران و جوتیاران و سەربازانیاندا. وترا دەوڵەتی سۆڤێت یان

روسیای سۆڤێت و هەموو ئەو ناوانەیتر لەوەوە وەرگیرا.

ساق: ١-(ساقَ- الماشِیَةَ سَوْقاً وسِیاقاً وسِیاقَةً ومَساقاً): ئاژەڵەکەی (ئاژۆت/ دایە پێشخۆی (لێخوڕی).

(سائِق (ج) ساقَة وسُوّاق وسائِقون): لێخوڕ. ئاژۆتەر.

(مَسُوقَة): ئاژۆتراو/ لێخوڕراو. وەپێشدراو.

(ساقَ- السَّیارَةَ): ئوتومبیلەکەی لێخوڕی.

(سائِقُ السَیارَةِ): ئوتومبیل- لێخوڕ/ ئاژۆتەری ئوتومبیل.

("ساقَهُ مَساقَةَ غَیرِهِ"): وەك خەڵکیتر لێیخوڕی/ ڕەفتاری لەگەڵدا کرد.

(-الحَدیثَ): قسەکەی گێڕایەوە/ باسکرد.

(إلیهِ المالَ): ١-داراکەی بۆ نارد ٢-خستیە بەردەمی و بەردەستی.

(-مِنَ إمرَأتِهِ): مارەیی بە ژنەکەیدا.

(-المَریضُ نَفسَهُ عند المَوتِ وسیقَ علی المَجهولِ): نەخۆشەکە کەوتە گیانەڵاّ/ گیانکێشان.

(سَوَّقَ- هُ الأمْرَ): کارەکەی دایە دەست ئەو کردی بە هی ئەو.

(سَوَّقَ- الماشِیَةَ): ئاژەڵەکەی دایە پێش/ لێخوڕی.

(ساوَقَ- هُ): پێشبرکێی لێخوڕینی لەگەڵدا کردو شانازیی ئەوەیانکرد.

(أساقَ واسْتَساقَ- هُ الماشِیَةَ. إساقَةَ واسْتِساقَةً): ئاژەڵەکەی دایێ لێیخوڕێت.

(تَسَوَّقَ): بازاڕیکرد/ کڕین و فرۆشتنیکرد.

(تَساوَقَ-تِ الماشِیَةُ): ١-ئاژەڵەکە بە دوای یەکدا ڕۆیشتن/ بەردودوا ڕۆیشتن ٢-لە ڕۆیشتندا تەنگیان بەیەك هەڵچنی.

(إنساقَ): لێخوڕرا/ وەپێشدرا.

(-تِ الإبلُ): حوشترەکان شوێنیەك کەوتن.

(إستاقَ- الماشِیَةَ. إستیاقاً): ئاژەڵەکەی دایە پێش و لێیخوڕین.

(السّاقَة): ١-دەستەڕەو ٢-پاشڕەوی سوپا/ دوادوای سوپا/ پاشینەی سوپا.

("فلان في ساقَةِ الجیش"): فیسار لە دوادوای سوپاکەوەیە/ لە پاشینی سوپاکەوەیە/ پاشین پێچەوانەی (بەرایی)یە.

(السوق (ج) أسواق): بازاڕ (بەمێ و نێر دەکرێت) (بۆیە وا ناونراوە چونکە کەلوپەل و شت بۆی دەهێنرێت شتی فرۆشتن و کڕینی بۆ بەکێشدەکرێت).

(سوقُ الحَرْب): (مەیدانی/ گۆڕەپانی/ کۆڕی) جەنگ.

(السُوقَةُ): خەڵکی بەڕێوەبراو/ بندەست/ گەل (ئەم وشەیە بۆ تاك و کۆو نێرومێیە) چونکە، شا ئەو خەڵکە بەڕێوەدەبات و بۆ کاروباری خۆی و بە هەوەسی خۆی دەیانئنێرێت.

(السَوّاق): لێخوڕ.

(اَلسَيِّق- مِنَ السَّحاب): هەوری وشك كە با رایدەدات.

(اَلسَيِّقَةُ (ج) سَيائِق وسَيِّقات): ئاژەڵێك كە دوژمن تاڵانیكردووەو داویەتیە پێشخۆی.

("اَلمَرْءُ سَيِّقَةُ القَدَرِ"): مرۆڤ چارەنووس/ قەدەر دەیداتە پێشخۆی بۆ ئەوەی چارەی بۆ لێدراوە.

(اَلسِياق) (مص): مارەیی ژن (چونكە عەرەب ئەگەر ژنیان بهێنایە حشوترو مەڕیان دەكردە مارەیی ژنەكەو دەیانداپە پێشخۆیان).

(سِياقُ الكَلام): شێوەی قسەو ڕێڕەوی ئاخاوتن.

("وقعت هذه العِبارَة في سياق الكلام"): ئەم دەربڕینە لە توێی ئاخاوتنەكەدا بوو.

(اَلمِسْوَق): حوشترێكە لە كاتی ڕاودا ڕاوكەر دەیكاتە سوپێری خۆیو خۆی لە نێچیرەكە دەشارێتەوە.

(اَلمِسْواق- عِندَ التجّار): ئەوەی كە وردەوردە دەكڕرێت.

(اَلمُنساق): ١-بەدەمەوە ڕۆیشتوو/ شوێنكەوتوو ٢-نزیك ٣-كەڕی/ شاخی درێژو لێژ.

٢-(ساقَ- ـُ سَوْقاً وسِیاقاً): بەر لاقیخست.

(سَوِقَ. یَسْوَقُ. سَوَقاً): لاقی ئەستوورو ڕێكبوو.

(سَوَّقَ- النَبتُ): ڕووەكەكە لاسیكرد/ قەدیكرد.

(اَلساق (ج) سُوْق وسِيقان وأسْواق) (ع ا): لاق- كە لە نێوان قولەپێو ئەژنۆدایە (وشەكە مێیە).

("كَشَفَ الأَمرُ عَن ساقِه"): كارەكە خۆی دەرخست سەختو گەورە بوو.

("قامَت الحربُ على ساقٍ"): جەنگەكە گەرمبوو.

("وَلَدَتِ المَرأةُ ثلاث بنين على ساقٍ واحِدَةٍ): ژنەكە سێ كوڕی لەسەر یەكبوو. كچیان لە نێواندا نەبوو.

(اَلساق) (ن): قەدی لاسكی ڕووەك قەدی ڕووەك كە لقو پۆپی لێوە دەردەچێت گەڵاو گوڵ هەڵدەگرێت یان بە خۆیەوە یان بە لقەكانیەوە ئەویش بە پێی ڕووەكەكە.

(ساقُ الشَجَرَةِ): قەدی درەخت.

(ساقُ البُندُقِيَّة): بەش دواوەو چەماوەی داری تفەنگ.

(اَلسَوَق): درێژی لاق.

(اَلسَوقاء): جزمە/ چەكمە.

(اَلأَسْوَق (م) سَوقاء (ج) سُوْق): لاقدرێژ.

(اَلسُوّاق): ١-لاقدرێژ.

(-مِنَ النُبات): پەلوپۆی سەر قەفو قەدی ڕووەك.

٣-(ساقُ حُر) (ح): نێرەی قومری.

(اَلسَويق (ج) أَسوِقَة): ١-ئاردی سفری گەنمو جۆ ٢-مەی ٣-ئاردە ساوەر (عامية).

(اَلسَـوَّاق): فرۆشـیاری ئـاردی سـفرو دروستکەری.

ســاك: ١-(ســاكَ وسَــوَّكَ الشيءَ. سَــوكاً): شتەکەی پرواندو پاکیکردەوە.

("سَوَّاك الأسنانَ بِالعودِ"): دانی بە چیلکەکە ئاژنیو پاکیکردەوەو لێیخست.

(تَسَوَّكَ واسْـتَاكَ. تَسَوُّكاً واسْـتِياكاً): داری سیواکەکەی لێخست.

اَلسِواك (ج) سُوك والمِسْواك (ج) مَساويك): داری سـیواك کـە دانـی پێدەئاژنــن و پێی پاکدەکەنەوە.

٢-(ساكَ وتَساوَكَ. سِواكاً): هێواش و لەسەرخۆ رۆیشت.

٣-(سَـوْكَرَ- الرسـالَةَ وغيرَهــا في إصْطِلاح العامة) (ايطالية): نامەکەی دڵنیاو مسۆگەر کرد.

ســال: ١-(سَوِلَ. يَسْوَلُ سَوَلاً): ورگی لە خوار ناوکییەوە شل و شۆڕ بوو.

(أَسْوَل (م) سَوْلاء (ج) سُول): ورگشۆڕ.

(تَسَوَّلَ- البَطنُ): ورگەکە شۆڕ بوو.

٢-(ســالَ. سُوالاً و سَــوالاً): پرســیاریکرد/ پرسی.

اَلسُــوْل: ســووککەرەوەی (سُــؤْل)ە: نیــازو خواست.

اَلسُــوَلَة: فــرە پرســیار/ زۆر بەرپرســیار خۆشپرس.

٣-(سَوَّلَ لَهُ الشَّيطانُ): شەیتان فریویداو لای خۆشکرد کە ئەو کارە بکات.

("هذا مِن تَسْوِيلاتِ الشَّيْطان"): ئەمە چرپەی شەیتانەو فریوی ئەوە بۆی رازانۆدتەوە.

("سَــوَّلَت لَهُ نَفسُــهُ كَــذا"): دەروونی بۆی رازاندەوەو لای ناسانکرد/ لای خۆشکرد.

٤-(اَلسولاء): دۆلکەی گەپ/ گەورە.

(اَلسَوِيل): هاوتا/ وەك ئەو.

(أنا سَــوِيلُكَ في هذا الأمر): مــن لەم کارەدا وەك تۆم/ هاوتای تۆم.

المُلحق:

سول: (اَلتَّسَوُّل): سواڵکردن، دەرۆزەکردن.

("مَنــعُ التَّسَــوُّل في أحياء مِــنَ العاصمة"): رێگەنــەدان و نەهێشــتنی دەرۆزەکــردن/ سواڵکردن لە هەندێك گەڕەکی پایتەختدا.

(حالَ المُتَسَوِّلَ): لە سواڵکردن رزگاریکرد.

---

سام: ١-(سامَ- السِلعَةَ. سَوماً وسُواماً): کاڵاکەی خستە بەر فرۆشتن و نرخیشی لەسەردانا.

(-المُشــتَرى السِــلعَةَ): کڕیارەکــە ســەودای کاڵاکەیکرد.

("سامَ بِســلْعَتِهِ كذا وكذا"): نرخی کاڵاکەی وت و داوای نرخێکی گرانی لێکرد.

(-ناقَتَهُ على الحَوضِ): مێحوشترەکەی بردە سەر گوڵەکە.

(-البَيضَــةَ) (عامية): هێلکەکەی کێشـا بە دانیدا تا رەقیی تاقیبکاتەوە.

(ساوَمَ- بالسِلْعَةِ. سِواماً ومُساوَمَةً): لەگەڵ کڕیارەکەدا چەندوچوونی نرخی کاڵاکەیانکرد تا ڕێکبکەون.

(تَساوَما السلعَةَ): سەودای کاڵاکەیان کردو لەسەری ڕێککەوتن.

(-في السِلعَةِ): پێکەوە لەسەر سەودای کاڵاکە دوان و ڕێککەوتن.

(إسْتامَ- فُلاناً السِلعَةَ): نرخی کاڵاکەی لە فیسار پرسی؟

(-بها): گرانیکرد.

٢-(سامَ- الأمرَ. سَوْماً وسُواماً): کارەکەی بەو سپاردو کردە ئەستۆی ئەوەوە.

(-هُ خَسْفاً): سەرشۆڕیکرد.

(سَوَّمَ- هُ الأمرَ): کارەکەی خستە ئەستۆی ئەو، دایە دەست ئەو.

(-هُ في مايَملِكُهُ): ئەوەی کە هەیبوو دایە دەست ئەوو بەویسپارد هەڵیسووڕێنێت.

٣-(سامَ-تِ الماشِيَةُ. سَوْماً وسُواماً): ئاژەڵەکە چووە لەوەڕگاکەوە.

(- الطَيرُ على الشيءِ): باڵندەکە بەسەرەوە دەوروو خولی شتەکەیدا.

(-تِ الريحُ): باکە هات و سەروەر بوو.

(سَوَّمَ- فُلاناً): فیساری سەربەستکرد چی دەکات بیکات.

("عَبدٌ و سُوَّمٌ"): کۆیلەیەک بێت و سەربەست و ئازادبکرێت (ئەمە بە مرۆڤی بەد دەوترێت ئەگەر سەربەست بکرێت و دەستی بەرەڵا بکرێت).

(سَوَّمَ- الخَيلَ): ١-ئەسپەکەی نارد ٢-ئەسپەکەی کردە لەوەڕگاکەوە.

(-عَلَيهِم): دای بەسەریاندا شەبەیخونیکردن و خراپی بەسەرهێنان.

(أسامَ- الماشِيَةَ. إسامَةً): ئاژەڵەکەی کردە لەوەڕگاکەوە.

(-إليهِ بِبَصَرِهِ): چاوی تێبڕی.

(السائِم) (فا): ١-کەسێکە بێنیاز بەملاولادا بڕوات ٢-شوان.

(السائِمَةُ والسَوام (ج) سَوائِم): ئاژەڵ و حوشتر کە بەرەڵا بۆ خۆی بلەوەڕێت.

(السُوَام) (ح): باڵندەیەکە.

(المَسام): خێرا تێپەڕین.

(الخَيلُ المُسَوَّمَةُ): ئەسپی ناولەوەڕگا. ئەسپی بەرەڵاکراو.

٤-(سَوَّمَ- الفَرَسَ): چارەوێکەی نیشانەکرد.

(تَسَوَّمَ): نیشانەیەکی بۆ خۆی دانا تا بەو نیشانەیە بناسرێتەوە.

(السِيمَةَ والسُومَةَ والسِيماءَ والسَيمى): ١-نیشانە/ نیشان ٢-دیمەن، ڕەزا، ئێسک.

(فيه سُومَةُ الصلاحِ وسِيمَتُهُ): نیشانەی چاکیی پێوە دیارە.

(السيميا والسيمياء): ١-نیشانە ٢-جوانیی شێوە، ئێسکسوکیی و ڕووخۆشیی.

(المُسَوَّم): ١-شـێوەو قەڵافەتجوان ٢-نیشانەدار کە بەو نیشانەیە بناسرێتەوە.

٥-(السام): مردن.

(سامَة): مردنێك.

(السام) (ن): دارحەیزەران.

(السـامَّة): ١-مردنێك ٢-دارێـژراوی زێڕ یان زیو.

(السامَّة (ج) سیَم): چاڵێك لە لێواری بیردا.

(المَسـامَة): باهـووی ئەسـتووری خوارەوەی دەرگا خەڵکە رەشۆکەکە پێیدەڵێت (العَتَبَة).

سوي: ١-(سَوِيَ یَسوی- الرَجُل سِویً): کابرا کارەکەی راستو دروستبوو.

(سَوَّى- الشَيءَ): شـتەکەی راستو رێککرد/ تەختیکرد.

("سَوَیتُ المَعُوَجَ فَما اسـتَوَى"): خواریەکەم راستکردەوە بەڵام بۆم راستنەکرایەوە.

(سَـوَّى): بـە رێکیـی دروسـتیکردو تەخت دروستیکرد.

(سَوَّى): بۆ دروسـتکردنو رێککردنی هەموو شتێك دێت.

("الأبّار یُسَوِّي الإبر"): تۆوپرژێنی دارخورما هەڵاڵەکەی بەسەر دارخورماکەدا پرژاند.

(سَوَّى- بَینَهُما): وەك یەك رەفتاری لەگەڵدا کردن/ یاکسانیکردن.

(-هُ بِـهِ): یەکسـانی ئەویکـرد/ وەك ئەوی لێکرد/ هاوتای ئەویکرد.

(سُـوِّیَت علیـه الأرضُ): مـردو خرایە ژێر خاکەوە زەویەکەی لەسەر تەختکرد.

(ساوى- الشَيءَ): وەك شـتەکە بوو/ هاوتای شتەکە بوو.

(هـذا لایُسـاوي دِرْهَماً): ئەمـە درهەمێك ناهێنێت نرخی·بەرامبەر درهەمێك نییە.

(-بَینَهُما): هاوتای یەکیکردن/ یەکسانیکردن.

(-هُ بِهِ): وەك ئەوی لێکرد/ بەو یەکسانیکرد/ هاوتای ئەویکرد.

(-الرَجُلُ قِرنَهُ): ١-پیاوەکە هاوتای هاورێکەی خۆیبـوو ٢-لـە رێزو پایـەدا وەك ئـەو بوو یەکسـانیبوو ٣-لە دلێریی‌و زانسـتدا گەیشتە ئەو.

(أسْـوى. إسْـواءً): کارەکـەی راسـتو دروستبووەوە.

(-الشَيءَ): شتەکەی راستو رێكو تەختکرد.

(-هُ بِهِ): هاوتای ئەویکرد/ رێکی ئەویکرد.

(تَسَوَّى): تەختو رێکبوو.

("تَسَـوَّت بِـهِ الأرضُ"): مـردو خرایە ناو زەوییەوەو زەویەکەی بەسەردا تەختبوو.

(تَسـاوَیا في کَذا): لەوەدا وەك یەکیان لێهات/ یەکسانی یەکبوون.

(إستَوى): رێكو راستبوو.

(-الشَيءُ): شتەکە راستو رێك دروستبوو.

("سـویتُ الشـيءَ فاسْـتَوى"): شـتەکەم راستکردەوەو رێكو راست دەرچوو.

(إِسْتوى- الرَجُلُ): ١-كارەكەی ڕاستو دروستو باڵا بوو ٢-گەنجێتیەكەی بەسەرچوو ٣-گەیشتە ئەوپەڕی هێزو گوڕو دەسەڵاتی- كە تەمەنی هەژدە تا سییە.

(-عَلَيهِ): ١-سەریكەوتو جێی خۆی گرتو دامركا، دەستی بەسەرداگرتو بوو بەهی خۆی.

(-على ظَهْرِ الدابَّةِ): ڕێكو قنج سواری پشتی وڵاخەكە بوو و دامركا.

("إِسْتَوى على سَرِيرِ المُلْكِ"): ئەمە ئیدیۆمە. واتا: دەستی بەسەر ئەو شتەدا گرتو بوو بە خاوەنی واتاكەیشی: چووە سەر تەختی پاشایی.

(-ت بِهِ الأَرضُ): مردوو لە زەویەكەدا نێژرا/ زەویەكەی بەسەردا تەختبوو.

(-الطَعام): چێشتەكە/ خواردنەكە پێگەیشت.

(اَلسَّواء): ١-چونییەك/ وەكیەك ٢-یەكسان بەیەك.

("هُما في هذا الأَمرِ سَواءٌ"): ئەو دوانە لەم كارەدا چونیەكن/ یەكسانن. دەیشوترێت: (سواءان): وەك یەكن.

(هُمْ سَواءٌ أَوهُم أَسواءٌ): ئەوان وەك یەكن/ یەكسانن/ بەرامبەرن/ لەتایەكدان (ئەگەر بە پێی پێوەری زمانیش نەبێت دەوترێت).

(هُم سَواسٍ وسَواسِيَةٌ وسَواسِوَةٌ): یەكسانن/ چونیەكن.

("مَرَرْتُ بِرَجُلٍ سَواءٍ والعَدمُ"): بەلای پیاوێكدا ڕابوردم، بوونو نەبوونی وەك یەكبوو ٣-ناوەڕاستی شت/ ناوەندی دوو سنوور.

("ضَرَبَ سَواءَهُ"): دای بە ناوەڕاستیدا.

("لَقَيتُهُ في سَواءِ النَّهارِ"): لەناوەڕاستی ڕۆژەكەدا پێیگەیشتم ٤-جگە لە.

("جاؤوا سَواءَ زَيدٍ"): هەموو هاتن جگە لە زەید نەبێت ٥-تەخت كە درێژیو پانیی وەك یەكبێت.

("مَكانٌ سَواءٌ وثَوبٌ سَواءٌ"): شوێنێك پانیو درێژی یەكسانبن. بەرگێك پانییو درێژییەكەی هێندەی یەكبن.

("هذا دِرهَمٌ سَواءٌ"): ئەمە پارەیەكی تەواوە ٦-ڕاست.

(سَواءُ السَبيل): ڕێگەی ڕاستو تەخت.

(سَواءُ الجَبَلِ): بۆپەی/ لووتكەی شاخ.

(لَيلَةُ السَواءِ): مانگیپر. شەوی سیازدە یان چواردە كە مانگ تیایدا پڕدەبێت (ئەگەر لە پاش وشەی.

(سَواءٍ): هەمزەی بەرامبەر بوو پێویستە (أَمْ): لەگەڵ دوو وشەكەدا هەبێت. جا یا ناوبن یان فرمانبن وەكو: ("سَواءٌ عَلَيَّ أَزَيدٌ جاءَ أَم عَمرُو"): لای من/ بۆ من وەك یەكە زەید هاتبێت یان عەمرو.

("سَواءٌ عَلَيَّ أَقُمْتَ أَم قَعَدتَ"): بۆ من وەك یەكە بە پێوە بیت یان دانیشیت (ئەگەر لە

دوای سَــواءدوو فرمان هــات به بێ هەمزەی بەرامبــەر بە (أو)پەیوەســتا دەکرێن) وەك:
(سَواءٌ عَلَيَ قُمتَ أوقَعَدَتَ): بۆ من وەك یەکە بە پێوە بێت یان بە دانیشــتنەوە بیت ئەگەر لە دوایەوە دوو چــاوگ بێن، بە (و)یان (أَو) پەیوەست دەکرێن) وەك: (سَواءٌ عَلَيَّ قِيامُكَ أَو قُعــودُكَ"): بۆ من یەکە/ لای من یەکە بە پێــوە بیت یان دانیشــتووبیت بە پێوە بێتو دانیشتویت.
(اَلسِوى والسُوى)١-ڕێك ڕاست ٢-ناوەڕاست ناوەند.
٣-جگە لە (ئەمە ئامرازی جیاکردنەوەیە).
("جاؤُوا ســوى زَيدٍ"): کشتیان هاتن جگە لە زەید/ زەید نەبێت.
"مررتُ بِرَجُلٍ سوىً والعَدَمُ") بەلای پیاوێکدا تێپەڕیم بوونو نەبوونی وەك یەکبوو.
("هُمــا على حَدٍ ســوىً"): ئــەو دوانە وەکو یەکنو لە دانگێکدان/ جیاوازییان نییە.
(اَلسَــوِيّ (ج) أَسْوِياء):١-بەرامبەر یەکبوون/ هاوتابــوون ٢-بەرامبــەر/ هاوتا/ یەکســان/ وەکیەك ٣-ڕاستو دروست ٤-بە ویژدانبوون.
(مَكانٌ سَوِيّ): شوێنێکی ناوەڕاستی دوولا.
(غُلامٌ سَــوِيّ): میردمنداڵێکی بە ڕەوشــتو ڕاستو بێخەوشو تەندروست.
(اَلسَــوِيَّة (ج) سَوايا):١-مێی وشەی (اَلسَوِيّ) ٢-هۆی پێکواســتنەوەی کەنیــزەكو هەژاران ٣-یەکسانبوون.

("هُم على سَــوِيَّةٍ في هذا الامر"): ئەوان لەو کارەدا چونیەکن/ لە پێو دانگێکدان.
(قَسمتُ الشيءَ بَينَهُما بِالسَّوِيَّة"): شتەکەم بە ویژدانانەو وەك یەك لێبەشکردن.
(اَلسِــيّ (ج) أَســواء):١-یەکســان/ وەکیەم ٢-هاوشێوە هاووێنە.
(هُماسَــيّان): ئــەو دوانە چونیەکــن. بۆ مێ دەوترێت.
("ماهِيَ بِسِيٍّ لَكَ"): ئەو مێینەیە هاوتای تۆ نییە.
(لَيسَتِ المَرأَةُ لَكَ بِســيٍّ"): ژنەکە هاوتای تۆ نییە.
(ماهُنَّ لَكَ بِأَسواءٍ): ئەوان هاووێنەی تۆ نین/ وەك تۆ نین.
(اَلسّي): بیابانی پانو بەرین.
(مَكانٌ سيّ): شوێنێکی تەخت.
(لاسِــيَّما): نەخوازەلا. وشەیەکە لە (سيّ) و (ما)پێکهاتووە، کەوشــەی دوای (ســيّما) لە وشەی پێش (ســيّما)ی پێ جیادەکرێتەوە بە زۆریش (و)ی پێشــدەخرێتو سووکدەکرێت. دەوترێت: (ولاسيَما) جاری وا هەیە (لا)کەی فرێدەدرێــت دەوترێت: (ســيّما) بەلام ئەمە کەمتر دەوترێت چونکە بێهێزە.
(اَلأسْوى): کرداری بەراوردە.
("هــذا المَكانُ أَســوى هذه الأمْكِنَــة"): ئەم شوێنە تەخترین ئەم شوێنانەیە.

(ألإسـتواء): ١-ڕێکی و ڕاستیی ٢-یەکسانیی/ بەرامبەریەکبوون.

(خَط الإستواء عند الجغرافيين): هێڵی کەمەرەی گۆی زەویی لای جوگرافیناسەکان هێڵێکی بازنەییەکە بە دەوری گۆی زەویدا کێشراوە کە لە هەردوو جەمسەری گۆکەوە دوورییەکی هەیەو گۆی زەوی بە دوو کەرتی وەك یەکەوە باکوورو باشوور، بە درێژایی ساڵیش لەوێدا شەوو ڕۆژ یەکسانە.

٢-(أسوى. إسواءً): ڕسواو سەرشۆڕ بوو.

٣-(إستَوى- إلى الشيء): نیازی شتەکەیکردو بۆی چوو.

(ألسَوَى): نیاز/ خواست.

الملحق:

سوي: (ألإستِوائي): ئەوەی لەسەر هێڵی کەمەرەی گۆی زەوییە.

(ألمُنطِقَة الإستوائية): ناوچە کەمەرییەکان.

(ألمَناخ الإستِوائِي): ئاووهەوای کەمەریی ئاووهەوایەکە جیایە گەرمایەکی زۆرو بارانێکی زۆری هەیەو کەشەکانی یەك کەشە.

(ألتَسوِيَة) (مص): تەختکردن و خۆشکردن شتەکە تەخت و ڕێك بکرێت و هەرچی قورت و گرێ هەیە لابرێت و ساف بکرێت.

(تَسوِيَة الأرض): ناکۆکیی خاوەندارییی زەویی بەبێ چوونە دادگاوە نەهێڵرێت و بە خۆشی ساغ بکرێتەوە.

("تمت التَسوِيَة علي يَدِ فلان"): فیسار زەویەکی ساغکردەوەو دایەوە بە خاوەنەکەی.

(ألتَسْوِيَة): ناکۆکیی و شەڕو بنار لە ڕێی یاساوە نەهێڵرێت.

("وَقَّعَ الطَرَفان التَسوِيَة"): هەردوولا ڕێککەوتننامەکەیان مۆرکرد. بارودۆخەکە بە گوێرەی یاساو شیرازە بێت. تَسوِيَة وضع الموظف: ("یەکسانکردن و چاککردنی باری کارمەند"). المساوات: وەك یەك تەماشاکردن و داد.

(المساوات في الثروات): ١-(لە ساماندا یەکسانی) ٢-بنەمایەکە ئەو مافە بە هەموو کەسێك وەك یەك دەدات.

(المساوات السياسية): یەکسانیی ڕامیاری.

(المساوات الاجتماعية): یەکسانیی کۆمەڵایەتی.

(المساوات في البلاغة): چوونیەکبوون لە ڕەوانبێژیدا: ئەوەیە وشەکە بە پێی واتاکە بێت. ئەم ڕێیەیش لە نێوان کورتکردنەوەو درێژەپێدانن لە ڕەوانبێژیدا.

(ألمُستَوِي): تەختکراوو ئامادەکراو.

(فُسْحَةٌ مُستَوِيَة): پانتاییەکی تەختکراو ڕێکخراو.

(ألسَطح المُستَوِي): ڕووی تەخت: ئەوەیە ئەگەر دوو پنتی سەری ڕووەکە بگیرێت و

هێڵێــك بە یەكیانــەوە بگەیەنێت هێڵەكە بە هەموو پنتێكی رووەكەوە دەنووسێت.

سیأ: (سَیَّأَ-تِ الناقَةُ): مێحوشترەكە بێدۆشین شیرەكەی دادا.

(تَسَــیَّأَ-تِ الناقَةُ): مێحوشــترەكە بیدۆشین شیرەكەی لێچۆڕا.

("تَسَیَّأتْ عَلَيَّ الأُمورُ"): كارەكانم لێ چەواشە بوو نازانم كامیان بگرمە بەر چاو.

("تَسَیَّأَ فلانٌ بِحَقِّي"): پێی لە مافەكەمنا كە لەوەپێش حاشای لێدەكرد.

(إِنْسَیأَ- اللبنُ): شیرەكە بێدۆشین دایدا.

(السَــيء والسيء (ج) سُــيُوء): شیری دەورو بــەری گــوان كــە بیدۆشــین لــە گوانەكــە دەچۆڕێت/ دێتە خوارەوە.

ســاب: ١-(ســابَ- الماءُ سَــیباً): ئاوەكە كشاو ڕۆیشتو بە هەموو لایەكدا بڵاوبووەوە.

(-الرَجُلُ): پیاوەكە خێرا ڕۆیشــت/ بە پەلە بۆی دەرپەڕیو ڕۆیشت.

(-فِي كَلامِهِ): بێگوێدانە قسەكەی لەسەر قسە ڕۆیشت.

(-تِ - الدابَّةُ): وڵاخەكە بە هەوەســی خۆی بەملاولادا ڕۆیشت.

(سَــیَّبَ-هُ): بەرەڵایكرد، بەملاولادا بڕوات و گوێنەدایە/ لێیگەڕا/ وازی لێهێنا.

(- العَبدَ): كۆیلەكەی ئازادكرد/ بەرەڵاكرد.

(إِنْسابَ إِنْسیاباً): خێرا ڕۆیشت.

(-تِ الحَیَّةُ): مارەكە بە تەكان خشا/ كشا.

(اَلسَــیب (مــص) (ج) سُــیُوب): ١-باراناوی ڕۆیشــتوو ٢-بەخشین ٣-ســامان/ دارا/ ماڵ ٤- تالانیی.

(اَلسُیُوب): لێشــاوی كانزایی كە خودا لە ژێر زەویدا دایناوەو دێت و دەچێت.

(اَلسِیْب (ج) سُیُوب): ئاوەڕۆ.

(اَلسائِب): بەرەڵا/ رەهاو نەپارێزراو.

("المالُ الســائِب یُعَلِّمُ الناسَ الحرامَ"): ماڵی بەرەڵا خەڵكی فێری حەرامدەكات، حەرام واتا دزیی.

(اَلسائِبَةُ (ج) سُیَّب وسَــوائِب): ١-بەڵاكــراو/ وازلێهێنــراو/ پشــتگوێخراو ٣-كۆیلــەی ئازادكراو.

(الســائِب) (ح): مێحوشــترێك كــە لە پێش ئیســلامدا عەرەبــەكان نەزریاندەكــرد، یان دە بەچكــەی مێینــەی دەبوو بــەرەڵا دەكرا، نە ســواریدەبوون/ نە شیرەكەی دەخورایەوە شــیرەكەی تەنها بە بەچكەكەی یان بە میوان دەدرا، بــەری لــەوەڕو ئاویان لێنەدەبەســت لێیدەگەڕان تا بۆ خۆی مردار دەبووەوە.

٢-(إِنســابَ فُلانٌ نَحْوَنا): فیســار بەرەو لای ئێمە كشایەوە/ گەڕایەوە.

٣-(اَلسَــیْب (ج) ســیُوب): ١-تووكــی كلكــی چارەوێ ٢-سێو ~~(فارسیە)~~.

(اَلسَیاب والسَــیَّاب والسُیَّاب. الواحِدَةُ سَیابَة

وسَــيَّابَة) (ن): فەریکــە خورمــا/ خورمای زەردبــووی پێنەگەیوو یان ســەوزەخورما. پێنەگەیوو یان سەوزەخورما.

(ألسَيابَة): مەی

(ألسِيبان (ح): وشەیەکە گۆڕراوە بنچینەکەی و راســتیەکەی (ألصِنبان)ە: ڕشــکی ئەســپێ و گەرای کچێ.

ســيج: (سَــيَّجَ- الكَرْمَ): پەرژینــی بۆ ڕەز کرد.

(ألسِــياج (ج) سَــياجات وأسِــوجَة وسُوج): ١-دیوار ٢-پەرژین/ تەیمان شوورە. چەپەر کە بە سووری باخ و ڕەزو کشتدا دەدرێت.

(ألسَيجان) (ح): جۆرە ماسییەکە.

الملحق:

ســيج (ألسِّــيجارَة (ج) سَــجائِر وسَجاير= السيكارة): جگەرە.

---

ســاح: ١-(ساحَ- الماءُ سَيحاً وسَيَحاناً): ئاوەکە بە سەر زەویدا کشا/ ڕۆیشت.

(ماءٌ سائِح وسَيْح): ئاوی ڕۆیشتوو کشاو.

(هذه الأرضُ تُسقى بالماءِ سَيحاً): ئەم زەویە ئاودێریی دەکرێت/ ئاوداشتی دەکرێت بە ئاوی کانــی و ڕوبارو چەم و چاڵاو.. هتد ئاودەدرێت نەك بە باراناو.

(-ساحَ سَيْحاً وسَــيَحاناً وسِياحَةً وسُيُوحاً): ١-بۆ خوداپەرســتی و گۆشەگیریی و دەروێشیی بــە جیهانــدا کەوتــە گــەڕان و ســووڕانەوە

٢-بۆ گەشــت و گوزارو سەیران و ڕوانین کەوتە گەڕان و وڵاتپشکنین.

(ســائِح (ج) سُــيَّاح ســائِحون): گەشتیار/ گەڕیدە.

(سُوَّاح) (عامية)": گەڕۆك و گەشتیار.

(سَــيَّحَ- هُ): ١-گەشــتی پێکرد. وای لێکرد کە بکەوێتە گەڕان ٢-ئاویدا.

(أسَــاحَ- هُ): گەڕاندی/ وایلێکرد گەشــتبکات ٢-ئاویدا.

(ألسَــيح (مص) (ج) سُيُوح و أسَاياح): ئاوی لەبەر ڕۆیشــتووی دیــار/ ئاوی ئاوداشــتن/ ئاودێریی/ ئاودان.

(ألســائِح): ڕۆژووگرێکــە مزگەوتی گرتبێت (چونکە بەبێ خواردن دێت و دەچێت).

(ألسَيَّاح): کەسێکە گەشت و گوزار زۆر بکات.

(ألمِسياح (ج) مَسايِيح): ئاشووبگێڕو زمانبەدو دووبەرەکیی نێرەوە.

٢-(ساحَ- الظِلُّ. سَيحاً وسَيَحاناً): سێبەرەکە گەڕایەوە.

(أسَــاحَ- الفَرَسُ بِذَنَبِــهِ): چارەوێکە کلکی بەردایەوە/ خاوکردەوە.

(إنْســاحَ- بَطْنُــهُ): ورگی گەورەبــوو لەبەر چەوریی زۆر شۆڕبووەوە.

٣-(سَيَّحَ- فُلانٌ. تَسييحاً كَثيراً): ئاخاوتنەکەی زۆر ڕازاندنەوەو وردەکاریی تێداکرد.

(ألسَيْح (ج) سُيُوح وأسياح): بەرگی میلدار.

(أَلمُسَيَّح- مِن الثِّياب): بەرگی میلدار.
٤-(إنساحَ- الثَوبُ): بەرگەکە دادڕدادڕ بوو.
(- تِ الصَخـرَةُ): تاوێرەکـە تلـۆر بووەوەو لەتبوو.
(-بالُـهُ): مێشـكو دڵی ئارامبـوو کرایەوەو حەوایەوە.
ساخ: (سـاخَ. سَيْخاً وسَيَخاناً): بنجبەستبوو، ڕەگیداکوتا.
(-ت قَدَمُـهُ في الطينِ): قاچی بە قوورەکەدا چوو/ چەقی.
(أَلسِياخ (ج) سُيُوخ): خانووی گڵ.
(أَلسِيْخ) (فارسية): کێرد/ چەقۆی گەورە.
سار: ١-(سارَ. سَيراً وتَسْياراً ومَسيْراً ومَسِيرَةً وسَيْرورَةً): ١-بەشەو بەڕیدا ڕۆیشت ٢-ڕۆیشت.
(-هُ وبِهِ): خستیە ڕۆیشتن/ وایلێکرد بڕوات.
(-الدابَّةَ): سواری وڵاخەکە بوو.
(-الـكلامُ أَو المَثَـلُ في الناسِ): قسـەکە یان پەندەکە بەناو خەڵکدا بڵاوبووەوە.
(سَـيَّرَ- الرَجُلَ): پیاوەکەی خستە ڕۆیشتن/ خستەڕێ/ دەستی پێوەنا.
(-المَثَلَ): پەندەکەی بڵاوکردەوە/ کارێکیکرد بڵاوبێتەوە.
(-هُ مِـن بَلَـدِهِ): لە شـارەکەی دەریپەڕاندو کۆچی پێکرد/ دەربەدەریکرد.
(-الجِلَّ عَن ظَهرِ الدابَّةِ): جلەکەی لە پشتی وڵاخەکە کردەوە.

(سايَرَ- هُ): ١-پێبەپێی ئەو ڕۆیشتو لەگەڵیدا ڕۆیشت ٢-لەگەڵیدا گونجاو دڵی ڕاگرت.
(أَسـارَ- الرَجُـلَ): پیاوەکـەی خسـتەڕێو ڕۆیشتن.
(تَسايَرَ- عَن وَجْهِهِ الغَضَبُ): تووڕەییەکەی بەڕووەوە نەما.
(تَسايَرا): پێکەوە پێبەپێی یەك ڕۆیشتن.
(إِسـتارَ. إِسـتياراً): بـۆ ڕۆیشـتنەکەی چی پێویستبوو کڕی.
(أَلسَيْر) (مص): بەڕیدا ڕۆیشتن. بزاوتن.
(قَولُ المُوَلَّدين ("ليسَ في عصاهُ سيرٌ"): قسەی تازەگەرەکان دەڵێـن: "گۆچانەکەی بە کەڵکی ڕۆیشـتن نایەت" بە یەکێك دەڵێن کە ئەوەی دەیەوێت نەتوانێت دەستگیری خۆی بخات.
(أَلسِـيرَة (ج) سِيَر): ١-ڕۆیشتن ٢-قسەی باوی ناو خەڵك.
(أَلمَثَـلُ السـائِر): پەندو قسـەی بـاوی ناو خەڵك.
(أَلسِـيَّار والسُيَرَة والسَـيُور): گەڕیدە/ زۆر ڕۆیشتوو یان شتێك هەر بجووڵێتو وەستانی نەبێت.
(أَلسَيَّارَة (ج) سَيَّارات): مێی وشەی (أَلسَيَّار): ١-کاروانیـی )(کـە بنەڕەتەکەی خوێشـگەلی ڕۆیشتووە) ٢-ئۆتومبیل/ ماشێن
٣-(السيارات) (فلك): ئەو ئەستێرانەی سووڕی خۆر دەدەن/ بە دەروی خۆردا دەسووڕێنەوەو

رووناكیی لەو وەردەگرن بە پێی دوورو نزیكیان لە خۆرەوە ئەمانەن: (اَلعطارِد) زاوە (اَلزُهرَة): ناهید/ زورە. (اَلأَرض): زەوی. (اَلمرِّيخ): بارام. (اَلمشتري): بەرجیس. (زُحَل): كەش. (اُورانوس): ئورانۆس. (كە هەرتس لە ساڵی ١٧٨١دا دۆزییەوە). (نبطون): نیبتۆن (كە لی فریبە ساڵی ١٨٤٦ دۆزییەوە). بلوطون: بلۆتۆن (ساڵی ١٩٣٠ دۆزرایەوە) بەرامبەر بەمانە ئەستێرە نەبزێوەكانە.

(اَلسَّيارات العليا) (فك): ئەستێرە بەرزەكان ئەوانەن كە لە زەوییەوە لە خۆر دوورترن.

(اَلسَّيارتان السُفليان) (فك): دوو ئەستێرە خوارینەكان كە لە رۆژ نزیكترن لە چاو زەویدا. ئەوانیش:

(عطارد) و (الزهرة): زاوەو ناهیدەن.

(اَلتَّسيار) (مص): گورجرەوی/ تودەجوولەیی.

(طَریقٌ مَسُورٌ) (مفع): رێگەیەك كە زۆر پێدا برۆن/ رێگەیەكی ئاوەدان.

(اَلمَسيرَةُ) (مص): ١-ماوە/ قۆناغ. (بَینَهُما مَسيرَةُ یَومٍ): نێوانیان رۆژە رێیەكە ٢-رێپێوان.

٢-(سارَ- السُنَّةَ. سَيراً وتَسياراً ومَسيراً ومَسيرَةً وسَیرورَةً): لەسەر سونەت و شەریعەت رۆیشت و پەیرەویكرد.

("وَأَوَّلُ راضِيٍ سُنَّةٍ مَنْ يَسيرُها"): یەكەم قایلی سونەت ئەو كەسەیە كە بە قسەو كردەوە پەیرەویبكات.

("سِرّ عَنكَ"): برۆ گوێمەدەری و گومان مەكە.

(سَيَّرَ سِيرَةً): سەرگوروشتەی پێشینانی گێرایەوەو دەرخست.

(اِسْتارَ بِسيرَةِ فُلان. اِسْتياراً): سونەتی فیساری پەیرەویكردو لەسەر رێرەوی ئەو رۆیشت.

(سارُ- الشَّيءِ): هەموو شتەكە.

(اَلسِیرَة (ج) سِیَر): ١-رەوش و چۆنیەتی و شێوەی شت ٢-سونەت و شەریعەت ٣-رێ و رێرەو.

(سيرة الرَجُل): نامەی كردەوەو ژیان و هەڵسوكەوتی/ رەفتاری لەگەڵ خەڵكدا/ ژیاننامەی.

("هُوَ حَسَنُ السيرَة"): رەوشت و هەڵسوكەوتی لەناو خەڵكدا باشە.

("مَن طابَت سَريرَتُهُ حُمِدَت سيرَتُهُ"): هەر كەسێك دەروون و نیازی چاك و پاكبێت رەفتاری باشدەبێت و بە باش دادەنرێت ٤-چیرۆكی ژیان/ سەربوردەی ژیان.

("سيرَةُ عَنتَر"): چیرۆكی ژیانی عەنتەر (عامیە).

المُسَيَّر: بەرێوەبراو/ جڵەوكێشكراو.

(*الإنسانُ مُسَيَّرٌ لامُخَيَّر*): مروّڤ بەو شێوەیە دەجوولێتەوە کە خودا بۆیداناوە نەك بەوەی کە خۆی هەڵیدەبژێرێت.

٣-(سَيَّرَ- الثوبَ أو السَهْمَ): رووی بەرگەکە یان تیرەکەی هێڵکێشکرد یان میلدارکرد.

(تَسَيَّر- الجلدُ): پێستەکە توێژی هەڵدا.

(السَيْر (ج) سُيُور وسيُورَة وأسْيار): قایش/ پارچە چەرمێکی درێژ.

(السِيَراء): بەرگێکی میلدار یان بەرگێکە میلدارو تاڵ ئاوریشمی تێکەڵە.

(المُسَيَّر- مِنَ الثِّياب): بەرگی میلدار/ هێڵدار.

٤-(سارُ- الشَيء): پاشماوەی شتەکە/ ئەویتری شتەکە یان هەموو شتەکە.

(سائِرُ الشَيء): پاشماوەی شتەکە یان هەموو شتەکە.

(السِيَراء): ١-زێری ساغو پوخت ٢-توێکڵی بەناوکەوە نووساو ٣-پەردەی دڵ ٤-پەلی بێگەڵای دارخورما.

٥-(السيرَج) ويقال أيضاً الشيرَج) (فارسية): رۆنی کونجی.

الملحق:

سير: (التَّسيير): هێنانە بزوەی شتێك/ جووڵە پێکردنی/ جووڵاندنو بەڕێوەبردنی.

(*تسيير الآلة): کارپێکردنو هێنانەجووڵەی ئامێرەکە.

(- عِنْدَ المتكلِّمين والفلاسِفَة): لای قسەزانو فەیلەسووفەکان ئەوەیە کە مروّڤ هیچ بەدەستی خۆی نییەو هەرچی دەکات پێیدەکرێتو بەڕێوەدەبرێت.

---

سيس: (سَيِسَ. يَسْيَسُ- الطَعامُ سَيَساً): خواردنەکەو دانەوێڵەکەو ئاردەکەو هەموو خواردەمەنییەك کرم یان مێشو جانەوەری لەو بابەتەی تێدا.

(ساسَ- هُ): خەوشی لێکرتو لێدەرهێنا.

(السِيْساء): بربڕاگەی پشت.

(سِيْساءُ الظهر- مِنَ الدَّوابِ): ماستی ئەو بربڕانەی وڵاخ کە شوێنسوارییەو کە ناوەڕاستی پشتیەتی.

سيط: (سَيْطَرَ وتَسَيْطَرَ عَلَيهِم. سَيطَرَةً): دەستی بەسەردا گرتنو خستنیە ژێر ڕکێفی خۆیەوە/ دەسەڵاتی خۆیەوەو چاودێرو بەڕێوەبەری کاروبارییانبوو.

ساع: ١-(ساعَ- الشيءُ سَيْعاً وسُيُوعاً): شتەکە ونبوو/ بزربوو.

(أساعَ- الشيءَ): شتەکەی ونکرد/ بزرکرد.

٢-(ساعَ وتَسَيَّعَ- الماءُ سَيْعاً وسُيُوعاً): ئاوەکە بەملاولادا پەرشو بڵاوبووەوەو ڕۆیشت.

(إنساعَ-الماءُ): ئاوەکە پەرشو بڵاو ڕۆیشت.

(-الجامِدُ): بەستووەکە توایەوە.

(السَيْع) (مص): ئاوی بەسەر زەویدا ڕۆیشتوو/ پەرشو بڵاو بوو.

(ناقَةٌ مِسياع): مێحوشترێك بچێته لەوەرگاو بەچكەكەی جێبهێڵێت.

٣-(سَيَّعَ- الحائِطَ بالطينِ): دیوارەكەی بە قور سواغدا.

(-الشيءَ): ڕۆن یان قیرێكی تەنكی لە شتەكە هەڵسوو.

(السِّياع): قوڕ.

(المِسْيَعَة) (ب): ماڵە. تەختە یان ئاسنە ماڵەی قورەكەی پێدەدرێت. المالج= ماڵە.

٤-(السَّيعاء والسَيعاء): بەشێكی شەو.

("خرجتُ بَعد سِيْعاءٍ مِن اللَّيلِ"): پاش تێپەڕینی بەشێكی شەو ڕۆیشتم.

ساغ: (ساغَ- الشَّرابَ. سَيْغاً. يَسُوغُ سَوغاً): وای لێكرد ئاسانو خۆش قووتبچێت.

(السَيغ- مِن الشَّراب): شەرابو شەربەتی بەچێژ/ خۆشو خۆشقووت.

ساف: ١-(سافَ- هُ. سَيْفاً): شمشێری پێداكێشا.

(تَسَيَّفَ- هُ): بە شمشێر لێیدا.

(سايَفوا وتَسايَفوا): شەڕە شمشێریانكرد.

(إسْتافُوإسْتِيافاً): شەڕەشیریانكرد.

(أُسْتِيفَ- القَومُ): خوێنشكەل بەر شمشێر دران.

(السَيف (ج) أَسياف وسُيُوف وأَسْيُف ومَسْيَفَة): شیر/ شمشێر.

(السَيْف) (ح): شیرماسی ماسییەكی دەریاییە دەنووكێكی درێژی هەیە وەك شمشێرە یان وەك سونگییە.

(سَيفُ الغُراب) (ن): توخمە گوڵێكە لە جۆری سەوسەن بە زۆری لەناو كشتدا دەڕوێت لە ناوچەی دەریای ناوەڕاستو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدایە، ڕەنگەكەی سووری تێر یا بنەوشەییە ئەمڕۆ بە هۆی چاندنیەوە یەكێكە لە گوڵە پەسەندەكانی ناو باخ.

السِيْف (ح): شیرماسی.

(السائِف): شمشێر هەڵگر/ شمشێرەوان یان شمشێروەشێن.

(السَيْفن (م) سَيْفانَة- مِنَ الرجال): باڵابەرز (دەیشڵێن ئەمە تایبەتە بە ژن).

(السَيَّاف (ج) سَيَّافَة): شمشێرەوانو كەسێكە بە شمشێر شەڕبكات.

(رَجُلٌ سَيَّاف): پیاوێكی خوێنڕێژ.

(سَيافُ الأَميرِ): جەللادی میر كە لە ملی تاوانباران دەدات.

(المُسَيف): ١-شمشێرهەڵگر ٢-دلێر/ ئازا/ نەبەرد.

(المُسَيَّف- مِنَ البُرود): بەرگێك كە وێنەی شمشێری تێدابێت یان میكی پانی وەك شمشێر تێدابێت.

٢-(سافَ- تِ اليَدُ. سَيفاً): سەری پەنجەكانیو دەوری نینۆكی قڵیشایەوە.

٣-(السِيف (ج) أَسياف): ١-ڕۆخی دەریا یان

هەمـــوو ڕۆخێك/ قەراغێك ٢-ڕیشـــال كە بە بنی پەلی دارخورماوە لكابێت.
(سَیفُ الجَبَّار) (فك): سێ هەسارەن.
(اَلأَسیاف): پارتەكان.
(اَلمَســایِف): ١-ساڵانی وشــك ٢-گرانیو قاتو قری.
(أَصابَتهُم المَســایِف): تووشـــی وشكەساڵییو قاتو قرییو گرانیی بوون.
(اَلمُسیف): هەژار.
(اَلمُسَــیَّف- مِــنَ الدراهِــم): پارەیــەك كــە ئەملاكــەی نیگــاری پێوە نەمابێت/ ســادەو بێنیگار بێت.
ســیك: اَلســێكاس (ن): دارخورمای ســاگۆ ڕەگــەزە ڕووەكێكــە قــەدو گەڵاكــەی لە هی دارخورما دەچێت بەڵام دروستبوونەكەی شێوە سنەوبەرە/ كاژە لەناوچە كەمەرییەكانو خوار كەمەرییەكاندا دەڕی جۆرێكی لە باخچەكانو خانە بۆ گەرمكردووەكانــی ناوچەی دەرەوەی ناوەڕاستدا بۆ جوانیی دەڕوێنرێت.
٢-(اَلسێكان) (مو): ئاوازێكی مۆسیقایە: سیكا (فارسیە).
سال: ١-(سالَ- الماءُ سَــیْلاً وسَیَلاناً ومَسیلاً ومَسالاً): ئاوەكە ڕۆی/ كشا.
سَیَّلَ- الماءَ تَسییلاً: ئاوەكەی ڕاكێشا/ ڕەواند.
(أَسالَ- الجامِدَ): بەستووەكەی تواندەوە.
(تَسایَلَ- القَومُ): خوێشگەل لە هەر چوارلاوە لە هەموو لایەكەوە وەك لێشاو هاتن.
(اَلسَــیْل (مص) (ج) سُــیُول): لێشاو/ ئاوی زۆری بەخوڕ هاتوو/ لافاو.
("ماءٌ سَــیلٌ"): ئاوی كشــاو، ئاوی بەلێشــاو هاتوو.
(اَلسَــیْلَةُ): ١-ئاوەڕ/ شــیو ٢-جارێــك هاتنی لێشاو/ لێشاوێك.
(اَلسِیْلَة): كشانی ڕۆیشتنی ئاو.
(اَلسَــیال الواحدةُ سَــیالَة) (ن): ڕووەكێكە چقڵسپیو درێژ، ئەگەر درکەكەی دەربكێشیت ئاوێكی شیریی لێدەردەچێت.
(اَلسَــیَّال (م) سَیَّالَة): لێشــاوی بەخوڕ ئاوی خوڕ.
(مَســیلُ الماء (ج) مَســایِل ومُسُــل وأَمْسِلَة ومُسلان): ئاوەڕۆ/ ڕووبار/ زێ/ چەم/ جۆگە/ شیو.
(سائِل (ج) سوائِل): شل. شلەمەنی.
(مِنَ المَعادِن): كانزای شل نەك بەستوو ڕەق.
٢-(ســالَ- ت غُرَّةُ الفَرَسِ. سَــیلاً وسَیَلاناً ومسیلاً ومَســالاً): پەڵەی سپیی ناوچەوانی چارەوێ مارۆكە درێژو پانبوو.
(أَسالَ- غرارُ النَّصلِ): نووكی تیرەكەی تیژو درێژو سازكرد.
(الســائِلَةُ-مِنَ غُــرَر الخَیل) (ج) سَــوائِل): پەڵەی ســپیی ناوچەوانی ئەســپ كە بۆ سەر لووتی درێژ دەبێتەوە.

(اَلسَيلان (ج) سَيالِين):ئەوەی لە دەمی شمشێر یان چەقۆ کە دەچێتە کیلانو کیفەکەیەوە.

(اَلُمُسَـال- مِنَ الوَجه):ئەمـلاولای ریش کە دوولان (مُسالان).

٢-(السِيلان (ج) سَيالين):جـۆرە یاقووتێکی سوورە.

الملحق:

سـيل: (السُيُولَة):شـلێتیی/ شلبوونی شت/ شێوە ئاویی.

("سُيولَةُ الماء") شلیی ئاو.

(اَلسُـيولَةَ مَصرَفياً):پارە لێشـاو لە بانکدا، بارێکـی داراییە، کـە دامـەزراوە داراییەکە دەتوانێـت ئـەو پارانەی کـە دەبێت بیدات و لەسەریەتی، بۆ ماوەیەکی کەم یان مامناوەندی، لەو پارەیـەی کە هەیەتی جێبەجێی دەکات و دەیدات.

سیم: (اَلسِّيمائِيَّة):ئاماژەزانسی، زانستییەکە ئامانجەکەی، واتا لە مێشکی قسە بۆکەرەکەیدا بچەسپێنێت و تێیبگەیەنێت.

(اَلسِيمُونِيَّة) بەناوی سیمۆنی جادووگەرەوەیە ١-کۆششی دەستگیربوونی پلەی ئاینی وەك هی قەشـەیی بە پارە ٢-فرۆشـتن و کرینی شـتە پیرۆزەکان و ئاینییەکان بە نرخی سەردەم.

سـین: (اَلسـينَماتُوغَراف):١-ئامێرێکـە بۆ پیشـاندانی تارمایـی وێنـە/ فیلم لەسـەر پەردەیەکی سـپی ٢-سـینەماخانە کە فیلمی سینەمای تێدا پیشاندەدرێت.

(اَلسِـينَراما): ئامێرێکی سـینەمایی تازەیە ئەوەی پیشانی دەدات وەك شتێکی سروشتیی و راست دێتە بەرچاوی بینەران (یونانیە).

سـيی: (سِيَّةُ القَوسِ (ج) سِـيات):هەردوو سەری چەماوەی کەوان.

(اَلسي وسيُّها):نەخوازەڵا. بە تایبەتی.

(لاسيما):جگە لە. بێجگە لە.

الملحق:

سین: (السِّينَمائِي):سـینەمایی/ تایبەت بە سینەما.

(اَلفَن السينَمائِي):هونەری سینەمایی.

(اَلسينَمائِي):ئەوانەن کە لە هونەری سینەکاو فیلم و هەموو شتێکی سینەمادا کاردەکەن.

---

سيي: (سِيَّةُ القَوسِ (ج) سِيات):دوو سەری کەوان کە چەماوەتەوە.

السِيّ:هاوتا/ وەکیەك.

(سِيَّما):نەخوازەڵا.




ش: (اَلشـــين): شـــين پيتى ســـيازدەهەمينى ئەلفوبێى عەرەبییە لە ژمێرەی کۆی پیتەکاندا (٣٠٠)ە و لەو پیتانەیە کە بە هەناســەی دەم دەوترێت.

شأب: (اَلشُؤبُوب (ج) شَآبيب): ١-تاومبارانێکی قایم ٢-تینی گەرمای خۆر ٣-لێوی تیژی هەموو شتێك ٤-توندیی گوڕبەستنەوەی هەموو شتێك ٥-سەرەتای خۆنەخشاندنو جوانبوون.

("هُوَ حَسَــنُ شَآبيب الوَجهِ"): ئەو هەرەتیو سەرەتای جوانبوونو خۆنەخشاندنیەتی.

شأز: (شَــئِزَ- المَكانُ.شَأزاً وشُــؤْزَةً وشُؤَازاً): شوێنەکە سەختو بەرزو نارەحەت.

(اَشْــأَزَ- الرَجُلُ عَن كذا): خۆی لەوە بەرزتر گرت.

(خَيلٌ شَأْزَةٌ): ئەسپێکی قەڵەو.

٢-(شَئِزَ. شُئِزَ. شَأزاً و شُؤْزَةً وشُؤَزاً): شپرزەو دڵخوردبوو، تۆقی.

(اَشْأَزَ- هُ): شپرزەو دڵخوردیکردو تۆقاندی.

(اِشْتَأَزَ): وەڕسبوو و ڕەویکرد.

(اَلشَأْزَةُ): جارێك دڵخوردو تۆقین.

(اَلَمشــؤُوز والمشُــوز): دڵخوردێکی شــپرزەو تۆقیو.

شئس: (شَــئِسَ- الشَــيءُ. شَأَســاً): شتەکە ڕەقبوو.

(-الرَجُــلُ): شــپرزەو دڵخوردی پــەژارە یان نەخۆشیبوو.

(-المَكانُ): شوێنەکە ڕەقو پتەو بوو.

(مَكانٌ شَــئِسٌ وشَــأْسٌ (ج) شَئس وشُؤُس): شوێنێکی ڕەقو زبر.

شــأش: (شَأْشَأَ- الراعي الغَنَم أَو الحَميرَ وبها شَأْشَــأَةً وشَأْشــاءً): شــوانەکە دەنگی لە ڕانە مەڕەکە یان کەرگەلەکە کردو لێیخوڕین.

(شَأْشَأْ وشُؤْشُؤْ): دەنگی لێخوڕینو مەڕو وڵاغ بە کوردی بۆ مەڕو بزن دەڵێن: کســە، پخخە

یان کس ویخ بۆ ولاخ دەڵێن: هەچە.
(-تِ النَخْلَـةُ): دارخورماکـە هەڵاڵەکـەی وەرنەگرت.
(-القَومُ): خوێشکەل بڵاوبوونەوە.
(-أمْرُهُم): کارەکە یان خۆش‌و ئاسانبوو.
(الشَأشـاء) (مص): ١-خورمایەکی خراپ کە ناوکـی ڕەقنابێـت ٢-(ن) دارخورمـای بڵند/ درێژ.
شـئف: ١-(شَـئِفَ- أصابِعُهُ شَـأفاً): سەری پەنجەکانی‌و دەوری نینۆکی قڵیشا.
٢-(شَـئِفَ-تِ الرجـلُ. شَـأفاً): قاچەکـەی دوومەڵی لێهات.
(مَشؤُوفَة): قاچی دوومەڵ لێهاتوو.
(شُئِفَ- تِ الرجلُ): دوومەڵی لێهات.
(إسْتَشْأَفَ- تِ القُرحَةُ): دوومەڵەکە پیسبوو گەورە بوو بنیکرد.
(شَـأْفُ الجِـرحِ): پیسـبوون‌و گەورەبوون‌و پڕبوونی برینەکە لە کێم‌و زووخ.
(الشَـأْفَةُ): ١-بیخ/ بن/ ڕیشە ٢-دوومەڵی بنی پێ.
("إسْـتَأْصَلَ شَـأْفَتَهُ"): لـە ڕەگ‌و ڕیشـەی دەرهێنا.
("بَينَهُم شَـأْفَةٌ"): دوژمنایەتیان لە نێواندا هەیە.
("إسْـتَأصَلَ اللهُ شَـأفَتَهُم"): خـودا دەسـتی زۆرداری‌و دوژمنایەتی‌و ئازاری بڕین.

(شَـأْفَةُ الرَجُـلِ): خێزان‌و سـەرو سـامانی کابرا.
(رَجُلٌ شَـأْفَةٌ): پیاوێکی دەسـەڵاتداری زەبر بەدەست‌و بەرێزو خانەدان.
٣-(شَئِفَ- فُلاناً ولِفُلانٍ. شَأْفاً وشَآفَةً): ڕقی لە فیسار بووەوە/ حەزی لە چارەی نەکرد.
٤-(شُئِفَ): زارەترەکبوو/ تۆقی.
(مَشْؤُوف): زارەترەکبووی تۆقیو.
شأم: (شَأَمَ- القَومَ وعَلَيهِم. شَأْماً): بەدوومی بەسەردا هێنان.
(شائِم): بەدووم/ شووم.
(شَؤُمَ وشُـئِمَ عَلَيهِم. شَآمَةً): بۆیان بەدووم بوو/ شوومبوو.
(تَشاءَمَ واسْتَشْـأَمَ – بِهِ): بە بەدوومی داناو ڕەشبینی لێکرد.
(الشُؤْم): ١-بەدوومیی/ ناپیرۆزیی‌و چارەڕەشیی ٢-ڕەشبینی ٣-بەدفەڕیی ٤-حوشتری ڕەش.
(الشائِم) (فا): بەدووم/ بەدهێن/ چارەڕەش/ شووم.
(الأَشْأَم (م) شُؤْمى): بەدوومتر/ چارەڕەشتر/ بەدفەڕتر/ شوومتر.
("اَشْـأَمُ كُلِ امرِئٍ بَينَ لِحيَيهِ"): بەدفەڕیی هەموو کەسێك بە زمانییەوەیەتی.
(المَشْـأَمَةُ= الشُـؤْم): بەدوومـی بەدفەڕیی/ چارەڕەشیی/ بەدبەختیی.
(المَشـوم والمَشؤوم (ج) مَشائِيم): چارەڕەش/

بەدفەر/ شووم/ بەدووم.
(مَیشوم (عامیة) = مَشؤوم): چارەرەش.
٢-(شاءَمَ-بِهِ. مُشاءَمَةً): تووشی بەدوومیکرد/ تووشی رەشبینیکرد.
(تَشاءَمَ وتَشَأَّمَ): رەشبینبوو.
(اَلشُأمَة): رەشبینی/ لای چەپ/ ناپیرۆزی.
(اَلشُؤمی): ناپیرۆزیی/ رەشبینی/ لای چەپیی.
(اَلأَشائِم جمع أَشْأَم): چەپەکان/ ناپیرۆزەکان.
(اَلمَشْأَمَة): چەپەکیی/ لای چەپ.
٣-(شَأمَهُم): بەرەو شام بردنی.
(شاءَمَ الرَجُلُ. مُشاءَمَةً): پیاوەکە هاتە شام.
(أَشْأَمَ): روویکردە شام یان هاتە شام.
(تَشـــاءَمَ وتَشَــأَّمَ): ١-بــوو بە شــامیی ٢-لای شامیگرت.
(اَلشام والشَأم): ولاتی سووریە.
(الشاميّ و الشآمي والشآمِيّ): شامیی/ خەڵکی شام.
٤-(شَــأَمَ-هُ (في اصطــلاح العامــة): بە پێی دەربڕەی خەڵکە رەشۆکییەکە: پایەو بایەخی خۆی دایە.
(أَشْأَمَ): بەسەربەرزییەوە تێپەری.
(اَلشــیمَة الشِــئْمَة (ج) شِــیَم): ١-رەوشــت ٢-رەفتار ٣-سروشت ٤-نەریت/ خوو.
(اَلشِــئْمَة- عنــد العامــة): لــە لای خەڵکە رەشۆکییەکە: مەردایەتی/ سەربەرزیی.
("فُلان صاحِبُ شِئمَة أَو بِلاشِئْمَة"): فیسار سـەربەرزو مەردە. یان فیسـار دەروونـنزمو نامەردە.
شــأن: (شَــأَنَ. شَــأْناً): کاروباریبوو، خاوەن پێداویستو پلەوپایە بوو.
("شَأَنَ شَأْنُكَ"): نیازی لای تۆیبوو.
("ماشَأَنَ شَــأْنَكَ"): بە تەنگ کاروباری تۆوە نەبوو، نەهات.
("إِشْأَن شَــأْنَكَ"): بەتەنگ کاروباری خۆتەوە بێ.
(إِشْتَأَنَ شَأْنَكَ): نیازی ئەو نیازەکەی تۆ بوو.
(اَلشَأْن (ج) شُؤُون وشِئان وشِئين): ١-کاروبارو رەوشــی گرنگ ٢-کارو رەوش بە شــێوەیەکی گشتیی.
("ماشَأْنُكَ"): رەوتی کاروبارت چۆنە.
("مِن شَأْنِهِ كذا أَو أَن يَفعَلَ كذا"): سروشتی، خواســتی، نەریتیو رەفتاری وەهایە/ خووی بەوەوە گرتووە.
(اَلشَــأْن (ج) شئُون وشُــؤُون) (ع ا): شوێنی بەیەکگەیشتنی ئێسکەکانی کاسەی سەر.
("بَلَغَتِ الرائِحَةُ إِلی شُــؤُونِ رَأسِــهِ"): بۆنەکە گەیشتە کاسەی سەری.
(اَلشَــأن): دەمارە گڵێکە لە کێودا کە خورمای لەســەر دەروێتو ریشــەکەی پێــدا دەچێتە خوارەوە.
(اَلشَأن) (ع ا): دەمارە فرمێسک کە فرمێسکی پێدا دەرواتو دێتە خوارەوە.

("فاضت شُؤونُهُ")؛ دەماری فرمێسکی چاوی پڕبوو، سەریکرد/ چاوی پڕبوو لە ئاو.

(اَلشُؤُون)؛ پێداویستیی‌و کاروبارەکان.

(كَلِّفني شُــؤُونَكَ)؛ پێداویستییەکانی خۆتم پێبڵێ‌و پێبسپێرە.

(شــؤُون الخَمر)؛ کارکردنــی مەی لە دەمارو لەشدا.

شأى: ١-(شَــأَى يَشؤُو- القَومَ. شَــأواً)؛ پێش خوێشگەلکەوت.

(شــاءَى- القَومَ؛ مُشَــاءاةً)؛ ١-پێشــیانکەوت ٢-کەوتە بەریانەوە.

(تَشاءَى- القَومُ. تَشائِياً)؛ ١-پێشکەوتنیانکرد ٢-بڵاوبوونەوە.

(-مابَينَهُما)؛ لەیەك دووركەوتنەوە.

(إشتَأَى- القَومَ. إشتِئاءً)؛ پێش خوێشگەلکەوت.

١-(اَلشَأو) (مص)؛ ١-مەودا ٢-ماوە.

("عدا شَأواً")؛ ماوەیەك بێپشوو ڕایکرد ٣-بە ئامانج‌و مەبەست.

("فُــلان بَعيــدُ الشَــأوِ")؛ بــاڵا مەبەســت‌و ئامانجــە/ بــە هەڵپــەو چابوك بە پشــووە ٢-ڕەشمەی مێحوشتر.

٢-(شَأَى. يَشْــؤُو- التُرابَ مِنَ البِئر شَأواً) و (اشــتأى- التربَ مِنَ البِئر اشتئاءً)؛ گڵی ناو چاڵاوەکەی هەڵکەندو دەردا.

(اَلشَأو)؛ ١-ئەو گڵەی لە چاڵاوەکە دەردەدرێت ٢-پشقلی حوشــتر (بە گڵی ناوبیر چوێنراوە) ٢-زەمیلە/ سەبەتەی گەڵای خورما.

(اَلمِشآة (ج) اَلمَشائي)؛ ١-گڵی دەردراوی چاڵاو/ بیر ٢-زەمیلە/ سەبەتە.

شــبّ: ١-(شَــبَّ- الغُلامُ شَــباباً وشَــبيبَةً): مێردمنداڵەکە پێگەیشت‌و بوو بە هەرزەکار/ لاو/ گەنج.

("مِن شَــبَّ إلى دَبَّ")؛ لــە گەنجێتییەوە بۆ پیریی‌و گۆچان بە دەستەوە.

("فَعَلْــتُ ذلــك مِــن شُــبَّ إلى دُبَّ")؛ ئەوە پیشەمبووە هەر لە لاوییەوە تا پیری‌و گۆچان بەدەستەوە.

(شَيَّبَ)؛ یادی هەرزەکاریی‌و یاری‌و ڕابواردن‌و دڵداریی کردەوە.

(أشَبَّ- الغُلامُ)؛ مێردمنداڵەکە گەورەبوو بوو بە لاو.

(-الرَجُــلُ)؛ کوڕەکانــی بــوون بــە لاوو پێگەیشتن.

(-الثَــورُ)؛ هەمــوو دانەکانــی گاکــە ڕوواو دەرهات.

(مُشِبّ ومُشَبّ وشَبَب ومِشَبّ)؛ گای دان تەواو دەرهاتوو.

(أشَبَّ- اللهُ الغُلامَ)؛ خودا کوڕەکەی پێگەیاندو هەرزەکاریکرد.

(-اللهُ قَرْنَهُ)؛ خودا تەمەنی درێژکرد.

("لا أشَبَّ اللهُ قَرنَهُ")؛ خودا نە بیکاتە گەنج‌و نە تەمەنی درێژ بکات.

(تَشَبَّبَ): یادی ڕۆژانی گەنجێتیی و ڕابواردن و کوڕێتی و دڵداریی خۆیکرد.

(اَلشَّب (ج) شَباب وشُبّان وشَبَبَة شَبَّة (ج شَبّات وشَوّاب وشَبائِب): گەنج/ لاو/ هەرزەکار.

(شَبُّ اللَّیلِ) (ن): شەوبۆ. گوڵێکی جوانە لە ئەمەریکای کەمەرییەوە بڵاوبۆتەوە گوڵەکانی پێش ئاوابوونی خۆرو دوای ئاوابوونی دەکرێنەوە.

(اَلشّاب (ج) شَباب وشُبّان وشَبَبَة (م) شابَّة (ج) شابّات وشَوابّ وشَبائِب): گەنج/ هەرزەکار/ لاو.

(اَلشَّباب (مص) والشَّبیبَة (مص) وجمع شَبیبَة شَبائِب): ١-هەرزەکار/ لاو/ گەنج لە تەمەنی باڵقییەوە تا نزیکەی تەمەنی سی ساڵیی ٢-سەرەتای هەموو شتێك وەکو.شَبابُ النَّهار: سەرەتای ڕۆژ.

٢-(شَبَّ- الفَرَسُ. شَبیباً و شِباباً وشُبُوباً): ١-چارەوێکە چابوك و چالاکبوو یان مانگرو چەموشبوو ٢-هەردوو دەستی بەرزکردەوە.

(اَشَبَّ- الفَرَسَ): چارەوێکەی وروژاند.

(اَلشَّبوب): ئەسپێك قاچی لە دەستی تێبپەڕێت.

٣-(شَبَّ- النّارَ. شَبّاً وشُبُوباً): ئاگرەکەی کردەوە/ هەڵیگیرساند.

(شَبَّ-تِ النّارُ): ئاگرکەوتەوە/ هەڵگیرساو بەرزبووەوە/ پەرەیسەند.

(-الشَّیءُ): شتەکە زۆر کراو گەشەی پێسەندرا.

(شُبَّ-تِ النارُ): ئاگرەکە کرایەوەو خۆشکرا.

(شَبَّبَ- قَصیدَتَهُ): هەڵبەستەکەی بەدەرخستنی جوانیی ئافرەت و پێداهەڵدانی ڕازاندیەوەو جوانیکرد (لە بنەڕەتدا لە گڕگرتنی ئاگرەوە هاتووە).

("شَبَّبَ قَصیدَتَهُ بِفُلانَة"): هەڵبەستەکەی بە جوانیی و شۆخی و ناوهێنانی ئەو ژنە ڕازاندنەوە (ئەریت وایە کە ڕازاندنەوەو هەڵدان لە سەرەتای هەڵبەستی پێداهەڵداندا بێت پاشان واکرا کە هەموو کارێك سەرەتاکەی گەرموگوڕ بێت ئەگەرچی بۆ پێداهەڵدانی جوان و دڵداریش نەبێت).

(شَبَّبَ- الشاعِرُ بالفَتاةِ): شاعیرەکە گڕی دەروونی بۆ کچە دڵدارەکەی دەربڕی و بە جوانیی و شۆخیەکەیدا هەڵیدا.

(اَلشَّباب= اَلتَّشبیب): بە یاردا هەڵدان و باسی شۆخیی و جوانیکردنی و دەربڕینی تاسەو حەز.

("قَصیدَةٌ حَسَنَةُ الشَّباب"): هەڵبەستێکی پڕ تاسەو حەزو بە یاردا هەڵدان و گەرموگوڕ.

(اَلشَّبُوب): جوانکارو ڕازێنەوەی شت.

("هذا شَبوبٌ لِکَذا"): ئەمە ئەوە باشتر دەنوێنێت و بەهێزتریدەکات.

("الخِمارُ شَبُوبٌ لِوَجهِها"): ڕووپۆشەکە ڕووی جوانتر دەنوێنێت.
(الشِــباب): چاوگی ئاگر/ ئــەوەی کە ئاگری پێدەکرێتەوە.
(المَشبــوب – مِــنَ الرجال): پیــاوی مەردو وشیارو دلێر.
(نارٌ مَشــبوبَة): ئاگرێکی بە شەوق/ خۆش. ناوتریێت (نارٌ شابَة).
٤-(شُبَّ- لَهُ الشيءُ): شتەکەی بۆ ڕێکەوت یان خودا بۆی سازاند.
(أشِبَّ- لَهُ كذا): ئەوەی بۆ ڕێکەوت/ بۆ سازا/ بۆ بوو.
٥-(شَــبَّبَ- الكِتابَ): دەستی بە نووسین یان خوێندنەوەی کتێبەکە کرد.
٦-(الشَــبّ) (ك): زاخ. خوێیەکــی کانزاییە. تفتە ڕەنگی سپییە هەیشە شینە وەکو زاج.
(الشَبّابَة) (مو): جۆرە بلوێرێکە/ جووزەلەیە. خەڵکــە ڕەشــۆکەکە پێیدەڵێــن (مِنْجَيْرَة)
(المِشَبّ) (ح): شێر.
شــبت. (الشِــبْت أو الشِــبِت) (ن): شــویت. پێشیدەڵێن (رُز الدجاج)).
شبث: (شَبِثَ- بِكذا. شَبَثاً): خۆی پێداهەڵواسی/ تێوەئاڵاند/ پێدالکا/ چنگی لێگیرکرد.
(تَشَبَّثَ-بِكذا): خۆی بەوەدا هەڵواسی چنگی لەوە گیرکرد/ خۆی لەوەوە ئاڵاند.
(الشَبَث (ج) أشباث وشِبْثان) (ح): ١-جاڵجاڵۆکە
٢-(ح)مۆریچــەی نــاو زەوییــە لــە هەزارپــێ دەچێت.
(رَجُلٌ شَبِثٌ): پیاوێکی داوێنگیرەو خۆهەڵواسە.
(رَجُــلٌ شُــبُّثَةٌ): پیاوێکــە هەمیشــە بــە هاورێکەیەوە بەندەو لێیجودا نابێتەوە.
(الشَّباث والشُّــبُوث (ج) الشَّبابيث): زمانەی گڕی ئاگر.
شبح: ١-(شَبَحَ- الجِلدَ. شَبْحاً): پێستەکەی لە نێوان گەلێك سنگەوە ڕاکێشاو درێژکرد.
(-الرَجُــلَ): ١-پیاوەکــەی بــۆ قامچیــکاری درێژکــرد/ ڕاکێشــا ٢-وەك لــە قەنــارەدراو پاڵیخست/ ڕایکێشا.
(-الداعي): نزاکارەکە دەستی بۆ نزاو پارانەوە درێژکرد.
(شَبُحَ. شَباحَةً): باڵی درێژ یان پانبوو.
(شَبَّحَ- الشيءَ): شتەکەی پانکرد.
(تَشَبَّحَ- الحِرباءُ على العُودِ): خۆرپەرستەکە (کــورد وا بــەم زینــدەوەرە دەڵێت) لەســەر چێوەکە خۆی درێژکرد.
(الشَبْح والشَبَح (ج) شبوح وأشباح): ١-دەرگای خانــەی بڵند ٢-تارمایی شــت لە دوورەوە یان سێبەر یان خێو.
(الشَــبْحَةُ): کۆت و زنجیرێکــە پێی چارەوێی پێدەبەسترێتەوە.
(الشَبْحان): پیاوی درێژ.
(الشَبَحان): دوو تێلای/ داری پێکوێزەرەوە.

٢-(شَــبَحَ- الشيءَ. شَبْحاً): شــتەكەی پەكاڵا كردەوە.
(شَــبَّحَ- الشَــيءَ): توێكڵــی شــتەكەیگرت/ شتەكەی پاككرد.
(اَلشَبْحَةُ): جارێك داماڵین/ پاككردن.
("نَزَعَ سَقْفَ بَيتي شَبْحَةً شَبْحَةً"): بنمیچی خانووەكەمــی دار لــە دوای دار دەرهێنــاو رووتیكرد.
٣-(شَــبَحَ- فُلانٌ شَبْحاً): فیســار دەركەوتو دیاربوو/ ئامادەبوو.
(شَــبَّحَ): پیربوو لەبەر كزیی چاوی شــتكەی وەك تارمایــی دەبینــیو بــە دوان دەهاتــە بەرچاوی.
(اَلشَبْح والشَبَح (ج) شُبُوح وأَشْباح): ١-كەس/ زەلام، تارمایی/ خێو/ سێبەر.
(أَشْــباحُ المال): تارمایــی ماڵیاتو كە بە چاو دەبینرێت. مەڕو حوشترو بزنو هتد.
(اَلصُوَرُ المُشَــبَّحَة): تارمایــی وێنەكان كە لە سینەمادا دەبینرێن.
شــبد: (اَلشِــبْدِع والشَبْدَع والشِــبْدِعَة (ج) شَــبادِع) (ح): ١-دووپشــك ٢-وەی/ چورتوم/ ئاپۆرە.
شبر: (شَبَرَ- الثَوبَ ونَحْوَهُ): بە بست جلەكەی یان شتیتری پێوا.
(شَبَّرَ- الشيءَ): ئەندازەی شتەكەیگرت.
(أَشْــبَرَ- الرَجُلُ) (ضد): پیاوەكە ١-وەچەی درێژی بوو ٢-وەچەی كورتی بوو.
(تَشَابَرَ- الفَريقان في الحَربِ): دوو دەستە دژ بەیەكەكە لە جەنگدا وا لە یەك نزیكبوونەوە وەك بستێكیان لە نێواندا بێت.
(اَلشَبْر): ١-بەژنو باڵا ٢-تەمەن.
(اَلشِــبر (ج) أَشْــبار): ١-بســت. نێوان پەنجە گەورەو پەنجە تووتە بەكراوەییان.
("هُــوَ قَصــيرُ الشِــبرِ"): ئــەو كورتەبنگاوە ٢-تەمەن كورتە.
(اَلشَبْرَةُ): بەژن/ باڵا بۆ كورتیش دەبێتو بۆ درێژیش دەبێت.
("فُلان أَشْــبَرُ مِنكَ"): ئــەو هەنگاوی لە تۆ درێژترە یان لە تۆ بە تەمەنترە.
٢-(شَــبَرَ- هُ مالاً. شَبْراً): ماڵی (پێبەخشی/ پێدا).
(أَشْــبَرَ- هُ مالاً): داراو ســامانی (پێبەخشی/ پێدا).
(اَلشَبْر) (مص): مارەیی.
("تَزَوَّجَها ولــم يُعطِها شَــبْراً"): بێمارەیی ژنەكەی هێناو مارەیكرد.
(اَلشَبْر): ژنهێنان/ هاوسەرگرتن/ مارەكردن.
(اَلشَــبَر): ١-بەخشــش ٢-قــەر/ خێــرو بێر ٣-ئینجیل ٤-قوربانیی.
(اَلشِبْرَةُ): بەخشش.
(مَشْبَر ومَشْبَرَة (ج) مَشابِر): ڕووباری قووڵ كە ناوی ئەملاولای تێدەرژێت.

٣-(شَبِرَ- الرَجُلُ. شَــبَراً): كابرا كەيفخۆش بوو كەوتە گۆرانیو هەلەكەسەما.
٤-(شَــبَّرَ- فُلاناً): فیســاری بە گەورە گرت/ مەزنیگرت.
(أَشْبَرَ- فُلاناً): فیساری لە پێشتر گرت.
(تَشَبَّرَ): مەزنبوو.
("شَــبَّرَهُ فَتَشَــبَّرَ"): بــە گەورەیگــرتو مەزنبوو.
٥-(اَلشَبور (ج) شَبابیر وشَبُورات) (عبرانیة): شەیپوور یان كەرەنا.
(الأَشْبُور) (ح): جۆرە ماسییەكە.
٦-(شَــبْرَقَ- هُ): شــڕو وڕیكــرد/ دڕانــدی/ لەتوپەتیكرد.
(-اللَّحْمَ): گۆشتەكەی لەتوكوتكرد.
(-البــازي الصَیْــدَ): بازەكــە نێچیرەكــەی ونجڕونجڕ كرد.
("شَــبْرَقَ الموســی علی الجِلْــدِ") (عامیة): دەمــی گوێزانەكــەی بە پێســتەكەدا هێنا تا تیژیی دەمەكەی دابمركێنێت.
(اَلشبارِق والشُبارِق): كوت/ پارچە.
(ثَوبٌ شَــبارِق شُبارِق وشَــبارِق وشَباریق وشَــبْرَق): بەرگێكــی شــیتر شــیتر بــوو/ لەتوپەتبوو/ دادڕدادڕ بوو.
(اَلشِبْراق- مِن كُلِّ شَــيءٍ): توندو سەختیی هەموو شتێك.
(ثَوبٌ شِبراق): بەرگێكی لەتوپەتبووی دڕاو.
(اَلشِبْرَقَةُ): پارچەیەكی جلەكە.
٧-(شَبْرَقَ-تِ الدابَّةُ في مَشیها): وڵاخەكە لە ڕۆیشتنیدا هەنگاوی گەورەینا/ بلاوپێیدانا.
٨-(اَلشِــبْرِق (ج) شَــبارِق) (ح): بەچكــە پشیلە.
شبص: (تَشَــبَّصَ- الشَجَرُ): پەلی درەختەكە (لەیەكئالا/ بەیەكداچوو).
اَلشَبَص: ١-لەیەكئالانی/ بەیەكداچوونی دڕكی درەخت ٢-زبریی.
شبط: (شُباط) (سریانیة): مانگی ڕەشەمێ. یەكێكە لە مانگــە خۆرییەكان یان (٢٨) ڕۆژە یان (٢٩) كە ئەمەیان بە چوار ســاڵ جارێكەو لە ساڵی (كَبیسَة)دا ساڵی پڕدا دەبێت.
(اَلشُّــبُوط والشَبُّوط والشَبُوط) (ح): سوورە ماســی. ماسیی ناو ڕووبارە ســەری بچووكو ناوەڕاستی پان دەبێت.
شــبع: ١-(شَبِعَ-مِنَ الطَّعام. شَــبْعاً وشِبَعاً): تێر خواردنبوو.
("شَــبِعْتُ مِن هذا الأَمرِ وروِیتُ"): بەرِقەوە دەوترێت: تیرم، لەم كاروبارە خوارد. بەسمە.
(شَــبِّعَ-ت غَنَمُــهُ): مەڕەكانــی خەریكــی تێرخواردن بوون بەڵام تێر نەبوون.
(أَشْبَعَ-هُ): تێر تێریكرد/ مریكرد.
(-الثَّــوبَ مِنَ الصَّبــغِ): بەرگەكــەی تەواو ڕەنگكرد.
(تَشَــبَّعَ): ١-وایدەرخست كە تێر بووە كەچی

تێریش نەبووبوو ٢-زۆریخوارد.

(ألَشِبع والشِبَع): خواردنێك كە تێربكات.

(ألَشُـباعَة): خواردنێك پاش تێربوون لەبەر بمێنێتەوە/ پاشماوەی خواردن.

(ألَشُـبْعَةُ): خواردنێـك جارێـك تێرتبكات/ ژەمە خواردنێك/ تێرەخۆرەیەك.

(ألَشَبْعَةُ= الشَبْعانَة): تێری.

(ألَشَـبْعان (م) شَبْعی وشَـبْعانَة (ج) شِباع وشَباعی): تێر/ تێرخواردوو/ مەری خواردن.

(هي شبعى الذِراع): ئەو ئافرەتە قۆڵئەستوورە.

(شَبعى الخلخالِ أو سوارِ أو الدرعِ): لەشی پڕ بە پڕی پاوانەیە یان بازنە یان زرێکەیە. واتا زۆر قەڵەوەو گۆشتنە.

٢-(شَبُعَ- عَقْلُهُ. شَباعَةً): مێشكی پڕە/ ژیرو زیرەكە.

(أشْبَعَ- الشيءَ): شتەكەی زۆرو مشەكرد.

(-الكَلامَ): ئاخاوتنەكەی پاراوو دوون تۆكمەكرد.

(ألَشِبْع (ج) شُبُع): پڕ/ تێر/ زۆر.

("ثَـوبٌ شَـبيعُ الغَزلِ"): بەرگێکـە پرتاڵە/ سفتە/ تاڵی زۆرە.

("رَجُلٌ شَبيعُ العَقلِ"): پیاوێكە مێشكی پڕە/ زۆر ژیرە.

(حَبلٌ شَبيعٌ): گوریسێكی/ پەتێكی تێرخوریيە/ تێرمووە.

الملحق:

شبع: (ألإشباع): ١-تێرخواردن ٢-تێربوون.

("إشْـباعُ الجائِعِ): تێربوونی یان تێركردنی برسییەك.

(ألإشْـباع): تێـر رەنگبوون/ رەنگـی تەواو گرتن.

(إشْباعُ الثَوب): تەواو رەنگكردنی بەرگ.

(ألإشـباع= الإرْضاء والتَلبِيَـة): قایلكردن‌و تێركردنی حەزو خواست.

(إشـباع الفُضُـول والرَغَبـات): تێركردن‌و مرانی حەزی زانین‌و خواست‌و ئارەزوو.

(ألإشـباع) (ك): لـەش لەو ئاوێتـەو مادانە تێربكرێت كە پێویستیەتی.

(-في القَـوافي): لەسـەرەوادا بـزوەی پیـت كـە لـە نێـوان ئەلفـە رەسـەنەكەداو پیتە بەدواداهاتووەكەدایــە وەك ژێـری وشـەی (قاتِل) ٢-لای زماننناسەكان گێرانی بزوێنە تا دەبێت بەپیت وەك ژێری دراهِم: كە دەبێتە (دراهیم).

---

شبق: (شَبِقَ. شَبَقاً): كرمنبوو ئارەزووەكەی لـە ئەندازەبـەدەر بـوو/ حەشـەریبوو/ بەئالۆشبوو.

(شَـبِق (م) شَبِقَة): حەشـەری‌و كرمن/ بە ئالۆش‌و خەستە ئارەزووی سێكس.

(شَـبِقَ- مِـنَ اللَّحْـم): تڵخەیكـرد هێنـدە گۆشتیخوارد لێیوەرس بوو.

("شَبَقَ-هُ بالعَصا") (عامية): تێر داركاریكرد.

(شابُوقَة) (عامية): داری داركاری (سريانية).

أَلشُوْبَق) (ج): شَـوابِق (فارسية): تەختەی هەڵشـێلانو تێکەڵدانی هەویر (شَـوبَك) ی پێدەڵێن.

شــبك: (شَـبَكَ-تِ الأُمورُ شَـبْكاً): کارەکە بەیەکداچوو/ ئاڵۆز بوو/ تێکەڵوپێکەڵبوو.

(-الشَيءَ): شـتەکەی لە یەك ئاڵاندو لەیەکی گیرکرد.

("شَـبَكْتُ أَصابِعـي بَعضَها في بَعـض"): پەنجەکانم بەیەکدا کرد/ لەیەکئاڵاند.

(شَبَّكَ- الشَيءَ): شتەکەی لەیەکئاڵاند.

(شـابَكَ بَينَ الأَصابِع): پەنجەکانی بەیەکدا کرد/ لەیەکئاڵاند.

(أَشْـبَكَ- القَومُ): خوێشـکەل تۆڕە چاڵاویان هەڵکەند، چاڵاوی نزیك نزیك.

(-المَكانُ): لە شوێنەکەدا خەڵکی بیری ئاوداری زۆریان هەڵکەند.

(تَشَبَّكَ): بەیەکداچوو/ تێکەڵبوو.

(-الـكَلامُ والأُمـورُ): قسـەکە یـان کارەکان نادیار بوون/ سـەرو دەریان ونبوو/ سـەریان لێدەرنەدەچوو/ ئاڵۆز بوون.

("تَشَبَّكَ فُلان") (عامية): فیسار لە سەرماندا هەڵدەلەرزی.

(تَشـابَكَ- تِ الأُمور): کارەکان ئاڵۆز بوونو بەیەکدا چوونو سەرودەریان دیارنەما.

(إِشْتَبَكَ= تَشَبَّكَ): بەیەکداچوو/ جنگی دایە یەك/ تێکچڕا.

(أَلشَبَكَةُ (ج) شَبَك وشِباك وشَبَكات): ١-تۆڕی ڕاوکردنی ماسـی ٢-داوی ڕاوکردنی سەرزەوی ٣-زەوییەك کە چـاڵاوی زۆربێت ٤-چاڵاو/ بیر ئەگەر لە یەکەوە نزیکبن و زۆریشبن.

(أَلشـبْكَةُ): خزمایەتـی/ خوێشـایەتی/ کەسایەتیی.

("بَينَهُما شُـبكَةٌ"): خزمایەتیـان لە نێواندا هەیە.

(طَريـقٌ شـابِك (ج) شَـوابِك): ڕێگـەی بەیەکداچوو و ئاڵۆز.

(أَلشَبَّاك): تۆڕچن/ تۆڕدروستکەر.

(أَلشُبَّاك ج)( شَـبابيك): ١-(ب) پەنجەرە ٢-هەموو جـۆرە پەنجەرەیەكو کلاوڕۆژنەیەك ٣-تـۆڕو داوی ڕاوکـەر ٤-ڕاوکەری ماسـی یان هیتر ٥-سەرقاپێکی تۆڕینی مەسینە.

(أَلشَبائِك): دوژمنکاریی.

(أَلمُشَبَّك) (ط): جۆرە حەڵوایەکە لە هەویرو شەکر دروستدەکرێت.

٢-(شَـبَكَ- هُ عَنهُ. شَـبْكاً): لێیبێئاگا کرد/ خەریکیکـردو هۆشـی لەسـەر ئـەو شـتە نەهێشت.

الملحق:

شـبك: (أَلشَـبَّاكة): جنگە تـەل، ئامێرێکە کاغـەزەکان کوندەکاتو پاش تێهەڵکێشـانی تەلێك بەسەر کاغەزەکاندا دەنوشتێنێتەوە.

(أَلشَـبَكِيَّة- في التَشـريح): تۆڕی بینینی لە

چــاودا، پەردەیەکی دەمــاری بینینە کە بنی چــاوی داپۆشــیوەو ئەوەیە کە ئەو شــتانەی بەرچاو دەکەوێت وەریدەگرێت‌و دەبینرێت.

(اَلإشتِباك): بەیەکداچوونی شت.

(إشــتِباك أسِــلاك حَديديَّة): لە یەکئالآن‌و بەیەکداچوونی تەلی ئاسنین.

(اَلإشتِباك): شەڕە جنك/ جنك لەیەکگرتن‌و بەگژیەکداچوون.

(إشتِباك مُسَلَّح): بەچەك بە گژ یەکداچوون‌و لەگەڵیەك جەنگین.

(عَــدَم الإشــتِباك فِي القتــال): نەچوونــە جەنگەوە.

---

شبل: (شَبَلَ- الغُلامُ شُبولاً): کوڕەکە بە نازو بوون گەشــەیکردو پێگەیشــت/ بە نازداریی گەورە بوو.

(شــابِل): کوڕی پێگەیشــتووی نــازو بوون/ نازدار.

(-فِي بَنــي فُــلان): لەنــاو فیســار بــەرەدا پێگەیشت.

(أشــبَلَ- عَلَيــهِ): ســۆزی لەگەڵــدا نواندو یارمەتیدا.

(-تِ المَــرأَةُ على أولادهــا): بێوەژنەکە پاش مردنــی مێردەکــەی بەســەر منداڵەکانیەوە دانیشت‌و شــووینەکردەوە/ بێوەژنکۆشیکردو نازیدانێ.

٢-(شَبَلَ- بِالخِیاطَةِ) (سریانیة) (فِي اصطلاح العامة): بە پێی قســەی خەڵکەکە شــتەکەی درشت دروو.

٣-(اَلشِبل (ج) أَشبال وشِبال وأَشْبُل وشُبُول (ح): بەچکەشــێرێك کــە فێــری ڕاوکــردن بووبێت.

(أبوالأشبال) (ج): شێر.

(لَبُــوَة مُشــبِل): مێشــێرێك بەچکەکانــی لەگەڵدا بێت.

(مَکانٌ مَشْبُول): شوێنێك بەچکە شێری زۆر تێدابێت.

شــبم: ١-(شَــبَمَ وشَــبَّمَ- الجديَ. شَــبْماً): چیلکەیەکــە دەیخەنــە دەمــی کارەوەو بــە شــاخیەوە دەبەســتن تــا دایکــی نەمژێت/ بەلامککــرا بەلامــك: دووپەتــی ئەمســەرو ئەوســەری پەچــەی ئافرەت کە بــە ملیەوە دەبەستێت.

(اَلشِبَم= الشِبَّام): بەلامك.

أَلْشَبَّم: ١-بەلامك لە دەمنراو ٢-برسی بە کاری بەلامك لە دەمنراو چوێنراوە.

٢-(شَبِمَ- الماءُ. شَبَماً): ئاوەکە ساردبوو.

(اَلشَبَم): ساردیی.

(اَلشَبِم (م) شَبِمَة): ١-ســەرمابوو ٢-کەسێکە سەرمایشــیبێت‌و برسیشبێت ٣-چەك ٤-ژەهر (ســاردکردنەوەی) ٥-مــردن (چونکە مردوو سارد دەبێتەوە).

شبن: (شَبَنَ- الغُلامُ شَــبْناً): مێردمنداڵەکە

بوو بە هەرزەکارێکی خرپن.
(اَلشابِن- مِنَ الغِلْمان): هەرزەکارێکی خرپن/ لەش پتەوی نەرمو نۆڵ.
(اَلشَبانِيّ والاَشْبانِيّ و الشَـبَّانِيّ): دەموچــاو سووری سمێڵ سوور.
٢-(شَبَنَ- الشيءُ. شُبُوناً): شتەکە نزیکبووەوە.
٣-(اَلشَبين والإشبين (ج) اَشابين): برازاوا.
(شَبينَة وإشبينَة): بەربووك (سريانيه).
شـبه: ١-(شَـبَّهَ- هُ إيـاهُ وشَـبَّهَ- هُ بِهِ): بەویچواند/ وایزانـی لـەو دەچێـت/ لـەو دەکات.
(شـابَهَ- هُ واشـبَهَ- هُ= ماثَلَـهُ): لەو چوو/ لەویکرد.
(اَشْـبَهَ فُلانٌ اُمَّهُ"): فیسار لە دایکی دەچێت. وەك ئافرەت بێدەسەڵاتو بێبڕشتە.
("مااَشْبَهَ الليلَةَ بِالبارحَةَ"): بۆ لەیەکچواندنی دوو شتی دوابەدوای یەك دوای یەك دەوترێت دەڵێن: ئای کە ئەمرۆو دوێنێ لەیەکدەچن.
(تَشَـبَّهَ- بِـهِ): وەك ئەویکــردو لاسـایی ئەویکردەوە.
(تَشابَهَ- الرَجُلانِ): دوو پیاوەکە لەیەکچوون/ وەکیەکوابوون.
(إشْتَبَها): ئەو دووانە لەیەکچوون.
(اَلشِـبْه (ج) اَشْباه ومَشـابِه): لەیەکچوون/ وەکیەکبوون/ هاوشێوەبوون.
(شَـبهُ المُنحَرِف) (هـ): نیمچـە لاتەریب. شـێوەیەکی چوار گۆشـەییە دوو لای بەیەك تەریبن و یەکسـان نـین ئەو دوانـە هەردوو بنکەکەین.
(شِـبهُ المُنْحَرِف المُتَسـاوي السـاقَين) (هـ): نیمچە لاتەریبی دوولایەکسـان کـە تەریبی نەبن.
(اَلشَـبَه = المُشـابَهَ): ١-لەیەکچـوون/ هاوچەشنیی/ هاوشێوەیی ٢-مسی زەرد (بۆیە وا ناونراوە چونکە کە زەرد دەکرێتەوە ڕەنگی لە زێڕ دەچێت).
(اَلشَبَه (ج) اَشـباه ومَشابِه= اَلشِبْه): وەکو/ ئەو، لە وێنەی ئەو/ چون ئەو.
(اَلشبْهَةُ (ج) شُبَه وشُبُهات): لێچـوون/ وەکو ئەو/ چون ئەو/ لەو چوو.
(اَلشَبَهان والشِبهان): مسی زەرد.
(اَلشَـبيه (ج) شِـباه): وەکو ئەو/ لە وێنەی ئەو/ هاووێنە/ هاوچەشن.
(اَلمتَشَـبِّهَة): دەستەئیسـلامێکن خودایان بە زیندەوەر چواندووەو سـیفەتی زیندەوەریان داوەتێ.
(اَلتَشـابُه أَو التَحاكي المركـزي أَو التَراكزي (هــ): تحويلٌ تعينهُ نقطـةٌ ثابتةٌ و قطب التشـابه او مركزه وعدد جبري (ع) نسبة التشـابه بحيث يقابل اي نقطـة (ن) من الشـكل (ش) نقطة (نَ) من الشـكل (شَ) يتوفر فيها الشرطان (١) ون، ن على استقامة

(٢) و ن ع و ن): لێکچـوونو بەیەکداچوونی چەمکـی یاخـود هاوچەقبـوون، گۆڕانـی دیاریکردنـی خاڵێکـی نەگۆڕو (جەمسـەری لێکچـوون یاخود چەقەکەیو بڕێکی جەبری (ع) (ڕێـژەی لێکچوون) بـه مەرجێك بگاتە هـەر خاڵـی (ن) لە وێنەکەشـا خاڵی (نَ) لە وێنەیە دوو مەرجی تێدا بەدیدەکرێت لەمەڕ یەکراستەیەی.

(مُثَلَّثان أو مُضَلَّعانُ مُتَشـابِهان) (هـ): دوو سێ گۆشـە یان دوو لادار (ن) کە گۆشەکانیان یەکسانن و دوو دوو لاکانیان ڕێکن.

٢-(شَـبَّهَ- عَلَيـهِ الأَمـرَ): لـه کارەکەی بە گومانکرد/ کارەکە لێچەواشەکرد.

(-الشيءُ): شتەکە گرانو ئاڵۆز بوو.

(شُـبِّهَ- عَلَيـهِ الأَمرُ): کارەکە لێ چەواشـە بـوو سـەری لێدەرنەکـرد/ کارەکـەی بـۆ ساغنەبووەوە.

(تَشـابَهَ- الأَمـرُ): کارەکـە چەواشـە بوو/ لێکجیانەدەکرایەوە.

(إشـتَبَهَ- في الأَمـرِ): لە ڕاسـتیی کارەکە بە گومانبووو سڵی لێکردەوە.

(-الأَمرُ عَلَيهِ): سەری لە کارەکە دەرنەچوو، کارەکە ناڕوون بوو، شاراوە بوو.

(الشُـبهَةُ )ج) شُـبَهَ وشُـبُهات):١-گومـان/ گومانلێکردن/ بە گومانبـوون/ ڕووننەبوون ٢-چەواشـەو تێکەڵبوون، کە ڕاستو ناڕاستو حـەرامو حـەلاڵ/ شـیاوو نەشـیاو لەیەك جیانەکرێتەوە.

(المُشَبَّه والمُشتَبَه- من الأُمور): کاری سەختو پڕ گرێو چەواشە/ بەیەکداچوو.

("إياكَ والمُشَبَّهات"): خۆت لە کاری سەختو ئاڵۆزو پڕ گرێو گومانو ناڕوون دووربگرە.

الملحق:

شـبه: (التَشـبيه) (مـص): ١-لێچواندن ٢-لەیەکچوون.

("تَشبيه دور القلب بِمُضَخَّة"): کاری دڵ بە ترومپا چواندن.

(التَشـبيه في البَيـان): لـە دەرخسـتندا لە ڕوونکردنـەوەدا بـە ئامرازێـك شـتێك بە شتێکیتر بوچێنێتو بەوە نیشانەیبکەیت.

("بَشَـرَةٌ كالحَرير نُعومَةً"): پێستێکی وەك ئاوریشم نەرمو نۆڵ.

---

شبا: ١-(شَبا- الشيءُ شَبْواً): شتەکە هەڵکشا/ سەرکەوت/ بەرزبووەوە.

(-الفَرَسُ): چارەوێکە هەستایە سەر پاشووی.

(أَشْبى- الشَجَرُ إِشباءً): درەختەکە باڵایکردو پەلوپۆی زۆر بوو/ بەیەکداچوو.

(الشَباة (ج) شَـباً وشَبَوات): چارەوێیەك کە لەسەر پاشووی هەستێت.

٢-(شَـبا- الوَجـهُ. شَـبْواً): ڕوومکـە پاش تێکچوون گەشایەوەو جوانبوو.

(-النَارَ): ئاگرەکەیکردەوە.

٣-(أَشـــبى- الرَجُلَ. إشباءً): دەستی باربووی بۆ درێژکردو دایە.

(-ەُ): ڕێـــزی لێگـــرت‌و ســـەروەریکرد/ سەربەرزیکرد.

(-علیـــە): میهرەبانیـــی لەگەڵدا کـــرد/ بەر سۆزی خۆی خست.

(أَشبی- ەُ. إشباءً): گرفتاری ناهەمواریکرد.

-الشَيءَ): پاڵی بە شتەکەوە نا.

(أَلشَبْو): ئەشکەنجە/ ئازار/ ئێش.

٥-(أَشبی- الرَجُلُ إِشْـــباءً): پیاوەکە کوڕێکی زیرەکیبوو.

(مُشبيّ ومُشْبِ): کەسێکە کوڕی ژیرو زیرەکی بووبێت.

(أَشبی- الأَولادُ أَباهُم): منداڵەکان وەك باکیان دەرچوون/ لەباوکیانکرد.

٦-(أَلشَباة (ج) شَباً و شَبَوات) (ح):١-دووپشك/ ساتی بوونی سۆڵسۆڵەی دووپشك یان دووپشکی زەرد ٢-چزووی دووپشك ٣-دەم‌و نووکی تیژی هەموو شتێك ٤-پیاوی خوێڕی‌و هیچ‌و پووچ.

("هذا رَجُلٌ شَباةٌ"): ئەمە پیاوێکی خوێڕی‌و هیچ‌و پووچە.

(-مِـــن السَّـــیف): هێنـــدەی کە شمشـــێرەکە دەیبڕێت.

شَبْوَة: ناوی دووپشکە.

الملحق:

شَبي: (أَلشَبِيَّة) (مِنَ السريانية): حەفتەیی (بـــە ســـریانی). پەرتووکی ســـڵاواتی هەموو حەفتەکەیە یەکەمجارە لە ڕۆما بە (کەرشۆنی) ســـاڵی ١٧٧٢ چاپکراو پاشان بە عەرەبی چەند جار چاپکرایەوە.

---

شت: (شَتَّ. شَتّاً وشَـــتاتاً وشتیتاً): پەرش‌و بڵاوبووەوە.

(شَتَّ وشَـــتَّتَ وأَشَـــتَّ – الأَشْـــیاءَ): شتەکانی بڵاوکردەوە.

("أَشَـــتَّ بِـــيَ قَومِـــي"): خێوشـــگەل کاریان پەرش‌و بڵاوکردمەوە.

(تَشَتَّتَ وانشَتَّ واشْتَتَشَتَ- الشَملُ): ئەوەی کە کۆبوون‌پەرەوازەبوون/ بڵاوبوونەوەوهەریەکە بە لایەکدا/ تەفروتوونا بوون.

(أَلشَـــتّ) (مص): بڵاوبوونەوە/ پارچەپارچە بوون.

(أَلشَـــتّ والشَتات (ج) أَشْـــتات): پەراگەندە/ پارچەپارچە/ پەرش‌و بڵاوبوو/ جیاجیا.

("جـــاؤُوا أَشـــتاتاً وجاؤُوا شَـــتاتَ شَـــتاتَ): بەجیاجیـــا هاتـــن/ دەستەدەســـتە هاتن/ بە بڵاویی هاتن.

(شَـــتَّان= بَعُدَ): دوورە (بەسەرداركردنی یان نوونەکەی ژێردار دەکرێت).

("شَـــتَّانَ بَینَهُما ومابَینَهُما وشَـــتانَ ماهما وشَـــتَّانَ مازَیـــدٌ وأَخُوهُ"): نێوانیـــان دوورە، دوورن لـــە یەکـــەوە زۆر جیـــاوازن. زەیـــدو براکـــەی لەیەك دوورن‌و جیاوازیان هەیە یان

نێوانیان هەیە.

(اَلشَّتیت (مص) (ج) شَتَّی): پەراگەندە بوون/ پەرش‌و بلاو بوون/ جیاجیا/ بلاوبوو ٢-جیاو بلاوکردنەوە یان پەرەوازەکردن/ تەفروتووناکردن.

(ثَغرٌ شَتیت): دانی پێشەوە کە لە یەك بلاون‌و شاشن‌و خوارو خێچن.

(اُناسٌ شَتَّی وشُتُوت): خەلکانێکی هەرمەمو لە یەکجیا/ هەریەکە لە خێل‌و لایەك.

(اَشیاءُ شَتَّی): شتی هەرمەمو جۆراوجۆر.

(وقَعوا فِي اَمرٍ شتی): تووشی جۆرەها شتبوون.

شتر: ١-(شَتَرَ- الشَیءَ شَتراً): شتەکەی لەتکرد، بڕی ٢-دڕاندی.

(-الرَجُلَ): پیاوەکەی بریندارکرد.

(-العَینَ): پێلووی چاوی هەلگێڕایەوە.

(شَتِرَ. شَتَراً): بڕرا/ قلیشا/ پچڕا ٢-دڕا.

(شَتِرَ): لچی خوارەوەی قلیشاو بوو.

(شَتِرَ وشُتِرَ): پێلووی چاوی هەلگەڕابووەوە یان پێلووی خوارەوە داکەوتبوو شۆڕبووبووەوە.

(شَتَّرَ- عَینَهُ): پێلووی چاوی هەلگێڕایەوە یان قلیشاند.

(اِنشَتَرَت عَینهُ): پێلووی چاوی هەلگەڕایەوەو شەقار شەقار بوو و پێلوی خوارەوەی داکەوت.

(اَلشَتَر) (مص): ١-پچڕان ٢-هەلگەڕانەوەی پێلووی چاوو قلیشانی.

(اَلشُترَة): قلیشی نێوان دوو پەنجە.

(اَلأَشتَر (م) شَترَاء (ج) شُتر): ١-کەسێکە لچی خوارەوەی قلیشابێت ٢-کەسێکە پێلووی سەروخواری چاوی هەلگەڕابێتەوە یان قلیشابێت یان پێلووی خوارەوەی داکەوتبێت/ شۆڕبووبێتەوە.

٢-(شَتِرَ- بِهِ. شَتَراً): جنێوی پێدا.

(شَتَّرَ- بِهِ): ١-نەنگیی دایە پال ٢-تێر جنێوی پێداو سووکیکرد/ قسەی دزێوو پیسی بە گوێدادا.

(اَلشَتَر): نەنگیی/ خەوش/ لەکەو نزمیی.

(اَلشِتِّیر): نارەسەن‌و شەڕەنگێزو سەرسەری ٢-ڕەوشتنزمو بەدخوو/ بەدکردەوە/ بەدڕەوشت.

شتع: (شَتِعَ. شَتَعاً): لە برساندا یان لەتاو نەخۆشیی ترساو تۆقی/ بێورە بوو.

شتغ: (شَتَغَ- هُ. شَتغاً): سواریبوو سەرشۆڕیکرد.

(اَشتَغَ-هُ) ١-پروکاندی/ فەوتاندی ٢-پلیشاندیەوە.

(اَلمَشاتِغ): فەوتێنەر یان فەوتگە.

شتل: (شَتَلَ وشَتَّلَ- الشَتلَ شَتلاً) (ز) (سریانیة): شەتلەکەی هەلکێشا تا لە شوێنێکیتردا بینێژێت.

(اَلشَتلَةُ) (ن): چلە شەتلێك.

(اَلشَتل) (ز): شەتل.

(اَلمَشتَل) (ز): شەتلگە شوێنێکە تۆوی

پێوەدەکــەن کە دەرهات هەڵدەکێشــرێت‌و لە شوێنێکیتر دەروێنرێت.
(اَلْشَـتُول) (عامیــة): مرۆڤــی پنتــی/ کە جلەکانی ڕێکوپێك لە بەرنەکات‌و ڕێکنەبێت.
شتم: ١-(شَتَمَ- ه شَتْماً ومَشْتَمَةً وتَشْتاماً): جنێوی پێدا.
(-هُ شَتْماً): جنێوی زۆرتر پێداو بەزاندی.
(شاتَمَهُ فَشَتَمَهُ): شەڕە جنێوی لەگەڵدا کردو بەجنێو بەزاندی.
(شَــتَّمَ- هُ): جنێوی زۆری پێدا/ مردووی لە گۆڕ دەرهێنا.
(شاتَمَ- هُ): شەڕە جنێوی لەگەڵدا کرد.
(تَشَتَّمَ): خۆی دایە بەر جنێو/ خۆی تووشی جنێو کرد.
(تَشــاتَمَ – القَومُ): شــەڕە جنێویان لەگەڵ یەککرد.
(اَلشَتیمَة (ج) شَتائِم): جنێو/ جمێن.
(اَلشُتام والشُتامَة): جنێوفرۆش/ بەدڕەوشت/ بەدخوو.
(اَلشَــتَّام والشَــتَّامَة): زۆر جنێــو فرۆشــی زمانپیس.
٢-(شَتُمَ. شَتامَةً): ناشیرین‌و چارەقورسبوو/ ڕەزاگرانبوو.
(شَتِم): چارەگران‌و ناشیرین/ ڕەزاقورس.
(اَلشَــتامَة (مص): ناشــیرینی‌و قوشــقێتی/ ڕەزاقورسیی‌و دەمارگیریی/ کەمچیکڵدانەیی.

(اَلشُــتام والشُــتامَة): دەموچاو ناشــیرینی گرژومۆن.
(اَلشَتُّامَة) (ح): شێری گــرژو مۆن/ دەموچاو بەپەکدادراو.
شتا: (شَــتا- بِالبَلَدِ. شَتْواً): لە شارەکەدا یان لە وڵاتەکەدا زســتانی بردە ســەرو (-المَكانَ) تیایدا مایەوە.
(-اَلشتاءُ): زستانەکە ساردبوو/ ساردیکرد.
(شَــتا وشَــتِيَ وأَشــتى- القَــومُ): ١-کەوتنە زســتانەوە ٢-لە زســتاندا تووشــی نەبوونی‌و نەدارایی‌و نەهامەتیی بوون.
("هذا شيءٌ يُشْــتيني"): ئەمە شتێکە بەشی زستانم دەکات‌و زستانی پێ بەسەردەبەم.
(شَتَّى- بِالبَلَدِ تَشْــتِيَةً): زستان لە شارەکەدا مایەوەو تیایدا زستانی بەسەربرد.
(-تِ الدُنیا) (عامیة): بارانی زستان باری
(شاتى- الرَجُلَ. مُشاتاةً وشِتاءً): بە درێژایی زســتان کاری لەگەڵــدا کرد/ بــۆ کارکردن لە زستاندا لەگەڵیدا ڕێککەوت.
(تَشَــتَّى- بِالبَلَــدِ. تَشَــتِّیاً): لە شــارەکەدا/ وڵاتەکەدا زستانی بەسەربردو مایەوە.
(-المَكانَ): زســتان لــە شــوێنەکەدا مایەوەو نیشتەنیبوو.
(اَلشِــتاء (ج) اَشْتِيَة وشُتِيّ): زستان. یەکێکە لە چوار کەژە/ وەرزی ساڵ لە ٢١ ڕێبەندانەوە (کانونی یەکەمەوە تا ٢١) نەورۆز. (مارت)ە.

(شَتَوِيّ وشَتْوِيّ): زستانه/ زستانی.
(اَلشِّــتاء والشِّــتا): گرانیــی‌و قــات‌و قــڕی ٢-وشکەساڵیی.
(فاكِهَةُ الشِّتاءِ): ئاگر.
(اَلشَتاة والشَتْوَة= الشِتاء): زستان.
(صاحِبُ الشَّـتْوَة): ئەوەی لە زستاندا هانای بۆ دەبەیت.
(اَلشَتِيّ): بارانی زستان/ زستانە باران.
(اَلشاتِي): زستانی.
("يَومُ شاةٍ وغداة شــاةٍ"): ڕۆژێکی باراناویی زستانە سەرلەبەیانییەکی باراناویی زستانە.
(اَلشَتَوِيّ): بارانی زستانی.
(اَلمَشْتى والمَشْتاة (ج) اَلمَشاتِي): کاتی زستانەو زستانە هەوارو شوێنی زستانەنشین.
("هذه مَشاتينا"): ئەمە زستانە هەوارمانە.
(ومصايِفُنا): هاوینەهەوارمانە.
(ومرابِعُنا): دەوارگامانە.
شث: (اَلشَثّ (ج) شِثاث والواحِدَةُ شَثَّة) (ن): ١-گوێــزە کێویلە ٢-(ح)مێشــە هەنگ ٣-لووتی شــاخ کە ئەملاولاکــەی شــکابێت‌و ڕمابێت‌و خۆی مابێتەوە ٤-هەموو شتێکی زۆر/ فرە.
شثر: (شَتِرَ-ت عَينُهُ شَتَراً): چاوی قورسبوو.
(اَلشِتر (ج) شُــتُور): پۆپەی شاخ/ لووتکەی شاخ.
(قَنــاةٌ مُتَشَــظِّبَة): جۆگــەی پەللێوەبــوو/ جۆگەلە لێهەڵگیراو.

شــثل: (شَــثِلَ وشَــثُلَ- ت أَصابِعُهُ. شَــثَلاً وشُثُولَةً): پەنجەکانی زبرو ئەستوور بوون.
(شَثْلُ الأَصابع): پەنجە زبرو ئەستوور.
(قَدَمُ شَثْلَةٌ): پێی پان‌و ئەستوورو زبر.
شثن: (شَثِنَ= شَثِل):
شج: (شَجَّ- الرَأْسَ. شَجّاً): سەرەکەی (برینداركرد/ شکاند/ قرنجاند).
("فُلان يَشــبُجُّ مَرَّةً ويَأْسُــو مَرَّةً"): فیســار تاڵیکەرەوەیــەو خۆشــیکەرەوەیە یان جارێك هەڵە دەکات‌و جارێکیتر ڕاســت دەبێکێت واتا جارێك بریندار دەکات‌و جارێك تیمار دەکات.
(شَجَّ- المَفازَةَ): بیابانەکەی بڕی.
(-الشَــرابَ بالماءِ): ئاوی تێکەڵ شــەربەتەکە کرد.
(-المَركَبُ البَحرَ): پاپۆڕەکە ڕووی دەریاکەی شەقکرد/ پاپۆڕەکە دەریاکەی بڕی.
("شَجَّ الأَرضَ براحِلَتِهِ"): تیژ (بە ئەسپەکەی/ بە وڵاخەکەی) زەویەکەی بڕی‌و پێداڕۆیشت.
(-شَــجَجاً): ســەری قلیشــی تێبوو یان جێ قلیشی تێدابوو.
اَشَجّ و شَجِيج (ج) شَجَّى ومَشْجوج ومُشَجَّج): سەرقلیشاو/ سەرشکاو.
(شَجَّجَ- ه): تەواو سەری شکاند.
(شاجَّ وتَشــاجَّ- القَومُ. مُشــاجَّةً وشَجاجاً): خوێنشگەل/ سەری یەکتریان شکاند.
(اَلشَجَج) (مص) شوێن شکانی سەر ٢-شوێنشکاویی

له ناوچەواندا.

(اَلشَجاج): هەوا.

(اَلشَـجّاج): كەسـێكە كـە برينێكـی قووڵ لەسەردا بكات.

(اَلشَجَّةُ (ج) شِجاج): نەشتەرگەریی برین بە تایبەتی لەسەردا.

(اَلشَجيج والمُشَجَّج): مێخ/ سنگ.

٢-(شَـجَجَ- على الأَمرِ): لەسەر ئەنجامدانی كارەكە سووربوو/ هەتەر بوو.

شجب: ١-(شَجَبَ- هُ. شَـجْباً): خەریكیكردو خڵافاندیو دووریخستەوە.

("إِنَّـكَ لَتَشْـجُبُني عَـن حاجَتـي"): تۆ لە نیازو پێداویستیەكەم دوورم دەخەیتەوە/ لە نیازەكەمدەكەیت.

(شَجَبَ- هُ): دڵگیریكرد/ خەفەتیدایە/ داخی پێخوارد/ داخیدایە.

(-الغُرابُ شَجيباً): قەلەڕەشەكە بۆ لەیەكدابڕان قیڕاندی.

(شَـجَبَ وشَـجِبَ. شَـجَباً): داخیخـوارد/ خەفەتیخوارد/ پەژارە گرتی.

(شَـجِب وشَـاجِب): خەفەتبـار/ دڵتەنگ/ داخلەدڵ.

(أَشْجَبَ- هُ): خەفەتباریكرد/ داخیدایە.

(تَشَـجَّبَ): پـەژارە گرتـی/ داخلەدڵبـوو. مەراقیكرد.

(اَلشَـجْب (مص) (ج) شُـجُوب وأَشـجاب): ١-مـەراق و خەفـەت و دەسـكورتی پـەژارەو نەبوونیی ٢-پەرێشانیی و داماویی/ گرفتاریی بە هۆی نەخۆشیەوە یان شەڕەوە.

(اَلشاجِب- مِنَ الغُربان): قەلەڕەشكەیەك كە زۆر بقیڕێنێت.

٢-(شَجِبَ- هُ): فەوتاندی/ لەناویبرد.

(شَجَبَ وشَـجِبَ. شَجْباً وشُـجُوباً وشَجَباً): فەوتاو مرد.

(-الشَيءُ): شتەكە ڕۆیشت/ لەدەستچوو.

٣-(شَـجَبَ- القنينَةَ. بِشِـجابٍ شَجْباً): قاپە شووشەكەی بە سەرقاپێك سەرنایەوە.

(تَشاجَبَ-الشَـيءُ): شـتەكە (ئاوێتـە بوو/ بەیەكداچوو).

(اَلشَجْب (مص) (ج) شُجُوب وأَشْجاب): پایە یان كۆڵەكەیەكی خانووەكە.

(اَلشاجِب): زۆربڵێ/ چەنەباز/ هەڵەوەڕ.

(اَلشِـجاب (ج) شُجُب): دەمەڵبێن/ سەرقاپ/ سەری شووشەو شتێتر كە پێی قەپاتدەكەن.

(اَلشِـجاب والشُجُب والمِشجَب: جمع المِشجَب. مَشـاجِب): داربەسـت. ئاسنبەسـت كـە جلوبەرگی پێدا هەڵدەواسـن./ بەرگهەڵواس/ هەڵواسە.

(مَشْجَبُ الاسلِحَة): جبەخانە.

(اَلشَجْباء): كوندەی ئاو.

شجر: ١-(شَجَرَ-الشَجَرَةَشَجْراً): پەلەشۆڕەكانی درەختەكەی هەڵبڕی/ بەرزكردەوەو بەستی.

(شَـجِرَ- الرَجُلُ. شَـجَراً): كۆمەڵی پیاوەكە زۆر بوو.
(شَـجَّرَ- النَّباتُ): ڕووەكەكـە یان نەمامەكە بوو بە درەخت.
(-المَكانَ): شـوێنەكەی كـرد بـە درەخت/ درەختـی زۆری لە شـوێنەكەدا ڕواند (ئەمە تازەگەرییە).
(شـاجَرَ-تِ الماشِـیَةُ شِـجاراً ومُشـاجَرَةً): لە بـێ پـاوەن و ئاڵف ئاژەڵـەكان لق و گەڵای درەختەكانیان ڕنیەوەو خواردیان.
(-الماشِیَةَ): ئاژەڵەكەی لەوەڕاند.
(أشْجَرَ- المَكانُ): شوێنەكە درەختی لێڕووا.
(الشَجَر (ج) أشجار وشَجْراء): درەخت/ دار.
(شَـجَرَة): درەختێك/ دارێك (ج). شَجَرات: ١-ڕووەكێـك كـە قەدیهەبێـت و لەسـەر قەد هەسـتێت ٢-(ن) ڕووەكێكـە دارینەیـە بەرزدەبێتەوەكۆمەڵێكی دارستان پێكدەهێنێت هەموو جۆرە درەختێك دەگرێتەوە پسپۆڕان بە دو بەشیەوە دەكەن.
(الراتینجیّات أو الأشـجار دائِمَةُ الخَضْرَة): درەختە هەمیشە سەوزەكان.
(المُحاوات أو الأشـجار التي يَسْقُطُ ورقها في الشـتاءِ): ئەو درەختانەی كە زستان گەڵایان هەڵدەوەرێـت زۆر جـۆری درەخت هەیە كە لە دەرەوەی دارسـتانەكانن یـان بۆ بەرەكەی دەروێنرێن یان بۆ جوانیی یان بۆ كەڵكیتر.

(شَـجَرُ المَطّاط) (ن): درەختی لاسـتیك كە لـە بنچینـەدا هـی ئەمەریكای باشـورە هی (بەرازیل و گویان) زۆر بەرزدەبێتەوە. ئەمڕۆ لـە وڵاتـە گەرمەكانـدا زۆر دەروێنرێت بە تایبەتـی لە وڵاتانێك كە دەكەونە باشـووری خۆرهەڵاتی ئاسـیا بۆ شـیلەكەی كە دەكرێت بە لاستیك.
(شَـجَرُ الخُبز) (ن): درەختی نان درەختێكە لە مالیزیـاو تاهیتی دەروێـت بەرێك دەدات كـە نیشاسـتە دارەو گەورەیـە بـە لێنراوی دەخورێت و وەك نانیش دەخورێت.
(شَـجَرَةُ النَسَـب): درەختـی/ ڕەچەڵەكـی باووباپـیر، كـە لـە باپـیرە هەرە گـەورەوە دەستپێدەكات بۆ نەوەكانی بەرە لە دوای بەرە بەو شێوەیە تا دەگاتە دواییەكان.
(شَجَرَةُ الزَنْبَق) (ن): درەختی شلێر. ڕەگەزە درەختێكە گوڵەكەی جوانە كە لە شێوەی گوڵە خوزامەیە لە ئاسیاو ئەمەریكادا دەروێنرێت. توێكڵەكەی بـۆ بەهێزكـردن و ورياكردنەوە باشە.
(شَـجَرَةُ الحیاة وشَـجَرَةُ مَعرِفَةِ الخَیر مِنَ الشَّر): درەختی ژیان و درەختی جیاكردنەوەی چاكـە لە خراپە، ئـەو درەختەیە كە خودای مەزن بە ئادەمی وت كە لە بەهەشتدا بوو لەو درەختە مەخۆ.
("فُلان شَـجَرَةُ الخَـیر"): فیسـار درەختی

خێروچاکەیە واتاکەڵکبەخشە.
(اَلشَّـجَرَ الملعونـَـةَ) (ن): درەختـی زەقـوم (درەختێکە تاڵەو بۆگەنـە جەهەنەمییەکان لە جەهەنەمکدا بەرەکەی دەخۆن.
(اَلشِجَر= الشَجَر): درەخت.
(اَلشَجْرَة): ١-جارێك هەڵنانی پەلە شۆڕەکانی درەخت ٢-جارێك یاریدەدان.
(مَكانٌ شَـجِر وشَـجِیر واَشْـجَر (م) شَجِرَة وشَـجِیرَة وشَجْراء): شـوێنێکی پڕ درەخت/ بەدرەخت داپۆشراو/ دارستان.
(الشجراء): جەنگەڵ/ بێشەلان/ چڕە دارستان بەرامبەرەکـەی: (المَرْداء): خاکی ڕووتەن کە درەختی هیچ پێوە نەبێت.
("قَطعـتُ كُلَّ شَـجَراءِ ومَـرداءٍ"): هەموو دارستانەکانو زەویە ڕووتەنەکانم بڕی.
(اَلشَجّار (ج) شَجّارون): زانای درەختناس.
(اَلمَشْـجَر (ج) مَشـاجِر): شـوێنی لێڕوانی درەخت.
(مَـكانٌ مُشْـجِرٌ (م) مُشـجِرَةٌ): دارسـتان/ شوێنێکی پڕ لە درەخت/ جەنگەڵ.
(ثَوبٌ مُشَـجَّر): بەرگێك کـە نیگارو وێنەی درەختی لەسەر بێت.
(كتابَة مُشَـجَّر): نووسـینی چینیەکان کە وەك درەخت بەیەکدادەچێت.
٢-(شَجَرَ- بَينَهُم أمرٌ شَجْراً وشُجوراً): لەسەر کارێك تێکچوونو بەگژ یەکداچوون.

("شَـجَرَ مابَينَهُــم"): نێوانیـان تێکچـوو/ بەیەکدا هەڵپڕژانو کەوتنە شەڕو بنار.
(شَـجَرَ- الرَجُلَ بالرمح شَـجْراً): نێزەی بە پیاوەکەدا کرد.
(شـاجَرَ- هُ شِـجاراً ومُشـاجَرَةً): لەگەڵیدا کەوتە شەڕو بنار/ بەگژیداچوو.
(تَشـاجَرَ- القَـومُ): بـە گـژ یەکداچوونو جنگیـان دایە یـەك (وەك درەخـت پەلیان لەیەك ئالآند).
(تَشاجَروا بِالرماح): بە نێزە لەیەکبەربوون/ بەیەکیانداکرد.
(إشْتَجَرَ-القَومُ= تَشاجَروا): بە گژ یەکداچوون.
(اَلشَجْر (مص) (ج) اَشْجار وشُجُور وشِجار): کارێـك کـە لەسـەری ناکۆکـبنو بەهۆیەوە لەسەری بەگژیەکدا بچن.
(رِماحٌ شِواجِر): ڕمبارانو هاویشتن/ لە هەموو لایەکەوە نێزەپێداکردن/ نێزەبەیەکداچوون.
٣-(شَـجَرَ- الشَـيءَ. شَـجْراً): ١-شـتەکەی بەستەوە.
(-البَيتَ): کۆڵەکەکەی بەر خانووەکەدا.
(-النَبـاتَ): پەلـە شـۆڕەکانی ڕووەکەکەی هەڵنا.
(شَجَّرَ- النَخلَ): هێشـوەکانی دارخورماکەی خستە سەر پەلەکانی تا نەشکێن.
(تَشاجَرَ- الشيءُ): شتەکە بەیەکداچوو.
(إشْـتَجَرَ- الرَجُـلُ): پیاوەکە دەسـتی ژێر

چەناگەیناو ئاشنیشکی خستە سەر زەوی.
("باتَ مُرتَفِقاً مُشتَجِراً"): شەو مایەوە دەستی لەژێر چەناگەیداو لەسەر ئانیشکی.
اَلشَجْر (ج) اَشجار وشُجُور وشِجار: ژێر چەناگە.
(اَلشَجْرَةُ): خاڵێکی بچووك کە لەسەر چەناگەی منداڵ دەبێت.
(اَلشَجار): ١-داری کەژاوە ٢-باربەستێك کە لە کەژاوە بچووکترەو سەر بەرەڵایە.
(اَلشِجار= اَلشَجار): داری کەژاوە.
(اَلشِجار (ج) شُجُر): ١-داری پشتکۆڵی دەرگا ٢-داری سەربیر.
(اَلمَشجَر (ج) مَشاجِر): تەختەی کەژاوە کە باربەستێك کە لە کەژاوە بچووکترەو سەربەرەڵایە.
(اَلمِشجَر (ج) مَشاجِر): ١-المَشجَر ٢-داربەست یان ئاسنبەست بۆ جل پێداهەڵواسین.
٤-(شَجَرَ- فُلاناً. شَجْراً): فیساری (پەرکرد/ وەلانا/ لاداو دەستی نایە بەر) بەری لێگرت.
(اِشْتَجَرَ- نَومُهُ): خەوی لێزڕا/ خەو لە چاوی فڕی.
(انشجر نومه): خەولی لێ زڕا..
(اَلشَواجِر): ١-ڕێگرەکان/ بەربەستەکان ٢-خەریککەرەکان/ دەستگرتووەکان/ مرۆڤو حوشتر.
(اَلشَجیر): نامۆ/ نەناس‌و لاوەکیی.

٥-(شَجَرَ- فَمَهُ. شَجراً): دەمی بە چیلکەیەك کردەوە.
(-الدابَّةَ): لغاوی چوارپێکەی توند ڕاکێشا بوەستێت واتا دەمیپێکردەوە.
(اَلشَجْر (ج) اَشْجار وشُجُور وشِجار): دەم یان نێوان مەلاشوو و زمان.
(اَلحُروف الشَجَرِيَّة): ئەو پیتانەن کە ڕاستەوڕاست لە دەمەوە دێتە دەرێ ئەوانەیش (ش. ض. ج) ن دەیشڵێن (ش. ج. ق. ك. ي)ن.
(اَلشِجار (ج) شُجُر): بەلامك/ چیلکەیەکە دەکرێتە دەمی کارەوە تا دایکەکەی نەمژێت.
٦-(اِشْتَجَرَ- الرَجُلُ): ١-پێشکەوت/ کەوتە بەرەوە ٢-سەربەستانە خێرا ڕۆیشت.
(اِنْشَجَرَ): سەربەستانە خێرایکرد.
٧-(اَلشِجار (ج) شُجُر): نیشانەیەکی حوشترە تا بناسرێتەوە.
(اَلشَجیر): ١-شمشێر ٢-هاوڕێی/ هاوەڵی (خراپ/ ناتەواو).
شجع: ١-(شَجُعَ. شَجاعَةً): ئازاد بوو/ دلێر بوو/ بوێرو بێباکبوو/ چاونەترسبوو/ نەبەرد بوو/ دلاوەر بوو.
(-ەُ): لەو ئازاتر بوو.
(شَجَّعَ- ەُ): دڵی قایمکردو ورەی نایە بەرو چابوکیکرد.
(-ەُ علی الأَمرِ): بۆ کردنی کارەکە بە

زاتيكردو ورەى نايە بەرو تێزيكرد.
(شـاجَعَ- هُ): لـه دلاوەريدا بەزانـدى/ لەو نەبەردتر بوو.
(تَشَـجَّعَ): ١-ئـازاو دلێـر بـوو/ وێـراى‌و پركێشيكرد ٢-خۆى بە ئازا پيشاندا.
(اَلشُـجاع والشَـجّاع والشِـجاع (ج) شُجعان وشِجعان وشِجاع وشُـجَعاء وشُجْعَة وشَجْعَة وشِجْعَة وشَـجَعَة): بوێرو پركێش/ دلْقايم/ چاونەتـرس لە تەنگانەو مەترسـيدا/ دلێر/ ئازا/ نەبەرد/ دلاوەر/ چاوقايم/ جەربەزە.
(اَلأَشْـجَع (م) شَـجْعاء (ج) شُـجْع): ١-دلێرتر/ ئازاتر/ چاوقايمتر/ جەربەزەتر ٢-شێر ٢-حوشترى پێشەنگ.
(اَلشَجِع= الشُجاع): دلێر.
(اَلشَـجيع (ج) شُـجْعان وشِـجاع وشُـجَعاء وأَشْـجِعَة (م) شَجيعَة (ج) شَـجائِع وشِجاع وشُـجُع= الشُـجاع): ئازا/ بەجـەرگ/ دلێر/ دلاوەر/ نەبەرد.
(اَلشَـجاعَةُ) (مص): ئازايەتيـى/ بوێريى‌و دلْقايميى لـە تەنگانەو مەترسـيدا دلێريى/ چاوقايمى.
٢-(شَجِعَ. شَجَعاً): درێژ بوو.
(أَشْجَع (م) شَجْعاء): درێژتر/ بەبالآتر.
(رجُـلٌ شَـجْعَةٌ وشُـجْعَةٌ): پياوێكى درێژى بەشۆكاو.
(اَلأَشْجَع): ١-درێژتر/ درێژ.
(اَلشَجِع): حوشترى شێت‌و وێت.
(جَمَلٌ شَجِعُ القَوائِم): حوشترێكى پێئازا.
٣-(اَلشُجُع (ز): رەگ‌و ريشەى درەخت.
(رَجلٌ شَجْعَةٌ وشُـجْعَةٌ): پياوێكى لاكەوتەى زيرەكردوو/ زۆرترسنۆك.
(اَلشُـجَاع والشِجَاع (ج) شَـجْعان و شِجْعان وأَشْجعَة) (ح): جۆرە مارێكە.
(اَلأَشْجَع) (ح): ١-جۆرە مارێكە ٢-رۆژگار.
(اَلأَشْـجَع والإِشْـجَع (ع ا) واحد الأَشاجِع): بنى پەنجەكان كە بە دەمارى پشتى دەستەوە دەنووسێت يان رەگە ديارەكانى پشتيدەستە.
(اَلمُشْـجَع): پەتيارە/ شـێتى تـەواو بەرەلآ/ بەتەرِيى.
شجم: (اَلشَجَم): فەوتان/ لەناوچوون.
(اَلشُـجُم): ١-درێژانـى بـەد ٢-زۆرزانان يان جورتومو بەلآ.
شـجن: ١-(شَـجِنَ وشَجُنَ شَـجَناً وشُجُوناً): داخيخوارد/ پەژارە دايگرت/ خەفەتبار بوو.
(شـاجن): خەفەتبـار/ پەژارەگرتـوو/ داخلەدڵ.
(شَـجَنَ- هُ): خەفەتيدايـە/ داخـى كـردە دڵيەوە/ دڵگيريكرد.
(-تِ الحَمامَة. شُجوناً): كۆترەكە بە سۆزەوە گماندى خەفەتيباراند.
(شَجَّنَ- هُ): خەفەتيدايە/ داخيكردە دڵيەوە.
(أَشْـجَنَ- هُ): دڵگيريكـرد/ جەخـارى كردە

دڵیەوە/ داخیدایە/ خەفتباریکرد.
(تَشَجَّنَ): خەمیخوارد/ پەژارەگرتی.
(-الأمرَ): بە داخەوە کارەکەی یادکردەوە.
(اَلشَجَن) (مص) (ج) شُجُون واَشجان):
١-خەفەت/ داخ/ خەم/ پەژارە/ ناسۆر/ جەخار ٢-مەراقو حەزی دەروون.
٢-(اَشْجَنَ- الكرمُ): مێوەکە پەلی ئاڵاندە یەك.
(تَشَجَّنَ الشَّجَرُ): درەختەکە پێچی خوارد.
(اَلشَجن (ج) شُجُون والشاجِنَةُ (ج) شَواجن):
ڕێی ناو دۆڵ یان ڕێی بەشی سەرەوەی دۆڵ.
اَلشَجَن (ج) شُجُون واَشجان والشَجْنَة والشِجْنَةُ والشُجْنَة (ج) شِجْن وشُجْن وشِجْنات وشُجْنات وشُجَنات): ١-(لقی/ پەلی/ چلی) تێکئاڵاوی لێکئاڵاوو هەڵزناو ٢-پەلی/ لکی هەموو شتێك.
("الحَديثُ ذو شُجون"): باسەکەو قسەکە پەلی ئەملاولای زۆرلێدەبێتەوەو مرۆڤ بەملاولادا بەکێشدەکات.
٣-(تَشَجَّنَ): جووڵا/ بزوا.
٤-(اَلشِجْنَةُ (ج) شِجْن وشُجْن وشِجْنات وشُجْنات وشُجَنات): لمیەکپچرانی شاخ، درزی شاخ/ شەقبوونی شاخ.
شجا: ١-(شَجا واَشجی- الرَجُلَ. شَجْواً واِشجاءً) (ضد): ١-خەفەتی بە پیاوە خوارد/ داخی کردە دڵیەوە ٢-هەوەس پێپەیداکردو خستیە گۆرانی ٣-وروووژاندی ٤-دڵیتەنگکرد.

(شَجِيَ. شَجاً): خەفەتیخوارد/ دڵگیر بوو.
(-بِالشَجا): پەژارەو مەراق گەرووی هێنایەوە یەك.
("عَلَيْكَ بِالكَظْمِ وإنْ شَجِبْتَ بالعَظْمِ"): ڕقو قینەکەت بخۆرەوە ئەگەرچی وەك ئێسقان لە گەرووت بگیرێتو گەروت بێنێتەوە یەك.
(تَشاجی= تَحازَن): خۆی بە خەفەتبار نیشاندا.
(اَلشَجا): ١-مەراق ٢-خەفەت، دڵگیریی/ جەخار ٣-ئەوەی لە گەروودا بگیرێت وەك پاروو، ئێسقانو شتیتر.
(اَلشَجْو) (مص): ١-مەراق ٢-داخ/ خەم/ پەژارە ٢-چینێك گریان.
("بكی فُلانٌ شَجْوَةً): فیسار چینێك گریان.
(بَكَتِ الحَمامَةُ شَجْوَها"): کۆترەکە ناڵەو سۆزەکەی گماند.
(مَفازَةٌ شَجْواء): بیابانێکی وشکی لێدەرچوونی پێداڕۆیشتنی گران بێت کە خەڵك بە دەستیەوە مەراق بخۆن.
(اَلشَجي والشَجِيّ (م) شَجِيَة وشَجِيَّة):١-خەفەتبار/ دڵ پڕ لە جەخار/ خەمبار ٢-دڵ پڕ لە مەراق.
(شَجُوِي): مەراقاویی/ خەمناك.
٢-(شَجِيَ- الغَريمُ عنهُ شَجاً): وامۆرگرەکەی لێدوورکەوتەوەو ڕۆیشت.
(اَشجی- الغَريمَ أَو السائِلَ): ئەوەی وامۆرگرەکەیان سواڵکەرەکەی پێ قایلبێت

دایەو ڕۆیشت.

(اَلشَجو): پێداویستی.

(لَهُ عِندي شَجوٌ"): شتێکی پێویستی لای من هەیە.

شحّ: ١-(شَــحَّ- بالشَّيءِ وعلى الشَيءِ. شَحًّا و شِحًّا وشُــحًّا): چرووکیی لە شــتەکەدا کرد/ دەستی پێوە لەرزیو کەمیدا.

(شَــحَّ ماءُ الينبوع أو مــاءُ النَّهرِ) (عامية): ئاوی کانیەکە یان ئاوی ڕووبارەکە کەمیکرد.

("أيامُ الشَّحايح") (عامية): ڕۆژانی کەمبوونی ئاو لە پایزدا دەبێت.

(شاحَّ-بالشيءِ على فُلان): لە دانی شتەکەدا درێخیــی لــە فیســار کــرد/ چرووکیکــردو کەمیدایە.

(تَشاحَّ- القَومُ على الأمرِ وفيهِ): لە کارەکەدا خوێشگەل درێخییان لەیەککردو چرووکییان لەگەڵ یەککرد.

(اَلشَــحّ) (مص): چــرووك/ ڕژد/ پیســکە/ ڕەزیل.

(اَلشَــحَّاح): چرووك/ ڕژد ٢-دەســتقووچاو/ بەرچاوتەنگ.

(اَلشَــحاح- مِنَ الأَرضِ): زەوییەکی ئاوهەڵمژ کە تــا زۆر نەبارێــت بەســەریدا باراناوەکە ناڕوات.

(زَندٌ شَــحّاح): چەرخێك کــە ئاگرنەکاتەوە (وەك چروکی بکات).

(ماءُ شَحَّاح): ئاوێکی کەم.

اَلشَــحيح (ج) شِــحاح واَشِحَّة واَشِــحَّاء (م) شَحيحَة (ج) شَحائِح): ١-چرووك/ ڕژ ٢-گیر/ بەچاوتەنگ.

(إبلٌ شَــحائِح): حوشــترگەلێکی کەمشــیر/ کەمدادەر/ کەمشیردەر.

٢-(شَــاحَ- هُ. مُشــاحَةً): کەوتە مشــتومڕو سەرسەختی لەگەڵیداونەیاریکرد.

("لامَشاحَةَ في الأَمرِ"): کارەکە دیارو چەسپاوە مشتومڕو هاتوهاواری ناوێت.

(تَشــاحَ- الخَصمان في الجَدَلِ): دوو نەیارەکە کەوتنە مشتومڕو هەریەکە دەیویست ئەویتر ببەزێنێت‌و خۆی سەرکەوێت.

(تَشاحا- على الشيءِ): هەریەکەیان دەیویست شتەکە بۆ خۆیبێت.

٣-(شَحْشَحَ- البَعيرُ): حوشترەکە هەردەیبۆڕاند.

(-الصُرَدُ): سیسرکەکە هەر زیکەزیکیبوو.

(-الطائِرُ): باڵندەکە خێرا فڕی.

(-مِنهُ): لێیکەوتە پاڕێزەوە.

(اَلشَحْشَــحَ): ١-بیابانێکی وشــکی بەرفراوان ٢-پیاوی ئــازا/ بەجەرگ ٣- پیــاوی مەرد کە ڕقی لە شــتی نابەجێ ببێتەوە یان دڵپیس ٤-وتاربێژی زمانتیژو زمانپاراو.

(اَلشَحْشــاح): ١-چرووك ٢-کەمفەڕ/ کەمخێر ٣-بەدڕەوشــت ٤-هەتــەر لەســەر شــتێك‌و بینگرتوو پێوەی.

(اَلشَّخْشَـحان): ١-چـرووك/ رژد ٢-دڵپیـس ٣-بالآبەرز/ درێژ.
(اَلْمُشَخْشَح والمُشَخْشِح): کەمخێر/ کەمفەر.
شحب: (شَحَبَ وشَحُبَ وشُحِبَ- لونُه. شُحُوبَةً وشُـحُوباً): لە برسـاندا یان بە نەخۆشی یان لەبەر هەر هۆیەکیتر ڕەنگی هەڵبزڕکاو گۆڕا/ ڕەنگپەڕی.
(اَلشـاحِب) (فا): لاواز/ چرووساو یان ڕەنگ هەڵبزڕکاو، ڕەنگپەڕیوو ڕەنگزەرد.
(شاحِبُ الجسم): لەشتێکچوو.
شحث:: (شَحَثَ- المُدیَةَ شَـحْثاً): کێردەکەی دەمە زەرد کردەوەو تیژکرد.
شحج: (شَـحَجَ وتَشَـحَجَ- البغلُ أو الغُرابَ. شحیجاً وشُـحاجاً وشَـحَجاناً وتَشْـحاجاً): ئێسـترەکە لوشـکاندی یـان قەلەڕەشـکەکە قیراندی یان دەنگیان گڕ دەرچوو.
(شُحاجُ وشَـحیجُ البَغلِ أوِ الغُرابِ): لوشکەی ئێسترو قیرەی قەلەڕەشکە.
(اَلشَّحَّاج والشاحِج) (ح): کەرەکێوی.
(بَنـاتُ شَـحَّاج وبَناتُ شـاحِج) (ح): گەلە ئێستر.
(اَلشَواحِج) (ح): قەلەڕەشکەکان.
(اَلمِشحَج = الشَحَّاج): کەرەکێوی.
شحذ: ١-(شَـحَذَ- السِـكِّینَ ونَحوَهُ. شَحْذاً): چەقۆکەو شتی لەو بابەتەی تیژکرد.
(سـكینٌ شَـحُوذ وشَـحیذ): چەقـۆی تیژ/ تیژکراو.
(شَـحَذَ- الجُوْعُ مِعدَتَهُ): برسێتیی ئاگری لە گەدەی بەرداو تێژی خوارنیکرد.
(-هُ ببَصَرِهِ): تیژچاوی تێبڕیو تەماشایکرد.
(-الشَـيءَ): شـتەکەی ڕووتکـرد/ توێکڵـی شتەکەیگرت.
(-فِي التَسَـوُّلِ): سـواڵێکی گەرمیکردو تیایدا پێیداگرت.
("هُـوَ یَشْـحَذُ النـاسَ"): دەرۆزەیکـردو بەهەتەرەوە سەری کردە سەرخەڵك.
(-الدابَّةَ): تیژ ولاخەکانی لێخوڕی.
(-هُ): دەریکرد.
(شـاحَذَ- هُ): ١-نامەی لەگەڵـدا گۆڕییەوە ٢-لەتیژکردنی شمشێرو شتیتردا وەك ئەو بوو.
(أشْحَذَ- السِكینَ): چەقۆکەی تیژکرد.
(تَشَحَّذَ- هُ): دەریکرد.
(- الرَجُلُ): پێی لە دەرۆزەکردنەکەیدا داگرت.
(اَلشَـحَّاذ (ج) شَـحاحِذَة وشَـحَّاذون): دەرۆزەکـەر/ سـواڵکەر (لـە چاوتێبڕیـنو تەماشـاکردنی خەڵکـەوە وەرگـیراوە یان لە تیژکردنی چەقۆوە).
(اَلشِحَاذَة): دەرۆزەکردن/ سواڵکردن.
(اَلشَـحْذان والشَـحَذان): ١-برسـی ٢-لێخوڕ ٣-لەشسووك لە هەڵسوکەوتیدا.
(رَجُلٌ شُحْذُوذ): پیاوێکی هەڵەشەی بەجرتو فرت/ توندوتیژ.

(ٲلمِشـــحَذ): ١-تيژكـــەرى تيــغ وەك بربەندو هەسان ٢-لێخورى قوشقيى توندوتيژ.
(ٲلمِشحاذ (ج) مَشـــاحيذ): گرد يان لووتكەى تيژى شاخ.
(ٲلمَشـــحَذَة): ١-هۆى تيژكردن ٢-هۆى هاندانو هەڵچوونو هەتەربوون.
("هذا الكَلام مَشْـحَذَةٌ لِلفَهْمِ"): ئەم قسەيە هۆى باشكردنو تيژكردنى لێتێگەيشتنە.
٢-(ٲلشَـحَّاذ) (طب): سيچكەسلاوەى پێلووى چاو.
شحر: ١-(شَحَرَ. شَحْراً): دەميكردەوە.
٢-(ٲلشَحر) (مص):١-ئاوەرۆ ٢-ئاوەندى دەرە/ دۆڵ.
(ٲلشَحْر والشِّحْر): رووبارى گەورە.
(شَــحْرُ وشِــحرُ عمــان): رۆخــى دەريا لە عومانەوە تا عەدەن.
(ٲلشِحْرَةُ): روبارى تەسك.
(ٲلشَــحَّار) (عنــد العامــة): ١-زەوييەكــى كانئاگريــن يــان زەوييەكى لماوى ٢-رەشــيى دووكەڵ.
(شَحَّرَ- هُ فَتَشَحَّر) (عامية): رەشيى دووكەڵى تێهەڵسوو ئيتر دووكەڵاويبوو.
(ٲلشِحتار) (سريانية): رەشى دووكەڵاويبوو.
(ٲلشُـــحرور (ج) شـــحارير أو الشَحْوَر) (ح): ريشـۆڵە. باڵندەيەكە لــە چۆلەكە گەورەترە دەنگخۆشە دەنوكى زەردەو درێژ.

(ٲلمَشـــحَرَة): كوورەى خەڵووز/ ئەو شوێنەى خەڵووزى لێدروستدەكەن.
شحز: (شَحِزَ. شَحَزاً): ترساو تۆقىو پەنايبرد/ هانايبرد.
شحص: (ٲشْحَصَ- هُ): ماندوويكرد.
(-هُ مِنَ المَكانِ وشَــحَّصَهُ عَنهُ): لە شوێنەكە دەريپەڕانــدو دووريخســتەوە بــارى پێكرد/ گوريزى پێكرد.
شــحط: (شَــحَطَ-الإناءَ. شَــحْطاً وشَــحَطاً وشُحُوطاً ومَشَــحَطاً): دەفرەكەى/ قاپەكەى لێوانلێو، پركرد.
(-اللبنَ): ئاوى زۆرى كردە شيرەكەوە.
٢-(شَــحَطَ- فُلانــاً. شَــحْطاً وشَــحَطاً وشُــحُوطاً ومَشــحَطاً): پێش فــلان كەوتو لێيدووركەوتەوە.
(-هُ) (عامية): دەريكرد.
(-المَكانُ): شوێنەكە دوور بوو.
(شَحِطَ- المَكانُ شَحَطاً): شوێنەكە دوور بوو.
(ٲشحَطَ- هُ): دووريخستەوە.
(ٲلشَحْط والمِشْــحَط): كۆڵەكەيەكــە دەدرێتە بەر مێو تا لە زەوى بەرزبێتەوە.
(ٲلمَسْمُوك) (عامية) = (المِشحَط)
(مَنزِلٌ شاحِط): هەوارێكى دوور.
(ٲلشَحَّاط): دوور.
(شَواحِطُ الأَودِيَة): دۆڵە دورەدەستەكان.
(ٲلشَوحَطَةُ): ئەسپى درێژ.

٣-(شَـحَطَ-تِ العَقْـرَبُ الرَجُـلَ. شَـحْطاً وشَحَطاً وشُحُوطاً ومَشْحَطاً): دووپشكەكە بە پیاوەكەیەوە دا.

(-الجَمَلَ): حوشترەكەی سەربڕی.

(شَـحِطَ- الجَمَلَ. شَـحَطاً): حوشـترەكەی سەربڕی.

(شُـحِطَ- بِالدَّمِ): خوێناویبـوو و خەڵتانی خوێنبوو.

(شَحَّطَ- هُ): خەڵتانی خوێنیكرد.

(تَشَحَّطَ- بِالدَّمِ): خەڵتانی خوێنبوو/ تیایدا گەوزاو لە خوێن هەڵكێشرا.

(اَلشَـحْط) (مـص): لـە خوێندا گـەوزانو خەڵتانی خوێنبوون.

٤-(شَحَطَ- هُ علی الأَرضِ شَحْطاً) (سريانية): بەسەر زەویدا بەكێشیكرد.

(-عـودَ الثِقـابِ): دەنكـە شـقارتەكەی داگیرساند.

(اَلشَحْطَةُ والشَحِّيطَةُ): دەنكە شقارتە.

(اَلشَـحَّاطة) (عامية): سۆل كە لە ماڵاندا لە پێدەكرێت.

٥-(شَحَطَ- الطائِرُ. شَحْطاً وشَحَطاً وشُحُوطاً ومَشْحَطاً): باڵندەكە ڕیقنەیكرد.

(اَلشَحْط): ڕیقنەی باڵندە.

٦-(الشاحُوطَة) (ب): ١-چەكوشی نەقاری ٢-(عند العامية): خێرا هەناسەدانو خرەخری لە گیانكێشاندا دەنگیدێتو دەبێت.

شحك: (شَـحَكَ- الجديَ شَـحكاً): بەلامكی خسـتە دەمی كارەكەوە تا دایكـی نەمژێت/ بەلامكی كارەكەیكرد.

(اَلشِـحاك): بەلامك/ چیلكەیەكە دەخرێتە دەمی كارەوەو بە شـاخەكانیەوە دەبەسترێت بۆ ئـەوەی دایكـی نەمژێت، ئەگەر شـاخی نەبوو پەتەكە بە ملیەوە دەبەسترێت.

شحل: (شَـحَّلَ- الكَرْمَ) (عامية. سريانية): مێوەكەی هەڵپاچی.

فَضيحها (قَضَبَ): مێوەكەی هەڵپاچی.

شحم: ١-(شَحَمَ- هُ. شَحْماً): بەزی دەرخوارددا.

(شَـحُمَ. شَـحامَةً): بـەزی (زۆر بـوو/ زۆر گرت).

(شَحِمٌ): لەش چەورو بەزدار.

(شَحِمَ. شَحَماً): حەزی لە خواردنی بەزكرد.

(شَحِمٌ): بەزو چەوریخۆر.

(شَحِمَ- تِ الناقَةُ شُحوماً): مێحوشترە لەڕەكە قەڵەو بوو بەزی زۆر گرت.

(شَـحَّمَ- القَومَ): بەزو چەوریـی دەرخوارد دان.

(اَشْحَمَ): بەزی زۆرگرت.

-القَومَ): بەزی دەرخوارد دان.

(اَلشَّحْم): بەز.

(شَحْمَة): پارچە بەزێك.

(اَلشاحِم): بەزفرۆش.

("رَجُلٌ شـاحِمٌ لاحِمٌ"): پیاوێكە هەر غەزو

بەزمو گۆشتنە یان بەزو گۆشتو دەرخواردی خەڵکدەدات.

(اَلشَحّام): ١-بەزفرۆش ٢-کەسێکە بەزو گۆشت زۆر دەرخواردی خەڵکدەدات.

(اَلشَحْمَةُ): پارچە بەزێك.

(شَحْمَةُ الأَرض) (ن): دوومەڵان.

(-العَينِ): گلێنەی چاو.

(-الأُذُن) (ع ا): پەرەکەی گوێ کە گوارەی پێوە دەکەن.

(-الرّمان): پەرەکەی هەنار کە توێژێکی زەردەو تەنك لە نێوان دەنکەکاندا دەبێت.

(-المَرْجِ): گوڵە هێرۆ کە گوڵەکەی سپی یان ئاڵە بە وشکی دەکوڵێنرێت بۆ سەرماو کۆکەو هەڵامەت یان بۆ گەدەباشە.

(الشَّحِم): بۆڵە تریی کەمئاو.

(اَلشَحَم): بووەی گۆراوی لە خۆبایی‌و لووتبەرز.

(اَلشحيم): قەڵەو/ پڕ غەزوبەز.

(اَلمُشَحَّم والمَشْحُوم): زۆر قەڵەوو بە غەزوبەز.

(-) (عامية): بەری پڕناووك‌و ناوکپتەو.

(اَلمُشَحَّمْ والمَشحُوم): بە بەز دروستکراو.

٢-(اَلشَحيم والشَحِيمَة) (سريانية): کتێبی سڵاوات لە لای سریان‌و مارۆنییەکان.

الملحق:

شَحَّم: (اَلتَّشحيم): ڕۆنکردنی مەکینە. چەورکردنی شوێنی بەریەککەوتنی پارچەکانی مەکینە.

(اَلمَشحَمَة (ج) مَشاحِم): شوێنی بەکبەرکەوتن لە مەکینەدا کە چەور دەکرێت.

("مَشاحِمُ سَيارَة"): شوێنی چەورکردنی/ ڕۆنکردنی ئۆتۆمۆبیل.

(اَلمِشحَمَة (ج) مَشاحِم): ئامێری چەورکردەی ئاژۆتە لە هەڵسوڕێن‌و تەوەرەی پێچکە بۆ ئاسانسووڕانەوەیان‌و گێڕانیان‌و کارپێکردنیان.

شحن: ١-(شَحَنَ- السَفينَةَ شَحناً): پاپۆڕەکەی پڕکرد/ بارکرد.

---

(-المَدينَةَ بالخَيلِ): شارەکەی پڕ لە ئەسپسوارکرد.

(أشْحَنَ- المَكانَ): شوێنەکەی پڕکرد.

(اَلشَحن (مص) عِندَ البَحريَّة وشركات سكك الحَديد وأَصحاب السَيارات الكَبيرَة): ئەوەیە پاپۆڕو شەمەندەفەرو ئوتومبیلی گەورەی پێ باردەکرێت‌و پڕدەکرێت.

(سَيَّارَةُ الشَّحن): لۆریی/ لۆریی زلە/ ئوتومبیلی باریی کە کەلوپەلی لێباردەکرێت‌و پێدەگوێزرێتەوە.

(اَلشِحْنَة (ج) شِحَن): ١-باری پاپۆڕو شتیتر ٢-دەستەیەك ئەسپ ٣-ئالیکی شەوو ڕۆژێکی چوارپێ.

(شِحنَةُ البَلَد): پۆلیسی وڵات‌و شار.

(مَركَـبٌ شـاحِن): ئوتومبيلـى بارهەڵگرى باركراوو پڕ.

(الشـاحِنَة (ج) شـاحِنات مِن قِطار سـكة الحديد): فارگۆنى شەمەندەفەرى بار.

(الشـاحِنَة مِن القِطـارُ الكهربائي= حافلة الركاب): فارگۆنى سەرنشين كە كورسى تێدايە بۆ سەرنشينەكان كە تيايدا دادەنيشن.

٢-(شَحَنَ- الرَجُلَ شَحْناً): ١-پياوەكەى دەركرد ٢-دووريخستەوە.

(شَـحَنَ وشَـحِنَ- تِ الـكِلابُ): سـەگەكان نێچيرەكەيان راوناو نەيانگرت.

٣-(شَـحِنَ- عَلَيهِ. شَـحَناً): رقى لێهەڵگرت/ لێيپڕبوو.

(شاحَنَ- هُ): رقەبەرايەتى لەگەڵدا كرد.

(تَشـاحَنوا): رقەبەرايەتيـى يەكتريانكرد/ رقيان لەيەكبووەوە.

(الشَحْناء): دوژمنكاريى‌و دڵپڕ لەقينبوون.

(الشِحْنَةُ (ج) شِحَن): دوژمنايەتى.

(عَدوّ مُشاحِن) (فا): دوژمنێكى دڵ پڕلەقين، دوژمنێكى سەرسەخت.

٤-(أشـحَنَ- السَيفَ) (ضد): شمشێرەكەى بە كێلانەكەيدا كرد/ شمشێرەكەى هەڵكێشا.

(-لهُ بِسَـهم): تيرێكى بۆ خستە كەوانەكەوە تێيبگرێت.

(-الصَبـيُّ): منداڵـە بچووكەكـە/ كۆرپەكە خەريكبوو بگرى.

شَحا: (شَـحا- الرَجُلُ. شَحْواً): ١-دەميكردەوە ٢-هەنگاوى گەورەينا/ هەنگاوەكانى گەورەتر كرد.

(-اللِّجـامُ فَـمَ الفَـرَسِ): لغاوەكـە دەمـى چارەوێكەيكردەوە.

(-الفَمُ): دەمەكە كرايەوە.

(أشحى- فاهُ): دەميكردەوە.

(شَحَّى- فُوهُ: تَشحِيَةً): دەميكرايەوە.

(تَشَحَّى- عَلَيهِ): زمانى (لێكردەوە/ لێدرێژكرد).

(الشَحا): هەموو شتێكى فراوان.

(الشَحْو): بۆشايى ناوەوە.

(الشَـحْوَة): ١-جارێـك بۆشـكردن ٢-جارێك هەنگاو هەڵگرتن ٣-هەنگاو.

(فَـرَسٌ بَعيدُ الشَّـحْوَة): ئەسـپێكى هەنگاو گەورە.

(رَجُلٌ بَعيدُ الشَّـحْوَة في مَقاصِدِهِ): پياوێك كە هەنگاوى گەورە بۆ ئامانجەكانيدەنێت.

(الشَحْواء): چاڵاوى فراوان.

شحي: (شَـحِيَ. يَشحى شَـحْياً): جەقەڵەكە دەميكردەوەو لووراندى.

شَخّ: (١-شَخَّ. شَخّاً): ميز/ ميزيكرد.

(-في النَّـوم): بـە دەم خـەوەوە پرخاندى/ پرخەيهات.

(-اللبنَ): شيرەكە لە دۆشيندا خۆشەيهات.

٢-(شَخْشَـخَ- بِبَولِهِ): بـە ميزەكەى خورەى لەشتهێنا.

(شَخشاخ): خرخرهێنەر.

(-تِ الناقَةُ): سـنگی بەرزکـردەوە کاتێ کە چۆکیدادا.

(اَلشَخْشَـخَةُ) (مص): ١-شەقەشەقی چەك ٢-ورشەورش و خشەخشی کاغەزو بەرگی تازەو هەموو شتێکی وشك.

(اَلخَشْخَشَـةَ= الشَخْشَـخَة): خشـەخش یان ورشەورش.

شـخب: ١-(شَخَبَ اللبنَ. شَـخْباً و مَشْخَباً): شیرەکەی دۆشی.

(-اللبَنُ): شیرەکە ڕۆبوو.

(-تِ أوداجُ القَتيلِ دَماً): شادەماری کوژراوەکە بڕراو خوێن لێوەی فیچقەیکردو ڕۆیشت.

(إنْشَـخَبَ): ١-شـیرەکە دۆشـرا ٢-ڕۆیـوو ٣-فیچقەیکرد.

(اَلشَخْب) (مص): خوێن.

(اَلشَـخْبُ والشُخْب): خوشـێکی شیرە کە بە گوشینی جارێکی گوانەکە دێتە دەرێ.

(الشُـخبَةُ (ج) شِخاب): خوشـێکی شیرە کە بە گوشینێکی گوانەکە دێتە دەرێ و دەستگیر دەبێت.

(اَلشِخاب): شیری دۆشراو.

(اَلأُشْخُوب (ح) أشاخِيب): دەنگی دەرچوونی شیر لە گوانەکە/ خۆشەی شیرەکە.

(وَدَجٌ شَـخيب): دەماری بـڕراوی خوێن کە لێوەی خوێن فیچقە دەکاتە دەرەوە.

٢-(اَلشِـنْخاب و الشَـنْخُوب والشُنْخُوبَة (ج) شَـناخِيب): لووتکەی شاخ/ سەرەپۆپەکەی و سەرەوەی.

شـخت: (شَـخُتَ. شُـخوتَةً): لەشـباریکی زکماکیبوو.

(شَخْت وشَـخَت (ج) شِـخات): لەشباریك/ جووزباریك/ لەشووشەیی/ یەکیا.

("هوَ شَختُ العَطاءِ"): کەمبەخشە.

("هو شَخْتُ الخُلْقِ"): ئەو ڕەوشتنزمە.

(شَخُتَ- هُ إليهِ): پێیراگەیاند.

(اَلشَخْت والشِـخِّيت والشَخيت والشِخْتيت): تۆزی هەستاوو بڵاوەبوو.

٢-(اَلشَخْتُور والشَخْتورَة): پاپۆڕێکی بچووکی سـووکەڵەی خێرا کە یەك ستوونی هەبێت و دوو سەوڵی هەبێت (دەڵێن ئینگلیزییە).

شخر: ١-(شَخَرَ. شَخيراً): مرخاندی/ بە لووت یان دەم لرخەیهات/ لرخەلرخیکرد.

(-الفَـرَسُ أو الحِمـارُ. شَـخيراً وشَـخْراً): چارەوێکە حیلاندی و کەرەکە زەڕی.

(اَلشَخير): مرخەمرخ/ پرخەپرخ/ لرخەلرخ کە لە گەرو یان لووتەوە دەبێت.

(اَلشِخِّير): مرخن/ لرخن/ پرخن.

٢-(شَخَّرَ- الحِلْسَ): جلی ژێر کورتانەکە یان زینەکەی بەرزکردەوە تا بێتە پێشەوە.

(-النَخلَةَ): هێشووە خورماکانی دارخورماکەی خستە سەر پەلەکانی تا نەوەرێت.

(اَلشَـخْر- مِنَ الرَحْلِ): ناوەڕاسـتی زین یان کورتان.

٢-(اَلشَـخر- مِـنَ الشَّـبابِ): سـەرەتای هەرزەکاریی.

(اَلشَـخِير): ئـەوەی لـە کێوەکـە بـە قـاچ بەردەبێتەوە.

شخز: (شَخَزَ. شَخْزاً): پەشۆکا/ شپرزە بوو/ شڵەژا.

(-عَلَيهِ الأَمرُ): کارەکەی لێگرانبوو.

(-هُ بالرمْحِ): نێزەی پێداکرد.

(- بَينَهُم): بەیەکیدادان و نێوانی تێکدان.

(تَشاخَزَ- القَومُ): ڕقیان لە یەکتری هەڵگرت.

(اَلشَخْز) (مص): ماندوێتیی زۆرو دەردیسەریی و نائاسوودەیی.

شَخس: ١-(شَخَسَ- الرَجُلُ شَخساً): پەشۆکا/ شڵەژا.

(شـاخَسَ- أَمرُ القَوم): کاری خوێشگەل لە یەك جیابوو، جیاجیابوو.

(تَشـاخَسَ أَمرُهُم): کارەکەیان جیابووەوەو لەیەك ترازاو خراپبوو.

(-ت أَسـنانُهُ): دانەکانـی لەیەکـترازان و خواربوونـەوەو هەندێکیـان لەبـەر بەریـی کەوتن.

(اَلشَـخِيس): ١-سـەرپێچەکەرو نافەرمان ٢-کاری جیاو لەیەك ترازاو.

٢-(شَـخَسَ- الحِمـارُ شَخسـاً): کەرەکـە لە باوێشکدا دەمیکردەوە.

(شـاخَسَ- الحِمـارُ): کەرەکـە دەمیکردەوە لۆزی هەڵبڕی کە بۆنی تەرسەکەیکرد.

(تَشـاخَسَ- الحِمارُ): کەرەکە دەمیکردەوەو باوێشـکیدا یـان کە بۆنـی تەرسـەکەیکرد دەمیکردەوەو لووتی هەڵبڕی.

٣-((اَشْـخَسَ- الرَجُلَ وبِهِ): لە پاشـملە بە خراپە ناویهێنا/ غەیبەتیکرد.

(-لَـهُ فِي المَنطِـقِ): بـە وتـەی ناخـۆش بەرەنگاریبوو.

شخص: ١-شَخَصَ- الشيءُ. شُخُوصاً): شتەکە بڵند بووەوە.

(-النَجمُ): ئەستێرەکە هەڵهات.

(-الجرحُ): برینەکە هەویکردو هەڵاوسا.

(-بَصَـرُ- هُ): چـاوی کرایـەوەو ئەبڵەقبوو لێکینەنا.

(-الميتُ بَصَـرَهُ وبِبَصَرِهِ): مردووەکە چاوی بەرەو ئاسمان زەقبووەوە.

(أَشْـخَصَ- الرامي): تیرئەندازەکە تیرەکەی سـەری نیشـانەکەیکرد یـان خۆی سـەری نیشانەکەی پێکرد.

٢-(شَـخَصَ- عَن قَومِهِ أَو مِن بَلَـدٍ إِلى بَلَدٍ شُـخوصاً): لەلای خوێشگەلەکەی ڕۆیشت یان لە شارێکەوە بۆ شارێکیتر ڕۆیشت.

(-إِلَيهِم): گەڕایەوە لایان.

(شُـخِصَ- بِـهِ): کارێکـی هاتـە بـەردەم

پەرێشانبوو، شپرزە بوو، دڵخوردبوو.
(شُخوصُ المسافِرِ): شپرزەیی‌و دڵخوردیی گوزارکار کە لە ماڵ دەردەچێت.
(أشْخَصَ الرَّجُلُ): کاتی رۆیشتنی هات.
(-هُ): نائاسوودەیکرد/ پەستیکرد.
(-هُ الى قَومِهِ): بەرەو خوێشانی گێرایەوە.
٢-(شَخُصَ شَخاصَةً): کەتەو زەلامبوو/ چەتەووڵو لەشگەورە بوو/ بوو بە زەبەلاح.
(شَخَّصَ- الشَيءَ): شتەکەی دیاریکردو لە هیتری جیایکردەوە.
(تَشخيصُ الأَمراض): هەلاّواردی نەخۆشیی/ دیاریکردنی نەخۆشی لە لایەن پزیشکانەوە.
(شَخَّصَ- الرِوايَةَ) (عامية): رۆمانەکەی لەسەر شانۆ نواند.
(تَشَخَصَ): ١-رۆمانەکە نوێنرا ٢-نەخۆشییەکە دیاریکرا.
(-لَهُ): وەك زەلام هاتە بەرچاوی.
(تَشاخَصُوا): جیابوون لە یەك نەچوون/ جیاوازبوون.
(الشَخْص (ج) أَشْخُص وأَشْخاص وشُخُوص): کەس، مرۆڤ نێربێت یان مێ.
(-عِندَ المُوَلِّدين): لای تازەگەرییەکان پەیکەرە کە لە بەردو شتیتر دروستدەکرێت.
(الشَخيص (م) شَخيصَة): کەتە/ زەلام/ زەبەلاح/ چەتەوڵ/ تەراح ٢-گەورە/ سەروەر.
٤-(أشْخَصَ- بِهِ): لە پاشملە/ ناویهێنا/ بە

خراپە غەیبەتیکرد.
(-لَهُ في المَنطِقِ وأشْخَصَ- إلَيهِ): بە وتەی ناخۆش بە ڕوویەکی گرژو تاڵەوە بە ڕوویەوە چوو.
(الشَخيص في المَنطِق): گفتەی تاڵ‌و تفت.
الملحق:
شخص: (الشَخصي): کەسیی تایبەت بەو کەسە.
(رأى شَخصيّ): ڕای کەسی/ ڕای خۆیی.
(أمْتِعَةٌ شَخصِيَّة): کەلوپەلی کەسەکە.
((شَخصِيّاً): کەسەکە خۆی.
(حَضَرَ شَخصِيّاً): کەسەکە خۆی ئامادە بوو.
(الأَحوالُ الشَخصِيَّة): بارو چونییەتی کەس.
(القَوانينُ التي تَتَعَلَّق بحال الأَفراد وأَهْلِيَّتِهم): ئەو یاسایانەیە کە پەیوەندیی بە باری تاکەکەسان‌و تواناو لێهاتووییانەوە هەیە.
(قانون الأَحوال الشَخصِيَّة في لُبنان): یاسای باروچۆنیەتی تاکەکەسان لە لوبناندا (ئەو یاسایانەیە کە دەربارەی کاروبارێکن کە پەیوەندیان بە دادگا ئاینییەکانەوە وەك یاسای ژنهێنان‌و بە خاوەنبوونی منداڵ‌و بەخێوکردنی).
(الشَخصِيَّة): کەسێتی. ئەو نیشانانەیە کە یەکێك لە یەکێکیتر جیابکاتەوە.
(كانَ قَوِيَّ الشَخصِيَّة): کەسێتیەیکی بەهێزی هەبوو.

("لا شَــخصِيَّةَ لَهُ"): كەســێتییەكی بێهێزی هەیە/ بوودەڵەیە/ كەسێتی نییە.

(حقیقَةُ الشخص): ئەو نیشانەو ڕاستیانەی كە كەسەكەی پێدەناسرێت كە ئەوە خۆیەتی/ ڕاستی كەسەكە.

(شَخصِیَّةُ مُعتَدٍ): كەسێتیەكی شەڕەنگێزیی.

(شَخصِیَّةُ بارزة): كەسێتییەكی دەركەوتوو. پیاوێكــی دیــارەو دەركەوتــووە بــە هــۆی كارمەندییەكەیەوە یان دەسەڵاتیەوە یان پلەی ناو كۆمەڵی.

("حضــرت شَــخصِیَّاتٌ عدیــدة حَفلَــةَ التَدشــین"): كەســایەتییەكی زۆر ئامــادەی ئاهەنگی كردنەوە كە بوون.

(اَلشَــخصِیَّة في القانون): كەسێتیی لە یاسادا = كەســێتیی یاســایی: لێهاتوویی پێلێنراوی كۆمەڵێكە كە دەســەڵاتێكی یاســایی تایبەتی وەربگرێت بتوانێت خاوەنــی تەواوی مافێك ببێت.

(اَلتَشــخیص): ١-دیاریكــردن جیاكردنەوەو ســاغكردنەوە بــە هــۆی نیشــانەو بەڵگەوە ٢-نواندن‌و نیشــاندانی بیرێك یان شــتێك لە ڕوو قەڵافەتی ئەو كەسەدا.

("تَشخیصُ المَوت") (طب): دیاریكردنی ئەو نەخۆشییەی پێی مردووە، بە دیاریكردنی بە هۆی نیشانەكانیەوە.

(اَلتَشخیص الروائِي): نواندنی ڕۆمانەكە.

شخل: (شَــخَلَ- الشَرابَ شَخْلاً): شەربەتەكە یان شەرابەكەی پاڵاوت.

(- الناقَةَ): مێحوشترەكەی دۆشی.

(شاخَلَ- هُ): دڵی هێنایەوە جێ‌و خۆشیویست‌و بوو بە دۆستی.

(الشَخْل والشَخیل): دۆستی ڕاستەقینەو پاك.

(اَلمِشخَل والمِشخَلَة): پاڵێو.

شــخم: ١-(شَخَمَ وشَخِمَ وشَــخُمَ- الطعامُ أَو اللَّحــمُ شُــخوماً وشَــخْماً): خواردنەكە یان گۆشتەكە خراپبوو/ بۆگەنیكرد.

(شَخِمٌ): بۆگەن یان خواردن‌و چێشتی ترشاوو خراپبوو.

(شَــخُمَ- الفَمُ): دەمەكە بۆنی ناخۆشــبوو/ بۆگەنبوو.

(أَشْــخَمَ- الطَعــامُ أَو اللَّحْــمُ): چێشــتەكەو خواردنەكــە ترشــاو خراپبــوو گۆشــتەكە بۆگەنبوو.

(-الفَمُ): بدەم كە ۆنی ناخۆشبوو.

(الشُخُم): ئەوانەی لوتیان بە بۆنكردنی بۆنی خۆش یان ناخۆش دەگیرێت.

٢-(أَشْــخَمَ- الرَجُلُ): كابــرای دڵی پڕبوو لە گریان‌و خەریكبوو بگری.

٣-(إِشْــخامَّ- النَبتُ): تەڕو وشكی ڕووەكەكە تێكەڵبوو.

٤-(رَوضٌ أَشْخَم): باخێكی وشكی بێرووەك.

(عامٌ أَشْخَم): ساڵێكی وشكی بێناوو بێلەوەڕ.

(شَعَرٌ أَشْخَم): قژێکی سپی.
شدّ: (شَــدَّ- عَضُدَهُ. شَــدًّا): هێزی بازوویدا بەهێزیکرد.
(-الشيءَ): شتەکەیبەستو گرێدا.
(-العُقْدَةَ): گرێکەی توندو قایمکرد.
(-على يَدِهِ): کۆمەکیکردو بەهێزیکرد.
(شَدَّ شِدَّةً): زۆر بەهێز بوو.
(شَدَّدَ- هُ): بەهێزیکرد.
(-الضَــربَ): توندتــرو بەهێزتــر لێیــدا/ لێدانەکەی بەهێزتر کرد.
(-عَلَيهِ): تەنگی پێهەڵچنی.
(-الحَرفَ): دەنگی پیتەکەیگرت.
(-الشيءَ): شتەکەی قایمکرد.
(شــادَّ- هُ في الأمرِ): لە کارەکەدا پێشیکەوتو زووتر ئەنجامیدا.
(اَشَــدُّ): ١-ولاخێکــی قایــمو پتــەوی پێبوو ٢-بالّغبوو/ ئاوەزی/ ئەقڵی پڕبوو.
(تَشَــدَّدَ): ١-بەهێزو توانابــوو ٢-لەکاروباریدا بەتواناو توندبوو.
(تَشادَّ- الشيءُ): شتەکە قایمبوو.
(إشْتَدَّ): ١-بەهێز بوو ٢-توند بوو.
(-عليه المَرَضُ): نەخۆشیەکە زیْفی لێسەند/ کەشەنگیکرد.
(اَلشَــدّ) (مــص): ١-بەســتن ٢-قایمکــردن ٣-توندکردن.
("شَدُّ الرِحال"): ئاوزەنگی لێدان (ئیدیۆمە) واتا بۆ گوزار/ سەفەر ڕۆیشتن لە عەرەبیەکەدا (لە گرێبەستنەوە هاتووە).
("لااَملِكُ شَــدّاً وإرخاءً"): توانای توندکردنو خاوکردنەوەم نییە واتا: توانای هیچم نییە.
(لَشَــدَّ ماجَنَيتَ عَلَيّ): ئای کە توند ســزای سەختتدامو تاوانت بەرامبەرم کرد.
(اَلشَــدَّة): جارێك بەهێزکردن یــان جارێك بەستنو توندکردن.
(اَلشِدَّة (ج) شِدَد): ١-توندوتیژیی/ زۆرلێکردن/ ڕەقیــیو ســەختیی/ زەبروزەنــگ ٢-تەنگو چەڵەمــە ٣-نەهامەتییو گرفتاریــی ڕۆژگار/ لێقەومــان ٤-گــوزەران ســەختیی/ گرانیــیو نەبوونیی.
(شِدَّةُ الأرض): (سەختیی/ ڕەقیی) زەوی.
اَلشُدَّی= الشِدَّة: توندی/ سەختیی/ قایمی.
(اَلشَدِید (ج) اَشِدَّاء وشِداد وشُدُود): ١-بەهێز/ بەتین ٢-بەزەبر ٣-توندوتیژ ٤-ڕەق ٥-ئازا.
(مِسْــكٌ شــدِید الرائِحة): بۆنێکــی (تیژو کارکردەیــە/ بەهێزە) ٦-تۆکمــە ٧-چرووك/ دەستقووچاو.
("رجلٌ شــدیدُ العَــین"): پیاوێکە چاو قایم وخۆڕاگرە/ خەونایباتەوە.
(اَلشَدِیدَةُ (ج) شدائِد): مێی وشەی (الشديد).
(الحُروف الشــدِیدَة): پیتە گرتــووەکان کە هەشتن. (ا. ب. ت. ج. د. ط. ق. ك) کە لەم دوو وشەیەدا کۆدەبێتەوە (أَجِدتَ طَبَقَكَ).

(اَلأَشُـدّ والأُشُـدّ): ئەوپـەری پێگەیشـتنو گورِوتـینو هوشـیاریی مرۆڤ کە لـە نێوان تەمەنـی ١٨ تـا ٣٠ سـاڵیدایە (ئەمـە کۆیە تاکـی نییە یان تاك بەشـێوەی کۆو عەرەبو تۆویەتی).

(اَلمِشَدّ):١-کەمەربەست کە ئافرەت دەیبەستێت ٢-پشتێن.

(اَلمُشِدّ): ئەوەی ولاخەکەی توندوتیژە.

(اَلمُتَشَدِّد) (فا):١-لە کاروباردا توندوگیرو قایم ٢-چرووك/ رژد.

٢-(شَـدَّ- الرَّجُـلُ. شَـدّاً): تونـد رایکرد/ تێیتەقان.

(-على العَدُوِّ. شَـدّاً وشَدَّةً وشُدُوداً):١-توند پەلاماری دوژمنیدا/ سەختبوو.

(إشْتَدَّ- فِي السَّـيرِ): لە رۆیشتندا خێرایکرد/ توند رۆیشت.

(-على قِرْنِهِ فِي الحَربِ شَـدَّةً): لە شەرِەکەدا شالاوی توندو سـەختی بردە سەر بەرامبەرە نەیارەکەی.

(اَلشَدَّة): شالاوی سەخت لە جەنگدا.

(اَلشَديد (ج) أَشِدَّاء وشِداء وشُدود):١-دلێر/ ئازا ٢-بەزەبروزەنگ ٣-شێر.

٣-(شَدَّ- النَّهارُ شَدّاً): رۆژ سەرکەوت.

(شَدُّ- النَّهارِ): کاتی سەرکەوتنی رۆژ.

(اَلشَديد (ج) أَشِـدَّاء وشِداد وشُدود): بڵند/ باڵا/ بەرز.

("هُوَ شَديدُ الخُزوانَة"):ئەو لووتبەرزەو خۆی بـە گەورە دادەنێت/ لووتی بە ئاسـمانەوەیە لووتی گۆیژە دەکێڵێت.

٤-(اَلشَـدَّة) (عنـد العامـة): ١-قۆنـدەرە ٢-کاغەزی یاری.

شدح: ١-(شَدَحَ. شَدْحاً): قەڵەو بوو.

(شادِح): قەڵەو/ خرت.

٢-(إنْشَـدَحَ): لەسـەر پشـت کـەوتو لنگی بڵاوکردەوە.

(اَلشادِح- مِنَ الكلأ): گیایەکی زۆرو فراوان.

(اَلأَشْدَح): هەموو شتێکی فراوان.

(اَلشَدْحَةُ واَلمُشْتَدَح):بەرفراوانیی/ بەربڵاویی و بواری رەها.

("لَكَ عَنهُ شُـدْحَةٌ أَو مُشْـتَدَحٌ"): تۆ لێوەی بـوارو بەرفراوانییەکی زۆرتهەیـە، نێوانتان دوورە.

شدخ: ١-(شَـدَخَ- الرأسَ شَدْخاً): سەرەکەی شکاند/ قرنجاند.

(-الرَّجُـلَ): کێشـای بە گەردنیـدا گەردنی پێکا.

(شَدَّخَ- الرأسَ): سەری شکاند.

(تَشَدَّخَ- الرأسُ): سەرەکە شکا/ قرنجا.

(إنْشَدَخَ- الرأسُ): سەرەکە شکا.

(اَلشَدَخ): کۆرپەیەك بە ئاسانی لە سکی دایکی بێتە دەریّو تەواو نەبێت.

(اَلشارِخ) (فا): جووزێتازە دەرهاتووی تەروبر.

(غُلامٌ شادِخٌ): تازه هەرزەکار.
(اَلشادِخَةُ): مێی وشەی(اَلشادِخ).
(اَلْمَشْـدُّخ) (مفع): ١-بنگەردن ٢-سەرقرنجاو/ سەرشکاو.
٢-(شَدَخَ. شَدْخاً) : له ئامانجەکه لایدا.
(-ت غُرَّةُ الفَرَسِ. شَدْخاً وشُدوخاً): سپێتیی ناوچەوانی (ئەسپەکه/ ماینەکه) و لووتیشی گرتەوە.
(فَرَسٌ اَشْـدَخٌ): چارەوێیەکـە ناوچەوانی تا سەر لووتی سپییه.
(أَمرٌ شادِخٌ): کارێکە لە ئامانجەکەی لایداوە.
(الشادِخَةُ): سپێتیی ناوچەوانی ئەسپ ئەگەر تاسەر لووت بێتەخوارێ.
(الأَشْدَخ- مِنَ الخَيل (م) شَدخاء (ج) شُدْخ): ١-نیشـانەی سـپێتی ناوچەوانی ئەسپ کە تا سەر لووتبێت ٢-شێر.
شدف: ١-(شَدَفَ- هُ): لەتلەتیکرد/ کوتکوتیکرد.
(اَلشُدْفَة): پارچە/ کوتە/ لەت.
٢-(اَشْدَفَ- اللَّيلُ): شەو تاریکبوو.
(اَلشَدَف (ج) شُـدُوف): ١-تاریکیی ٢-تارمایی هەموو شـتێك چونکە لـە دوورەوە تاریك و رەش دەنوێنێت.
(اَلأَشْـدَف (م) شَـدْفاء (ج) شُـدْف (ح)): چارەوێ لە دوور گەورە بنوێنێت.
٣-(شَـدِفَ- الفَـرَسُ- شَـدَفاً): چارەوێکـە کەیفی پەیداکردو کەوتـە هەڵبەزو دابەزوو حیلاندن/ کەوتە بایخۆی.
(تَشادَفَ): ئەملاولایکرد.
(اَلشَـدَف) (مص) (ج) شُـدُف): ١-لاریی لە رووەمتدا. ٢-خواریی سەری حوشتر.
(الأَشْدَف (م) شَدفاء (ج) شُدْف): ١-حوشترێك له رۆیشـتندا لاگیربێت ٢-کەسێك کە کەجیی لە رووەمتیدا هەبێت ٣-چەپلەر.
٤-(الشَـدِف): درێژێـك کە خێـرا قەڵەمباز دەدات.
شدق: ١-(شَدَقَ. شَدَقاً): لالغاوەی بڵاو بوو.
(اَشْـدَق (م) شَدقاء (ج) شُـدْق): دەمپەل/ لالغاوەفراوان.
(تَشَـدَّقَ): ١-لێوی تـەواو جووڵانـد تا باش قسـەکە دەرببڕێت ٢-بۆ گاڵتە بە خەڵککردن لچی هەڵقورتاند.
(-بالكَلامِ وفيــه): بێپەرواو گوێدان درێژەی بە قسەکەیداو قسەی هەڵرشت.
(اَلشِـدْق والشَـدْق (ج) اَشْـداق وشُدُوق): لالغاوەی دەم.
(شِدقُ الوادِي): ئەملاولای دۆڵەکە.
(اَلشَـديق مِنَ الوادي (ج) شُـدُق): کەناری دۆڵ.
(اَلأَشْدَق): بە زمان/ زمانزانی زمانڕەوان.
٢-(اَلشَـدْقَم والشُداقِم): ١-دەمپەل/ دەمبلاو (ح) ٢-شێر.
٣-(اَلشِدياق (ج) شـدايِقَة- عِندَ النَّصارى)

(يونانيــة): كەسـێكە كە پلەيـەك لە خوار كاهينەوە بێت.
شدن: (شَـدَنَ-الظبي- شُدُوناً): كارمامزەكە خەپەرەبـوو لـە دايكى جيا بـووەوەو دايكى نەويست (ئەمە بە بەچكەى هەموو يەكسمو دوو سمێك دەڵێن).
(أَشْـدَنَ-تِ الظبيَـةُ): ئاسـكەكە كارەكـەى بەرەلاكردو لێيجيابووەوە.
(مُشدِن (ج) مَشادِن ومَشادين): ئاسكەمێيەك كە بەچكەكەى بەرەلاكردبێت.
(الشـادِن) (فـا): كارمامـزى خەپەرەبووى بەرەلاكراو.
(الشَدن) (ن): رووەكێكە گوڵەكەى وەك گوڵى ياسەمينە.
شده: ١-(شَـدَهَ- الرأسَ شَـدْهاً): سەرەكەى قرنجاند/ شكاند.
٢-(شَدَهَ- الرَجُلَ. شَدْهاً): پياوەكەى (حەپەساند/ سەرسامكرد).
(شُدِهَ): حەپەسا/ سەرسامبوو.
(أَشْـدَهَ- الرَجُلَ): پياوەكەى (حەپەسـاند/ سەرسامكرد).
(إِشتَدَهَ وانشَدَهَ): سەرسامبوو.
(الشُداه والشُدْه والشَدْه والشَدَه): واقورمان/ سەرسامبى/ حەپەسان.
(المَشادِه): سەرقاڵيى/ رەتبلاويى/ خەريكيى.
شدا: ١-(شـدا- الرَجُلُ شَـدواً): شيعرى بە دەنگەوە خوێندەوە وەك گۆرانيى بڵێت.
(-الشِعْرَ): بە دەنگەوە هەڵبەستەكەى وت.
(-الإبِـلَ): بـە دەنگـەوە/ بـە ئـاوازەوە حوشترەكانى راوناو دايە پێش/ لێيخورين.
(أَشدى. إِشداءً): چاك گۆرانيوت.
٢-(شَـدا- مِنَ العِلمِ شَـيئاً. شَـدْواً): شتێك زانستى وەرگرت.
(شـادٍ (ج) شُـداة وشـادون): كەمەكـە زانستوەرگرتوو.
(الشَدا): پاشماوەى هێز.
(-مِـنَ الشـيءِ): ١-ئەوپەرى/ كۆتايى شـت ٢-لايەك و لێوارى ئەو شتە.
("أَخَـذَ مِنـهُ شَـداً"): لايەكـى/ سـەرێكى شتەكەيگرت.
("لَم يَبقَ مِنَ المَريض إلاَّ شَداً"): نەخۆشەكە لـە لێـوارى مەرگدايـە/ خەريكـى مردنە/ ئاهێكى تێدا ماوە.
(الشَدْو) (مص): كەمەكێكى هەموو شتێك.
("أَخذوا شَـدْواً مِن مالِهِ"): كەمەكێكى دارا زۆرەكەيانبرد.
٣-(شَـدا- هُ. فُلانـاً أو بِفُـلانٍ. شَـدْواً): بەويچواند.
(-شَدْوَهُ): وەك ئەويكرد لاسايى ئەويكردەوە/ رێى ئەويكرت.
٤-(الشَدا): ١-گەرما ٢-گەرىى/ گوليى.
شدي: (الشِدْيت) (فرنسية): جۆرە تەقەمەنييە

کــە زۆر بەهێزە مادە ســەرەکیەکەی کولۆراتی پۆتاسیۆمە.

شــذّ: (شَــذّ- عَنِ الجَمهورِ أو الجَماعَةِ. شَذّاً وشُــذوذاً): لەناو جەمــاوەرو کۆمەڵدا تاكو ناتاسایەو لادەرە/ تەریکە.

(-القَولُ): قسەیەکە جیا لە قسەی ئاسایی/ بە پێوەری قسەیتر نییە/ قسەیەکە بێبنچینەیە/ قسەیەکی سەیرە/ ناتاساییە.

(-عَنِ الأُصُول): پێچەوانەی دەستوورە.

(شاذّ (ج) شُذّاذ وشَواذّ (م) شاذَّة (ج) شَواذّ): پێچەوانەی دەســتوورو پێوەر/ هەڵاوێژ/ لە نەریتو ئاسا لایداوە/ لاوەکی/ ناتاسا.

(شَذَّ- هُ. شَذّاً): ناتاساییکرد/ جیاوتەریکیکرد/ لاوەکیکرد.

(شَذَّذَ- هُ): ناتاسییکرد کردی بە شتێکی جیاو پەڕ بوو.

(أَشَــذَّ): قســەیەکی کرد کە لە هێڵی پێوەرو دەستووردا نەبوو/ قسەی سەیریکرد.

(-الشــيءَ): ١-شــتەکەی لاداو دوورو خســتەوە ٢-کــردی بــە شــتێکی نادیــارو بێبنچینــە/ لاوەکیکرد.

(اَلشُــذاذ- مِنَ النــاس): ١-خەڵکی ئەملاولای جیــا کە لە خێڵەکەدا بنو لــەو خێڵە نەبن/ نامۆ ٢-تاکە تاکەو کەمەك دەگمەن.

(جاؤوا شُذّاذاً): بە کەمکەمو جیاجیا هاتن.

(شُــذّاذُ الآفاقِ): خەڵکی نەناسو پەرەوازەی ئەملاولا.

(اَلشُــذّان والشَــذّان): چــەوی جیاجیــاو پەراگەندە یان شتی جیاجیا.

(شُــذّان النــاس): خەڵکــی پــەرەوازەو هەمەچێزەی جیاجیا.

شــنب: ١-(شَــذَبَ وشَــذّبَ- اللحاءَ. شَذْباً): توێکڵەکەی (گرتەوە/ لێکردەوە).

(-الشيءَ): شتەکەی (لەتکرد/ کوتکوتکرد).

(-المــالَ): مــاڵو ســامانەکەی (تەخشــانو پەخشانکرد/ بڵاوکردەوەو تەفروتونایکرد).

(-الشَــجَرَ): درەختەی ڕووتکردو پەلی پێوە نەهێشت.

(تَشَذَّبَ): ١-درەختەکە بێتوێکڵبوو ٢-پارەکەو سامانەکە تەخشانو پەخشانبوو ٣-درەختەکە بێپەلکرا.

(تَشَــذَّبَ- القَومُ): خوێنشــکەل بڵاوبونەوە/ پەراگەندەبوون.

(اَلشَّــذَب (ج) أشــذاب): ١-چیلکەو چەوێڵی پەراگەنــدە ٢- کەلوپەلــی ناومــاڵ کــە لــە کووتاڵبێت ٣-پاشماوەی گیای خوراو.

("في الأَرضِ شَــذَبٌ مِــنَ الــکَلأ"): زەویەکە پاشماوەی گیای خوراوی تێدایە.

("مالَــهُ إلاّ شَــذَبٌ مِــن العَســکَرِ"): تەنهــا ســەربازی پاشماوەی هەیە ٤-پارچەی درەخت ٥-توێکڵەکان.

(الشَــذْبَة واحِــدَةُ "الشَــذَب"): پەلووپــۆی

هەڵپاچراوی درەخت.

(اَلشاذِب) (فا): کەسی دوورەپەرێزی نیشتمان/ لـە نیشـتماندوور/ کەسـی پەراگەنـدەی نیشتمان.

(اَلمِشذَبْ): داس و تەوراس یان هەر ئامێرێکیتر کە درەختی پێ هەڵپاچن.

(اَلمُشَذَّب) (مفع): هەڵپاچراو/ قەدی درەخت کە درکەکانی هەڵپاچرابێت.

(فَـرَسٌ مُشَـذَّب): چارەوێیەکـی درێـژ کە گۆشتی زۆر پێوەنەبێت.

٢-(شَـذَبَ- عَنهُ. شَذْباً): لەسـەریکردەوەو بەرگریی لێکرد.

(شَذَّبَ- هُ): دەریکرد.

(-عَنهُ): لەسـەریکردەوەو بەرگریی لێکردو پاراستی.

٣-(اَلشَوْذَبَ- مِنَ الرجال): ١-پیاوی بالآبەرزی رێکوپێک ٢-هەموو شتێکی دروست و رێکوپێک و رەسەن.

شـذر: ١-(شَـذَّرَ- النَّظْمَ): مورووی خسـتە نێوان مرواریی یان شتیتری هۆنراوەوە.

("شَذَّرَ کَلامَهُ بِشِعرٍ"): شیعری لە قسەکەیدا هێنایەوەو پێیرازاندەوە.

(تَشَـذَّرَ- القَـومُ): خوێنشـکەل پـەرش و بلاو بوونەوە/ پەرەوازە بوون و هەریەکە بەلایەکدا.

(اَلشَذْر الواحِدَةُ شَذْرَة (ج) شَذَرات وشُذُور): ١-پارچـە پارچـەی زێـڕ کـە لـە کانزاکەی هەڵدەچنرێت ٢-مـووروو کە دەخرێتە نێوان مرواریـی و لەو بابەتەی کـە هۆنراوەتەوە ٣-مرواریی بچووک.

(شَذَر وشِذَر): بلاوبوو هەریەکە بەلایەکدا.

("تَفَرَّقـوا شَـذَرَ مَذَرَ وشِـذَرَ مِـذَرَ"): بە هەموو لایەکدا پەرشوبلاوبوونەوە/ هەریەکە بەلایەکدا.

٢-(شَـذَّرَ- بِفُلانٍ): نەنگیی دایە پاڵ فیسارو خەوش و کەموکووریی دەرخست.

(تَشَـذَّرَ): ١-بۆ بەگژداچـوون و خراپەکردن ئامادەبـوو ٢-تووڕە بـوو ٣-چابوکبوو پەلەی کارەکەیکرد.

(-ه): هەرەشەی لێکرد.

(-القَـومُ فِي الحَربِ): لە جەنگدا زۆر چوونە پێشەوەو دەستدرێژیانکرد.

٣-(اَلشَـوْذَر): ١-لێفـەو هـەر شـتێک کە بە خۆتیدا بدەیت ٢-کراسێکی بێدوگمە.

شذف: (شَـذَفَ. شَـذْفاً): لێیدەسـتکەوت/ لێیهەڵکراند.

("ماشَذَفْتُ مِنهُ شَیئاً"): هیچم(لێهەڵنەکراند/ لێدەسـتنەکەوت) ئەمە تەنها لە نەکردندا لە نەرێدا بەکاردێت.

شـذم: (اَلشَـذام): ١-جـزووی دووپشـک و زەردەواڵە ٢-خوێ.

(اَلشَیْذَمان) (ح): گورگ.

(اَلشَیْذَمانَة) (ح): جوانە مێحوشتری گورج.

شـــذا: ١-(شَـــذا شَـــذواً): خۆی بۆنخۆشكرد/ بۆنی مسكی له خۆیدا.

(اَلشَذْو) (مص): ١-بۆنی مسك ٢-مسك.

(اَلشَذا): ١-تیژیی بۆنی خۆش ٢-چیلكەی شكاو ٣-ئازار.

(اَلشَذاة (ج) شَذَوات واحِدَةُ الشَذا): بۆنێكی مسك، مسكێك پارچەیەكی چیلكە.

٢-(شَذا وشَـــذّی. بِالخَیرِ. شَـــذْواً وتَشذِیَةً): به چاكەكەی زانیو تێیگەیشت.

٣-(شَذا وأَشْذی- فُلاناً شَذْواً): ئازاریدا.

(اَلشَـــذا): ١-ئـــازارو خراپــــەو زیانپێگەیاندن ٢-(ح) مێش.

٤-(أَشْذی- هُ عَنهُ): لێیلادلو لێیدوورخستەوە.

٥-(اَلشَـــذا): ١-خـــوێ ٢-گەرمیـــی ٣-جـــۆرە پاپۆرێكه.

(اَلشَـــذاة): ١-هێـــزو تینێك كـــه مابێتەوە ٢-شتێكی كۆنو دڕاو.

شـــرّ: ١-(شَـــرَّ. شَـــرّاً وشَـــرارَةً وشَـــرَراً): بەدسروشـــتە/ بەدە/ خراپە یـــان بەدیكرد/ خراپەیكرد.

(شَـــرٌّ (م) شَرَّة (ج) أَشـــرار وشِرار وأَشِرّاء): مرۆڤی (بەد/ خراپ/ خراپەكار/ شەڕفرۆش/ بەدخواز).

(شَرَّرَ وأَشَرَّ- فُلاناً): ١-فیساری (به بەدخواز دانا/ بەبەددانا) ٢-دەریكرد.

(شارَّ- هُ): به گژیدا چوو/ دوژمنایەتیكرد.

(تَشَرَّرَ): خۆی به بەد نواند.

(تَشـــارّا): به گژیەكدا چـــوون/ دوژمنكاریان لەگەڵ یەككرد/ شەڕیان به یەكفرۆشت.

(اَلشَـــرّ (مص) (ج) شُرُور): خراپە/ بەدیی/ شەڕ.

(هو شَـــرُّ الناسِ): ئەو بەدترینی/ خراپترنی هەموو خەڵكه.

(هُم شِـــرُ وأَشـــرار وأَشِـــرّاءُ الناسِ): ئەوان بەدترین/ خراپترینی خەڵكن.

(هيَ شَرَّة أَو شُرَّی النِساءِ): ئەو ژنه له هەموو ژنێك (بەدترە/ خراپترە). له بنچینەدا (أَشَرّ): بووەو هەمزەكەی لێفرێدراوە.

(اَلشَرُّ): جەنگ (عامیة).

(اَلشَرَّة): مێی وشەی (اَلشَرّ).

(هي شَرَّةُ النســـاءِ): ئەو ئافرەته بەدترینی/ خراپترینـــی ژنانـــه. وەك چـــۆن دەوترێـــت (خَیْرَتُهُنَّ): باشترینی ژنانه.

(اَلشُرّ): بێزراو.

(اَلشِرَّة): بەدیی/ خراپە/ شەڕ.

(اَلشَـــریر (ج) أَشرار وأَشِـــرّاء (م) شَریرَة): بەدخوا/ خراپەكار/ شـــەڕەنگێز/ شـــەڕانی/ شەڕفرۆش.

(اَلشِرّیر (ج) شِـــرّیرون): ١-زۆر شەڕەنگێز/ زۆر بەد/ زۆر خراپ/ زۆر شـــەڕانی ٢-ئازناوی شەیتانه.

٢-(شَـــرَّ- اللَحْـــمَ أَو الثَوبَ): گۆشـــتەكەی یان

جلەكەی لەبەر هەتاو هەڵخست تا وشكبێتەوە.
(شَــرَّرَ- اللَّحْــمَ أَوِ الثَّوبَ): گۆشــتەكەی یان جلەكــەی دایە بەرخۆر یان هــەوا بۆ ئەوەی وشكبێتەوە.
(أَشَــرَّ- اللَّحْــمَ أَوِ الثَوبَ): بۆ وشــككردنەوە گۆشــتەكە یــان جلەكــەی هەڵخســتو دایە بەرهەتاو.
(-الشَيءَ): شتەكەی دەرخست.
(أَلإشــرارَة (ج) أَشــارِير): ١-ســیپاڵ كــە دەنكی وەریوو شتیتری لەســەر هەڵدەخەنو وشــكیدەكەنەوە ٢-رەوە حوشترێكی گەورە كە بڵاوبووبنەوەو بەملاولادا رۆیشــتبن ٣-كوتە گۆشتی درێژكۆلەی وشكراو.
أَلشَــرَّان الواحِدَةُ (شَــرَّانة) (ح): جانەوەری وەك مێشــوولە كە دەدەنە سەروچاوی مرۆڤ پێوەینادەن.
٣-(شَرَّ- فُلاناً. شَرّاً): گاڵتەی پێكردو خەوشی لێگرتو قسەی بەدی پێوت.
(شَــرَّرَ وأَشَــرَّ- فُلاناً): ناوی زڕانــدو لەناو خەڵكدا سووكیكرد/ ئابڕوویبرد.
٤-(شَرَّ- الماءُ. شَرّاً): ئاوەكە دڵۆپە دڵۆپ هاتە خوارێ.
(-الرَّمادَ) (عامیة): خۆڵە مێشەكەی پرژاند.
٥-(أَلشَّــرة): ١-تیژیــی ٢-بەدیــی ٣-چالاكیی ٤-تووڕەیــی ٥-هەڵەشــەیی ٦-هەتەربــوون/ بەتەنگەوەهاتن/ سووربوون.

(شَــرَّةُ الشَــبابِ): سەركەشــیو چابوكــی/ سەرچڵیی هەرەتی گەنجێتیی.
(أَلشَرَر والشَرار): پریشكی ئاگر.
شَرَرَة وشَرارَة: پریشكێكی ئاگر.
(أَلشَرِير (ج) أَشِرَّة): لای/ تەنشتی دەریا.
٦-(شَرْشَرَ- الشَيءَ): ١-شتەكەی (شڕو وڕكرد/ لەتو پەتكرد) ٢-گەستیو پاشان تفیكردەوە.
(-السكینَ): بە بەردێك چەقۆكەی تیژكرد.
(-تِ الماشِــيَةُ النَباتَ): ئاژەڵەكە ڕووەكەكەی خوارد.
(أَلشَرْشَر والشِرشِر) (ن): هەرێز/ ڕووەكێكە بێدركەو بەسەر زەویدا زۆر خۆی دەكێشێتو درێژدەبێت.
(شَرْشَرَةُ وشِرشِــرَة): هەرێزێك یەكێك لەو ڕووەكەیە.
(أَلشِرشِــرَة): ١-پارچەیەكــی هەموو شــتێك ٢-(ن) هەرێز (گیایەكە).
٧-(شَرَشَرَ- الماءَ) (عامیة): ئاوەكەی تكەتكە ڕۆكرد.
(-الــماءُ): ئاوەكــە (دڵۆپە دڵۆپــە/ تكەتكە) ڕۆیشت (عامیة).
(تَشَرْشَرَ- مِنهُ): لێیجیابووەوە.
(شِواءٌ شَرْشَرٌ): برژاوێكە ڕۆنەكەی دەتكێت.
(شَراشِر النَنَب): ڕیشوو تووكی ئەملاولای كلكە.
٨-(أَلشَراشِــر): ١-دەروون ٢-هەمــوو ئەندام/ لەش.

("ألقى عَلَيه شَراشِـرَهُ"): خۆی تێدا توانەوە هێندە خۆشیویست ٢-باروکۆڵ.

(ألشُرشُـور (ج) شَراشـير (ح) = البِرقش): باڵندەیەکی بچووکی دەنگخۆشـە ڕەنگەکەی شینە لە چۆلەکە دەچێت.

شـرب: ١-(شَرِبَ- الماءَ شُـرْباً وشَرْباً وشِرْباً ومَشْـرَباً وتَشْـراباً): ١-ئاوەکەی (خواردەوە/ هەڵقوڕاند) ٢-تینوێتی لە ئاوەکە شکا.

(-شَرَباً) (ضد): ١-حوشترەکانی تێر ئاو بوون ٢-تینوویانبوو/ تێرئاونەبوون.

("أكَلَ عليه الدَّهْرُ وشَرِبَ"): ڕۆژگار فەوتاندی.

(أكَلَ فُلانٌ مالي وشَـرِبَهُ): فیسـار داراکەی فەوتاندم.

(شَرَّبَ- هُ): ئاوی دایە بیخواتەوە/ پێیخواردەوە.

(-قَصَبُ الزَرعِ): لاسـکی کشـتەکەی (تێرئاو کرد/ پاراو کرد).

(شـارَبَ- هُ. مُشـارَبَةً و شِـراباً): لەگەڵیدا خواردیەوە.

(أشْـرَبَ- هُ): خواردنـەوەی دایـە/ وایکرد بخواتەوە/ پێیخواردەوە.

(أشْـرَبَ- الرَجُـلُ) (ضد): ١-حوشـترەکانی تێرئاو بوون ٢-حوشـترەکانی تێرئاو نەبوون تینوو بوون.

(تَشَرَّبَ- الثَوبُ العَرَقَ): جلەکە ئارەقەکەی/ خوویەکی هەڵچنی/ هەڵمژی.

(تَشارَبا): پێکەوە خواردیانەوە.

إشْـرَأَبَّ- لِلشَـيءِ وإلَيهِ): بۆ بینینی شتەکە ملەقوتێیکرد.

(ألشُرْأبِيبَة): ملەقوتێکردن.

(ألشَـرْب) (مص): کۆی وشـەی (الشـارِب)ە (فا): خۆرەوە.

(ألشِـرْب (مـص) (ج) أشْـراب): ١-ئـاوی خواردنـەوە ٢-کاتـی خواردنـەوە ٣-بـەش و بەرکەوتی ئاوی خواردنەوە ٤-سەرچاوەی ئاو.

(ألشَـربَة): ١-جارێك خواردنـەوە ٢-قومێك ئـاو یان هەر خواردنەوەیەکیتر ٣-شـەربە کە ئاوی خواردنەوەی تێدەکەن ٤-(طب) دەرمانی ڕەوانکردن.

(ألشُربَةُ): ئاوی پێویستی (ئاوداشتن/ ئاودان).

(ألشَربَةُ (ج) شَرَب وشَرَبات): خواردنەوەی زۆر.

(ألشَراب (ج) أشْرِبَة): هەرچی بخورێتەوە.

(ألشَـرابيُّ): ئـاودەر/ کەسـێکە خواردنەوە بگێڕێت و بیدا بە خەڵك.

(ألشُرَبَةُ والشَرّاب والشِرِّيب): ١-کەسێکە زۆر بخواتەوە ٢-ڕاهاتووی خواردنەوە/ کەسـێکە خواردنەوە بووبێت بە خووی.

(ألشَرّابَة): مێی وشەی (ألشَرّاب).

(ألشـارِب (فـا) (ج) شُـرب): بخـۆرەوە/ شەرابخۆرەوە.

(ألشـارِبَةُ (ج) شـارِبات وشَـوارِب): ١-مێی وشەی (الشارِب) ٢-خەڵکێك کە لەسەر لێواری ڕووبار نیشتەجێبن.

(أَلشَوارِب) (ع ا): ١-رەگی ناو گەروو ٢-ئاوەڕۆی ناو گەروو.
(أَلشُرُوب): خەڵکانێك کە دەخۆنەوە.
(أَلشَرُوب): ١-ئەوەی زۆر بخواتەوە ٢-کەسێکە خووی بە خواردنەوەوە گرتبێت.
(ماءٌ شَروبٌ): ئاوێك بۆ خواردنەوە بشێت.
(أَلشَــرِيب): ١-ئەوەی زۆر بخواتەوە ٢-ئەوەی لەگەڵتــدا دەخواتــەوە ٣-ئــەوەی لەگەڵتــدا حوشترەکانی دەهێنێتە سەرئاو ئاویاندەدات.
(ماءٌ شَــرِيب): ئاوێکە بە کەڵکی خواردنەوە دێت.
(أَلمَشْــرَب (ج) مَشــارِب): ١-ئــاو ٢-شــوێنی ئاوخواردنەوە ٣-حەزو ئارەزووی دڵ/ هەوەس.
("وافَقَ الأمرُ مَشْرَبَهُ"): کارەکە بە پێی حەزو ئارەزووی دڵی ئەو بوو.
(أَلمَشْرَبَة والمَشْرُبَةُ (ج) مَشارِب) (ز): ١-زەوی نەرمانــی زۆنگ کە هەمیشــە گژوگیای تێدا رواوە ٢-ژوورێــك کــە تیایــدا دەخۆنەوە ٣-شوێنی ئاولێخواردنەوە ٤-خواردنی ئاوکێش.
(طَعــامٌ ذو مَشْــرَبَة): خواردنــی ئاوکێش/ خواردنێك کە ئاوی زۆر لەسەر دەخۆیتەوە.
(أَلمِشْرَبَة (ج) مَشارِب): دەفری پێخواردنەوە (جام، کۆچەڵە، پەرداخ/ کاسە).
أَلمَشــروب) (مفــع): هەرچــی دەخورێتەوە. خواردنەوە.
٢-(شَرِبَ. شَرَباً): ١-تینوێبوو ٢-حوشترەکانی تینویانبوو (ضد): تێرئاوبوون.
(أَشْرَبَ- الرَجُلُ): ١-تینوێبوو ٢-حوشترەکانی ١-تینویانبوو (ضد) ٢-تێرئاو بوون.
(أَلشَــرَبَةُ (ج) شَرَب وشَــرَبات): ١-قرچەی گەرما ٢-تینوێتیی.
٣-(شَرِبَ- السُــنبُلُ الدَقيقَ. شُــرْباً وشَرْباً وشِــرْباً و مَشْرَباً وتَشْــراباً): گوڵە گەنمەکە شیلەی تێزا.
(شَــرَّبَ- السُــنبُلُ الدقيقَ): گوڵە گەنم یان جۆکە شیلەی تەواوی گرتووە.
(أَشْرَبَ وأُشْرِبَ الزَرعُ): کشتەکە دانیگرتووە/ کامڵبووە.
٤-(شَرِبَ- بِهِ. شَرَباً): درۆی بۆ هەڵبەست.
(أَشْرَبَ- بِهِ): درۆی بۆ هەڵبەست.
("أَشْــرَبَني مالَــم أَشْــرَب"): درۆی وای بــۆ هەڵبەســتم کــە مــن شــتیوام نەکردبێتو نەوتبێت.
٥-(شَرَبَ- الكَلامَ. شَرباً): قسەکەی (وەرگرت/ تێگەیشت).
٦-(شَــرَّبَ- القِربَــةَ): کونــدە تازەکەی پڕ لــە قوڕاوکرد تا کە ئاوی تێکــرا چێژو تامی خۆشبێت.
(أَشْرَبَ- اللَّونَ): ڕەنگەکەی (تێر/ تۆخ) کرد.
(-الثَوبَ حُمْرَةً): جلەکەی سووری تێرکرد.
("أُشْــرِبَ حُبَّ فُلانٍ"): خۆشەویستی فیسار چوو بە دڵیا.

(إِسْتَشْرَبَ- لَونُهُ): ڕەنگەکەی تێر بوو.
(اَلشُرْبَةُ): ئاڵیی ڕەنگ/ سووریی ڕوومەت لە دەموچاودا.
("فِي وَجهِهِ شُربَةٌ مِن حُمْرَةٍ"): ڕەنگی ڕووی سورباوە.
٧-(أَشْرَبَ- الإبلَ): حوشترەکەی بەستەوە.
٨-(اَلشَرَبَةُ): ١-زەوی چیمەنە جاری بێدرەخت ٢-تەنشتی دۆڵەکە ٣-ڕێگا/ ڕێباز.
(مازالَ فُلانٌ على شَــرَبَةٍ واحِدَة): هێشـتا فیسار لەسەر ڕێبازێکە.
(اَلشَــرَّابَة (ج) شَراريب): ڕیشــووی قێستی پیاوانە.
(اَلشارِب): سستیی‌و بێهێزیی زیندەوەر.
(شارِبُ الرَجُلِ): ســمێڵی پیاو (لە عەرەبیدا دەکرێــت بە دوان دەوترێت، (شارِبا الرَجُل): واتا هەردوو بەری سمێڵی پیاوەکە (ج).
(شَوارِبُ الرَجُلِ): واتا تووکی هەموو لایەکی سمێڵی.
٩-(اَلشُــرابِت): ١-چەپکەورە لەپکەورە ٢-(ح) شێر.
١٠-(شَربَقَ- الثَوبَ): جلەکەی شڕووڕکرد.
١١-(اَلشَــربين) (ن): عەرعــەری کێــوی/ هەڤریســک- جۆرە ڕەگەزی دارە لە کۆمەڵەی کاژە وەك سەرووە بەڵام لەو سوورترەو بۆنی تیژتــرەو بۆنی خۆشــترە گەڵاکــەی پانترەو بەرەکەی بچووکترە لە دەشت‌و کێو لە وڵاتانی دەریای ســپی دەڕوێت‌و لــە باخچەکاندا زۆر دەڕوێنرێــت‌و قەترانــی لێدەگیرێت‌و دارەکەی داری چاکە.
شــرث: (شَــرِثَ وانشَــرَثَ-ت يَدُهُ. شَرَثاً): پشتیدەســتی زبرو ئەســتوورو شەقار شەقار بوو بە هۆی سەرما یان شتێترەوە.
(-الرَجُلُ): پشتی دەستی بە سەرما یان شتێتر قلیشاو زبر بوو.
(شَــرِث): کەســێکە کــە پشتیدەســتی زبرو ئەستوورو قلیشاو بێت.
(-تِ النَعــلُ): پێڵاوەکــە دادڕدادڕ بــوو/ شەقیبرد.
(اَلشَرْث): هەموو شتێکی دڕاو/ شڕووڕ.
(اَلشَرثَة): پێڵاوی دڕاو/ شڕ.
(اَلشَــرِث- مِنَ السُيُوف والأَسِــنَّة): شمشێرو نووکی نێزەی تیژکراو.
شــرج: (شَــرَجَ- الشيءَ. شَــرْجاً): شتەکەی (کۆکردەوە/ گرمۆڵە کرد).
(-الشَــرابَ بِالماءِ): ئاوی تێکەڵ شــەربەتەکە کرد.
(-الحِجــارَةَ): بەردەکانی خســتە پاڵ یەك‌و ڕێکیخست‌و ڕیزیکردن.
(-الخَريطَــةَ): دەمی توورەکە پێســتیەکەی هێنایەوە یەك‌و بەستی.
(-الثَوبَ): جلەکەی شاش دروو.
(سَــرَجَ (عامية) = شَــرَجَ. شُــرِّجَ- اللَّحْمُ):

چەوری/ بەز تێکەڵ بە گۆشتەکە بوو.
(أَشْــرَجَ- الحِجــارَةَ): بەردەکانی خســتەپاڵ یەكو ڕێکیخستن.
(-الخريطَةَ): شتەکانی لە توورەکە پێستییەکەدا قایمکردو دەمەکەی بەست.
(أَشْــرَجَ-صَدرَهُ على كذا): ئەو شتەی خستە دڵیەوەو نهێنیکرد.
(تَشَرَّجَ- الشيءُ في الشيءِ): شتەکان بەناویەکدا چوون.
(اَلشَرَج (ج) أَشراج): ١-قوڵفە ٢-کۆم.
(اَلشَــرِيْجَة (ج) شَــرائِج): ١-جەواڵێــك/ خەرارێك کە لە گەڵای دارخورما دروستبکرێت ٢-تەپمانەچنراوێکــی قامیشــی کــە لەبــەر دووکانەکەدا بەردەدرێتەوە.
(اَلتَشْــرِيج): درووماني شلی شــاش، خەڵکە ڕەمەکییەکە پێیدەڵێن: (تَسْرِيج).
٢-(شارَجَ- هُ): وەك ئەو بوو/ لەویکرد/ چون ئەو بوو.
("فَتَياتٌ مُشارِجات"): کچانێکی هاوتەمەن.
(تَشارَجا): هاوشێوە بوون/ لەیەکچوون.
(اَلشَرْج (مص) (ج) شِراج وشُرُوج): جۆر.
("هــذا شَــرْجُ ذاك"): ئەمە (لــەو جۆرەیە/ لەیەکن).
("هُمَــا شَــرْجٌ واحِــدٌ"): هەردووکیــان لــە جۆرێکن.
(اَلشَرِيج (ج) شَرائِج): هاوشێوە/ وەك یەك/ لەیەکچوو.
(هُوَ شرِيجُهُ): لەیەکچووی یەکن/ هاوجۆرن.
٣-(شَرَجَ. شَرْجاً): درۆیکرد.
٤-(إِنْشَرَجَ- الشيءُ): شــتەکە یەکالابــووەوەو بوو بە دوو کەرتی وەك یەکەوە.
(اَلشَرْج (ج) شِراج وشُرُوج): تیپە دەستە.
(أَصبَحوا في الأَمرِ شَــرْجَين): لــە کارەکەدا بوون بە دوو تیپەوە.
(اَلشَرْج (ج) أَشْراج): هەڵقڵیشانی کەوانەکە.
(اَلشَــرِيج (ج) شَــرائِج): ١-لەتــی چێوەکە، چێوەکــە بکرێــت بە دوو قڵیشــی/ دوولەتی وەك یەکەوە ٢-چێوەکە کە هەڵدەقڵیشــێت و دوو کەوانی لێدروستدەکرێت.
(قَوسٌ شَــرِيج): کەوانێکە کە لــە چێوێکی ڕاستە قڵیشاو دروستبکرێت.
٥-(اَلشَــرْج (ج) شِراج وشُــرُوج): ئاوەڕۆ لە شوێنێکی بەرزەوە بۆ پێدەشت.
(اَلشَرْجَة)٢-ئاوەڕۆ لە بەرزاییەوە بۆ پێدەشت ٢-چاڵێکە پێستێکی تێدا ڕادەخرێت و ئاوی بۆ حوشتر تێدەکرێت.
(اَلشَرَج (ج) أَشْراج): پانتایی دەرەی دۆڵ.
(اَلشَرِيجَة (ج) شرائِج): شوێنی چەسپاندنی پەڕ لە تیرەکەدا.
(اَلشيرِج): ڕۆنی کونجی (فارسية)
(اَلســيرِج (عامية) = اَلشيرِج. سَهْمٌ مُشَرَّج): تیرێك کە بنەکەی پەڕی پێوەکرابێت.

٦-(اَلشَــرجَب) (ح): ١-چارەوێی ڕەســەن ٢-لۆفدرێژ.

(اَلشَــرْجَبان والشُــرْجُبان) (ن): ڕووەکێکە وەك باینجانە پێستەی پێخۆشە دەکرێت.

شرح: ١-(شَرَحَ- اللَّحْمَ. شَرْحاً): گۆشتەکەی توێ توێی درێژ کرد.

(شَــرَّحَ- الشَــيءَ): شــتەکەی لەتلەتــی جیاجیاکرد.

(-قِطعَةَ اللَّحم): لەتی گۆشتەکەی تەنککرد.

(اَلشَرْحَة): کوتە گۆشتێکی تەنك.

(اَلشَريح والشَــريحَة (ج) شرائِح): ١-هەموو (پارچەیەکــی/ کوتێکــی) گۆشــت ٢-هەموو گۆشتێکی چەوری توێکراو.

(عِلْمُ التَشريح) (طب): زانستیی توێکردنو لەتکردنی لەشــی مردوو بۆ گــەڕان بە دوای چۆنیەتیــی دروســتبوونیو دۆزینــەوەی دەردەکانی.

٢-(شَــرَحَ- المَسألَةَ. شَــرْحاً): پرسە بابەتەکەی دەرخستو شیکردەوەو نادیارەکانی ڕوونکردەوە.

(-الكلامَ): ئاخاوتنەکەی تێگەیاند.

(-الشيءَ): ١-شتەکەی کردەوە ٢-فراوانکرد.

(-إلى الشيءِ): حەزی بۆ شتەکە دەربڕی.

("فُلانٌ يَشرَحُ إلى الدنيا"): فیسار دەربڕی کە حەز لە دنیا دەکات.

(-صَدْرَهُ لِلشَيء وبِالشَــيءِ): دڵی بە شتەکە کرایەوەو پێیخۆشبوو.

(شَــرَّحَ- الشَــيءَ): شــتەکەی دەرخســتو والأیکرد/ یەکالأیکردەوە ئاشکرایکرد.

(شَــرَّحَ التِّــين تَشــريحاً) (عنــد العامة): هەنجیرەکــەی یەکالاکــردەوەو خســتیە بەر هەتاو تا وشکببێتەوە.

(اَشْــرَحَ- صَــدرَهُ): دڵیکردەوەو خۆشــی بە دڵیدا/ دڵی ڕوونکردەوە.

(إنْشَرَحَ): ١-کرایەوەو ڕووبنووەوەو دەرکەوت ٢-دڵی خۆشیی تێکەوت.

("شَــرَحَ اللهُ صَدرَهُ لِقَبولِ الخَير فانشَــرَحَ): خودا بۆ چاکە دڵی فراوانکردو دڵی کرایەوەو گوشاد بوو.

(اَلشَــرح: عنــد المؤلفــين): ڕاڤەکــردن/ لێکۆڵینەوەو لەسەر دەقنووسین.

(الإنشِــراح): دڵکرانــەوەو گوشــادبوون، پێخۆشحاڵیی/ ستارە بە دڵگەیاندن.

٣-(شَرَحَ- الشيءَ شَرْحاً): پاراستی.

الملحق:

شرح: (شَرَّحَ الجُثَّةَ): لاشەکەی لێکهەڵوەشان/ جیاکردنــەوەی ئەندامــی مردووەکــەو لێکهەڵوەشــانی جوســتەی بــۆ ئــەوەی هۆی مردنەکــە بزانرێــت. یــان بۆ تێگەیتشــنی زانستیی لاشەکە.

(اَلمَشرَح): مێزی لێکهەڵوەشاندنی تەرمەکە.

(غُرفَةُ التَشــريح): ژووری لێکهەڵوەشــادنی تەرمی مردوو و لێکۆڵینەوەی.

شــرخ: ١-(شَــرَخَ- نــابُ البَعــير. شَــرخاً وشُــرُوخاً): كەڵبەی حوشــترەکە پووکەکەی هەڵدڕیو دەرچوو.

(-الصَبِيُّ- شُــروخاً): منداڵەکە بوو بە لاو/ هەرزەکار.

(شارِخ (ج) شَرْخٌ): هەرزەکار.

(اَلشَــرْخ (مــص) (ج) شُــرُوخ): ١-بنەڕەت/ بنچینە ٢-هەرەتی هەرزەکاریی/ تاڤی هەرەتی لاویی.

(هُوَ في شَــرخِ الشَّــباب"): ئەو لــە هەرەتی لاویدایــە. ٣-لای لووتی دەرپەڕیــوی هەموو شتێك ٤-سەرەتای کار/ یەکەمجار ٥-دەمار.

(شَــرخا الرَحْلِ): ئەمســەرو ئەوسەری زین یان کورتان.

("فُلان لايَزال بين شَــرخَيِ رَحلِهِ"): فیسار هەر لەکاروانو سەفەردایە.

٢-(اَلشَرْخ (ج) شُرُوخ): هاو (تەمەن، وێنە، تا، شێوە، جۆر) چونیەك. وەك ("هُوَ شَرخي"): ئەو هاوتای منە/ وەك منە/ لە وێنەی منە.

(هما شَرخانِ): ١-ئەو دوانە وەك یەکن.

(اَلشَــرخ): ٢-بەرهــەمو بەچکەی ســاڵانەی حوشتر.

٣-(اَلشُرْخُوب (ج) شَراخيب) (ع ا): ئێسکی بڕبڕەپشت.

شــرد: ١-(شَــرَدَ. شَــرْداً وشُروداً وشِــراداً وشِراداً): تەرەبوو.

(-على اللهِ): نافەرمانبوو/ لە خودا یاخیبوو/ سەرپێچیی فەرمانی خودایکرد.

(شــارِد (ج) شَــرَد وشَــرُود (ج) شُرُود (م) شــارِدَة (ج) شَــوارِد وشُــرَّد): تەرە، یاخی، نافەرمان/ ڕۆیشتوو.

(شَــرَّدَ- هُ): دەریکــرد/ دەربەدەریکــردو تەرەیکرد.

("فُلانٌ مُطَرَّدٌ مُشَــرَّدٌ"): فیســار دەرکراوو دەربەدەرو تەرەکراوە.

("طريدٌ شَريد"): دەرکراوی دەربەدەر.

(شَــرَّدَ- شَــمْلَهم): کۆمەڵــی کــۆی پەرشو بڵاوکردنەوە.

(-بِفُلانٍ): کەموکووڕیی ئەوی بەناو خەڵکدا بڵاوکردەوەو بە خەڵکی ڕاگەیاند.

(اَشْرَدَ- هُ): تەرەو دەربەدەریکرد.

(تَشَرَّدَ- القَومُ): ١-ڕۆیشتن ٢-تەرەبوون.

(قافِيَة شــارِدَة وشَرُود): ســەرواى بە وڵاتدا بڵاو/ واتە هەڵبەستەکە بەناوبانگە.

(اَلشَــرْد) (عامية): بارانێکە کە با بەماڵیدا دەکات.

(شَــوارِدُ اللُغَــة): ناوێزەو ســەیرەکانی ناو زمان.

اَلشَريد= الطَريد): ڕاونراوو دەربەدەرکراو.

(اَلشَــريدَة (ج) شَــرائِد): ١-مێــی وشــەی (اَلشَريد) ٢-پاشماوەی شت.

٢-(الشِرداح): گۆشتی نەرمەڵۆك/ نەرمەگۆشت.

شرد: (شَرَّذَ- الجَمعَ): كۆمەڵەكەی بڵاوكردەوە.
(الشِرْذِمَة (ج) شَراذِم وشَراذِيم): دەستە خەڵكێكی كەم.
(ثياب شَراذِمُ): جلی شركەو پركە.
شرز: ١-(شَرَزَ- هُ. شَرْزاً): بڕی/ لەتیكرد.
(شارِز (ج) شُرَّاز): بڕەر/ لەتكەر.
(شَرَّزَ- هُ): لەتلەتیكرد.
(الشِيراز (ج) شَوارِيز وشَرارِيز): ماستی (خەستەوەبوو/ ئاولێگیراو).
(اللَبنَة المقطوعة) (عامية): خەستە.
٢-(شَرُزَ- هُ): ١-سزایدا ٢-جنێویدایە.
(شارَزَ): بەدڕەوشتبوو.
(-الرَجلَ): ناكوكیی لەگەڵدا كردو دوژمنایەتیكرد.
(أشْرَزَ- هُ): تووشی گرفتاریی و فەوتانیكرد.
(الشَرْز) (مص): ١-هێز ٢-دڵڕەقیی و خراپیی ٣-توندوتیژیی و بێبەزەیی ٤-سەخت و توند.
("عَذَّبَهُ اللهُ عَذاباً شَرزاً"): خودا سزایەكی سەختیدا.
(الشَرزَة): ٣-جارێك سزادان یان جنێودان ٢-فەوتان و توندو تیژیی/ سەختیی.
(الشُرَّاز): ئەوانەی سزای سەختی خەڵكدەدەن.
(المُشارِز (فا)): ١-توندو سەخت ٢-بەدڕەفتار/ پیاوخراپ/ بەدخوو.
(المُشَرَّز): ١-پێكەوەشەتەكدراو ٢-هەردووسەری (بەناوداچوو/ هەڵپێچراو).

شرس: (شَرِسَ. شَراسَةً وشَرَساً وشَرِيساً): دڕ بوو/ بەدڕەوشت و دڵڕەقبوو.
(شَرِس وشَرِيس وأشْرَس): دڕ سروشت/ بەدڕەوشت و دڵڕەق.
(شَرَسَ- هُ. شَرساً): بە قسەی ڕەق و ناشیرین ئازاری دڵیدا.
(شارَسَ- هُ مُشارَسَةً و شِراساً): دڕندانەو بەدڕەفتارانە لەگەڵیدا جووڵایەوە.
(تَشارَسَ- القَومُ): دوژمنایەتیان لەگەڵ یەكدا كرد.
(الشَرْساء): مێی وشەی (الأشْرَس).
(الشَرِيس) (مص): ١-بەدڕەفتاریی و دڕیی ٢-زۆر ناكۆكیی و نالەباریی.
("فلانَ شرِيسُهُ") نالەباریی و سەرسەختیەكەی نەرمبوو ٣-بەدكردارو دڕ ٤-سەرسەخت و ناكۆك.
("هو ذو شَرِيس"): ئەو بەدسروشت و ناكۆكەو ناگونجێت.
("لَهُ نَفْسٌ شرِيسَة"): دەروونێكی نالەبارو ناكۆك و نەگونجاوی هەیە.
٢-(شَرِسَ-تِ الماشِيَةُ شَرَساً): ئاژەڵەكەی هەر سەرگەرمی خواردنی درەختی دڕكەوردە بوون.
(شَرَسَ- تِ الماشِيَةُ. شَرَساً): ئاژەڵەكە بە پەلەو شپرزەو گەرم دەلەوەڕا.
(الشَرَس (مص) والشَرْس والشِرْس): درەختی دڕكە وردە.

(شَرِيسُ الأَكْلِ): توندخۆر.
(أَرضٌ شريسَةٌ ومُشرِسَةٌ): زەوییەکە درەختی درکە وردەی زۆرە.
٣-(شَرَسَ- الناقَةَ شَرْساً): توند حوشترەکەی بە جلەوەکەی راکێشا.
٤-(الشَرساء): هەوری تەنکی سپی.
(الشِراس): شرێس/ کەتیرە.
(السِراس= الشِراس. الشَريس) (ح): شێر.
٥-(شَرْسَـفَ. شَرسَفَةً): رەوشـتی تێکچوو/ بەدرەوشتبوو.
(الشُرْسُـوف (ج) شَراسِيف): ١- (ع ا) سەری دانەپەراسوو کە بەسەر سکەوەیە ٢-حوشتری بەستراوە ٣-توندیی ٤-وەی/ چورتوم/ بەلا.
شرش: (الشَرْشَف (ج) شَراشِف) (فارسية): چەرچەف.
شـرص: (شَـرَصَ- هُ. شَـرْصاً): رایکێشـا/ بەکێشیکرد.
(شَرَصَ- هُ بِكَلامِهِ): پرجنێویکرد.
(الشَرْص) (مص): ١-توندوتیژیی ٢-دلْرەقیی/ سەختیی.
(الشِرْص (ج) شِراص وشِرَص): لاجانگ.
شـرط: ١-(شَـرَطَ- عَلَيهِ في بَيـعٍ ونَحْوهُ. شَـرْطاً): ١-لە فرۆشـتنو شـتیوادا مەرجی لەگەڵـدا کـرد ٢-پەیمانـی لەگەڵـدا کـردو پێیبەستەوە.
(تَشَرَّطَ): مەرجی پتری بەجێهێنا کە لەسەری نەبوو.
(-في العَمَـلِ): لـە کارەکـەدا وردەکاریکردو چاکی دەرهێنا.
(تَشارَطَ القَومُ): ١-مەرجیان خستە سەریەكو بە مەرج یەکتریان بەستەوە.
(تَشـارَطوا على الشَـيء): لەسـەر شـتەکە مەرجکاریانکردو مەرجیان لەسەردانا.
(إِشْـتَرَطَ- لَهُ كَذا): ئـەو مەرجەی بۆ داناو پێیبەستەوە.
(الشَـرْط (م) شُـروط): مـەرجو خۆپێـوە بەستن.
("الشَـرطُ أَمْلَكُ عَلَيكَ أَم لَكَ"): مەرج تۆی پێوە دەبەسترێتەوە یان بۆ تۆیە.
(الشَـرط- عِندَ النحاة): لای رێزماننناسـان ئەوەیە کـە روودانی کارێك بـە کارێکیترەوە بەسترابێت ئەویش بە ئامرازێك دەبێت وەکو: ( إِن زرتَنـي زُرتُكَ) ئەگەر سـەرت لێدامایە سەرم لێدەدایت.
(الشُرْطَة): ئەو مەرجەی دایدەنێیت.
(الشَريطة (ج) شَرائِط): مەرج.
٢-(شَـرَطَ- الجِلدَ. شَـرطاً): تەشـتەری لە پێستەکەدا/ پێستەکەی دری بۆ ئەوەی خوێن بێتەدەرێ.
(شَرْط الجلد): پێستەکەی دری یان هەڵدری.
(الشَريط (ج) شُرُط): هەڵدراو.
(الشَـريطَةُ (ج) شَـرائِط): حوشـتری گوێ

(هەڵقڵیشاو/ هەڵتڵیشاو).
(اَلمِشْرَط والمِشْـراط والمِشْرَطَة (ج) مَشارِط ومَشـاريط): چەقـۆو تیغـی هەڵدریـن/ نەشتەر.
٣-(شَـرِطَ. شَـرَطاً): کارێکـی گـەورەی بەسەرهات.
(أشْـرَطَ نَفْسَـهُ أو مالَهُ في أمرٍ): خۆی یان ماڵو سامانەکەی خسـتە گێژاوی کارێکی پڕ مەترسییەوە.
(-الإبلَ): حوشترەکەی جیاکردەوەو بانگێشتی فرۆشتنیکرد.
(-نَفْسَهُ لِكَذا): خۆی بۆ ئەوە ئامادەکرد.
(-إلَيهِ رسُـولاً): بە پەلە فرسـتادەیەکی بۆ نارد.
(اَلشَـرَط (مص) (ج) أشْـراط): ١-نیشـانە سەرەتای هەموو شتێك.
(اَلشُـرَط): یەکـەم دەسـتەی سـەرباز کـە لـە پێشـەوە دەچێتـە جەنگـەوەو ئامادەی مردندەبێت.
(اَلشُرْطَةُ والشُرْطِيُّ): کۆمەڵێکی هەڵبژاردەی سەر بە والیو کاربەدەستانو میرانن ٢-ئەمڕۆ بـە پۆلیسـی دەڵێـن چونکە نیشـانەیەکی تایبەتیی هەڵدەگرن کە پێیان دەناسرێن.
٤-(شَـرَّطَ- الشـيءَ): شـتەکەی پێچایەوەو بەست.
(اَلشَـرِيط (ج) شُرُط): پێبەسـتەیەکە کـە بە گەڵای دارخورما دروسـتدەکرێتو نوێنو شتیتری پێدەبەسترێت ٢-سیم/ تەل رووتبێت یـان بەرگـدار لەوانە سـیمو تەلـی کارەباو تەلەفۆنو شتیتر.
(اَلشَـرِيطَة (ج) شرائِط): نۆیەی قژی کچان کەلە ئاوریشـم یـان لۆکە دەبێت سـپی یان ڕەنگاوڕەنگ کە پانییەکەی چوارپەنجە زۆرتر نابێت یان جلی پێ دەرازێنرێتەوە.
(اَلشِـرطَةُ (ج) شَـراطيط) (عاميـة): پارچەیەك کووتاڵی بڕاو.
٥-(أشْـرَطَ- بالشـيءِ و فيهِ): شـتەکەی لا بێبەهابوو بە تەنگیەوە نەهاتو بە شـتێکی هیچی زانی.
(إسْتَشْـرَطَ- المالُ): ماڵەکە باشبوو پاشان لە کەڵککەوتو لەدەستچوو.
(اَلشَـرْط (ج) أشْراط): پوشـتو زمانبەدی نامەرد.
(اَلشَرَط (ج) أشْراط): ١-شتی گەندەو بێکەڵك ٢-ماڵیاتی بچووك ٢-ئاوەڕۆی بچووك.
(هُوَ مِن شَـرَطِ الناسِ وأشْـراطِهِم): ئەو لە ڕسواو سووکترینو نامەردترینی خەڵکە.
(اَلأشْـراط) (ضـد): ١-ڕسـواترینی خەڵـك ٢-خانەدانو وەجاخزادەی ناو خەڵکە.
(شُـرْطَةُ كُلِّ شـيءٍ): هەڵبـژاردەو ناوێزەی هەموو شتێك.
(أشْرَطُ الناسِ): سووکترینو ڕسواترینی خەڵك.

٦-(اَلشَريط (ج) شُرُط): جانتای دەستی ژن کە بۆن و شتی خۆی تێدەخات.
٧-(شَرْطَنَ- هُ) (یونانیة): پایەیان بەرزکردەوە بۆ پلەیەکی کەهەنووتی. ئەمڕۆ نووسەران دەڵێن: (کَهَّنَهُ وسامَهُ کاهِناً): (نیشانەکەی/ لێهاتووییەکەی) کردی بە قەشە.
(اَلشَرطُونِیَّة): کتێبێکە کە ئاهەنگی پلەوپایەی کلێسەی تێدایە کە قەشە دیاریدەکات.
شرع: ١-(شَرَعَ- للقَومِ شَرْعاً): دەستووری بۆ دانان.
(-لَهُم الطَریقَ): ڕێ و ڕێبازی بۆ دیاریکردن و دەرخستن.
("شَرَعَ الله لَنا کَذا بِشَرعِهِ"): خودا بە شەرعی خۆی ئەوەی بۆ ڕوونکردوینەوەو دەریخستووە.
(-الرَجُلُ): پیاوەکە ڕاستی و هەقی دەرخست و ناهەقیی و ناڕاستیی پووچەڵکردەوە.
(-الطَریقُ. شَرْعاً وشُروعاً): ڕێبازەکەو ڕێگەکە دەرکەوت/ دیاربوو.
(شَرَّعَ وأَشْرَعَ- الطریقَ): ڕێگەکەی دەرخست/ دیارکرد.
(إشتَرَعَ الشَریعَةَ): یاسا یان شەریعەتی دانا.
(اَلشَرع) (مص): ئەو یاساو شەریعەتەی خودا بۆ بەندەکانی خۆی داناوە.
(اَلشِرع والشَرَع): نموونە/ وەك/ چوونیەك/ هاویەك.
("النّاسُ في هذا شرعٌ واحِدٌ"): خەڵکی لەمەدا وەکیەکن/ چوونیەکن.
("هُم في هذا شرعٌ"): ئەوان لە مەدا یەکسانن و چوونیەکن.
("هُما شِرعان"): ئەو دوانە وەکو یەکن.
(اَلشِرعَةُ (ج) شِرْع وشَرع وشِرَع وشِراع): ١-شەرع/ شەریعەت ٢-ئەریت ٣-وەکیەك/ وەك ئەو/ چوونیەك.
(هذه شَرعَةُ هذه): ئەمە وەك ئەومیە.
(اَلشَریعَة (ج) شَرائِع): ١-یاسا/ دەستوور ٢-ئەو یاساو دەستوورانەی خودا بۆ بەندەکانی خۆی داناوە.
(اَلشَرعِيّ): ئەوەی بە پێی شەرع و دەستووری خودایە.
(الابن الشَرعي): زاڕۆڵەیەك کە بە شەرعی بکرێت بە زاڕۆڵەی خۆ وەك زاڕۆڵەی ڕەسەن و سرووشتی لێبکرێت.
(المشروع): ١-شتێکی ڕەواو دروست بە پێی شەرع ٢-پرۆژە.
٢-(شَرَعَ- البیتُ شرعاً): خانووەکە لەسەر شەقامە گشتیەکەدا بوو.
(- البابَ إلى الطَریقِ): دەرگاکەی خستە سەر شەقامەکە.
(شَرَعَ البابُ): دەرگاکە کەوتە سەر شەقامەکە.
(-فُلانٌ عَلَینا. شَرْعاً وشُروعاً): فیسار

نزیکمانبووەوەو بەسەرماندا ڕوانی.

(أَشْرَعَ- بابَهُ إلى أو على الطريقِ): دەرگاکەی خستە سەر شەقامەکە.

(الشارِع (ج) شوارِع): شـەقام/ شەقامەڕێ/ جادە.

(بَيتٌ شـارِعٌ): خانوویەك نزیك شەقامبێت. یان لەسەر شەقامو ڕێگابێت.

(الشَـوارِع مِنَ النُجوم) (فك): ئەستێرانێك كە نزیكی ئاوابوونبن.

(الشَريعَةُ (ج) شَرائِع): ئاستی دەرگا.

٣-(شَرَعَ- في الماءِ. شَرْعاً وشُروعاً): چووە ناو ئاوەكەوە یان بە مشت ئاویخواردەوە.

(-الوارِدُ): هاتووەكە دەمی خستە ئاوەكەوەو ئاویخواردەوە.

(-الماشِيَةَ): ئاژەڵەكەی كردە سەر ئاوەكە.

(-الأَمرَ): دەستی بە كارەكە كرد.

(-في الأَمرِ): چووە ناو كارەكەوە.

(-بِفُلان): فیساری هێنایە سەر ئاوەكە.

(-يَضرِبُ): دەسـتی بە لێدانكرد (لە كردارە نزیككردنەكانە) (افعال المقارنة)

(شَـرَّعَ وأَشْـرَعَ- هُ في الماءِ): ئەوی كردە ناو ئاوەكەوە/ خستیە ناو ئاوەكەوە.

(الشِرعَةُ (ج) شِـرْع وشَرْع وشِرَع وشِراع): ڕێگەیەك كە دەچێتە سەر ئاو.

(الشُرَّع والشُروع): ناو ئاو چوو.

(إِبِلٌ شُرَّع وشُـرُوع): حوشترگەلێك چووبنە ناو ئاوەوە.

(الشَـريعَة (ج) شَـرائِع): سـەرچاوەی ئاو/ دەراوی ئاو/ شـوێنی ئـاو (هێنان/ وەرگرتن) لە ڕووبارەكە.

(المَشرَع والمَشرُعَة والمَشـرَعَة (ج) مَشارِع): شوێنی وەرگرتنو خواردنەوەی ئاوی.

(الأَمرُ – المَشروع): كارێكی دستپێكراو.

٤-(شَـرَعَ- الرِمـاحَ. شَـرْعاً وشُـروعاً): نێزەكەكانی ڕاستكردەوەو ئاراستەیكردن.

(تَسَـدَّدَت وتَصَوَّبَـتِ الرمـحُ): نێزەكـە ڕاستبووەوەو ئاڕاستەبوو.

(أَشْـرَعَ- عليه الرِمحَ): ڕمەكەی ئاڕاسـتەی ئەو كرد.

(الشـارِع (م) شـارِعَة (ج) شُـرَّع وشُـرُوع وشَوارِع) (فا): ئاڕاستەكار.

(رِماحٌشارِعَةوشَوارِع)١-نێزەئاراستەكراوەكان ٢-نێزە ڕاستو لووسكراوەكان.

(الشِراع (ج) أَشْرِعَة وشُرُع): ژێی توندكراوی كەوان.

(الشُراعِيّ- مِن الرِّماح): نێزەی درێژ كە بە ناوی یەكێكەوە ناونراوەو كە دروستیكردووە ناوی (شُـراع) بووە كە نێزەو نووكو سەری نێزەی دروستكردووە.

(الشَـرعَةُ والشِرعَةُ (ج) شِرْع وشَرْع وشِرَع وشِراع): ژێی كەوان.

("ضربوا على الشَرَعِ"): لە ژێكانیاندا. واتا لە

دەهۆڵی خۆیاندا.
(اَلشّــرع): ١-ژێ عوود ٢-ئاوزەنگی سـۆڵ کە وەکو ژێ وایە.
(اَلمَشروع): ١-راستو دروست ٢-شیاو.
٥-(شَرَعَ- الشَّيءَ. شَرعاً): شتەکەی زۆر بڵند کردەوە.
(-الحَبلَ): پەتەکە گرێداو هەردوو سەرەکەی بە کونەکەدا کرد.
(شَــرَّعَ- السَــفينَةَ): چارۆکەی بۆ پاپۆڕەکە کرد.
(- الحَبلَ): سەری گوریسەکەی گرێدا.
(أَشْرَعَ- الشَيءَ): شتەکەی زۆر بەرزکردەوە.
(اَلشِراع (ج) أَشرِعَة وشُرُع): ١-هەموو شتێك کـە قنـچ و راسـت بکرێـت و بەرزبکرێتەوە ٢-وەك چارۆکـەی پـان کـە هەڵدەدرێـت و بەرزدەکرێتەوەو لەسەر پاپۆڕ دادەمەزرێت کە با لێیدەدات دەبێتە هۆی رۆیشـتنی پاپۆڕەکە ٣-ملی حوشـتر (کە بە چارۆکـەی هەڵکراوی پاپۆڕ چوێنراوە لەبەر درێژیی.
("رَجُلٌ شراعُ الأَنف"): پیاوێکی لووتدرێژ.
(اَلشِراعِيُّ مِنَ الإِبِلِ): حوشتری ملدرێژ.
(اَلشَرعَةُ (ج) أَشراع): پاپۆڕ.
(اَلشِرعَةُ (ج) شِــرْع وشَرْع وشِرَع وشِراع): پەتی/ داوی گرتنی قەتێ/ کورکور.
(أَنفٌ أَشرَعُ): لووتێك پەرەکەی درێژبووبێتەوە.
(اَلمُشَرَّعَ- مِنَ البيُوتِ): خانووی بەرز/ بڵند.

٦-(اَلشَراعَة): ئازایەتیی/ دلێریی.
(اَلشَرّاع): فرۆشیاری کەتانی چاك.
(اَلشَريع): ١-دلاوەر/ دلێر ٢-کەتانی چاك.
(اَلشَريع- مِنَ الليف): تاڵی قایمی ریشوو کە ئەستورو بووبێتو بۆ درووومان بەکەڵکبێت.
(اَلمِشــرَع) (مو): ئامێرێکە وەك تۆپە سەمای کاتژمێــر کــە ئامــاژەی خێرایــی جووڵەی مۆسیقاکە دەکات لە هەموو پلەیەکدا.
٧-(شَــرْعَبَ الأَديمَ): چەرمەکەی بە درێژیی بری.
(اَلشَرْعَبُ): درێژ.
(اَلشَــرْعَبِيُّ): ١-جـۆرە بەرگێکـی میلدارە ٢-کەسێکی بۆشناخی شۆخ و لەشجوان.
الملحق:
شرع: (اَلشَــرعِيَّة): نیشانەیەك یان رەوشێك کە شیاوو رەوابێت.
(شَرعِيَّةُ العَقد): یاسایی گرێبەست.
(شرعِيَّةُ إِجراء): یاسایی ئەنجامکاریی.
(اَلتَشريع): یاسادانان.
(سُلطَةُ التَشريع): دەسەڵاتی یاسادانان.
(مجموعَةُ القَوانين في حَقلٍ مُعَيَّن): کۆمەڵە یاسایەك بۆ بابەتێکی تایبەتی.
(تَشريعُ العَمَل): دانانی یاسای کارکردن.
(اَلتَشريعُ المالِي): دانانی یاسای دارایی.
(اَلتَشريعيّ): یاسایی.
(عَمَــلٌ تَشــريعِي): کارێکــی یاســایی یــان

یاسادانان.

(الخاص بِالجَمْعِیَّة التَشــریعیَّة): تایبەتە بە کۆمەڵەی یاسادانان.

(إنتِخاباتُ تَشریعیة): هەڵبژاردنی ئەنجومەنی یاسادانان.

(اَلمَجلِسُ التَشریعي): ئەنجومەنی یاسادانان.

(اَلسلطة التَشــریعیَّة): دەسەلاّتی یاسادانان: ئەو دەســتەیەیە کە یاســا بۆ وڵات دادەنێتو ڕێڕەوی پەیرەویکردنی دیاریدەکات.

(اَلمَشروعِیَّة): ڕەوشێك/ بارێك یان نیشانەیەك کە ڕەواو یاسایی بێت.

("مَشْــرُوعِیَّة حقٍ"): ڕەوایی یان ڕەوابوونی مافێك.

---

شــرف: ١-(شَــرُفَ. شَــرافَةً وَشــرَفاً): بــە نامووســبوو/ ناموســداربوو ٢-خانەدانبوو/ ســالاریی پەیداکرد ٢-بەرزیی ئاین‌و جیهانی بەدەستهێنا.

(شَــرَفَ- هُ. شَــرْفاً): لــەو بــە ناموســترو خانەدانتر بوو/ لەو بەرزتر بوو.

(مَشْرُوف): بە ناموس‌و بەرزو خانەدان.

(شَرَّفَ- ه): ١-شــکۆداریکرد/ خاوەننگینکرد ٢-بە گەورەیگرت‌و مەزنیکرد.

(شارَفَ- هُ): شانازیی گەورەیی خۆی بەسەردا کرد.

(تَشَرَّفَ-الرَجُلُ): نگین‌و شکۆیدەستگیر بوو.

(-بِکَذا): ئەوەی بە نگین‌و گەورەیی بۆ خۆی زانی‌و شانازیی پێوەکرد.

(تَشُرِّفَ- القَومُ): گەورەپیاوەکانی خوێشگەل کوژرا.

(إسْتَشْــرَفَ- الشاةَ): دەســتی لە مەرەکەداو وێقلەمەیکرد تا بزانێت بێخەوشەو بە ساغیی ببیات (لە وشەی (شُــرْفَة) وە وەریگراوە کە واتای هەڵبژاردەی ماڵیات وەرگیراوە.

(اَلشَــرَف) (مص): ١-نگین‌و شکۆو بەرزیی ٢-وەجاخزادەیی/ خانەدانیی.

(اَلشَریف): خاوەن نگین‌و شکۆدار.

("هُوَ شَرَفُ قَومِهِ وکَریمُهُم): ئەو خانەدان‌و جوامێری نەتەوەکەیەتی.

(اَلشَــرفَةُ): خانــەدان‌و وەجاخــزادە لــە باوکانەوە.

(اَلشُــرفَةُ مِن المال): گەنج‌و ســامانی چاك‌و ناوێزە.

("أُعِدُّ زِیارَتَکُم شُــرْفَةً"): سەردانەکەتان بۆ مــن مایەی ســەروەریی‌و ســەربەرزیمە پێی گەورە بووم.

(اَلشــارِف (فا) (ج) شُــرَّف وشُرُف وشُروف وشُرْف): کەسێکە کە بەو نزیکانە سەروەریی‌و شکۆیی بەدەستدەهێنێت.

(اَلشَــریف): دەبێتە خاوەن نگین‌و ســەروەر دەبێت.

(اَلشَریف (ج) شُــرَفاء وأشراف (م) شَریفَة (ج) شَرائِف وشَریفات): پایەبەرز/ نگیندار/

شكۆدار.

(-عِنـدَ المُسـلمين): لای موسـوڵمانەكان بە نەوەی پێغەمبەر دەڵێن‌و پێشیدەڵێن سەید.

(اَلخَطُ الشَّـریف): ئەو نامانەو نووسینانەی كە سـوڵتان بە دەسـتی خۆی دەینوسـێ یان فەرمان بە نوسوینی دەدات.

(نَقیـبُ الأشـراف): رەچەڵەكراگـی نەوەی پێغەمبەر (بۆ ئەوەی بێگانەیان تێنەكەوێت‌و بڵێ من لە نەوەی پێغەمبەرم).

(اَلشَـریفَة قولُهُم "فلان نَفسُـهُ شریفَة"): دەوترێت فیسـار دەروونی بەرزەو بێزی شتی نزمی نایەت (عامیة).

(اَلأشْرَف): پایەبەرزترو شكۆدارتر/ نگیندارتر.

٢-(شَرَفَ- الحائِطَ شَرْفاً): كلاوی/ گوێسوانەی بۆ دیوارەكە كرد.

(شَرِفَ. شَرَفاً): بەرزبووەوە/ بڵند بوو.

(شارَفَ المَكانَ): سەری شێوەنەكەوت.

(-الشيءَ): لەسەرەوە بەسەر شتەكەدا ڕوانیی.

(شَرَّفَ- البَيتَ): باركۆنی بۆ خانووەكە كرد.

(-المَكانَ): سەركەوتە سەر شوێنەكە.

(أشْرَفَ- الشيءُ): شتەكە بەرزو بالا بوو ٢-ڕاست‌و قنج وەستا.

(-المَكانَ): سەركەوتە سەر شوێنەكە.

(عَليـهِ): ١-لــە سـەرەوە بەسـەریدا ڕوانیی ٢-سەرپەرشتیكرد ٣-بەزەیی پێداهاتەوە.

(تَشَـرَّفَ- البَيـتُ): خانووەكـە باركۆنـی زۆربوو.

(-المَكانَ): سەر شوێنەكە كەوت.

(-الشَـيءَ): دەستی خستە سـەر برۆی وەك سـێبەر بـۆ چـاوی بـكات‌و چـاوی هەڵبڕی تەماشای شتەكە بكات.

(-للشَيءِ): لە شتەكەی ڕوانی.

(-على الشَيءِ): لە سەرەوە (ڕوانییە شتەكە/ تەماشایكرد).

(إشتَرَفَ): قنجبووەوە/ ڕێك ڕاوەستا.

(إستَشرَفَ): قنج ڕاوەستا.

(-الشَـيءَ): چـاوی بـۆ شـتەكە هەڵـبڕی تەماشایبكات‌و دەستی خستە سەر برۆی وەك سێبەر بۆ چاوی بكات.

(-هُ حَقَّهُ): چاوی بڕییە مافەكەی‌و سـتەمی لێكرد.

(اَلشَـرَف (ج) أشـراف): ١-شـوێنی بـەرز ٢-لووت.

٣-(شَرَفُ البَعيرِ): كۆپارەی حوشتر.

(أشـرافُ الإنسـانِ): هەردوو گـوێ‌و لووتی مرۆڤ.

(اَلشَرَفَةُ (ج) الشَرَفات): دیكۆری شوورا، یان سـەرەوەی كۆشك كە سێگۆشە یان چوارگۆشە شێوە دەبێت وەك نەخشێكە.

(اَلشُـرفَةُ- مِنَ القَصر) (ج) شُـرَف): چینی سەرەوەیە كە دەروانێت/ شانشین/ پێشەیوان.

(اَلأشـرَف) (ح): شەمشـەمەكوێرە (چونكە

گوێی به دەرەوەیە) قەبارەیەکی دیاری هەیە.
(قَصرٌ أَشْرَف (م) شَرْفاء (ج) شُرْف): کۆشکێك کە بارکۆن یان ستارەی جوانی هەبێت.
(رَجُلٌ أَشْرَف): پیاوێکە پشتی بەسەر سنگیدا داهاتبێت: کۆمابێتەوە.
(منكب أَشْرَف): شانی بەرزو جوانو رێك/ چوارشانە.
(الشَّرْفاء): مێی وشەی(الأَشْرَف).
(-من الابنية): بارکۆنی خانە، پێشهەیوان.
(-مِنَ الآذان): گوێی درێژ.
(حارِكٌ شَريفٌ): سەرشانی بەرز.
(المُشرف- مِنَ الأَماكِن): ١-شوێنی بەرز ٢-شوێنێك بەسەر ئەملاولای خۆیدا بڕوانێت.
(المُشْرَف (ج) مَشارِف): شوێنی لێوەڕوانینی ئەملاولای خۆی/ ڕوانگە.
(مَشارِفُ الأَرضِ): شوێنە بەرزەکانی زەوی.
(المُسْتَشرف): بەرز.
٣-(شَرُفَ- تِ الناقَةُ شُروفاً): مێحوشترەکە پیروە پەککەوتە بوو.
(الشّارِف- مِنَ النُوق (ج) شُرَّف وشُرُف وشُرُوف وشُرْف): مێحوشتری پیری پەککەوتە.
(سَهْمٌ شارِف): تیرێکی کۆنی بێکەڵك.
(دَنٌّ شارِف): کووپەی مەی کۆن، کە مەی کۆنی تێدابێت.
(الشارِفَةُ (ج) شارِفات وشَوارِف): ١-مێی وشەی (الشارِف) ٢-مێحوشتری پیری پەککەوتە.
(الشَوارِف): دەفری مەی وەك کوپو شتیتری لەو بابەتە.
٤-(شارَفَ- هُ): لێیتزیکبووەوە/ هاتە بەرەوەی.
(أَشْرَفَ- على المَوتِ): لە مردن نزیکبووەوە.
(-تِ الخَيلُ): ئەسپەکان تاویاندایە خۆیانو خێرایانکرد.
(-لَكَ الشَيءُ): شتەکە کەوتە بەردەستتو توانات بەسەریدا شکا.
(-ت نَفسُهُ على الشَيءِ): بە تەنگ شتەکەوە هاتو حەزی لێکرد، بۆی سووتا/ بۆی پەرێشانبوو.
(المَشرَفِيّ): خەڵکی (مشارق شامە) کە دێوخاکێکی عەرەبە.
(السُيوف المَشْرَفِيَّة): شمشێری مەشرەفی (دەیشڵێن بە ناوی شوێنێکەوەیە لە یەمەندایە).
الملحق:
شرف: (التَشريفات): دەستوورو نەریتی پەیڕەوکراوە لە کاتی پێشوازیکردنو ئاهەنگە میرییەکانداو لە بۆنەیتردا پێشی دەوترێت (مَراسيم) هەڵسوکەوتو ڕەفتار لە پێشوازیو بۆنەیتردا.
(ديوان التَشريفات): فەرمانگەیەکی میرییەو سەر بە وەزارەتی دەرەوەیە فەرمانی هەڵسوکەوتو پێشوازیی پێسپێردراوە.

(سجل التَشريفات): تۆماری سەردانو پێشوازیی. دەفتەرێکە میوانە سەردەرەکان ناوی خۆیانی تێدا دەنووسن ئەوە وەکو سەردانو میوانداریی تەواوە.

---

شرق: ١-(شَرَقَ- الشاةَ شَرْقاً): گوێی مەڕەکەی بە درێژیی هەڵدڕی.

(شَرقاء) مەڕی گوێی هەڵدڕاو.

(شَرِقَ-تِ الشاةُ شَرَقاً): مەڕەکە بە درێژی گوێ هەڵدڕاو بوو.

(مَشروقَه الأُذُن): گوێ بە درێژیی هەڵدڕاو.

(إِنْشَرَقَ- تِ القَوسُ): کەوانەکە لە باری درێژیی هەڵقڵیشا.

(اَلشَرْق (ج) أَشْراق): درز/ قڵیش.

("مادَخَلَ شَرْقَ فمي شيءٌ"): هیچ نەچۆتە درزی دەممەوە.

(اَلشَرْق والشِرق): ئەو تروسکاییە ڕووناکییە لە درزی دەرگاکەوە دێتە ژووری.

(اَلشَرَّاق) (ب): کەلەبەرێک درزێک کە هەواو ڕووناکیی لێوە بێتە ژوورەوە (عامية).

(مِشْرِيقُ البابِ): ئەو درز یان کەلەبەری دەرگایەی کە کاتی هەڵهاتنی خۆر هەتاوی لێوە دێتە ژوورەوە.

٢-(شَرَقَ- المَرَقَ شَرْقاً) (عامية): لەبەر گەرمیەکەی شۆرباکەی زووقوتدا.

(شَرِقَ- بِرِيقِهِ شَرَقاً): تفەکەی لە بینگیرا.

(تَشَرْدَقَ) (عامية): تفی لە بینگیرا.

(اَلشَرْدُوقَةُ (عامية): تف لە بینگیران.

(شَرِقَ- الجُرحُ بِالدِمِ): برینەکە پڕ بوو لە خوێن.

(-المَوضِعُ بِأَهلِهِ): شوێنەکە وا پڕ بوو خەڵکی ماڵەکەی نەدەگرت.

(تِ الأَرضُ): زەویەکە ئاوەکەی خواردەوەو نەیهێشت بەسەریدا بڕوات.

(أَشْرَقَ- هُ بَرِيقِهِ): تفەکەی خۆی لە بینگیران.

(إِشْرَورَقَ-ت العَينُ بِالدَمعِ إِشْرِيراقاً): چاوەکە پڕ فرمێسکبوو.

(اَلشَرْقَةُ): جارێك لە بینگیران.

("أَخَذَتْهُ شَرَقَةٌ كادَ يَموتُ مِنها"): لە بینگیرانێك تووشبوو خەریکبوو پێی بخنکێتو بمرێت.

(اَلشَهْقَة) (عامية= الشَرقَة. الغُصَّة): لەبینگیران.

(اَلشَرْقَة) (طب): کۆکەرەشە کۆکەیەکی پیسە هەناسەی پیاو دەگیرێت.

(اَلشراق): تف لە بینگیران.

٣-(شَرَقَ-تِ الشَمسُ. شَرْقاً وشُروقاً): خۆرهەڵهات.

(-النَخْلُ): دارخورماکە بالأیکردو جوانبوو.

(-الثَمَرُ): بەرەکەی (چنی/ ڕنی).

(شَرَّقَ): ١-ڕووی کردە خۆرهەڵات ٢-ڕووی گەشو جوانبوو.

(مُشـرِقُ الوَجـهِ): ڕووی گـەش و کـراوەو ڕووناك.

(شَرَّقَ- اللَّحمَ): گۆشتەکەی سووورکردەوە یان لەبەر هەتاو وشکیکردەوە.

(أشرَق-تِ الشَّمسُ): خۆرهەلأت و ڕووناکیدا.

(- وَجهُهُ): ڕووی گەشایەوە.

(-المَکانُ): شـوێنەکە/ جێگەکە بە هەڵهاتنی خۆر ڕووناکبووەوە.

(-الرَجُلُ): کەوتە دەمی خۆرهەڵاتن.

(-تِ الشَـمسُ المَکانَ): هەتاوەکە شوێنەکەی ڕووناککردەوە.

(-النَخلُ): دارخورماکە بالأیکردو جوانبوو.

(تَشَرَّقَ): لەبەر بەرۆچکەکە دانیشت.

(اَلشَـرْق (ج) أشْـراق) (فـك): ١-شـوێنی خۆرلێوەهەڵاتـن سـەرەتای بەهـارو پایـزو شـوێنی لێهەڵهاتنی بە فراوانبوونی ئاسۆکەی بە درێژایی ڕۆژەکان ٢-خۆر.

(اَلشَرَق (مص): خۆر.

(اَلشَـرْقَةُ): بەربەرۆچکـە کـە لە زسـتاندا لێیدادەنیشن.

(اَلشَرْقَةُ والشِرقَةُ): خۆر دەمی هەڵهاتنی.

(اَلشَریق (ج) شُـرُق): ١-خـۆر کاتی هەڵاتنی ٢-مێرمنداڵی ڕووجوان/ جوان.

(اَلتَشْـریق) (مص): نوێـژی جەژن چونکە دوای خۆرهەڵاتن دەکرێت.

(أیّامُ التَشریق): سێ ڕۆژ پاش جەژنی قوربان.

چونکـە گۆشـتی قوربانیـی تێـدا لەتوکوت دەکرێت.

(الشارِق (فا) (ج) شُرْق): خۆردەمی هەڵاتنی/ خۆری هەڵاتوو دەشێت بەهیتریش بوترێت.

(اَلشـارِق): لای خۆرهەڵاتی شـاخ یان هیتر. ئـەوە پێچەوانەی (غارب)ە کە لای خۆرئاوای شاخە.

(اَلَمشْـرِق والمَشْرَق والمَشْـرُق (ج) مَشارِق): شـوێنی یـان لای خۆرهـەڵات کـە خـۆری لێهەڵدێت.

(اَلَمشرِقان والمَغرِبان): دوو شوێنی خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابـوون بە زسـتان و هاوین کە لە یەك جیان.

(اَلَمشـارِق والمَغارِب): شـوێنی خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابوون بـە درێژایی سـاڵ کە لە یەك جیادەبن.

(اَلَمشْـرَقَةُ والمَشْـرَقَةُ والمَشْـرُقَةُ والمِشْـراقُ والمِشْرِیقُ): بەربەرۆژکەی زستان.

(اَلُمسْتَشْـرِق): خۆرهەڵاتناس کەزانای زمان و وێژەو زانستیی خۆرهەڵاتە.

(اَلإستِشراق): خۆرهەڵاتناسیی.

٤-(شَـرِقَ- الدمُ فی عَینِهِ): خوێن لە چاویدا دەرکەوت/ خوێن زایە چاوی.

(-لَونُـهُ): لـە شـەرماندا، لـە تەریقـیو شەرمەزاریدا سووورهەڵگەڕا.

(-ت عَینُهُ): چاوی سوورهەڵگەڕا.

(-الشَيءُ): شتەكە ئاوێتە بوو.
(-تِ الشَّمسُ): خۆرنیشت و خەریکی ئاوابوون بوو سوورو تەڵخ بوو.
(شَـرَّقَ- الشَـيءَ بِالزَعْفَران): شتەکەی بە زەعفەران ڕەنگکرد.
(أشْـرَقَ- الثَوبَ في الصِبغِ): جلەکەی تێر لە ڕەنگ هەڵکێشا.
(إشْـرَوْرَقَ- تِ العَـينُ بِالدَمعِ إشْـرِيراقاً): چاوەکە بە فرمێسك سوورو هەڵگەڕا.
٥-(شَرَّقَ- البِناءَ): خانووەکەی گەچکاریکرد.
(الَشاروق= الصاروج): قسڵ و بابەتەکانی.
(اَلُمُشَـرَّق) (مفع): گەچکاریکراو بە گڵەسپی تەڕاوکراو.
٦-(الَشَـرَقْرَق والشَـرَقْراق والشِـرِقْراق والشَقِرّاق) (ح) = (الأخيل): دارە سمە/ دارە تەقێنە/ دارکونکەرە.
(اَلشُقُرُّق) (علمية) = (اَلشَرَقْرَق): دارکونکەرە.
الملحق:
شرق: (اَلإشراق): هەڵهاتن و ڕووناکیدان.
("إشراقُ الشَّمس"): خۆرهەڵاتن و ڕووناکیدانی.
(اَلتَّلأْلُـؤ حُسْـناً): ١-دەرەوشـانەوەی جوانیی ٢-بەختیاری و دڵگراوەیی و گەشڕوویی.
("إشْراقُ الوَجه"): ڕووگەشیی.
(اَلإشراق): بیردۆزێکی فەلسەفانەیە ئیفلاتونییە نوێیەکـە بڵاوی کردۆتـەوە دەڵێـت: گیتیی لە خوداوە هاتوو وەك چۆن ڕووناکی لە خۆرەوەیە.

(اَلإشراقيون مفردها الإشراقي: اتباع المذهب الفلسـفي القائل بحكمه الاشراق، او الحكمة المشرقية، كان هدفهم التوفيق بين الفلسفة اليونانية التي اتتهم عن الافلاطونية الجديدة، وفلاسـفة الفرس وغيرهم): گەشاوەییەکان، تاکەکـەی گەشـاوەییە، شـوێنکەوتوانی ئەو ڕەوتە فەلسەفیەن کە بڕوای هەیە بە «دانایی گەشانەوە، یان دانایی گەشێنراوەیی، ئامانجیان گونجاندن بوو لە نێوان فەلسەفەی ئیفلاتۆنی تازەو فەیلەسووفەکانی فارس و ئەوانی تر.

---

شرك: ١-(شَرِكَ- تِ النَعْلُ شَرَكاً): ئاوزەنگی یان سەری سۆلەکە یان پێڵاوەکە پچڕا.
(شَرَّكَ وأشْرَكَ- النَعْلَ): ئاوزەنگی بۆ سۆلەکە کرد.
(اَلشَرَك (ج) شُرُك وأشْراك الواحِدَةُ شَرَكة): داوی ڕاو/ تۆڕی ڕاوکردن ٢-جێسـمی ولاخ لە ڕێگەدا.
(اَلشِراك (ج) أشْرُك و شُرُك): ١-چەرمەباریکە کە بەسەر سۆلەوەیە ٢-باریکە سەوزە.
(اَلشُرَكِيّ والشُرَّكي): ڕۆیشتنی خێرا.
("لَطمَهُ لَطماً شَـرَكِيّاً"): زللەی خێراو یەك لە دوای یەکی پێدا کێشا.
٢-(شَرِكَ- هُ. شَرْكاً وشَرِكاً و شِرْكَةً وشَرِكَةً): بوو بە هاوبەشی.
(شارَكَ- هُ): هاوبەشیکرد.
(تَشارَكا): هاوبەشییەکیان پێکەوە نا.

(أَشْـــرَكَ- هُ فِي أَمْرِهِ): كــردى بە هاوبەش لە کارەکەیدا.

(-بِاللهِ): هاوبەشى بۆ خودا پەيداكرد.

(مُشـــرِك ومُشـــرِكِيّ): هاوبـــەش بـــۆ خودا پەيداکەر/ کافر.

(الشِرْك): هاوبەش بۆ خودا پەیداکردن.

(إِشْتَرَكَ- الأَمْرُ): کارەکە بەيەكداچوو/ ئاڵۆز بوو.

(-القَـــومُ فِي كَـــذا): خوێنــــگەل لـــەوەدا بەشداربوون/ هاوبەشبوون.

(الشِـــرك (ج) أَشْـــراك): ١-هاوبەشـــیی/ بەشـــداریی = المُشـــارِك ٢-بەشـــدار/ هاوبەش ٣-بەش/ بەركەوت.

(الشِـــرْكَة) (مص): ١-هاوبەشـــی ٢-تێکەڵیی ٢-بەشەکان. بە شێوەیەکی گشتی بەشداربوون هاوبەشـــبوونێکی تێکراییی لـــەو کۆمپانیایەدا ٣-بەش.

(بِيـــع شِـــركٌ مِـــن دارِهِ): بەشـــێك لـــە خانووەكەی فرۆشرا.

(شـــرِكة تجارية): كۆمپانيايەكی بازرگانیی. کـــە بـــە پێـــی رێککەوتنێـــك لـــە لايـــەن بەشداربووەکانەوە دەکرێت.

(الشَـــرِيك (ج) شُرَكاء وأَشْـــراك (م) شَرِيكَة (ج) شَرائِك): هاوبەش/ بەشدار.

("الله لا شَرِيكَ لَهُ"): خودا بێهاوبەشە/ کەس نییە لە موڵکیـــدا هاوبەشـــبێت و بێوێنەیەو کەس لەو ناچێت سيفاتی ئەوی نییە.

(المُشـــتَرَك) (مفـــع): بەشـــدارکراو/ ناوکۆ/ بەشداربوو.

(طريـــق مُشْـــتَرَك): ڕێبـــەش/ ڕێیەکە هی هەمووانە.

(رَأْيٌ مُشْتَرَك): ڕابەش/ ڕای هاوبەش.

(أمرٌ مُشتَرَكٌ): کاربەش/ کاری هاوبەش.

(لَفظٌ مُشْـــتَرَكٌ): وشـــەی ناوکۆ/ وشەیەکە چەند واتايـــەك دەبەخشـــێت وەك (العَين): ١-چاو ٢-كانی/ سەرچاوە/ وشەی ناوکۆ.

(رَجُلٌ مُشـــتَرَك): پياوێکـــی مەراقكردو كە لەبەر خۆيەوە قسە بکات.

(الإِشتراكي): سۆشياليست.

(الإِشـــتراكِيَّة): سۆشيالیســـتیی: ڕێڕەوێکـــە ئامانجـــی گۆڕینـــی شـــێوەی کۆمەڵگایـــە بەوەی کە هـــۆی بەرهەمهێنـــان بکرێتە هی هەمووان و ســـامان هەموو تیایدا بەشداربن و کار بە ســـەرهەمواندا دابەشـــبکرێت و تیایدا بەشـــداربن و هاوکاربن و پێداویستیی و مادەی بەکاربـــردن دەســـت هەمـــووان بکەوێت و بۆ هەمووانبێت یەکســـانی و هاوبەشيی دروشمی ئەو ڕێڕەوەیە.

الملحق:

شرك: (الإِشتراك):١-بەشدرابوون/ بەشداریکردن ٢-هاوکاریـــی لە کارێکـــدا/ پێکـــەوە (کارکردن/ ڕەنجدان).

(اَلإشـــتراك في الإضراب): بەشـــداریكردن له مانگرتندا.

(اَلإشتراك في الحَديث): بەشداریی له قسەكردن.

(الإشـــتراك: المقاسَـــمَة والمحاصَـــة): پێكەوه بەشكردن و بەشومرگرتن.

("الإشـــتراك في الأربـــاح"): لـــه قازانجـــدا بەشداربوون.

(اَلإلتزام بدفع مبلغ معين في أوقاتٍ مُحَدَّدَة مقابِـلَ الإنتفاع بخدمـــة أو الحصول على شيءٍ بطريقة مُنَظَمَة): بەوەوە بەندبێت كه پارەیەكی دیاریكـــراوو له كاتێكی دیاریكراودا بەرامبـــەر بـــه كارگوزارییەك یان ســـوودێك بدات به شێوەیەكی رێكوپێك وەك("الإشتراك في جريدَة"): له رۆژنامەیەكدا بەشـــداربێت و ئابوونەی بەســـەر یەكەوه یان بەشـــبەش بۆ بدات.

("دَفعُ الإشْتراك"): دانی پارەی بەشداربوون/ ئابوونه.

---

(شرم): ١-(شَرَمَ- الشَـــيءَ. شَرماً): شتەكەی هەڵدری/ هەڵهێنایەوه/ هەڵقڵیشاند.

(-الأَنْفَ): پەرەكەی لووتی بڕی.

(-الثَّريدَ): له كەناری تریتەكەیخوارد.

(-لِفُلان مِن مالِهِ): شـــتێكی كەمی/ چكێكی ماڵەكەی خۆی به فیسار بەخشی.

(شَرِمَ شَرَماً): پەرەكەی لووتی بڕرابوو.

(اَلشَـــرَم (م) شَـــرماء (ج) شُـــرْم): پەرەكەی لووتبڕراو.

(شَرَّمَ- هُ): شەقارشەقاریكردو دڕاندی.

(تَشَـــرَّمَ وانْشَـــرَمَ): دڕاو دادڕ دادڕ بـــووو له توكوتكبوو.

(-الصَیدُ): نێچیرەكه بـــه برینداریی دەرباز بوو/ هەڵات.

(اَلشَرم (مص) (ج) شُروم): كەنداو.

(اَلشـــارِم) (فا): تیرێك لایەكـــی ئامانجەكه/ نیشانەكه هەڵدرێت.

٢-(اَلشَـــرْم (ج) شُـــرُوم): دەنگی شـــەپۆل و بەیەكدادانی شەپۆلەكانی دەریا ٢-دەرەختێكه.

شرن ١-(شَـــرِنَ- الصَخرُ شَـــرَناً): تاوێرەكه درزیبرد/ شەقیبرد.

(اَلشَرْن= الشَّق): درز/ قڵیش.

٢-(اَلشَـــرَنْبَث والشَرَنبَذ): ١-چەپۆڵه گەورەو رەگیدەست ئەستوور ٢-(ح): شێر.

٣-(اَلشَرَنْبی) (ح): باڵندەیەكه.

٤-(شَرْنَفَ- الزَرْعَ): كشتەكەی گەڵا قرتكرد/ گەڵاكەی لێكردەوەو بڕی كاتێك گەڵاكه وابوو زیانی به رووەكەكه دەگەیاند.

(شِرناف): گەڵای زیاد قرتكردنی رووەك.

٥-(شَـــرْنَقَ- الشـــيءَ): شـــتەكەی لەتكـــرد، قرتاندی.

(اَلشَرانِق): كاژێمار كاتێك كه فرێیدەدات.

١-(اَلشَـــرنَقَة): ١-كاژێكی مار ٢-ئەو خانووەیه كـــه كرمیناوریشـــم كاتی متبوونـــی بۆ خۆی

دەچنێت/ قۆزاخەیئاوریشم/ سارمە.
(ألفَيلجه (ج) فَيالِج): قۆزاخە.
(ألصُلَّـج واحِدَتُهـا: صُلَّجَـة): قۆزاخـەی ئاوریشم.
شـره: (شَـرِهَ. إلى الطَعـام وعَلَيه. شَـرَهاً وشَـراهَةً): زۆر حـەزی لـە خواردنەکـە لـە چێشـتەکە کرد/ دڵـی زۆر چووە سـەر خواردنەکە.
(شره شَرْهان): چڵێس. ئەوسن.
(ألشَرِه): کەسـێکە چڵێسـیی زۆر بـکاتو لە پێویستیی خۆی زۆرتر بخوات.
(ألشَراهَة): چڵێسیی/ ئەوسنیی.
(ألشَـرهاء- مِنَ السِنين): ساڵانی وشکەساڵو بێبەرهەم/ ساڵانی قاتو قڕی.
شَرو: ١-(ألشَرْو و الشِرْو): هەنگوین.
٢-(ألشِرْوال= السِرْوال) (فارسية): شەرواڵ.
شـری: ١-(شَـرَى- الشـيءَ شِـراءً وشِرىً): شتەکەی کڕی.
(-بِنَفْسِهِ عَن قَومِهِ): ١-خۆی کردە پێشمەرگەو بەرگریی لێکردنو پاراستنی ٢-چووە بەردەمی سوڵتانو لە بری ئەوان قسەیکرد.
(-الشيءَ): شتەکەی (سەند/ کڕی).
(شـارى- الرَجُلَ. مُشاراةً وشِـراءً): لەگەڵ پیاوەکەدا سەودایکرد/ کڕینو فرۆشتنیکرد.
(اَشْـرى- القَومُ): خۆیشـگەل سـەرپێچیو نافەرمانیی پێشەواینیکرد.

(تَشَرَّى- تَشَـرِّياً): بوو بە یەکێك لە یاخیو دەرچوو لە فەرمان.
(ألشُراة): یاخییەکان.
(إشتَرى- الشَيءَ): ١-شـتەکەی کڕیو بوو بە خاوەنی ٢-فرۆشتی.
(ألشِـراء (ج) أشْـرِيَة والشِـرى): ١-کڕیـن ٢-فرۆشتن.
(ألشَرى والشَـراة): ١-کەلوپەلو کاڵای خراپ ٢-کەلووپەلوکاڵاو ماڵی هەڵبژاردە
("إبلٌ شَراة"): حوشترگەلی هەڵبژاردە.
(ألشَـرْوَى): وەکو/ چون/ وەك (بۆ هەمووان وشەیەکە دەوترێت)
(هـوَ وهِيَ وهُما وهُم وهُنَّ شَـرْواك): وەکو تۆیە یان وەکو تۆن.
("إنَّه لايمَلِكُ شَرْوى نَقير"): بە ڕاستی وەك چـۆن ئەڤقیرێکی نییە (ئەمە بۆ کەمیی شـت دەوترێت).
(ألنَقير): ئـەو چاڵە بچکۆلەیە کەلە پشـتی ناوکی خورمایەکدا هەیە.
(ألشَرِيّ- مِنَ الخَيل): ئەسپی ناوێزەو نایاب/ هەڵبژاردە.
٢-(شـرِيَ. يَشرى- الرجُلُ شُرىً): ١-پیاوەکە ویرەویریکرد ٢-تووڕە بوو.
(-الفَرَسُ في سَيرِه): چارەوێکـە زۆر خێرا ڕۆیشت.
(-الفَـرَسُ في لِجامِـهِ والبَعـيرُ في زِمامِهِ):

چارەوێکــە لغاوەکــەی درێژکــردو ڕاکێشــاو سەرکێشــیکرد حوشــترەکە جڵەوەکــەی درێژکردو ڕاکێشاو سەرکێشیکرد.
(-زِمــامُ الدابّةِ): جڵەوی وڵاخەکە شــپرزەی تێکەوت.
(-البَرقُ): هەورە بروســکەکە شەوقیدایەوەو تیژ بوو زوو زوو بوو.
(-الشَــرُّ بَینَهُــم): خراپــە لــە ناویانــدا بڵاوبووەوەو تەشەنەیسەندو زۆر بوو.
(شاری- الرَجُلَ. مُشاراةً وشِراءً): چەلەحانێی گەرەو گرەگری زۆری لەگەڵ پیاوەکەدا کرد.
("اَلمُشــاراة والمُمــاراة تُفسِــدانِ الصَداقَــةَ القَديمَــةَ"): چەلەحانــێو گرەگــری زۆرو ناکۆکیی دۆستایەتیی کۆن تێکدەدات.
(اَلمُشاراة): چەلەحانێو ویرەویرکردن.
(المُماراة): ناکۆکیی.
(أشْــری- الزِمــامَ): جڵەوەکــەی بزوانــد/ جووڵاند.
(-البَرقُ): هەورەبرووسکەکە شەوقیدایەوەو تیژ بوو.
(-الشيءَ): شتەکەی لارکردەوە.
(-بَينَهُم): لە یەکی تیژکردن.
(تَشَرَّی. تَشَرِّياً): بڵاوبووەوە.
(تَشاری- الرَجُلانِ. تَشارِياً): دوو پیاوەکە لە یەك تووڕەو توند بوون.
(إِسْتَشْــری- الرَجُلُ فِي الأَمرِ. إِسْتِشْــراءً): ١-لە کارەکــەدا (ویرەویرکرد/ گرەگرکرد) ٢-تووڕە بوو.
(-تِ الأُمــورُ): کارەکان گرانبــوون لــە برەوچوون.
(-الفَرَسُ فِي سَيرِهِ): چارەوێکە تاویدایە غار/ ڕۆیشت/ سەریهەڵگرت.
(إشْروری. إشريراءً): پەشۆکا/ شپرزە بوو.
(أَلشُراة): یاخییەکان/ نافەرمانەکان.
(أَلشَرِيّ): ئەوەی لە ڕۆیشتندا تاودەدات.
(أَلشَرِيَّة): مێی وشەی (الشريّ).
٣-(شَــرَی- اللَّحْمَ أَو الثَوبَ ونَحوَهُما. شِراءً وشِرِيً): گۆشــتەکە یان کراسکە یان شتێتری لەو شێوازە دایە بەر خۆر.
(شَرَّی اللَّحْمَ أَو الثَوب ونحوهما): گۆشتەکە یان کراسەکەی دایە بەر تیشکی خۆر.
٤-(شَرَّی- هُ شِــراءً وشِرِيً): ١-گاڵتەی پێکرد ٢-خراپەی/ بەدی (لەگەڵدا کرد).
(فَعَلَ بِهِ ماشَــراهُ): کارێکــی پێکرد کە پێی ناخۆشبێت.
٥-(شَــرِی- اللهُ فُلاناً. شِــراءً وشِرِيً): خودا فیساری تووشی گرمەژنە کرد.
(شَرِيَ- يَشْــرِی- الجِلدُ. شَــرِيً): پێستەکە تووشــی گرمەژنــە بوو کە زیپکــەی وردە لە لەش دەدرێتو دەخورێت.
(شَرِ): گرمەژنە گرتوو.
(أَشرَی- الحَوضَ): گولەکەی پڕکرد.

(اَلشَرى) (طب): زیپکەی وردەپێست دەریدەکات دەخورێت لەوانەیە خورووەکەی زۆر بێت/ گرمەژنە.

٦-(اَلشَراء): کەنار/ لا.

(اَلشَری (ج) اَشراء): ١-شاخ/ چیا ٢-ڕێگا ٣-لا/ کەنار.

(دَخَلوا اَشراء الحَرَمِ): چونە ئەملاو لای کەنارەکانی حەرەمەوە ٢-شێرگەی کەناری فورات کە دەکرێتە پەندو نموونە دەڵێن:

(هُوَ کأسَدِ الشَری): ئەو وەك شێری شیرگەی کەناری فوراتە.

(اَلشَرْيُ. الواحِدَةُ شَرْيَة) (ن): ١-گوژاڵك.

("لِفُلانٍ طَعمان اَريٌ وشَريٌ"): کابرا وەك هەنگوین شیرینەو وەك گوژاڵکیش تاڵە ٢-(ن) دارخورمایەك کە بە ناووك ببێت.

(اَلشاري (ج) شُراة) (ف): برووسکەبڕ (ئامرازێکی بەربەستیی هەورەتریشقەیە بۆ پاراستنی خانووبەرە).

(اَلشَريَّة): ١-ڕێگە/ ڕێباز ٢-سروشت.

(اَلشَرْيان (ع ا) (ج) شَرايين): خوێنبەر ئەوەی پلدەدات‌و خوێنی گەش لە دڵەوە بۆ لەش دەبات.

(اَلشَرْيان الرِئَوِي) (ع ا): ئەو خوێنبەرە لە دڵەوە خوێن بۆ سی دەبات.

(اَلشِريانات): خوێنبەرە وردەکانی ناولەش.

(اَلمُشتَري) (فك): ١-ئەستێرەی بەرجیس ٢-

(ح) باڵندەیەکە.

٧-(شَرْيَفَ- الزَرْعَ): کشتەکەی گەڵاڕنکرد. گەڵا پەرەکانی کە زیان بە ڕووەکەکە دەدات ڕنی.

شزّ: (شَزَّ. شَزازَةً): زۆر وشکبوو.

(شَزّ وشَزيز): زۆر وشك.

شزب: ١-(شَزَبَ وشَزُبَ. شَزْباً وشُزُوباً): زبر بوو یان پووکایەوەو وشکهەڵات.

(شازِب (ج) شُزَّب وشَوازِب): وشکی زبری پووکاوە.

(رجلٌ شاحِبٌ شازِبٌ): پیاوێکی زەردی ڕەنگپەڕیوی پووکاوە.

(شَزَّبَ- الفَرَسَ): چارەوێکەی پووکانەوە/ چرووساند.

(الشَزبَةُ): کەوانێکی کۆن وەك لاسکەکەی پووکابێتەوە وایە.

(-مِن الأُتُنِ): ماکەری لەڕی پووکاوە.

(اَلشَزيب (ج) شُزُوب): ١-چیلکە پێش چاککردنی ٢-کەوانێك نە تازە بێت نە کۆن/ نیوداشت.

٢-(تَشازَبَ- القَومُ علی الماءِ وغَیرِهِ): خوێشکەل سەرەیان بۆ ئاوو شتیتر گرت.

("هُم مُتَشازِبون"): ئەوان لە سەرەدان بۆ ناو وەرگرتن/ چاوەڕێی بەشە ناو وەرگرتنن.

الشَزبَةُ: جارێك سەرەگرتن.

(اَلشُزبَةُ): هەل.

("مَضَـت شُـزبَتُهُ"): هەڵەكـەی تێپـەڕی سەرەكەی لەدەستچوو.

٣-(اَلشَوْزَب): نیشانە.

شـزر: (شَـزَرَ- الرجُلَ وإلَیهِ): خیسـەی لە پیاوەكە كرد/ بە ڕقەوە لێیمۆڕبووەوەو پشتی تێكرد.

(-فُلاناً): ١-نێزەی بە ڕاسـتو چەپی فیساردا كرد ٢-بە چاویەوە كرد.

(-الحَبلَ شَزْراً): پەتەكەی بە پێچەوانەوە بادا یان بۆ سـەرەوە بادا، بە پێچەوانەی سـووڕی تەشیەكەوە بایدا.

(شـازَرَ- هُ مُشـازَرَةً): دوژمنایەتیی لەگەڵدا كرد.

(تَشَزَّرَ): تووڕە بوو.

(-لِلقِتالِ): بۆ جەنگ خۆی ئامادە كرد.

(تَشـازَرَ- القَـومُ): خوێنـگەل بـە ڕقەوە (خیسەیان لەیەككرد/ لەیەك مۆڕ بوونەوە).

(إستَشزَرَ-الحَبلَ): پەتەكەی بە پێچەوانەوە بادا.

(-الشَيءُ): شتەكە بەرزبووەوە.

الحَبلُ: پەتەكە بە پێچەوانەوە بایخوارد.

(اَلشَزْر) (مص): باخواردنێكی نارێك.

("غَزلٌ شَزْرٌ"): ڕستنێكی نارێك.

(اَلشَزَر والشُزرَة): چاوسوور بوون/ سووریچاو.

(اَلأشْزَر): سوور.

(عَـینٌ شَـزراء): چاوێكـی ڕقـاوی كـە لە ڕقانـدا سـووربووبێت/ چـاوی (مۆڕەكردو/ خیسەكردوو).

٢-(اَشْـزَرَ- هُ اللهُ): خـودا ڕقـی لێهەڵگرتو تووشی گرفتاریی خراپیكرد كە لێدەرچوونی نەبێت.

(اَلشَـزْر): گرفتاریـیو داماویـی سـەخت/ سەختییو دژواریی نائاسوودەیی.

شزن:١-(شَزِنَ- الرَجُلُ. شَزَناً): گورجوگۆڵبوو/ چابوكبوو/ چالاكبوو.

(تَشَـزَّنَ- الرَجُـلَ. تَشَـزُّناً و تَشـزیناً): دایبەزەویدا.

(-الشاةَ): مەڕەكەی بە زەویدادا سەریبڕێت.

(-لِلسَـفَرِ): بۆ گوزارەكەی خۆی كۆكردەوەو شتی ئامادە كرد.

(اَلشَزِن): میچ كە یاری پێدەكەن.

(اَلشَزَن): ١-تەنشتو كەنار ٢-دووریی.

(الشُـزُن): ١-تەنشـتو لا/ كەنـار ٢-دووریی ٣-میچ كە یاریی پێدەكەن.

٢-(تَشَزَّنَ- الشيءُ. تَشَزُّناً وتَشْزیناً): ١-شتەكە توند بوو ٢-گرانبوو نارەحەتبوو سەختبوو.

(-لَهُ فِي الخُصُومَةِ): ناحەزیو نەیارییەكەی لەگەڵدا سەختو تۆخكرد.

(اَلشَزَن والشُـزُون): ١-توندوتیژیـیو ڕەقیی ٢-زەویی ڕەقەنو سەخت.

(-مِنَ العَیشِ): سەختییو تاڵیی ژیان.

(اَلشَزُونَة): توندڕەقیی.

(شزا. شَزْواً): بلندبووموه.

شـــسّ: (شَـــسَّ- الشـــيءُ شَسُوســـاً): شتەكە وشكبووموه.

(الشاسّ): باريكى لاواز.

(اَلشَـــسُّ (ج) شـــاس وشُسُـــوس وشَسِيس): زەوييەكى ســـەختى رەقـــەن وەك يەكپارچە تاوێر بێت.

شسب: (شَسِـــبَ وشَسُبَ. شَسْـــباً و شُسُوباً): وشكبووموو پووكايەوه.

(شاسِب (ج) شُسُب): وشكى پووكاوه.

(اَلشِسْـــب والشَسِـــيب- مِنَ القسيّ): چەرمى وشكەوەبوو.

(اَلشَسُـــوب- مِـــنَ النـــوق): مێحوشـــترێك بەچكەكـــەى لـــە زســـتاندا مرداربێتـــەوەو شيرەكەى نەدۆشرێت.

شسع: ١-(شَسَـــعَ- المَنزِلُ شَسْـــعاً وشُسُوعاً): هەوارەكە/ نشينگەكە دوور بوو.

(شَسُوع (ج) شُسُع وشاسِع): زۆر دوور.

(شَسِـــعَ- الفَرَسُ. شَسَـــعاً): چارەوێكە نێوان دانێكـــى پێشـــەوەىو دانـــى دواى كەڵبەكەى بڵاوبوو/ لە يەكەوە دووربوون.

(-بِهِ): دووريخستەوه.

(اَشسَعَ- الشَيءَ): شتەكەى دوورخستەوه.

(اَلشِسْـــع (ج) اَشْســـاع): ١-زەويـــى تەســـك/ تەنگەبەر ٢-كەنارى شوێن.

("نَزَلَ بِشِسْـــعِ مِنَ الوادي"): لـــە كەنارێكى دۆڵەكەدا دەوارى هەڵدا.

("اَدنى مِنَ الشِسْعِ"): لێوەى نزيكتر بوو.

٢-(شَسَعَ وشَسَّـــعَ واَشْسَـــعَ- النَعلَ. شَسْعاً): پەنجەپێى بۆ (سۆلەكە/ پێڵاوەكە) كرد.

(شَسِـــعَ- تِ النَعلُ. شَسَعاً): شوێن پەنجەپێى سۆلەكە پچرا.

(اَلشِسْـــع (ج) اَشْساع): پەنجەپێى سۆل كە لە نێوان پەنجەى ناوەراســـتو ئـــەوەى لە دواى دێت.

(اَلشِسْع) (ضد): ١-دارا و سامانێكى كەم ٢-داراو سامانێكى (زۆر/ فراوان).

("هُـــوَ شِسْـــعُ مـــالٍ"): ئـــەو دارا بـــاش هەڵيدەسوورێنێت.

شســـف: (شَسَفَ وشَسُـــفَ شُسُـــوفاً وشِسافَةً وشَسافَةً): وشكبووموه تێقوپاو لەڕ بوو.

(شاسِف وشَسيف): وشـــكەوەبووى تێقوپاوى لاواز بوو.

(اَلشِسف): نانەرەقەيەك.

(اَلشَسَـــف): فەريكە خورماى هەڵقڵێشـــاوى وشككراوه.

(اَلشَسِـــف): ئەوەى كە گۆشـــتەكەى بەســـەر ئێسقانەكەيدا وشـــكبووبێتەوه واتا: زۆر لەڕو لاوازه.

شصّ: ١-(شَصَّ- الرَجُلُ شُصُوصاً وشِصاصاً): دوور كەوتەوه.

("مـــااَدري اَيـــنَ شَـــصَّ"): نازانـــم بـــۆ كوێ

دووركەوتەوەو رۆیشت.
(-ەُ عَن كذا. شَصّاً): رێی ئەوەی لێگرتو لەوە دووریخستەوە.
(أشصَّ- الرَّجُلُ): پیاوەکە دووركەوتەوە.
(-ەُ عَن كذا): دەستی نایە بەری و لەوەی دوورخستەوە.
٢-(شَصَّ-تِ الناقةُ شُصُوصاً وشِصاصاً): مێحوشترەکە شیرەکەی تەواو کەمیکرد.
(-تِ المَعيشَةُ): ژیانەکە کولەمەرگیبوو/ سەختو تاڵبوو.
(أشَصَّ-تِ الناقَةُ): مێحوشترەکە شیرەکەی تەواو کەمبوو.
(الشَصوص- مِنَ النُوق أو الشِياه (ج) شُصُص وشَصائِص وشِصاص): مێحوشترو مەڕی کەمشیر.
(سَنَةُ شَصُوص): ساڵێکی وشکە ساڵو بێبەرهەم.
(نَفى اللهُ عَنكَ الشَصائِصَ): خودا تووشی سەختیو نەهامەتیت نەکات.
٣-(الشِصّ (ج) شُصُوص): دزێك کە هەرچی بەردەستکەوت بیباتو هیچ نەهێڵێتەوە.
(الشِصّ والشَصّ- الصِنّارَة (ج) شُصُوص): قولاپی ماسیگرتن.
شصب: ١-(شَصَبَ وشَصِبَ- العَيْشُ. شُصُوباً وشَصَباً): ژیانەکەو گوزەرانەکە سەختو گرانبوو.
(شاصِب): ژیانی سەختو گران/ ناخۆش/ پڕ کوێرەوەریی.
(-الأمرُ): کارەکە سەختبوو.
(-المَكانُ): شوێنەکە وشكو بێبەرهەم بوو.
(أشصَبَ اللهُ عَيشَهُ): خودا ژیانەکەی سەختو گرانکرد.
(الشَصْب والشَصَب): وشكو بێبەرهەم.
(الشِصْب (ج) أشْصاب): تەنگانەو نەدارایی/ بێبەرامەتیی.
(عَيشٌ شَصِبٌ): ژیانێکی سەختی بێبەرامەتیی/ ژیانی کولەمەرگی/ ژیانی مەمرەومەژیی.
(الشَصيبَة (ج) شَصائِب): سەختیی تەنگانەی بێبەرامەتیی/ کوێرەوەریی نەبوونیی.
٢-(شَصَبَ- الشاةَ. شَصْباً): مەڕەکەی کەوڵکرد.
(الشَصُب): مەڕی کەوڵکراو.
٣-(الشِصْب (ج) أشصاب): ١-بەش/ بەرکەوتە ٢-شانس/ بەخت.
(الشَصّاب= النَصّاب): فێڵباز/ کەڵەکباز/ فۆڵبر/ ساختەباز.
(الشَصيب): ١-بەش/ بەرکەوت ٢-شانس/ بەخت/ چارەنووس ٣-نەناس/ نامۆ.
(الشَصيبَة (ج) شَصائِب): بنی چاڵاو/ بیر.
(الشَصائِب): داری زینو کورتانی حوشتر.
شصر: ١-(شَصَرَ- الثَوبَ. شَصْراً): جلەکەی شاش دروو.
٢-(شَصَرَ- فُلاناً بِالرِمحِ شَصْراً): کابرای

دایه بەر نێزە/ نێزەی پێداکرد.
(-هُ الشُّورُ): گاکـەی شـۆقی لێـدا/ قۆچی تێهەڵدا.
٢-(الشَـاصِر مِـنَ الظباء (م) شـاصِرَة (ج) شَواصِر) (ح): کارمامزی کۆرپە کە پێبگرێت و بکەوێتە گەڕان.
(الشَصَر (م) شَصَر (ج) أشصار (ح): ١-کارمامز کە پێبگرێت و بکەوێتە گەڕان ٢-(ح) باڵندەیەکی بچووکە.
(الشَـصَر والشَـوصَر مِنَ الظِبـاء): کورپە کارمامز کە کەوتە سەرپێی و کەوتە ڕۆیشتن.
شَـصا: ١-(شَـصا وشَصِيَ- يَشـصُی-البَصَرُ. شُصُوّاً وشُصِّياً): چاوەکە کرایەوەو بینی.
(-السَّحابُ): هەورەکە بەرزبووەوە.
(-تِ القِربَـةُ): کوندەکـە پـڕ لـە نـاو بوو قاچەکانی ڕەپبوون.
(-المَيتُ): مردووەکە قاچو دەسـتی ڕەپبوو/ بەرزبووەوە.
("شَصا بِرِجلِهِ"): قاچی بەرزکردەوە.
(أشـصَى بَصَرَهُ): چـاوی بـە چاویکەوت و ناسییەوە.
٢-(الشَصْو): ١-سیواك ٢-توندیی، تەنگانە.
شطّ: ١-(شَطَّ- شَطّاً وشُطُوطاً): دووركەوتەوە.
(-فُلاناً): ١-زۆرداریی بەرامبەر کرد/ ستەمی لێکرد ٢-دووریخستەوە.
(-شَطَطاً): ١-زیادڕەویکرد ٢-لە ڕاستیی و هەق دووركەوتەوەو لایدا.
(-فِي سلعَتِهِ): نرخی کاڵاکەی زۆر داوا لێکردو نرخی گرانکرد.
(-عَلَيهِ فِي قَولِهِ وحُكمِهِ): لە قسـەو ڕاکەیدا بەرامبەری (ستەمی لێکرد/ زۆرداریکرد).
(شَطَّطَ): ١-زۆر زیادڕەویکرد ٢-لە ڕاستی زۆر دووركەوتەوە.
(-المَركَبُ عِندَ البَحرِيَّة): پاپۆڕەکە نزیك ڕۆخی دەریاکە چەقیی و نەتوانرا بگوێزرێتەوە.
(شـاطَّ-هُ): لە زیادڕەویدا بۆڕی ئەویداو لەو لە ئەندازە بەدەرتر بوو.
(أشَـطَّ واشـتَطَّ- إشـطاطاً واشـتِطاطاً): ١-زیادڕەویکـردو لە ئەنـدازە بەدەربوو ٢-لە ڕاستیی و هەق لایدا.
(-عَلَيهِ): زۆرداریی بەرامبەر کرد.
("فَاحكُـم بَينَنـا بِالحَـقِّ ولا تُشـطِط"): دادوەریـی نێوانمان بکەو لە ڕاسـتیی و هەق لامەدەو زۆر لە کەسمان مەکە.
(الشَـطّ (مـص) (ج) شُـطُوط وشُـطّان): (ڕۆخی/ کەناری) دەریاو ڕووبارو چەمو زێ.
(-شُطُوط): تەنشتی کۆپارەی حوشتر.
(الشَطَّة): جارێك زیادڕەویی.
(الشِطَّة والشَطاط والشِـطاط والشَطاطَة): دووریی/ دووربوون.
(رَجُلٌ شاطّ (م) شاطَّة): سینەپان و بۆشناخ.
٢-(رَجُلٌ شاطّ (م) شاطَّة): پیاوێکی بۆشناخ و

بەژنوبالا ڕێك.
(جارِيَةٌ شَطّةٌ):کەنیزەکێکی قەدوبالا جوان/ شۆخو شەنگ.
(الشَطاط والشِطاط): شۆخیی‌و ڕێکیی بالا/ بۆشناخیی.
شطأ: (شَطَأَ. شَطْأً وشُطُوءً):بە کەناری دەریا یان ڕووبارەکەدا ڕۆیشت/ پیاسەیکرد.
(شَطَّأَ- النَهْرُ. تَشطِيئاً):ئاو لە هەردووبەری ڕووبارەکە سەریکرد.
(شــاطَأَ- هُ): هەریەکەیــان لــەو دوانــە بە ڕۆخێکی ڕووبارەکەدا ڕۆیشت.
(أَشْطَأَ- الوادي):ئاو بە هەردوو بەری دۆڵەکە ڕۆیشت.
(مُشطِئٌ): بە هەردو ڕۆخی دۆڵەکەدا ئاوەکە سەریکردووە.
(الشَــطْءُ (ج) شُــطُوء = الشــاطِئُ):(ڕۆخ،/ قەراغ/ کەنار/ لێوار)ی دەریا یان هی ڕووبارو چەم.
(الشــاطِئُ- مِنَ النَهرِ (ج) شَواطِئُ وشُطّآن): ڕۆخی/ تەنشتی ڕوبار.
(شــاطِئُ الأَوْدِيَة): کەنــاری دۆڵەکان (لێرەدا کۆناکرێتەوە).
(شاطِئُ- مِنَ البَحرِ): (کەنار/ ڕۆخ)ی دەریا.
٢-(شَطَأَ- الدابَّةَ بِالحَمْلِ شَطْأً وشُطُوْأً): باری گرانی لە چوارپێکە نا.
(-فُلاناً): فیساری بەزاند/ بەسەریدا زاڵبوو.

٣-(شَــطَأَـتِ الأُمُّ بِالوَلَدِ. شَــطْأً وشُــطُوْأً): منداڵەکەی بوو.
(شَطّأَ- الزَرعُ):کشتەکە دووپەلە بوو/ گەڵای دەرکرد.
(أَشْطَأَ- الزَرعُ):کشتکە گەڵای دەرکرد.
(-الشَــجَرُ بِغُصُونِــهِ): درەختەکــە پەلــی دەرکرد.
(الشَطْأُ والشَــطَأُ (ج) أَشْطاء):١-گەڵای کشت ٢-بێچووڵەی دارخورما.
(-مِنَ الشَّــجَرِ): ئــەو بێچوولانــەی لە بنی درەختەوە دەردێن.
٤-(أَشْــطَأَ- الرَجُــلُ): پیاوەکــە (تووشــی هەڵامەتبوو/ هەڵامەتیگرت).
(الشُطْأَةُ):هەڵامەت.
شطب: (شَطَبَ- الشَيءَ شَطْباً):شتەی دابڕی یان لە باری درێژی (هەڵهێنایەوە/ دایدڕی).
(-هُ وشَــطَبَ فَوقَهُ): هێڵی بەســەردا هێنا/ کوژاندیەوە.
("شَطَبَ الكاتِبُ العبارَةَ"): نووسەرەکە هێڵی بەسەر دستەواژەکەدا هێناو کوژاندیەوە.
(شَطَّبَ- هُ): توێتوێیکرد.
(تَشَطَّبَ):توێتوێبوو.
(تَشَطَّبَ وانْشَطَبَ- الماءُ ونَحوَهُ): ئاوەکە یان شتی لەو بابەتە کشاو ڕۆیشت.
(الشَــطْب (ج) شُــطوب) (مص): ١-شــۆخ/ بالابــەرزی ڕێکوپێــك ٢-پەلــی تــەڕو تازەی

دارخورما.
(اَلشَـطْبَةُ): ١-هێڵێـك كـه بەسـەر هەڵەدا بهێنرێت ٢-(ح) چارەوێیەك كه گۆشـتەكەی نەكەمو نە زۆر بێـت ٣-كەنیزەكی بالأبەرزی رێكوپێك.
(اَلشَطْبَة (ج) شُطَب): شمشێر.
(-مِـنَ النَخـلِ): گـەڵای سـەوزی تـازەی دارخورما.
(اَلشِطبَة): ١-كەنیزەكی شۆخ ٢-چارەوێی لەش رێكوپێك كه نە لەرو نە قەڵەو بێت.
(اَلشِطْبَة والشُـطبَة والشُطَبَة (ج) شُطَب): هێـڵ یان هەڵكۆڵین لەسـەر رووی شمشـێرو شتیتر.
(اَلشَطیبَة (ج) شَـطائِب): پارچە دووگێكی حوشتر كه بە ردێژیی بڕرابێت.
(سَیفٌ مُشَطَّب): شمشـێرێك كه هێڵداربێت یان هەڵكۆڵین لەسەر دەمەكەیبێت.
(رَجُلٌ مُشَطَّب): پیاوێك كه جێدەمی شمشێر یان شتیتری بە دەموچاویەوە بێت.
(سَـیفٌ مَشْـطوب): شمشـێری هێڵدار یان دەمەكەی هەڵكۆڵینی لەسەر بێت.
٢-(شَطَبَ- الرَجُلُ. شَطْباً): دووركەوتەوە.
(-عَنْهُ): لێیدووركەوتەوەو خۆی لێلادا/ لایدا.
(-الرمحُ عَن مَقلَقِـهِ): نێزەكە (كورتیهێنا/ نەیگەیشتێ).
٢-(اَلشَـطائِب): ١-تیپی جیاجیا ٢-گرفتاریی و سەختیی.
شطر: ١-(شَطَرَ- الشيءَ شَطْراً): شتەكەی بە دوو كەرتی وەكیەكەوە كرد.
(-بَیتَ الشِـعرِ): نیوەی دێڕە هەڵبەستەكەی لابرد.
(-الناقَةَ أَوِ الشاةَ): نیوەی گوانی مێحوشترەكە یان مەڕەكەی دۆشیو ئەویتری وازلێهێنا.
(-تِ الناقَـةُ شُـطُوراً): گـۆی گوانێكـی مێحوشـترەكە لە گـۆی گوانەكەیتری درێژتر بوو.
(شَطَّرَ- الشَيءَ): شتەكەی كرد بە دوو كەرتی وەكیەكەوە.
(-الشِعرَ): لەهەر دێڕە هەڵبەستەی دێڕێكیتری خستە سەر.
(-الناقَةَ وبالناقَةِ): دوو گوانی مێحوشترەكەی دۆشیو دوانی وازلێهێنا.
(شاطَرَ- هُ مالَهُ): داراكەی/ ماڵەكەی لەگەڵدا كرد بە دوو كوتی وەكیەكەوە.
(اَلشَطْر (مص) (ج) اَشْطُر وشُطُور): ١-كەرتی شت ٢-نیوەی شتەكە.
("شَطْرُ بَیتِ الشِعر"): نیوەی دێڕە هەڵبەستەكە.
(للناقَـةِ شَـطران قادِمـانِ وآخَـران، وكُلُّ خِلْفَینِ شَـطْرٌ): مێحوشتر دوو كەرتە گوانی هەیە هی پێشـوو هی پاش هەر كەرتەی دوو گوانە.
("حَلَبَ اَشْطُرَ الدَهرِ"): دنیای تاقیكردۆتەوەو

تاڵیی‌و شیرینیی دنیای چەشتووەو چاکەو خراپەی زانیوە (لە بەشە گوانی حوشترەوە وەرگیراوە).
("هـذا حَلَبٌ لَكَ شَطْرُهُ"): ئەمە کارێکە سوودی تۆیشی تێدایەو بۆ هەردووکمانە.
(الشِطرَة): جۆر.
(ولادُ فلان شِطْرَةٌ): منداڵەکانی فیسار دوو بەشن نیوەیان کورن‌و نیوەکەیتر کچن.
(الشَطْرانُ (م) شَطْرى): تەنها تا نیوەی پڕە.
(الشَطور- مِنَ النِعاج أو النوق): مێحوشتر یان مەڕێك کە تاکێکی، لایەکی گوانەکانی لەوانیتر درێژترە یان یەکێك لە گوانەکانی وشکبووە/ وشکیکردووە.
(ثوبٌ شَطورٌ): بەرگێکە لایەکی لەلاکەیتری درێژترە/ بەرگێکە تەکولۆیە «تاکولۆ».
(-الشَطیر): نیوە.
("هذا شَطْرُوهُ و شَطیرُهُ"): ئەمە نیوەو نیو کۆکییەتی.
(مَشطور): دوو نیوەکراو.
٢-(شَطَرَتِ الدارُ شُطوراً): خانووەکە دوورکەوتەوە/ دەرکەنار بوو.
(-عَنْهُم. شُطوراً وشُطورَةً وشَطارَةً): لێیان جیابووەوەو دوورکەوتەوە/ دەرکەنار بوو.
(-إلَیهِم) (ضد): ١-هاتەلایان/ چووە پاڵیان ٢-لێیان جیابووەو دوورکەوتەوە.

(-علی أهلِهِ): لە خێزانەکەی هەڵگەڕایەوە نەگونجاو بەدی‌و خراپەی دەربارە کردن‌و سزایدان.
(شاطَرَ- فُلاناً): هاوسێ بوون دیوار بە دیوارەوە.
(الشَطْر (ج) اَشطُر وشُطور): دووریی.
(نَوىً شُطُرٌ): مەبەستێکی دوور.
(الإبنُ الشاطِر): کوڕێکی خوێڕی‌و سەرسەری لە باوك یاخی پاشان پەشیمانبێتەوەو بێتە خاك‌و پای باوکی.
(دارٌ شَطور): خانویەکی تەریك‌و جیا لەوانیتر.
(الشَطر (ج) شُطَراء وشُطُر): ١-دوور ٢-تەنیاو تاك ٣-نامۆ، نەناس.
٣-(شَطَرَ- شَطْرَ فُلانٍ. شَطْراً): ڕووەو لای ئەوو ڕۆیشت/ نیازی لای فیساریکرد.
(الشَطْر (ج) اَشْطُر وشُطور): قۆڵ/ لا، کەنار.
("شَطَرَ شَطْرَهُ"): ڕووەو لای ئەو ڕۆیشت.
(وَلِّ وَجهَكَ شَطرَ المَسجِدِ الحرام): ڕوو بکەرە مزگەوتی حەرام.
٤-(شَطَرَ- شَطارَةً): زۆرزان‌و فێڵباز بوو/ سەختەباز بوو.
(الشاطِر)( فا) (ج) شُطّار): ١-زۆرزان‌و فێڵاوی/ تەڵەکەبازو ناپاك ٢-زرنگ‌و چابوك.
٥-(الشِطْرَنج (ج) شَطْرَنجات): یاری

شەترەنج (فارسية) شەشرەنگ، شەترەنج لە (شـەترَنك) وەرگیراوە واتا شەشرەنگ چونکە شـەش جۆرە کە یـاری پێدەکرێت، ئەوانیش ئەمانەن: ١-شـا ٢-وەزیر ٣-فیل ٤-ئەسپ ٥-قەلا ٦-سەرباز.

شطس: (شَطَسَ- فِي الأَرضِ شَطساً): بە زەویدا کەوتە گەڕان.

(اَلشَطْس) (مص): زۆرزانیی.

(اَلشُطسوالشُطسَة): ناکۆکیی و بەربەرەکانێ و کەللەرەقیی.

(اَلشَـطُوس): ١-ڕۆیشـتوو بە هەموو لایەکدا ٢-نافەرمان/ سەرپێچیکەر.

شـطع: (شَـطِعَ- الرَجُلُ. شَـطَعاً): ترساو نارامی لەبەر بڕا بە هۆی نەخۆشـییەوە یان شتێترەوە.

شطف: ١-(شَطَفَ- الرَجُلُ شَطفاً): ڕۆیشت و دوورکەوتەوە/ سەری خۆی هەڵگرت.

(-عَنِ الشـيءِ): وازی لە شتەکە هێناو خۆی لێلادا.

(سَهْمٌ شاطِف): تیرێکی نەپێك.

(نِيَّةٌ شَطُوف): نیازو مەرامێکی دوور.

٢-(شَطَفَ- الثَوبَ وغَيرَهُ. شَطفاً): جلەکەی یان شتەکەی شت.

٣-(شَـطَّفَ-الحَطَبَ) (عامیـة): دارەکـەی (پارچە پارچەکرد/ لەتلەتکرد).

(اَلشُطْفَةُ- مِنَ الشَيءِ (ج) شُطَف): (پارچە/ لەت)ی شتەکە.

شـطن: (شَطَنَ- هُ شَطْناً): پێچەوانەی نیازو ئامانجی ئەویکردو ئەو بوو ٢-دووریخستەوە.

(-فِي الأَرض): بەزەویدا چوو.

(-تِ الدارُ شُطُوناً): خانووەکە دوورکەوتەوە.

(-الرَجُلُ): لە ڕێی ڕاست و هەق دوورکەوتەوەو لایدا.

(شَيْطَنَ وتَشَـيْطَنَ. شَيْطَنَةً): شەیتانیکرد/ جامبازیکرد.

(اَشْطَنَ- هُ): دووریخستەوە.

(اَلشـاطِن) (فا): ١-لە ڕاسـتی و هـەق لادەر ٢-پیاوی بەدو ناپاك.

(بِئرٌ- شَطونٌ): چاڵاوێکی زۆر قووڵ.

(نِيَّةٌ شَطُون): نیازێکی/ ناواتێکی دوور.

(رمحٌ شَطونٌ): نێزەیەکی درێژی خوار.

(اَلشَطين): دوور.

(اَلشَيطان (ج) شَياطين): ١-شەیتان/ گیانێکی شـەربەخش/ بەدکار ٢-بە هەمـوو مرۆڤێك یان جنۆکەیەك یان چوارپێیەك دەوترێت کە یاخی بێت بێبەرواو زۆر ستەمبکات.

(شَياطين العَرَب): یاخییەکانی عەرەب.

(الشَيطان): مار. (شَيطان الشِعرِ عند العَرَب الأَقْدَمـين): شـەیتانی شـیعر لای عەرەبـە کۆنـەکان ئـەوە بوو کە شـیعری دەخسـتە دڵـی شـاعیرەوە بڕوایـان وابوو کـە هەموو شـاعیرێك شـەیتانێکی هەیە کە هەڵبەستی

پێرادەگەیەنێت.
٢-(شَـطَنَ- هُ. شَـطْناً): بە پەت بەستیەوە/ پەتبەستیکرد.
(اَلشَطَن (ج) اَشْطان): پەت/ گوریس.
(حَربٌ شَطُونٌ): جەنگێکی سەختی قورس.
٣-(شَیطانُ الفَلا): تینوێتیی.
(مَخاطُ الشَیطان): تووڵە تیشك کە لە هەواداو لە ڕۆژانی گەرمـــدا بەرامبەر ڕووناکیی خۆر دەردەکەوێت کە تەماشا بکرێت.
(شَـیاطینُ الرَأس): شـێتگیریی‌و هەڵچوونی تووڕەیی‌و دەمارگیریی.
(«رَکِبَهُ شَـیطانُهُ»): شـەیتانەکەی سواری سەریبوو. واتا شێتگیر بوو/ دەمارگیر بوو.
شـطي: (شَـطيَ شَـطِیّاً): دەسـت‌و قاچی بەرزکردەوە.
(شَطَّی- الشاةَ. تَشطِیَةً): مەڕەکەی کەوڵکردو گۆشتەکەی لەتلەتکرد.
(اِنْشَـطی- الشَـيءُ): شـتەکە پەلپەلبـوو و بڵاوبووەوە.
شظّ: ١-(شَظَّ-القَومَ شَظّاً): پەرەوازەیکردن‌و دەریکردن.
(شَـظَّظَ واَشَـظَّ- القَومَ): پەرەوازە پەرش‌و بڵاوو دەربەدەریکردن.
(اَلشَظّ (مص) (ج) اَشظاظ): تاقی ئێوارەی ڕۆژ.
(اَلْاَشْـظاظ والشَـظاظ): پارچەپارچـەو پەرەوازە.

(طـاروا اَشــظاظاً اَو شَــظاظاً): پـەرش‌و بڵاوبوونەوە.
٢-(شَــظَّ واَشَظَّ- الجُوالِقَ شَــظّاً): دارپێچی خستە دەمی جەواڵەکانەوە.
(اَلشِــظاظ (ج) اَشِظَّة): دارپێچ کە دەخرێتە کونی هەردوو سەری جەواڵەکەوە.
(اَلشَظیظ (ج) اَشظاظ): ١-جوالی دەمبەستراو ٢-چێوی هەڵقڵیشاو.
٣-(شَظَّ- هُ الأَمرُ. شَظّاً): کارەکەی لێ چووە بەستە.
شظف: ١-(شَظَفَ- هُ عَن کذا. شَظفاً): دەستی نایە بەری ڕێی ئەوەی لێگرت.
(اَلشَظاف): دووریی.
٢-(شَـظِفَ- العَیـشُ شَـظَفاً): گوزەرانەکە گران‌و سەختبوو.
(-الرَجُــلُ): پیاوەکە نەدارا بوو/ نەبوو بوو/ دەستتەنگبوو.
(شَـظِفُ العَیــشِ): نەبوونــی/ نەدارایــی/ دەستتەنگی.
(-تِ الیَدُ): دەستەکە زبر بوو.
(شَظِفَ وشَظُفَ- الشَجَرُ. شَظافَةً): درەختەکە سەختبوو لە بەربێناویی.
(شَظیف): پتەو.
(اَلشَظْف) (مص): چیلکەیەك وەك سنجووق.
(اَلشَـظَف (مص) (ج) شِـظاف والشَظاف): ١-تەنگانەو سەغڵەتیی سەخت ٢-بێگوزەرانیی‌و

تەنگدەستیو نەبوونیی.
(اَلشِظْف (ج) شِظَفَة):١-نانەرەقە ٢-سنجوق.
(اَلشَظِف)١-بەدخوو/ بەدرەوشت ٢-جەنگاوەری ئازا.
(عودٌ شَظِف): چیلکەی شکاو.
(أرضٌ شَــظِفَةٌ): زەوییەکی وشــكو رەقەنی زبر.
٢-(شَــظِفَ- السَّهْمُ. شَــظَفاً): تیرەکە چووە نێوان پێستو گۆشتەوە.
٣-(اَلْمِشظَف): کەسێکە کە بە قسە بشکێنرێت بەڵام بە هەڵە.
شظي: ١-(شَــظِيَ. يَشظی شَــظًى): قڵیشا/ قڵیشیبرد.
(-القَوْمُ): لەیەکبوون/ جیابوونەوە.
(شَظّی- القَومَ. تَشظِيَةً)پەرشو بڵاویکردنەوەو لەیەکیکردن.
(-الفَــرَسَ): ئێســکە باریکەکــەی پــووزی چارەوێکە یان بازووی یان ئەژنۆی درزتێکردو قڵیشاند.
(أشظی- هُ):زیانی بە ئێسکەباریکەکەی پوزی یان بازووی یان ئەژنۆی گەیاند.
(تَشَــظّی):١-قڵیشــا ٢-پەرشو بڵاوبووەوە/ جیابووەوە.
(-العُــودُ):تەڵەزمەکانی چیلکەکە بە هەوادا پەری.
(إنْشَظی):قڵیشا.

(اَلشَــظی) (مص):١-ئێسکۆکە باریکەی پووز یــان بازوو یان ئەژنۆ یــان دەماری ورد کە لە ناویدایە ٢-ســەر بە نەتەوە یان خوێشگەل ٣-کەسانێکی دەرەکی کە لە نەتەوەو خوێشگەل نەبنو چووبنە ناویان.
(اَلشَظِيَّة (ج) شَظايا وشَظِيّ (ع ا) ١-ئێسقانی لاق ٢-تەڵەزمی چیلکە یان ئێسقانو شتی لەو بابەتانە ٣-کەوان.
٢-(شَظى- السِقاءُ. شَظِيّاً):کوندەکە پڕکراو قاچەکانی رەپبوونو بەرزبوونەوە.
(-المَیتُ):مردووەکە دەستو قاچی رەپبوو و بەرزبووەوە.
شــعّ: ١-(شَــعَّ- الماءُ. شَعّاً وشَــعاعاً):ئاوەکە پەرشو بڵاوبووەوە.
(-الماءَ):ئاوەکەی پەرشو بڵاوکردەوە.
(شــعَّ الغــارَةَ عَلَیهِم):لە هەمــوو لایەکەوە شاڵاوی بردنە سەر.
(أشَعَّ- الماءَ ونَحْوَهُ. إشعاعاً):ئاوەکە یان شتی لەو بابەتەی بڵاوکردەوە.
(-تِ الشَــمسُ):خۆرەکە تیشــکی بە هەموو لایەکدا پەخشکرد.
(إنْشَعَّ- الذِئبُ في الغَنَم):گورگەکە پەلاماری مەڕەکانیدا.
(اَلشَعاع) (مص):بڵاوبونەوەی خوێنو شتی وەها ٢-هەموو شتێکی پەرشو بڵاوەبوو.
(«ضَرَبــتُ بِالعصا علی الحائــطِ فَتَطایَرَت

شَعاعاً»): دارەكەم بە دیوارەكەدا كێشا كەچی شكاو پارچەپارچە بوو بڵاوبووەوە.
(«ذَهَبَ القَومُ شَـعاعاً»): خوێشكەل پەرش‌و بڵاوبوونەوە.
(«طارَ قَلْبُهُ شَـعاعاً»): داخ‌و مەراقەكانی لە دڵی دەرچوو.
(«طارَت نَفْسُهُ شَعاعاً»): ترس‌و ئەو شتانەی لە دەروونندا بوو رەوییەوە.
(ألشُـعاع (ج) أشِعَّة وشُعُع وشِعاع):١ـتیشكی خـۆر/ هەتـاو رووناكی خۆر كـە دەبینرێت وەك پەتی درێژەوەبوو ٢ـ(هـ)هێڵێكی راسـتی ئاراستەكراو.
(شُعاعُ الدائِرَة) (هـ):هێڵێكی راستە كە پنتێكی سـەر بازنەكە بە چەقـی بازنەكە دەگەیەنێت ئەویش نیوەتیرەی بازنەكەیە.
(ألشُعاعُ المُحْرَقي في قطع مَخروطي) (هـ)
(شُـعاعانِ مُتسـايران) (هـ):٢ـدوو تیشكی تەریبن‌و ئاراستەیەكیان هەیەو درێژییەكیان هەیە.
(أشِعَّة (س) أَو أشِـعَّة رُنتجن) (ف):تیشكی ئێكس: تیشكێكی نەبینراوە تەنە نارِوونەكان دەبڕێـت وەك تەختـەو تەختـە كانزایـی تەنك‌و شـتیتر، بە گەڕان لە لەشی مرۆڤدا بۆ دۆزینەوەی ئازارو دەردو گرتنی وێنەی لەش.
(أشِـعَّة ماقَبلَ الأَحْمَر) (ف):تیشـكی پێش سـوور: تیشـكێكە لە رووناكیی سپیدا هەیە. نابینرێت. لەناو پەلكەزێڕینەدا پێش رەنگی سوورەو زۆر گەرمە.
(أشِـعه مابَعدَ البَنَفْسَـجي): تیشـكی پاش بنەوشەیی (ف) تیشكێكە لە رووناكیی سپیدا هەیەو نابینرێت شوێنی لەناو پەلكەزێڕینەدا پاش وەنەوشەییەو كاردەكاتە سەر فلیم بەوە بوونی دەزانرێت.
(ألأَشِـعَّة المَهْبِطيَّة) (ف):تیشكە كاسۆد. ئەو تەزو یان لێشاوی بارگانەیە (ئەلیكترۆنانەیە) كە لـە كاسـۆدەوە دەردەچێت بـەرەو ئانۆد لە لوولەی گـازە كەم پەسـتانەكاندا. كاتێك كارەبای تێدا خاڵیدەبێتەوە.
(ألشِعاع): ئامێرێكە بۆ ناردنی تیشك.
(شُعُ الشَّمس): تیشكی خۆر/ هەتاو.
(ألشَعَ- مِن كُلِّ شَـيء): پەراگەندەی هەموو شتێك.
(ألشُـعاعِيّات) (ح): كۆمەڵـە گیانداریێكـی یەكخانەیی ئاوین بە میكرۆسكۆب دەبینرێن لە ناخی دەریا قووڵەكاندا دەژین.
(ألمِشـع (ج) مُشِعّات) (ف):تیشكدەر ئەوەیە كە تواناى تیشكدانەوەی تێدا بێت‌و بیداتەوە وەك رادیـۆم‌و ئۆرانیـۆم‌و ئا لـەو بابەتە كە تیشكێك دەنێرێت كاری فیزیایی‌و فسیۆلۆجی دەكات.
٢ـ(أَشَـعَّ- الـزَرعُ. إِشـعاعاً) (ز):كشـتەكە قەڵاسی دەركرد.

(-السُـنبُلُ): گوڵەگەنمەکە یان گوڵە جۆ کە شیلەی تەواویگرت.

(اَلشَـعَاع- مِنَ اللبن): شـیرێك کە ئاوی زۆر تێکرابێت.

(شُعاعُ السُنبُل) (ز): قەڵاسی وشکەوەبووی سەرگوڵە گەنمو جۆ.

(شُعاعُ وشِعاعُ وشَـعٌ- السُنبُلِ): قەڵاس کە بە گوڵە گەنمو جۆوەیە.

٣-(شَعَّ. شَعّاً وشَعيعاً): پەلەیکردو خێرایکرد/ ئازاییکرد/ دەستوبردیکرد.

(اَلشَعّ والشَعيع): گورجیی.

٤-(اَلشُـعّ): (خانـووی/ تەنـاف) جاڵجاڵۆکە ٢-سێبەرێکی کاڵ/ ڕووناك.

٥-(شَعْشَعَ- الشَرابَ): شەربەتەکەی ڕوونکردەوە/ ئاوی کردە شەربەتەکەوە.

(-الشَيءَ): شتەکەی ئاوێتەکردو دایبەسەریەکدا/ تێکی هەڵدا.

(تَشَعْشَـعَ- الشَـهْرُ): مانگەکـە خەریکبـوو بەسەردەچوو/ کەمی مابوو.

(اَلشَعْشَـع الشُعْشُـع والشَعْشَـاع والشَعْشَعَان والشَعْشَعانيّ): ١-درێژ ٢-بە زمان/ قسەزان ٣-سووك/ سووکەڵە.

(-مِنَ الظِلّ): سێبەری کەمتاریك/ ڕووناك.

(اَلشَعْشـوع) (ز): چـووزی تـەری قەزوان. سوورەو ناسکەو خۆشە.

٦-(شَعْشَـعَ-تِ الشَمسُ): خۆر تیشکیدایەوە/ ڕووناکیی بڵاوکردەوە.

(-الضَـوءُ): (شـەوقەکە/ ڕووناکییەکـە) بڵاوبووەوە/ پەخشبوو.

(-عَلَيهِمُ الخَيلَ): هێرشـی سوارەی بەسەردا هێنان واتا بە سواری ئەسپەوە پەلاماریاندان.

الملحق:

شع: (الإشْعاع): پەخشانی هێڵی ڕووناکیی.

(-في المَجـاز): بڵاوبوونـەوەی تیشـکی بیرو شارستانی.

(إشْعاعُ بَلَدٍ): پەخشانی شارستانەتیو زانستو بیری وڵاتێك.

(الإشعاع الذَرّيّ): تیشـکدانەوەی ئۆتۆمیی/ هەستانو بڵاوبوونەوەی ئۆتۆم بەهەوادا.

---

شعب: ١-(شَعَبَ- الشَيء. شَعْباً) (ضد): ١-شتەکەی بڵاوکردەوە/ جیایکردنەوە ٢-کۆیکردەوە ٣-درزی تێکرد/ قلیشاندی.

(-فُلاناً): فیساری خەریککرد/ سەری قاڵکرد.

(-اللِجـامُ الفَرَسَ): لغاوەکـە چارەوێکەی لە جووڵە خستو ڕایگرت.

(-الشَيءُ): شتەکە دەرکەوت.

(-القَومُ): پەرەوازە بوون/ بڵاوبوونەوە.

(-إلى القَومِ): وازی لە هاورێکانی هێناو چووە لای خوێشکەل.

(-الأَميرُ رَسولاً إلى موضِعِ كذا): میر ڕاسپێرێکی/ فرستادەیەکی بۆ ئەو شوێنە نارد.

(شَـعِبَ- الرَجُلُ أَو الثَورُ): ناوشانی پیاوەکە

یــان گاکــه پانبوو/ ســەری هەردوو ســەری بازووی گاکە لە یــەك دووربوون کە هەردوو شاخەکەی لە یەك دووربوون.

(شَــعَّبَ- عَنهُ): بەیەکجــاری لێجیابووەوەو لەیەکپچڕان.

(شاعَبَ- صاحِبَهُ): لە هاورێکەی دوورکەوتەوە.

(أشْــعَبَ- عَنــهُ): بەیەکجــاریو تــا هەتایە لێدوورکەوتەوە.

(تَشَعَّبَ- القَومُ): پەلپەلبوون/ لێکجیابوونەوە.

(-الــزَرْعُ): کشــتەکە پەلوپــۆی دەرکــردو بڵاوبووەوە.

(-النَهرُ): جۆگەی زۆر لە ڕووبارەکە بووەوە.

(-عَنهُ): ١-لێدوورکەوتەوە ٢-لکی لێبووەوە/ پەلی لێجیابووەوە.

(-ت أغْصانُ الشَــجَرَةِ): پەلوپۆی درەختەکە بڵاوبووەوە.

(تَشَعَّبَتْهُم- الفِتنَةُ): ئاشوبەکە لە یەکیکردنو لێکپچڕاندن.

(إنْشَعَبَ- عَنهُ): لێدوورکەوتەوە.

(-ت أغصانُ الشَــجَرَةِ): لقەکانی درەختەکە بڵاوبوونەوە/ درەختەکە پەلی هاویشت.

(-الطَریــقُ أوِ النَّهرُ): ڕێکەکــە (ڕێگەیتری/ پەلــی) لێبــووەوە یــان ڕووبارەکــە جۆگەی لێهەڵگیرا.

(-بِهِ القولُ): لە واتای قســەکە واتایەکیتری لێدەرهێناو لێتێگەیشت کە لەویتر جیابوو.

(اَلشَعب (ج) شُعوب): ١-دووریی ٢-دوور.

(ماءٌ شَعْبٌ): ئاوێکە دوورە ٣-گەل.

(اَلشِــعب (ج)( شِــعاب): ١-ڕێــی ناوشــاخ ٢-ناوەڕۆی ژێرزەوی ٣-دەربەندی شاخ ٤-کەنار.

(اَلشَــعَب (مص) (ج) شُعَب وشِعاب): دووری نێوان دوو ســەری سەرشان یان دووری نێوان دوو قۆچی ئاژەڵ.

(اَلشُــعْبَةُ (ج) شُعَب وشِــعاب): ١-لك/ پەل/ قۆل/ هۆبە ٢-دەستە ٣-بەشێکی شت.

(«إشْــعَب لِي شُــعْبَةً مِن المالِ»): بەشــێکی داراکەتم بدەریو بۆم جیابکەرەوە ٤-شەقبوونی شاخ ٥-(لق/ چڵ/ پەل)ی درەخت ٦-نێوانی دوو شاخی ئاژەڵ یان دوو پەلی درەختو شتیتر ٧-ئاوەڕۆ ٨-شیوی ناو دۆڵ/ چەم.

(شُــعَبُ الدَّهــرِ): هەموماوو پێشــهاتو باری ڕۆژگار.

(-الیَد): پەنجەکانی دەست.

(-السَــفود): شیشــەکانی گۆشــتبرژاندن یان شیشی کەباب.

(-الفَرَس): ئەو شوێنانەی چارەوێ کە بەرزن وەك سەریو یان سەرشانی.

(-الجسم): دەستو قاچی مرۆڤ.

(«هذِهِ مَســألَةٌ کَثیرَةُ الشُعَب»): ئەمە پرسە بابەتێکە لکی زۆر لێدەبێتەوە.

(-شُــعْبَتا الرَحــل): پێشو پــاش زین یان کورتانی حوشتر.

(الأَشْعب (م) شَعْباء (ج) شُعْب): ١-ئەو ئاژەڵەی هەردوو سەر شانی زۆر لە یەك دووربن یان دوو شاخەكەی زۆر بلاوبن و لە یەك دووربن ٢-ئاژەڵی (كۆڵ/ شاخشكاو).

(ألشاعِبان): دوو سەر شان (لەبەرئەوەی لە یەكەوە دوورن).

(شَعْبان (ج) شَعابين و شَعبانات): مانگی كوڵەمانگ كە هەشتەمین مانگی عەرەبییە كە دەكەوێتە نێوان مانگی رەجەب و رەمەزانەوەو (٢٩) رۆژە (بۆیە وا ناونراوە چونكە عەرەب بۆ ئاو بلاوبوونەتەوەو بۆی گەراون).

(اَلمَشعَب (ج) مَشاعِب): رێباز/ رێگە.

(«هذا مَشْعَبُ الحَقِّ»): ئەمە رێگەی هەق و راستییە كە جیایە لە رێگەی ناراستی.

٢-(شَعَبَ- الشيءَ. شَعْباً (ضد)): ١-شتەكەی كۆكردەوە ٢-بلاوكردەوە ٣-(ضد) چاكسازیكرد ٤-خراپیكرد/ تێكیدا.

(انشَعَّبَ- الشيءُ): شتەكە چاكسازبوو/ كۆكبوو.

(اَلشَعْب (ج) شُعُوب): ١-جێلكانی پارچەكانی سەر بەیەكەوە ٢-جێی لێكترازان/ درز/ قلیش.

(«إلتَأمَ شَعْبُهُم»): پاش لەیەكترازانیان یەكیانگرتەوە ٣-گەل، هۆز، خێڵ، تیرە، پەل. بەرە، بەرەباب.

(اَلشَعب): وەكیەك/ هاوشێوە/ چونیەك.

(«هُما شعبان»): ئەو دووانە وەك یەكن.

(ألشِعْب (ج) شِعاب): گەرەكێكی گەورە/ مەزن.

(ألشَعَّاب): ئەوەی قلیش و درز دەهێنێتەوە یەك.

(اَلشُعوبِيَّة): نەتەوەپەرستیی.

(اَلشُعوبِي): نەتەوەپەرست.

(اَلشِعابَة): پیشەی درز و قلیشسازیی.

(اَلشَعيب (ج) شُعُب): ١-كوندەی كۆن و دراو ٢-زین یان كۆپانی حوشتر (چونكە پارچەكانی لەیەكدەدرێت) ٣-جەوەندە.

(اَلمُشَعَّب): سازكراو/ چاككراو.

(اَلمِشْعَب (ج) مَشاعِب): سمۆ/ كونكەرە.

٣-(شَعَبَ- الرَجلُ. شَعْباً): مرد.

(- تْهُ المَنِيَةُ): مەرگ كوشتی.

(شاعَبَ-ت نَفسُهُ): مرد.

(-الحَياة): ژیانی نەهێشت/ مرد.

(انشعب الرجل): مرد.

(أشْعَبَ- الرَجُلُ): مرد.

(إنْشَعَبَ-ت نَفسُهُ): مرد.

(شَعُوبُ): مەرگ/ مردن.

٤-(شَعْبَذَ=شَعْوَذَ): جادووگەریی/ چاوبەستیی/ فێڵ و ساختەبازیی/ ئەفسانەبازیی.

الملحق:

شعب: (اَلشَعْبِيّ): گەلیی.

(إعتقاد شَعبِي): بیرو برِوای گەلیی.

(مظاهَرَة شَعبيَّة): خۆپێشاندانێکی گەلیی.
(المُنبَعِث مِنَ الشَّـعب»): لەنـاو میللەتەوە هەڵقولابێت.
(حکومَةٌ شَعبِيَّة): فەرمانڕەواییەکی میللی/ گەلیی.
(«مایَروق الشَّعب»): ئەوەی گەل پێیخۆشبێت.
(إجراءٌ شَعْبِي): کردەیەکی میللی.
(«خـاصٌ بِطَبَقَـة الشـعب»): تایبەتە بە چینی گەلیـی پێچەوانەی هی دەوڵەمەندانو ئورستوکراتییەکان.
(«حَيٌّ شَعْبِيّ»): گەڕەکێکی میللی.
(اَلمُتَشرِبَینَ الشَّعب): لەناو میللەتاندا بلاوە.
(لُغَةٌ شَعبِيَّة): زمانی میللی.
(«الخاص بِتَقالید شَـعْب وعاداتِهِ وفَنِّهِ»): تایبـەت بـە دابو نەریـتو خـوو هونەری فۆلکلۆریی گەلێک.
(اَلرقص الشَعبِي): هەڵپەڕکێی میللی.
(اَلمَحبوب مِن الشَعب): خۆشەویستی گەل.
(الذي لَهُ حُظوَةٌ لَدَیهِ): ئەوەی لەلای میللەت لە پێشە.
(زعیمٌ شَعبِيّ): پێشەوایەکی میللی.
(اَلشَعْبِيَّة): میللی/ گەلیی.
(اَلحُظوَة عِندَ الشَّعب): بوونی پلەوپایەی لە دڵی میللەتدا.
(کَوْنُ الشَخص مَحبوباً مِنَ الشَعب): کەسەکە لەلای گەل خۆشەویستە.

(مسـموعُ الكلمـة لَديـهِ): ئـەو کەسـە خۆشەویسـتی میللەتبێـت لەنـاو میللەتدا قسەی ڕەوایە.
(تَمَتُّع بِشَعبِيَة کبیرَة): لەناو میللەتدا خاوەن بڕواو خۆشەویستی زۆر بێت.
(«تَضاءَلَت شَعبِيَّةُ»): بڕواو خۆشەویستی ناو میللەتی کز بووە.
(«اَلرَّواج والإنتشار لدی الشَّعب»): ببێتە باو لەناو میللەتدا بلاوبێتەوە.
(شَعْبِيَّةُ أُغنِيَة): باوو بلاویی گۆرانییەك.

شعث: ١-(شَـعِثَ- الشَعَرُ شَـعَثاً وشُعُوثَةً): قژەکە بژ بوو ئالۆزکاو بەیەکداچوو.
(أَشـعَث (م) شَـعْثاء): کەسـێکی قـژ بژی ئالۆزکاوی بەیەکداچوو.
(-الأَمرُ شَعْثاً): کارەکە بلاوبۆتەوە.
(شَعَّثَ- الشيءَ): شتەکەی پەرتو بلاوکردەوە/ جیاپکردنەوە.
(-الشـاعِرُ): هۆزانڤانەکـە/ شـاعیرەکە لـە هۆنراوەکەیدا (تَشعیث) ی بەکارهێنا ئەویش پیتـی بزوێنداری وشـەکە لەسـەر کێشـی (فاعلاتن) بوو کردی بە (مفعولن).
(-مِـن فُـلان): لـە کابـرای کەمکـردەوەو سووکیکرد.
(-مِـنَ الطَّعـام): شـتێکی/ کەمەکێکـی لە خواردنەکە خوارد.
(-مِنهُ شیئاً): شتێکی لێ داواکردو وەریگرت.

(-هُ بخَيرٍ): شتێك خێری بەرخست.

(تَشَعَّثَ): پەرش و بڵاو بووەوە.

(-الشَّعَرُ): قژەكە بەیەكداچوو و ڕەنگی بۆز بوو.

(-الشِعرُ): هۆنراوەكە/ شیعرەكە (تَشعیث)ی تێچوو.

(-مِنَ الطَّعامِ): كەمێكی لە خواردنەكە خوارد.

(اَلشَّعْث والشَّعَث): پەرش و بڵاوبوونەوەی كارو كەم و كورتیی تێبوون.

(«لَمَّ اللهُ شَعْثَهُم»): خودا یەكیخستنەوەو تەبایكردنەوە.

(اَلشَعِث والشَعْثان= الأَشْعَث): ١-بژی و پەشۆكاوی ٢-پەراگەندەیی.

(التَشعیث): پیتێكی بزوێنداری وشەیەك كە لەسەر (فاعلاتن)ە لابەرێت و وشەكە بكەیت بە (مفعولن).

٢-(شَعَّثَ- عَنهُ): لەسەریكردەوە/ بەرگری لێكرد.

شعر: ١-(شَعَرَ- الثَوبَ شَعْراً وشِعْراً): ناواخنی مووی بۆ بەرگەكە كرد.

(شَعِرَ. شَعَراً): مووی زۆرو درێژبوو.

(شَعَّرَ- الجَنینُ): كۆرپەلەكە لە سكی دایكیدا بوو تووكی لێڕوا.

(-الثَوبَ ونَحْوَهُ): ناواخنی مووی بۆ بەرگەكە یان شتیتر كرد.

(أشْعَرَ- الجَنینُ): كورپەلەكە مووی لێڕوا.

(-الثَوبَ): ناواخنی مووی بۆ جلەكە كرد.

(-هُ الشِعارَ): ژێركراسی پێ لەبەركرد.

(-هُ بِكَذا): بەو شتەوە چەسپاندی/ نووساندی بەو شتەوە.

(أشْعَرَ الهَمُّ قَلْبي): داخ و مەراق دڵیگرتم.

(-هُ شَرّاً): بەدیی و خراپەی پێوە لكاندو پێگەیاند.

(تَشَعَّرَ- الجَنینُ): كۆرپەلەكە مووی لێڕوا.

(إستَشْعَرَ- الجَنینُ): كۆرپەلەكە مووی لێڕوا.

(-الشَعارَ): ژێركراسی پێ لەبەر كرد.

(-بالثَوبِ): لەژێر جلەكەیەوە لەبەریكرد.

(اَلشَعْر (ج) أَشْعار وشِعار وشُعُور): موو. تووك.

(شَعْرَة (ج) شَعَرات): تووكێك/ تاڵێك موو.

(اَلشَّعَر) (مو): ئەو چەمكە مووەی كە لە كەمان دەبەسترێت كە بە ژێی كەوانەكەدا دەهێنرێت و پێی لێدەدەن.

(اَلشَّعَر (ج) أَشعار وشِعار وشُعُور= الشَّعْر): ١-موو/ تووك ٢-قژ.

(اَلشَّعَرَةُ): تاڵەموویەك/ چڵە تووكێك.

(اَلشَعِر والشَّعرانِيّ): تووكن/ ئەوەی تووكی/ مووی زۆربێت و درێژبێت.

(اَلشِعْرَة): پەڵەموویەك.

(اَلشِعْرَةُ والشِعْراء): بانەگا/ شوێنی تووكی بەر كە لە خوار ناوكەوەیە.

(اَلشَعار)؛ ١-ژێرپۆش/ ژێركراس كه لهسهر پێستهوه لهبهردهكرێت ٢-جلی ئهسپ كه بۆ پاراستنی بهسهر پشتیدا دهدرێت.
(اَلشَعِرَة)؛ جێی شهش دانه تووكی ئێستر.
(اَلأشعَر (م) شَعراء (ج) شُعر)؛ تووكن/ مووین/ مووهكه پرو درێژبێت.
(«فلان اَشعَر الرَّقَبَة»)؛ فیسار ملتووكنه دهڵێی شێره.
(اَلشَعراء (ج) شُعر)؛ فهروو.
(اَلمَشعَر (ج) مَشاعِر)؛ ژێركراس/ ژێرپۆش.
(إناءٌ مَشعُور) (عامیة)؛ قاپێكی كهمهكه درزاوی.
٢-(شَعَرَ- الرَجُلُ شِعراً وشَعراً)؛ هەڵبەستی دانا/ هۆزانیدانا.
(- لِفُلان)؛ شیعر/ هۆزانی بۆ دانا.
(شاعَرَ- هُ فَشَعَرَ- هُ)؛ شعره هۆزانیانكردو بەزاندی.
(تَشاعَرَ)؛ خۆی به هۆزانڤان داناو شیعری دانا.
(اَلشِعر (مص) (ج) اَشعار)؛ هۆزان/ هۆنراوه/ شیعر، هەڵبەست. ئاخاوتنێك كێش و سەروای هەبێت.
(اَلأشعَر)؛ هۆزانی تەواو جوانترو باشتر.
(الشاعِر (فا) (ج) شُعَراء (م) شاعِرَة (ج) شَواعِر وشاعِرات)؛ هۆزانڤان/ شاعیر/ هۆنەر.
(شِعرٌ شاعِرٌ)؛ هۆزانێكی چاك.
(اَلشُعرور (ج) شَعارِیر)؛ كۆلكه شاعیر/ شاعیرێك كه هۆزانەكانی ناتەواوو نارێكبێت.
٣-(شَعَرَ وشَعُرَ- بِهِ شِعراً وشَعراً وشِعری وشُعری وشِعری وشِعرَةً وشَعرَةً وشُعرَةً وشُعوراً وشُعورَةً ومَشعُوراً ومَشعُورَةً ومَشعُوراء)؛ پێیزانی یان هەستی پێكرد.
(-لَهُ)؛ بیری بۆیچوو/ دەركی پێكرد/ كەوتە دڵیەوه/ بەدڵیداهات.
(اَشعَرَ- هُ الأمرَ وبِالأمرِ)؛ هەواڵی كارەكەی پێگەیاند/ له كارەكەی ئاگاداركرد.
(-أمرَ فُلان)؛ كاروباری فیساری ئاشكرا كرد.
(-الرَجُلَ)؛ پیاوەكەی لەوه ئاگاداركردەوه كه شتێكی خراپی به باشی ئاوهێناوه.
(اَلشِعر)؛ پێزانین/ ئاگاداربوون/ هەستپێكردن.
(لَیتَ شِعري فلاناً اَو عَن فُلانٍ اَو لِفُلانٍ ماصَنَعَ)؛ خۆزگه بمزانیایه یان هەستم پێیكردایه كه فیسار كەس چیكردووه.
(اَلشاعِر)؛ هەستەكان.
(رَجُلٌ مَشعُور) (عامیة)؛ كابرایەكی تێكچوو.
٤-(اَشعَرَ- القَومُ)؛ ١-خوێنگەل دروشمێكیان بۆ خۆیان دانا ٢-بانگەوازی دروشمەكەی خۆیانكرد.
(اِستَشعَرَ- القَومُ)؛ له جەنگدا دروشمی خۆیان هەڵبڕی و به گوێیاندا دایەوه.
(«اِستَشعِرْ خَوفَ اللهِ»)؛ ترسی خودا له دڵدا

رانوماتبێت دروشمتبێت.
(اَلشِعار (ج) اَشْعِرَة وشُعُر= سِر اللَّيل): بانگێکە تایبەتیە بە خۆیشگەل یەکتری پێدەناسنەوە یان لە کاتی جەنگو داگیرکردنو پەلاماردا یەکتری پێدەناسنەوەو بانگەکەن پێیدەڵێن نهێنیی شەو ٢-دروشم/ نیشانەی جەنگو گوزار.
(شِعارُ الحَجّ): دروشمی حەج، نیشانە/ هێماو دەستوورەکانی.
(شِعارُ المَمْلَكَةِ): دروشمو نیشانەی وڵات.
(شِعارَة): دروشمو نیشانەیەکی وڵات.
(شَعارُ الحَجّ) (الواحِدَةُ شَعارَة): نیشانەو دەستوورەکانی حەج.
(اَلشَعيرَة (ج) شَعائِر): ١-نیشانە ٢-یەك نیشانەو دەستوورو کردەو زانینێکی حەج.
(اَلمَشْعَر (ج) مَشاعِر): شوێنی جێبەجێکردنی دەستوورەکانی حەج.
٥-(اُشْعِرَ- المَلِكُ): شاکوژرا.
٦-(اَلشَعار): ١-شوێنێك کە درەختدار بێت ٢-درەختی بەیەکداچوو لە شوێنێکی نشێودا بە زستان بۆ گەرمیی خۆیانی تێدەکوتنو لە هاوینیشدا بۆ فێنکیی دەچنە بن سێبەرەکەی ٣-بە گشتیی بە درەخت دەوترێت.
(اَلشَعار (ج) اَشْعِرَة وشُعُر): ١-هەورەگرمە ٢-زەبەنگ/ درەختی بەیەکداچوو.
(اَلشَعير) (ن): جۆ.
(شَعيرَة): دەنکە جۆیەك. کە لە بنەرەتدا لە ئاسیادا بووە لە هەموو وڵاتە ئاوو هەوا مامناوەندیەکاندا دەچێنرێت. دەکرێت بە ئالیکی وڵاخو دەیشهارێتو بە نان دەکرێت. نانەکەی زۆرباش نییە. هەروەها بیرەی لێ دروستدەکرێت.
(اَلشَعيرَة) (طب): سیچکەسلاوە کە لە پێڵوی چاو دەردێت شێوەی لە جۆ دەچێت.
(اَلشَعيرِيّ): ١-جۆیی ٢-جۆفرۆش.
(الأَشْعَر (ج) أشاعِر): ١-مووی دەوری سمی وڵاخ ٢-گۆشتی دەرچووی ژێر نینۆك.
(اَلشُعَراء (ج) شُعْر (ح): ١-مێشەکەرانە کە سەوزەو مێشە سەگانە ٢-زۆریی خەڵكو جەنجاڵییان ٣-(ن)جۆرە قۆخێکە ٤-دارێکە لە ترشەمەنییەکان.
(-مِنَ الدَّواهي): لێقەومانی سەخت/ چورتومی گران.
(اَرضٌ شَعْراء): شوێنێکی پردار/ دارستان.
(رِمالٌ شَعْراء): زەوییەکی لمانی کە جۆرە درکێکی تێدا دەروێت.
(اَلشِعْرى) (فك): هەسارەی گەلاوێژ کە لە سەختیی گەرمادا هەڵدێت.
(اَلشُعْرُور (ج) شَعارير) (ن): وردە ترۆزی/ بەرووله ترۆزی.
(شُعْرُورَة): وردە ترۆزییەك بەرووڵەیەك.
(اَلشَعْرِيَّة (ج) شَعْرِياتِ المُشَرَّبِيَّة): تۆڕی

پەنجەرەکـە لـە توولْـی باریکـی تەختـە دروسـتدەکریْتو لـە پەنجـەرە دەنریْت تا خەلْك ناوەوە نەبینیْت.

(اَلمَشْعَر (ج) مَشـاعِر): درەختی سایەدار کە دەچنەبنی.

ملحق:

شـعر: (اَلشُّـعور): پیْزانین/ بە هەسـتەکان پیْیبزانریْت.

(«اَلشُّعور بِالبَرد»): هەست بە سەرماکردن.

(«الإحسـاس الداخلي»): هەسـتی ناوەوە/ هەستی دەروون.

(«شُعور بِالفَرَح»): هەست بە خۆشیکردن.

(العاطِفَة): سۆز.

(رقيق الشُعور): هەستناسك.

(اَلشُّعور- في علم النَّفس): هەست لە زانستیی دەروونناسیدا: باری (ئاوەز/ عەقلْ)ی مرۆڤ لـە بەئاگاییدا کە لەسـەر زانیـاری ویژدانو ئارەزوو خواستو ویست دەوەستیْت.

(«غابَ عَن الشُّـعور»): بیْهۆشـبوو/ هۆشی لیْبرا.

(الإشـعار): پیْراگەیانـدن/ بـە ئاگاهیْنان/ ئاگادارکردنەوە.

(«الإشـعار بِالأمـر»): ١ـلـە کارەکـە ئاگادار بکریْتـەوە ٢ـکارەکـەی پیْرابگەیەنریْت/ لە پیْشەوە ووریابکریْتەوە.

(«تَلقّـی إشـعاراً»): پیْشـەکیی ئاگادارکراو پیْراگەیەنرا.

(تَعليمـات تَصْـدُرُ علـى الأخـص كتابَـةً وبواسطة الإعلان): ریْنومایی کە دەردەکریْت بـە تایبەتـی بە نووسـین یان بە جـارِدانو ئاگاداریی.

(«حتى إشعار آخر»): تا ئاگادارکردنەوەیەکی تر.

(إشعارٌ بِالإستِلام): ئاگادارنامەی وەرگرتن.

(بطاقَـة مرفقَـة بِالكتاب المضمـون تُعلِم بِاسـتلامِهِ): بلیتیْکـە بـە نوسـراوەکەوە دەکریْـت تیایدا وەرگرتنەکـە دەردەخریْتو پیْرادەگەیەنریْت.

(الأشْـعَرِيَّة): دەسـتەیەکی ئاخاوتنییـە کە سـەر بە (أبو الحسـن علي الأشعري) یە کە لە موعتەزیلەکان جیابوونەوەو هەلْویْسـتیْکی مامناوەنـدی لـە نیْـوان ئەوانەی پشـت بە ئاوەزو ئەوانەی پشـت بە دەق دەبەستن وتی: لـە دەقەکە بە هۆی ئـاوەزەوە/ ئەقلەوە/ لە قەدەکە تیْدەگەین، چونکـە عەقلْ خزمەتی شەریعەت دەکاتو لە خزمەتی شەریعەتدایە.

---

شعف: ١-(شَـعَفَ- هُ الحُبُّ شَعْفاً): ئەوین لە دلْیەوە ئالاْو گرفتاریکردو زالْیبوو.

(-بِالقَطْرانِ): قەترانی تیْهەلْسوو.

(-الشَـيءُ الشَـيءَ): شتەکە سـەر شتەکەیتر کەوت.

(شَـعِفَ- بِفُـلانٍ وبِحُبِ فُـلانٍ): گرفتاری خۆشەویستیی ئەو بوو/ سەرگەردانی ئەوینی

ئەو بوو.

شُــعِفَ بِفُلانٍ: خۆشەویســتی لە ناخی دڵیدا کاریکردو پەرێشانیکرد.

(اَلشَعَف) (مص): پۆپەی کۆپارەی حوشتر.

(اَلشَعْفَةُ): جارێك گرفتاریی ئەوین.

(اَلشَــعَفَةُ (ج) شَــعَف وشُــعُوف وشِــعاف وشَعَفات): سەری چیا/ چەپکە مووی سەر.

(-مِنَ القَلْب): سەری دڵ.

(شَعْفَةُ كلّ شيءٍ): سەرەوەی/ پۆپەی هەموو شتێك.

(-الشُعاف): (شەدایی/ دێوانەیی) و هۆشلێبڕان.

(-اَلشَــعَاف): حــەزو دڵداریی دڵ بســێنێت‌و بەرێت.

(اَلمَشْعُوف): شێت‌و شەیداو دێوانەو هۆشلێبڕاوی دڵداریی.

٢-(شَــعِفَ-تِ الناقَةُ. شَــعَفاً): مێحوشترەکە تووشی برژانگهەڵوەرانبوو.

(شَعْفاء): مێحوشتری برژانهەڵوەریو.

(اَلشَــعَف) (طب): دەردێکە تووشی مێحوشتر دەبێت‌و برژانگەکانی هەڵدەوەرێت.

٣-(اَلشَــعْفَةُ): ١-دڵۆپە بارانێك ٢-نەمبارانێك کە ڕووی زەوی تەربکات.

(«ماتَنفَــعُ الشَــعْفَةُ فِي الــوادي الرُغُب»): نەمبارانێك لە زەوییەکی ئاوهەڵمژدا بێسوودە/ ئــاو هەڵناســێنێت واتا کەمــە یارمەتییەك‌و دەستگیرۆییەك پێداویستیی تەواو لانابات.

شــعل: ١-(شَــعَلَ- النَّارَ شَــعْلاً): ئاگرەکەی خۆشکرد/ گڕی بە ئاگرەکە سەند.

(شَــعَّلَ- النَّارَ): ئاگرەکەی خۆشکردو کڵپەی پێسەند.

(اَشْعَلَ- النَّارَ): گڕی بە ئاگرەکە سەند.

(-هُ): گــڕی پێگــرت/ تووڕەیکــرد/ ئاگــری تێبەردا.

(تَشَعَّلَ-تِ النارُ): ئاگرەکە کڵپەیسەند.

(إشْتَعَلَ-تِ النارُ): ئاگرەکە کڵپەیسەند.

(«إشْتَعَلَ الراسُ شَيباً»): سەرەکە مووی سپی دایگرت/ مووی سپی زۆری تێدا پەیدابوو.

(«إشْــتَعَلَ فُــلانٌ»): فیســار ئاگریگــرت/ گریسەند/ تووڕە بوو.

(غُــلامٌ شَــعْلٌ): مێردمنداڵێکی ســووکەڵەو چابوك‌و زیتەڵە.

(اَلشُــعْلَةُ (ج) شُــعَل): ١-گڕی ئاگر ٢-چاوگی ئاگر.

(اَلشَــعيل): ١-بنکــڕی ئاوەمنجــەڵ ٢-ئــاوی ئێجگار سوێر.

(اَلشَــعيلَة (ج) شُعُل): ١-بڵێســەی ئاگری بە پلیتەوە نــراو ٢-پلیتەی گڕاوی/ شــاپلیتەی گڕاوی.

(الأشعل – مِنَ الناس): کەسێکە کە چاوی بە سگماکی سووربێت.

(اَلمَشــعَل (ج) مَشاعِل): ١-مەشــخەڵ. دار کە گڕاوی دەبێــت‌و بۆ ڕووناکــی هەڵدەگیرێت/

شاپلیته ٢-قوتیله.
٢-(شَـعَلَ- الأَمْـرَ شَـعْلاً): چـاوی بڕییـه ئه‌نجامــدان‌و کۆتایـی کاره‌کــه/ بـۆ کاره‌که سووتاو زۆر به تەنگەوه هات.
(أَشْعَلَ- السَقْيَ): ئاوێکی زۆری دا.
(- تِ العَينُ): چاوه‌که فرمێسکی زۆری ڕشت.
(شَعِلَ واشْـعَلَّ الفَرَسُ): چاره‌وێکه کلکسپی یان ناوچه‌وان مارۆ بوو.
(شاعِل وشَـعيل وأَشْعَل): چاره‌وێی کلکسپی یان ناوچه‌وانمارۆ.
(إشْعَلَّ واشْعالَّ. إشْعِلالاً وإِشْعيلالاً): کلکسپی یان ناوچه‌وانمارۆ بوو.
(أَلشَـعَل) (مص): سـپێتیه‌یك لـه کلك یان ناوچه‌وانی یان پشتی سـه‌ری نێوان هه‌ردوو گوێچکه‌دا بێت.
(أَلشُعْلَةُ (ج) شُعَل= أَلشَعَل): سپێتی کلك یان مارۆیی یان سـپێتی پشتی سـه‌ری چاره‌وێ‌و نێوان هه‌ردوو گوێچکه‌ی.
٤-(أَشْـعَلَ الجَمـعَ): کۆکه‌کـه‌ی پـه‌رش‌و بلاوکردەوه.
(-الخَيـلَ- في الغـارَةِ): لـه په‌لامارەکــه‌دا سوارەکانی بلاوکردەوەو نارده سه‌ریان.
(-ت القِرِبَـةُ): کونده‌کـه ئاوه‌کـه‌ی لێچوو بلاوبووەوه.
(-تِ الطَعْنَـةُ): خوێنی نێـزه پێداکردنه‌که فیچقه‌یکردو بلاو بووەوه.

(إشْـعَلَّ وإشْـعالَّ رأسُ الرَجـلِ إشـعِلالاً وإشْعِيلالاً): قژی سه‌ری کابرا بژبووەوه.
٥-(أَلمِشْعَل والمِشْعال (ج) مَشاعِل ومَشاعيل): پالێو.
٦-(أَلشُـعْلُول (ج) شَـعاليل): ١-گری ئاگر ٢- تیپی ده‌سته‌ی خه‌ڵك یان هیتر.
(«ذهَبوا شعاليلَ»): جیاجیاو ده‌سته ده‌سته ڕۆیشتن.
شعم: (شَعَمَ- الرَجُلُ. شَعْماً): چاکه‌کاریی ناو خه‌ڵکیکرد.
شـعن: ١-(أَشْـعَنَ- عَدُوَّهُ): چنگـی له قژی پێشی سه‌ری دوژمنه‌که‌ی گیرکرد.
(إشْـعانَّ واشـعَنَّ- شَـعْرُهُ): قـژی سـه‌ری بژبووەوه.
(أَلشَعَن (ج) أَشْعان): گه‌ڵای وه‌ریوو وشکه‌وه‌بوو و گیای وشکه‌وه‌بووی په‌رش‌و بلاو.
(رَجُلُ مُشْعانُ الرأسِ): پیاوێکه ده‌مارگرتووی قژبژەوەبووه.
(شَعْرُ مَشْعُون): قژی بژ.
(أَلشَعانين= السَعانين): جه‌ژنی یه‌کشه‌ممه‌ی پێش جه‌ژنی قوربانی (عبرانية).
٢-(شَـعْنَبَ- الكَبْـشُ): به‌رانه‌کـه شـاخی ده‌رکــردو پاشــان به پشــتدا بــه‌لای گوێیدا چه‌مایه‌وه.
(مُشْعَنَب ومُشَـعْنِب): به‌رانی قۆچ به پشتدا چه‌ماوه.

شـعا: ١-(شَـعا- الشَـعَرُ شَـعْواً): قژەکـە بژبووەوە.

(شَعِيَ يَشْعى- تِ الغارَةُ): شالآوو تالآن هەموو لایەکی گرتەوە.

(شَعواء): شالآوو تالآنیی بەربلآوو خەست.

(أَشْعى- القَومُ الغارَةَ): خوێشگەل شالآوەکەیان بەربلآو کرد.

(اَلشاعي (فا) (م) شاعِيَة (ج) شَواعٍ):١-دوور ٢-جیاجیاو بەربلآو.

(«جـاءتِ الخَيـلُ شَـواعِيَ وشَـوائِع»): ئەسپسوارەکان جیاجیاو بلآو بلآو هاتن.

(غـارَةٌ شَـعواء): پەلاماریکـی/ شـالآویکی بەربلآوو جیاجیاو بەردەوام.

(شَجَرَةٌ شَعواء): درەختێکی پەلوپۆ بلآو.

(اَلشُعى الواحِدَةُ شَعْوَة): قژی بژی کەپرۆکە گرتوو.

٢-(أَشعى- بِهِ):(بەتەنگیەوە/ بە دەربەسیەوە) هات.

٣-(شَعْوَذ. شَعْوَذَةً):چاوبەست و سووکدەستییو جادووگەریکرد.

(مُشَعْوِذ ومُشَعْوَذ): جادووباز/ چاوبەستکارو سووکدەست.

(اَلشَعْوَذَةُ):سووکدەستیی و کردگاریك کە وەك جادوو وابێت، چاوبەستی لە خەلککردن.

شغ: (شَغْشَغَ- الشَيءَ):شتەکەی خستە ناوەوە هێنایو بردی.

(شَغشَغَ- الطاعِنُ): نێزە وەشێنەکە نێزەکەی لە لێدراوەکەدا هێناو برد.

(-اللُجُمُ): لغـاو بە دەسـتەکە لغاوەکەی بۆ سەرکوتکردن لە دەمی ولآخەکەدا ڕاوەشاند.

(-في الأَمر): پەلەی لە کارەکەدا کرد.

(- في الشُربِ): کەمکەم خواردیەوە.

(-في الإِناءِ ماءً أَو غَيرَهُ):ئاوی کردە قاپەکەوەو پڕینەکرد.

(-البِئرَ): ئاوی بیرەکەی لێلکرد.

(«شَغْشَـغَ شُـربي»): خواردنەوەکـەی لـێ لێلکردم.

شغب: ١-(شَغَبَ وشَغِبَ- القَومَ وبِهِم وعَلَيهِم. شَغْباً وشَغَباً):گێچەلی بۆ نانەوە/ ئاشوبی بۆ گێران.

(شَغِبٌ وشِـغَبٌ وشَغّاب ومِشْـغَب ومُشاغِب وذو مَشاغِب): ئاشـوبگێرو پشێوێنین/ سەر بەگێچەل/ ئاژاوەگێر/ گێرەشێوێن

(شَغَبَ عَنِ الطَّريقِ. شَغْباً):لەرێ لایدا.

(شَغَّبَ- القَومَ وبِهِم وعَلَيهِم= شَغَبَ):گێچەلی بۆ خوێشـگەل نایـەوە/ خراپـەی بەرامبەر ورووژانـدنو گرفتاریکـردن/ ئاشـووبی بۆ نانەوە.

(شـاغَبَ- هُ):١-گێچەلی بۆ نایەوە/ خراپەی بەرامبەر ورووژاندو کرد بە گژیدا.

(تَشاغَبَ- الرَجُلُ):کابرا یاخیبوو/ ملینەدا.

(«طَلَبْتُ مِنهُ كذا فَتَشـاغَبَ»):داوای ئەوەم

لێکرد لێم یاخیبوو، قایل نەبوو.

(اَلشَّغْب(مص) والشَّغَب(مص)ئاشوبگێڕیی/ ئـاژاوەو گێچەڵنانـەوە/ گۆڵەمزگێڕیـی/ ئاژاوەگێڕیی/ گێرەشێوێنی.

(اَلشَّـغُوب): ئاشـووبگێڕ/ ئاژاوەنـین/ پشـێوییباز/ ئـەوەی ئاگـری دوژمنایەتییو ناکۆکیی خۆشدەکات.

٢-(تَشَــغْبَرَ- تِ الريحُ): باکـە گێژێخواردو پێچیدا.

شغر: ١-(شَغَرَ- الرَجُلُ شُغوراً):دوورکەوتەوە.

(-الناسُ):خەڵکەکە بلاوەیان لێکرد.

(-هُ عَن بَلَدِهِ. شَـغْراً وشِـغاراً):لە وڵاتەکە دەریپەڕاندو دەربەدەریکرد.

(أَشْغَرَ- المَنْهَلُ):سـەرچاوەی ئاوەکە دووری ڕێگاکە بوو.

(-تِ الرفقَــةُ): هاوڕێـکان لــە ڕێگەکـەو خەڵکەکە کە پیایدا دەڕوات (دوورکەوتنەوە/ کەلاکەوتن).

(-الحِسابُ عَلَيهِ):ژمێرەکە لەلای زۆرو بلاو بوو نەیتوانی چاریبکاتو ئەنجامی بدات.

(تَشَــغَّرَ- البَعيرُ):حوشترەکە توند تاوی دایە غار.

(-في أَمرٍ قَبيحٍ):خۆی هاویشتە کاری دزێوو خراپەوەو (لەســەری ڕۆیشــت/ خــۆی تێدا خنکاند).

(اِشْتَغَرَ- الأَمْرُ):١-کارەکە بەرفراوانو گەورە بوو/ پەلیهاویشت ٢-ئاڵۆز بوو/ بەیەکداچوو.

(-الحســابُ عَلَيهِ):ژمێرەکـەی لێئاڵۆز بوو سەری لێدەرنەکردو بۆی ئەنجامنەدرا.

(-الحَــربُ بَينَ القَومَــين):جەنگ لە نێوان دوو خوێشگەلدا بەرفراوانو توندو گەرمبوو.

(-في الفَلاةِ):لە بیابانە وشکەکەدا دوورکەوتەوە.

(اَلشَــغَر والشِــغَر):پــەرش‌و بــلاو بە هەر چوارلادا.

(«تَفَرَّقــوا شَــغَرَ بَغَــرَ وشِــغَرَ بِغَــرَ»): بەهەرچوارلادا پەرش‌و بلاوبوونەوە.

(اَلشِغار)(مص)پەرەوازەکردن‌ودەربەدەرکردن/ ئاوارەکردن.

(«بِئرٌ شِــغارٌ وآبارٌ شِغارٌ»):چاڵاوی فرەئاوو فراوان.

(اَلمِشــغَر):کورتــە نێزەیــەك کــە دڕندەی پێدەربکرێت.

٢-(شَغَرَ-تِ الأَرضُ شُغوراً):زەوییەکە بەرەڵاو چۆڵبوو.

(شاغِرَة):زەوییەکی بێخاوەن‌و چۆڵ‌و بەرەڵا.

(-السِعْرُ):نرخەکە (شکا/ دابەزی/ کەمیکرد).

(إِناءٌ شَغارٌ):دەفرێکی بۆش.

٣-(شَــغَرَ- الكَلْبُ. شَغْراً):ســەگەکە لنگێکی هەڵبڕیو هەڵمیزی.

(-تِ الناقَةُ):مێحوشترەکە لنگێکی هەڵبڕیو لەقەی لە بەچکەکەیدا.

(شاغَرَ- الرجلانِ عَلَيهِ. مُشاغَرَةً و شِغاراً):

هەردووکیان بوونە دوژمنیو پەلاماریاندا.
(إشـتَغَرَ- عَلَيهِ): دوژمنکاریی لەگەڵدا کردو خۆی بەسەردا بادا.
٤-(شاغَرَ- هُ. مُشاغَرَةً وشِغاراً): هەریەکەیان کەسـێکی خـۆی لەویتر بە کراسـی بەریەوە مارەکرد.
٥-(اَلشَـغَّارَة): چەرخ/ ئاسـتۆ یان ئەسـتێ ئاسـنێکە لەگەڵ بەردە ئەستێدا کە بەیەکدا بدرێن ئاگـر دەکاتەوە یان چەرخی بەنزینو گازو ئا لەو بابەتانەیە.
(اَلشاغُور) (آرامية): تاڤگەی ئاو.
(اَلشِغِّير): بەدخوو/ بەدڕەوشت.
٦-(اَلشَـغرُبِيَّة): پاشـقوولێگرتن/ قـاچ لـە قاچیەوە دەئاڵێنێتو بەزەویدا دەدات.
شغز: ١-(شَغَزَ- عَلَيهِم. شَغْزاً): دوژمنکاریی بەرامبـەر کـردن/ بـە زمـانو کـردەوە بەرامبەریانبووەوە.
(-بَينَهُم): نێوانیانی تێکداو لەیەکیبەردان.
(اَلشَغيزَة): سووژن.
٢-(شَـغْزَبَ- هُ): پاشـقولی لێگرتو دای بە زەویدا.
(تَشَـغْزَبَ-تِ الريـحُ): باکـە گێژیخـواردو پێچیدایەوە.
شغف: ١-(شَـغَفَ- هُ. شَغْفاً): دای لە پەردەی دڵی/ بەندی دڵیگرت.
(-فُؤادَهُ): دڵی لێسەند/ دڵیبرد.
(شَـغِفَ حُبُّهُ. شَغَفاً): گرفتاری ئەوینی بوو/ چووە پەردەی دڵیەوە.
(شُغِفَ- بِهِ): شەیداو هۆگریبوو/ دڵی پێوەی بەند بوو.
(تَشَغَّفَ- النّاسَ): دڵی خەڵکی (لەیەکترکرد/ کرمێکـرد) و پەرتپەرتیکردن/ لەیەکیکردن (وەکو چووبێتە پەردەی دڵیانەوە).
(اَلشَغْف) (مص): پەردەیدڵ.
(اَلشَـغَف) (مص): شێتو شـەیداو دێوانەو گرفتاری ئەڤین/ خۆشەویستی/ دڵداریی.
(شَغَفُ القَلب): پەردەیدڵ.
(اَلشَغاف (ج) شُغُف وأشـغِفَة): ١-پەردەیدڵ ٢-ناخیدڵ کە شوێنی خۆشەویستیە.
(اَلشَغاف والشُغاف) (طب): دەردێکە تووشی ژێر پەراسووی لای ڕاست دەبێت.
(اَلمَشغوف) (مفع): دێوانەو شەیدای دڵداریی.
٢-(شَغَفَ- اليُبسُ. شَغْفاً): وشکانییەکە گیای (لێروا/ لێسەوز بوو).
شـغل: ١-(شَـغَلَ وأشْـغَلَ- هُ بكذا. شَـغْلاً وشُغلاً): بەوەوە خەریکیکرد.
(-عَنهُ): ئەو شـتەی لە بیر بردەوەو هۆشـی لەسەر لادا/ خەریکیکرد.
(شُـغِلَ عَنهُ بِكَذا): بەو شـتەوە خەریککراو ئەوەی لەبیر برایەوە.
(«مااَشْغَلَهُ»): ئای کە سەری (قاڵە/ جەنجاڵە) (ئەمە لە سەر دەستوور نییە).

(شَغَّلَ- هُ): زۆر خەریکیکرد.
(تَشَغَّلَ- بِكَذا): بەوەوە خەریکبوو.
(تَشاغَلَ- بِكذا): بەوەوە خەریکبوو.
(-عَنهُ): هۆشی لەسەر ئەوە نەماو بەهیترەوە خەریکبوو.
(إشْتَغَلَ- بكذا): بەوەوە خەریکبوو.
(-قَلْبُــهُ): دڵو هۆشــی لەســەرخۆی نەبوو شپرزە بوو.
(اَلشُغل): ١-ئاوەدان ٢-کار/ فرمان.
(اَلشُغْل والشُغُل والشَغَل (ج) أشْغال وشُغُول): کار/ فرمان/ پیشە، خەریکبوون.
(اَلشــاغِل) (فــا): خەریــك/ دەســتگیراو/ کارکردە.
(«أنا فِي شُغلٍ شــاغِلٍ»): من لە کارێکدام کە تەواو دەستیگرتوومو سەرقاڵم.
(اَلشَــغْلَةُ (ج) شَــغْل): جارێــك کارکــردنو دەستگیران.
(اَلشَغِل): خاوەنفرمان/ کاردار.
(اَلشَغّال): کەسێکە کاری زۆر بێت سەری زۆر قاڵبێت.
(الأشْغُولَة والمَشغَلَة): دەستگرو خەریککەر.
(اَلمَشــغَل (ج) مَشــاغِل): کارگەی دەســتیی کە کاری دەســتیی تێدا دەکرێــت وەك کاری ئاوریشــمیو لۆکەو لەو بابەتە کە بە دەســت دەکرێن. کە پێیدەڵێن لەوانەیە بە کارگەکەیش هەروا بڵێن.

(اَلمَشــغُول) (مفع): پروگراو یــان خەریكو سەرقاڵ.
(مَكانُ مَشــغول): شــوێنێکە کە چۆڵ نییە/ خەڵکی تێدایە.
(مالٌ مَشغول): دارایەکە لە بازرگانیدایە.
(دارٌ مَشــغُولَة): خانوویەکە خەڵکی تێدایەو چۆڵ نییە.
(جارِيَة مَشغولَة): کەنیزەکێکە هاوسەریەیە.
٢-(إشْــتَغَلَ- فيه السُمُّ): ژەهرەکە لە لەشیدا بڵاوبووەوە.
(-الدواءُ فيــه): دەرمانەکە کاری خۆی کردو ئەنجامیبوو.
٣-(اَلشَغْلَةُ (ج) شَغْل): ١-خەرمان ٢-خەرمانی سوور/ دانی پاککراوو کۆ.
شغم: (الشَغم): هەتەر/ چاوچنۆك ٢-چڵێس زۆرخۆر.
(اَلشُغمُوم والشَغميم): شۆخی جوان.
شــغن: ١-(اَلشُغْنَةُ (ج) شُــغَن): چڵی نەرمی تەری ناسك.
٢-(اَلشُغْنُب والشُغْنُوب): چڵی تەرو نەرم.
شــغا: (شَغا وشَــغِيَ. تَشغی-تِ السِــنُّ شُغُوّاً وشَغاً): دانەکە لەوانیتر درێژتر دەرچوو.
(شــاغِيَة (ج) شَــواغٍ): دانــی درێژتــر لــە دانەکانیتر.
(أشــغی (م) شَــغواء وشَــغْياء (ج) شُــغْو): کەسێکە دانی لە دانەکانیتری درێژتر بێت.

(أَشـفى- القَومُ بِـهِ): دەربارەی ئەو كەســە پێچەوانەی خەڵكبوون.
(-فُلانٌ رأيَهُ): ڕاكەی خۆی جیاكرد.
(الشَفْواء) (ح): كۆلارە (چونكە بەشی سەرەوەی دەنووكی لە هی خوارەوە درێژترە).
(شــف) (شَــفَّ- الشــيءُ. شُـفوفاً وشَفيفاً وشَــفَفاً): شــتەكە تەنك و ڕوونبوو ئەودیوی دیاربوو/ دیــوەودەر/ كونــاودەر/ كونبوو لە هەردوو دیوەوە.
(شفيف وشَفّاف): ڕوون و تەنك.
(-الجِسْــمُ): تەنەكە/ لەشــەكە لــە لاوازیدا تەنكبوو.
(-هُ المَرَضُ أوِ الهَمُّ): نەخۆشــی یان پەژارەو مەراق بێهێزیكرد.
(إستَشَفَّ – هُ): تەماشای ئەو دیوەوە كرد.
(-لَــهُ السِــتْرُ): بــۆی دەركــەوت لــەو دیو پەردەكەوە چی هەیە.
(-الثَــوبَ): جلەكەی دایە بــەر ڕووناكیی تا بزانێت خەوشی چییە.
(-الشيءَ): تەماشایكردو سەرنجیدایە/ لێیورد بوومەوە.
(-الكِتــابَ): لــە كتێبەكــەی ڕوانــی و ورد سەرنجیدایەو بیری لە نوسراوەكانی كردەوە.
(ألشَفُّ والشِــفّ (ج) شُفُوف): ١-بەرگ/ جل/ كراس ٢-پۆپەشمین ٣-تەنكەپەردە.
(«ثَوبٌ شَفٌّ وشِــفٌّ»): بەرگێكی/ كراسێكی تەنك.
(الشَفَف): ١-سووكیی ٢-تەنكیی ٣-بارتەنكیی.
(ثَوبٌ شَفيف): جلێكی تەنك.
٢-(شَــفَّ- الشــيءُ شَــفّاً) (ضــد): ١-پتربوو ٢-كەمبوو.
(أشَــفَّ الدرهَمَ) (ضد): ١-پارەكەی زۆر كرد ٢-پارەكەی كەمكرد.
(-هُ على فُلان): لە فیساری زیاتر ڕێزلێگرت.
(-هُ علــى فُلان): لــە فیســاری زیاتر كردو سەركەوتووتر بوو.
(إستَشَــفَّ- في تِجارَتِهِ): لــە بازرگانیەكەیدا دەستگیربوو قازانجیكرد.
(ألشَــفُّ والشِفّ (ج) شُــفوف): ١-پتریی و لە پێشتریی (ضد) ٢-كەمیی و كورتیی ٣-قازانج.
٣-(شَفَّ- الشيءَ. شَــفّاً) (ضد): ١-كەمیكرد/ كەمیهێنا ٢-پتر بوو.
(-عَنهُ الثَوبُ شُــفُوفاً وشَــفيفاً وشَــفَفاً): جلەكە كورتبوو.
(أشَــفَّ- الدرهَمَ) (ضــد): پارەكەی كەمكرد ٢-پارەكەی زۆركرد.
(ألشَــفّ (ج) شُــفُوف) (ضد): ١-كەمبوون/ كورتهێنان ٢-زۆربوون/ پتربوون.
(ألشِفّ): تۆزە شتێك.
(ألشِفّ (ج) شُفُوف) (ضد): كەمیی/ كەمبوون ٢-زۆربوون.
(الشَفَف): تۆزێك/ كەمێك/ چكێك.

(اَلأشَف): لەپێشترو زۆرترە.
(«فُلان أشَفُّ مِن فُلان»): فیسار لە فیسارکەس کەمەکێك لێی گەورەترە.
٤-(شَفَّ- فَمُ فُلان شَفیفاً): دەمو پووك‌و دانی بە هۆی سەرماوە ژانیکرد/ ئازاری پەیداکرد.
(اَلشَفّان): بای سارد بە بارانەوە.
(الشَـفیف (ج) شِفاف) (ضد):١-بای سارد ٢-بای گەرم ١-ئەوپەڕی سۆڵەی سەرما ٢-قرچەی گەرمای خۆر.
٥-(شَفَّ- الشيءُ. شَفّاً): شتەکە جووڵا/ بزوا.
(-لَهُ الأمرُ):کارەکەی بۆ چەسپی/ بنجبەست‌و سەرومڕ بوو.
٦-(شَفَّ- الماءَ. شَفّاً وشُفُوفاً):هەموو ئاوەکەی (هەڵلووشی/ هەڵقوڕاند).
(تَشــافَّ واشْــتَفَّ- مافي الإناءِ): هەرچی لە قاپەکەدا بوو (خواردیەوە/ هەڵیقوڕاند).
(«لَیس الرَيُّ عَنِ التِشــافِ»): ئەو ئاوەی کە دەخورێتەوە تینوێتیی ناشکێنێت.
(ألإستقصاء في الأمورِ لایُروی المُستَقصِي»): گــەڕان بــە دوای کاردا لەوانەیــە کەســەکە تاســووقی لە کارەکــە نەشــکێت‌و ئەنجامی تەواوی دەستگیر نەبێت.
(إسْتَشَــفَّ- مافي الإناءِ):هەرچی لە قاپەکەدا بوو خواردیەوە.
(-إلیهِ):زۆر تاسوقیبوو/ زۆر حەزی لێکرد.
(اَلشُفافَة):پاشماوەی ئاوی ناو قاپەکە.

(شُــفافَةُ النَّهــارِ): ئــەو دەمەی لــە ڕۆژەکە ماوەتەوە.
٧-(اَشَــفَّ- الفَمُ): دەمەکە (بۆگەنبوو/ بۆنی ناخۆشبوو).
(اَلشَفّ والشِّف (ج) شُفوف): زیپکەیەك کێمی کردبێت‌و لەبەر بڕوات.
(اَلمَشْفُوف): کەسێکی زیپکاوی.
٨-(شَفْشَفَ- بِهِ): تێکەڵیبوو/ تێیئالا.
(-الرَجُلُ): لەرزی/ دانەچۆقێی پێکەوت.
(-عَلَیهِ): بەزەیی پێداهاتەوە.
(-الـدَواءَ علــی الجِــرحِ): دەرمانەکــەی بە برینەکەوە کرد.
(-الهَمُّ فُلاناً): مەراق/ داخ/ خەفەت فیساری لاواز کرد.
(-الصَقیعُ النَباتَ): زوقوم ڕووەکەکەی بردو وشکیکردەوەو هەڵیپرووکاند.
(-الحَرُّ أو البَردُ):گەرما یان سەرما شتەکەی وشککرد.
(تَشَفشَــفَ- النبــاتُ): ڕووەکەکــە خەریکی وشکبوونبوو.
(اَلشَفْشاف):١-باران بە تەرزەوە.
(النَفْناف) (عامیة):١-باران‌و تەرزە پێکەوە ٢-باسی سارد.
(ثَوبٌ شِفْشــاف):بەرگێکی شاش دروستکراو هەرەمە دروستکراو.
٩-(شَفْشَــفَ- الرَجُلُ): بەدرەفتارو بەدخوو

بوو.

(مُشَفْشِف ومُشَفْشَف): بەدخوو/ بەدڕەوشت/ بەدڕەفتار.

شفت: ١-(شَفْتَرَ- القَومُ): پەرش‌و بڵاوبوونەوە.

(إشْفَتَرَّ- القَومُ): بڵاوبوونەوە.

(-العُودُ): چیلکەکە شکا.

(-السِراجُ): چراکە گڕیگرت/ گڕەکەی بەرزو زۆر بوو.

٢-(شَفْتَرَ) (عامية): لە ڕق‌و تووڕەییدا لچی ئەستوور بوو دایهێشت.

(مُشَــفْتِر) (عامية): لچ شــۆڕەوەوە بوو لە داخ‌و ڕقاندا.

(اَلشَفْتَرَةُ): ئەستووربوون‌و داهێشتنی لچ لە تووڕەییدا یا لە خۆوە.

شفر: ١-(شَفِرَ. شَفارَةً): کەمیکردو کەمبوو.

(شَفَّرَ-المالُ): داراکە کەمیکردو لەدەستچوو.

(-الشيءَ): شتەکەی لەبنهێنا.

(عَيــشٌ مُشَــفِّر): ژیانێکــی (کولەمەرگیی/ تەنگدەستیی).

٢-(شَــفَّرَ-تِ الشَــمسُ): خــۆر خەریکــی ئاوابوونبوو.

(-على الأَمرِ):ڕوویکردە کارەکە.

٣-(اَلشَفْر والشُفْر (ج) أَشفار) (ع ا): ١-بنی/ بێخی برژانگ لە کەناری پێڵوی چاودا ٢-لێوارو کەناری هەموو شتێک.

(-مِنَ الوادي):کەناری سەرەوەی دۆڵ.

(مافي الدارِ شَــفْرٌ وشُــفْرٌ): لــە خانووەکەدا کەسی تێدا نیە.

(اَلشَــفْرَة (ج) شَــفْر وشِــفار وشَــفَرات): ١-کێردیگەورەی پان ٢-دەمی شمشێر ٣-نووکی تیر ٤-گازنە کە پینەچی چەرمی پێدەبڕێت.

(مافي الدارِ شَــفَرَةٌ): خانووەکە کەســی تێدا نییە.

(اَلشَفير): ١-بنی/ بێخی برژانگ کە لە کەناری/ لێواری پێڵودایە ٢-کەناری هەموو شتێک.

(-مِنَ الوادي): کەناری سەرەوەی دۆڵ.

(اَلمِشفَر (ج) مَشــافِر): ١-توندیی‌و پتەویی‌و قایمیــی ٢-پارچە زەوییەک یــان پارچە لمێک ٣-(ع ا) لچ‌و لێو بە تایبەتی هی حوشتر.

ملحق:

شــفر: (اَلشُــفرَة): جفرە/ پەرلە/ نیشانەو هێما کە دانراوە لە نامە ناردن‌و کاری نهێنیی دیدا.

(برقية مُرسَلَة بالشِفرَة): برووسکەیەک بە جفرە/ بە پەرلە نێرراوە.

---

شفز: (شَــفَزَ- هُ. شَــفْزاً): بە قاچی لەقەی لێدا/ شەقی تێهەڵدا.

شفع: ١-(شَفَعَ- الشيءَ شَفْعاً): شتەکەی کرد بە جووت، یەکێکیتری وەک خۆی دایە پاڵی.

(«كانَ وَتْراً فَشَــفَعَهُ بِآخَر»): تاکبوو کردی بە جووت.

(-تِ الناقَةُ): مێحوشــترەکە ئاوسبوو کاتێک

بەچکەیەکیتری بەدواوە بوو.

(-جـارَهُ): دراوسـێکەی لە خەڵکیتر پێشـتر خست بۆ ئەوەی خانووەکەی پێبفرۆشێت.

(شُفِعَ): چاوی یەکی بەدوو بینی.

(شُفِعَ لي الأَشخاصُ): کەسێك بە دوان دەبینم بە هۆی کزیی‌و شلەژانی چاوەوە.

(العَينُ الشـافِعَة): چاوێکی کزی وا کە شتێك جووتبکات بەدووای ببینێت.

(شَفَّعَ- الشيءَ): شـتەکەی لەبەرچاو بوو بە دوو.

(أَلشَفع (مص) (ج) أَشفاع وشِفاع): جوت لە ژمارەدا.

(«أَشَفْعٌ أَم وِترٌ»): جووتە یان تاکە.

(ناقَةٌ شـافِعٌ) (فا): مێحوشـترێکە ئاوسـەو بەچکەیەکیشی بەدواوەیە.

(عَـينٌ شـافِعَةٌ): چاوێکـە یـەك بـە دوو دەبینێت.

(أَلشُـفْعَةُ (ج) شُـفَع- عنــد الفُقَهاء): لای شەریعەتناسەکان مافی هەڵگرتنەوەی موڵکێکە کـە بەشـی تێدابێـت یـان دراوسـێ بێت‌و بفرۆشـێت بە دراوسێکەی بەو نرخەی کە لە فرۆشتنیدا دەیکاتێ (لە خستنەپاڵەوە هاتووە چونکەئەو خـاوەن مافی وەرگرتنـە دەیخاتە سەر خانووبەرەکەی خۆی‌و دەیکاتە جووت).

(-مِـن الضُحـى): دوو ڕکاعـەت نوێـژی چێشتەنگاو.

(ناقَةٌ شَـفوع): مێحوشـترێك کـە لە جارە دۆشینێکدا دوو جام شیر بدات.

(أَلشَفيع – مِنَ العَدَد): ژمارەی جووت.

(أَلشَـفيع (ج) شُـفَعاء): خاوەنمـافی هەڵگرتنەوەی دراوسێیەتی یان بەشداریی لە موڵکێکی فرۆشراودا.

٢-(شَـفَعَ- لِفُلان أَو فيه إِلى زَيدٍ. شَفاعَةً): داوای لـە زەید کرد/ تکای لـە زەید کرد کە یاریدەی ئەو بۆی بدات.

(-عَلَيهِ بِالعَداوَةِ): بەرامبەری وەستاو پشتی ناحەزەکەیگرت.

(«فُـلانٌ يَعادينــي ولَهُ شـافع»): فیسـار دوژمنایەتیمـدەکات‌و پشتگیریشـی هەیە کە یاریدەیدەدات.

(-لِفُـلانٍ في المَطْلَب): بۆ خواسـتی فیسـار تکایکرد کۆششی بۆ کرد.

(شَـفَّعَني في فُلان): تکاکـەی منی دەربارەی ئەو وەرگرت.

(تَشَـفَّعَ- لي وإِلَيَّ بِفُلان أَو في فلان): داوای لێکردم لای فیسار تکاکاربم بۆی.

(إِسْتَشـفَعَ زَيداً إِلى عَمـرو): پەنایبردە بەر زەید کە بۆی لای عەمرو تکاکاربێت.

(-بِفُلانٍ على فُلانٍ): پەنایبردە بەر فیسـار دژی فیسار کەس.

(أَلشَفيع (ج) شُـفَعاء): تکاکار پەنا بۆ براو/ هەنا بۆ براو.

(اَلْمُشَفَّع): تكاوەرگیراو/ هانادراو.
(اَلْمُشَفِّع): هانادەر/ پەنادەر/ تكاوەرگر.
٣-(اَلشُفْعَةُ (ج) شُـفَع): ١-دێوانەیی/ شێتیی
٢-چاو.
(اَلأَشفَع): درێژ.
(اَلْمَشْفُوع): شێت، دێوانە.
(إِمْرَأَةٌ مَشفُوعَة): ژنێكی بە چاوەوە بوو.
شـفق: (شَـفِقَ- عَلَيـهِ. شَـفَقاً): بەتەنگ خێروبێـرو چاكەیـەوە هـات/ بەزەیـی پێداهاتەوە.
(شَفيق وشَـفِقٌ وشَـفُوقٌ): ١-بەتەنگ فەرو بێرو چاكەوە هاتوو ٢-بـە بەزەیی/ دڵنەرم/ میهرەبان.
(-مِنَ الأَمرِ): لە كارەكە ترسـاو بەتەنگیەوە هات.
(-على الشـيءِ): لـە شـتەكەدا درێخیكردو چرووكیی تێداكرد.
(شَفَّقَ- هُ): میهرەبانو دڵنەرمیكرد.
(-الشيءَ): شتەكەی كەمكردەوە.
(اَشـفَقَ- علـى الصَغيرِ): دڵی بـە منداڵەكە سووتاو سۆزی بۆی جووڵاو لاواندی.
(-الشيءَ): شتەكەی كەمكردەوە.
(-عَلَيهِ ومِنهُ): لێیترسـا/ سـڵیی لێكردەوە/ خۆی لێپاراسـت. بەتەنگیەوە هات، سۆزی بۆ جووڵا.
(اَلشَفَق (ج) اَشفاق):١-ترس ٢-بەزەیی.
(اَلشَـفَقَةُ): ١-دڵنەرمییو دڵسۆزیی ٢-بەزەیی ٣-میهرەبانییو لێترسان ٤-بەتەنگەوەهاتن.
(«لي عَلَيهِ شَفَقَةٌ»): بەزەییم پێدادێتەوە.
٢-(اَشْفَقَ- الرَجُلُ): كەوتە زەردەپەر.
(اَلشَفَق): دوای زەردەپەر/ سەرەتای خۆرئاوابوون.
(اَلشَفَق (ج) اَشْفاق): رۆژ.
٣-(شَفَّقَ- الثَوبَ): بەرگەكەی خراپ چنی.
(اَلشَفَق (ج) اَشفاق): گەندەی شت.
(ثَـوبٌ شَـفَقٌ): بەرگێكی ناقایـم/ خراپ/ عەمارەپۆ.
٤-(اَشْـفَقَ- الريـحُ): باكە تونـد هەڵیكردو خۆڵو تۆزی دایە پێش خۆی.
٥-(اَلشَفَق (ج) اَشفاق): كەنار/ لا.
شفن: ١-(شَفَنَ وشَـفِنَ- الرَجُلَ وإلى الرجُل شُـفوناً): بە تیلەی چاو تەماشای كابرایكرد یان لابەلا تەماشایكرد.
(شـافِن وشَـفُون): بـە تیلـە یـان لابـەلا تەماشاكردوو.
(اَلشَفْن): ١-چاوەڕوانیی ٢-چاوەڕێی میرات.
(اَلشَـفْن واَلشَـفِن): رەفتـار جـوانو ژیرو هوشیار.
(اَلشَـفون (ج) شُفُن): دڵپیسـێك كە هەر لە چاودێرییو لە پارێزدا بێت.
٢-(اَلشَفَنتَرِيُّ والشَـفَنتَرى): پەرشو بڵاوو جیاجیا.
شفه: ١-(شَفَهَ- فُلاناً شَفهاً): كێشای بە لچو

لێویدا.

(شافَهَه. شَفاهاً ومُشافَهَةً): ڕووبەڕوو قسەی لەگەڵدا کرد.

(-الشيءَ): شتەکەی نزیککردەوە.

(ألشَفَه والشِفَه – مِنَ الإنسان): لچو لێو.

(شَفَتان): لچو لێو.

(ج) (شِفاه وشَفَهات. شَفَهِيّ وشَفِيّ وشَفَوي): بە دەمیی/ زارەکی.

(شُفَيْهَة): لێوچکە.

(ماكَلَّمَهُ بِبِنتِ شَـفَهٍ): وشەیەکی لەگەڵدا بە دەمدا نەهات/ نەیدواند.

(ألشافِه): لێو وشك/ تینوو.

(ألشُـفاهِيّ و والأَشْـفَهُ): لچو لێو ئەستوورو گەورە.

(ألحُروف الشَفَهِيَّة): پیتەلێوییە عەرەبییەکان کە (بـ فـ میم)ن.

(ماء مَشفوهٌ): ئاوێك کە زۆر ئاوخۆری لەسەر بێتو زۆر بخورێتەوە.

٢-(شَفَهَ فُلاناً. شَـفْهاً): داوای زۆری لێکردو سەری کردە سەری تا چی هەبوو لێیسەند.

(-الإنـاءَ): هەرچـی لـە دەفرەکـەدا بـوو خواردیەوە.

(«كانَتِ العَيالُ تَشْـفَهُ مالي»): خێزانەکەم خەریکبـوو هەرچیـم هەیە لـە ناوییەرن‌و لەدەستمبەدەن.

(شَـفَهَ- هُ عَـنِ الأَمْـرِ): لـە کارەکەیکردو خەریکیکرد.

(شُفِهَ زَيدُ): لەزەید داواکار زۆر بوو.

(-الشيءُ): داواکاری شتەکە زۆر بوو.

(-الطَّعامُ): خواردنەکە بخۆری زۆر بوو.

(مَشْـفُوه): خواردنێـك کە خۆشـبێتو زۆر بخورێت.

(ألشَفَه): دەمبزوانـدن.

(هُوَ خَفيفُ الشَفَه): کەمپرسە کەمدووە یان فرە پرسەو لەسەر پرسیارەکانی سوورە.

(«لَهُ في الناسِ شَفَةٌ حَسَنَة»): لەناو خەڵکدا ناوێکی باشی هەیە.

(«ماأَحْسَـنَ شَـفَةَ الناسِ عَلَيك»): ئای کە خەڵك بە باشی هەڵتدەنێن‌و ناوت دەهێنن.

(ماءٌ مَشفُوهٌ): ئاوێکە لەبەر داواکاریی زۆری بەرنەکەوێت.

(«هُوَ مَشْـفوهُ المَوارِدِ»): ئـەو ئانبدەیەو بە دەستودڵە.

(«فُـلان مَشْـفوهٌ عَنا»): فیسـار سـەرقاڵە ناپەرژێتە سەر ئێمە.

٣-(شَفَةُ الشَيءِ كالدَلو) کەنار/ تەنشت‌و لێوو لێواری شت وەك دۆلکە.

شفا: (شَفا- الهِلالُ. شَفواً): مانگی بە کشەوە هەڵهات.

(-الشَخصُ): زەلامەکە/ کەسەکە دەرکەوت.

٢-(شَـفا- تِ الشَـمسُ. شَـفواً): خـۆر لـە ئاوابووندا بوو/ خەریکبوو ئاوا دەبوو.

(اَلشَفا): مانگی یەکشەوە پێش ئاوابوونی.

(الشَفا. شَـفَوان): جووتەکەی (ج) (أَشفاء): لێوارو دەمی هەموو شتێك.

(شَفا المَوت): سەرەمەرگ.

(شفا القَمَر): دەمی ئاوابوونی مانگ.

(شَفا الشَـمس): دەمەدەمی ئاوابوونی خۆر/ زەردەپەڕ.

(«مابَقِيَ مِنهُ إلاّ شَـفاً»: تەنها تۆزێکی مابوو ونبێت/ بمرێت یان ئاوابێت.

٣-(الأَشـفى): کەسـێکە کـە لـچو لێـوی نەگەنەیەك.

شـفى: ١-(شَـفى – اللهُ فُلاناً مِـن مَرَضِهِ. شِـفاءً): خودا فیسـاری لە نەخۆشـییەکەی ڕزگاریکردو خۆشیکردەوە.

(-فُلانٌ فُلاناً): فیسـار چاکبوونەوەی بۆ ئەو خواست.

(شُفِيَ- المَريضُ): نەخۆشەکە (خۆشبووەوە/ چاکبووەوە).

(أَشفى فُلاناً. إِشفاءً): چاکبوونەوەی بۆ فیسار خواست.

(-العَليـلُ): نەخۆشـەکە چاکنەبووەوە (ئەو هەمزەیە بۆ نەبوونی شتەکەیە).

(-المَريضَ): دەرمانێکی بۆ نەخۆشەکە نووسی پێی چاکبێتەوە.

(«أَشـفِني»): چاکم بکەرەوە/ شـتێکمبەرێ پێی چاکببمەوە.

(اَشفى- هُ الشيءَ): شتێکیدایە پێی چاکبێتەوە.

(تَشـفّى- بِکَـذا): بـەوە (خۆشـبووەوە/ چاکبووەوە).

(-مِـن غَيظِـهِ): ڕقەکـەی نیشـتەوە دڵی سرەوتیکرد.

(«تَشَفّى مِن فُلان»): تۆڵەی تەواوی لە فیسار کردەوەو دڵی سرەوت.

(إِسـتَفى- بِکَـذا): بـەوە خۆشـبووەوە/ لە نەخۆشییەکە ڕزگاریبوو.

(إِستَشفى- بِهِ. إِستِشفاءً): بەوە چاکبوونەوەی خواست.

(-المَريـضُ مِـن عِلَّتِـهِ): نەخۆشـەکە لـە نەخۆشییەکەی چاکبووەوە.

(اَلشِفاء) (مص) (ج) (اَشفِيَة و (جج) أَشافٍ): ١-لە نەخۆشیی چاکبوونەوە ٢-دەرمان.

(اَلشافي- مِنَ الأَدوِيَة): دەرمانی چاککەرەوەو سەرکەوتوو.

(اَلجَواب الشافي): وەڵامی (تەواوو سارێژکەری دڵ/ دڵخۆشکەرە/ کوتایی پێهێن).

(اَلمُستَشفى (ج) مُستَشفَيات): خەستەخانە/ نەخۆشخانە.

٢-(شَفى- تِ الشَمسُ. شِفاءً): خۆر خەریکی ئاوابوونبوو.

(شَفى وشَفِيَ- الهِلالُ شَفىً): مانگی یەکشەوە (داسە مانگ) ئاوابوو.

(اَشـفى- عَلَيهِ إِشفاءً): ١-بەسـەریدا ڕووانی

٢-سەرپەرشتیکرد.
(«أَشْــفى المَرِيضُ على المَوتِ»): نەخۆشەکە (لەگیانکەنشــتدابوو/ خەریکی مردنبوو) لە گیانەلادا بوو.
(-المســافِرُ): گوزاریارەکــە/ ســەفەرکەرەکە لە کاتی مانگاوابووندا کە دوادوای شــەو بوو کەوتەرێ.
٣-(الأَشفى (ج) أَشافٍ): کونکەرەو درەوشە.
شقّ: ١-(شَقَّ- الشَيءَ شَقّاً): شتەکەی قلەشت/ لە توکوتیکردو جیایکردەوە.
(«شَــقَّ عَصا القَومِ»): یەکێتیی خوێشکەلی تێکداو کۆی بلاوکردنەوە.
(«شَقَّ فُلانٌ العَصا»): لە کۆمەڵە جیابووەوە.
(شَــقَّ- الصُبحُ): بەیانیدا/ سپێدە دەرکەوت (وەکو شوێنی دەرکەوتنەکەی بقلیشێنێت).
(-الأَرضَ بِالسِكَّةِ) (ز): زەویەکەی کێلا.
(-على المَرِيضِ) (عامية) سەری نەخۆشەکەی داو بیریکرد.
(-النَبــتُ. شُــقُوقاً): رووەکەکــە ســەری لە زەویەکە دەرهێنا/ رووا.
(-نابُ البَعِيرِ): دانی حوشترەکە دەرهات.
(-البَرقُ: شَــقّاً ومَشَــقَّةً): چەخماخەکە بۆ ناوەراستی ئاسمان راست درێژبووەوە.
(-الفَرَسُ): چارەوێکە لە رۆیشتنەکەیدا خوار رۆیشت/ لایدا.
(شَــقَّقَ — الحَطَبَ): دارەکەی هەڵقلیشــاند/ شکاند.
(-الكَلامَ): قســەکەی زۆر جــوان دەرهاوردو کرد.
(شــاقَّ- هُ. شِــقاقاً ومُشــاقَّةً): ناکۆکیــیو دوژمنایەتیی لەگەڵدا کرد.
(تَشَقَّقَ الحَطَبُ): دارەکە هەڵقلیشاو لەتبوو.
(شَقَقتُهُ فَتَشَقَّقَ): هەڵمقلیشاندو لەتلەتبوو.
(«تَشَقَّقَت عصاهُم بَالبَينِ»): کاریان کەوتە لە یەکپچران.
(تَشــاقَّ- القَومُ): ناکۆکبوونو دوژمنایەتیی یەکتریانکرد.
(-الرَجلانِ): دوو پیاوەکە لەسەر دوژمنایەتیی یەکــتری ســووربوونو خــراپ لــە یەکــتری بەربوون.
(تَشاقُّوا ثِيابَهم): بەرگی یەکتریان (شیترشیتر کرد/ ونجرونجر کرد).
(إشْتَقَّ- الشَيءَ): نیوەی شتەکەیبرد.
(الفَرَسُ في عدوِهِ): لە غارەکەیدا بەملاولادا دەرۆیشت/ ئەملاولایدەکرد.
(-الكَلِمَةَ مِنَ الكَلِمَةِ): لە وشەکە وشەیەکیتری دەرهێنا/ وەرگرت.
(«إشْــتَقَّ» ضَرَبَ مِن الضَرْب»): لە ضَرْبْ (لێدان) وشەی (ضَرَبَ: (لێیدا)ی دەرهێنا/ وەرگرت.
(-الطريقَ في الفَلاةِ): بە بیابانەکەدا رۆیشت/ رێی بیابانی گرتەبەر.

(إِنْشَقَّ- الشيءُ): شتەکە درزێکی تێبوو قڵیشیبردو دوولەتبوو.

(-الفَجرُ): سپێدەیدا/ بەیانیدا.

(-الأَمرُ): کارەکە بە هۆی ناتەباییەوە پەرتپەرتبوو.

(«إِنْشَقَّت عَصاهُم»): کاریان پەرتو بڵاوبوو.

(اَلشَقّ (مص) (ج) شُقوق): ١-درز/ قڵیش/ کەرت/ لێکترازان ٢-شوێنی (دەلاقە/ قڵیش/ درز) تێبوو ٣-بەیان ٤-نیوەی هەموو شتێك.

(اَلشِّقّ): ١-لایەکی مرۆڤ ٢-خوشك ٣-لا/ کەنار ٤-هەر شتێك کە تەماشایبکەیت ٥-نیوەی هەموو شتێك.

(«المالُ بيني وبَينَكَ شِقُّ أَو شَقُّ شَعْرَة»): ماڵەکە نیوەییمانەو بە موو جیاوازیی نییە.

(اَلشُقَّةُ (ج) شُقَق): ئەو ماوەیەی کە رێبوارێك دەیبڕێت.

(اَلشُقَّة الساعِيَة) (فك): ناوچەیەکە دوو هێڵە درێژیی گۆی زەوی دیاریدەکەنو نێوانیان پازدە پلەکە بە کاتژمێرێك دەبڕرێت.

(اَلشُقَّةُ صِفر): ماوەی سفر کە هێڵی گرینیتش لەسەریەتیو دەیکاتە دوو کەرتی وەکیەکەوەو کە وەك بۆی دانراوەو کاتژمێرەکە دیاریدەکات.

(اَلشِقَّة (ج) شِقَق وشِقاق): ١-جل یان شتێتر کە لە باری درێژیی/ باری ڕاستە هەڵبهێنرێتەوە ٢-پارچە ڕاستە هەڵهێنراوەکە ٣-نیوەی شتێك ئەگەر کەرتبووبێت/ هەڵهاتبێتەوە.

(اَلشِقَّة (ج) شُقَق= اَلشُقَّة): کەرتە.

(اَلشَقيق): نیوەی هەر شتێك ئەگەر بکرێت بە دوو کەرتی یەکسانەوە هەریەکەیان نیوەکەرتی ئەویترە.

(اَلشقيق (ج) أَشِقّاء): ١-برای باوکیو دایکی ٢-هاو وێنەی یەك.

(اَلشَقيقَة (ج) شَقائِق) (طب): ١-ژانی نیوەسەریی ٢-خوشك ٣-زەوییەکی ڕەقەنی نێوان باخو گوڵوگوڵزار ٤-لێزمەباران (چونکە هەورەکە داتڵیشاوەو ئاوەکەی لێهاتۆتە دەرێ).

(اَلشَقيقة مِنَ البَرقِ): (بریسکەی/ چەخماخەی) سەر ئاسۆ.

(شَقائِقُ النُعمان) (ن): گوڵاڵە سوورەو هەڵاڵەو گوڵە نیسانو گوڵەمیلاقە.

(اَلأَشَقّ- مِنَ الخَيل): ئەسپێك کە لە غاردا ئەملاولا بکات وەك بەلایەکدا بکەوێت.

(فَرَسٌ أَشَقُّ المِنخَرَين): چارەوێیەکی کونەلووتفش.

٢-(شَقَّ- الأَمرُ. شَقّاً ومَشَقَّةً): کارەکە (بە گیروگرفتبوو/ گرانبوو).

(-علَى فُلانٍ): کابرای تووشی گیروگرفتو سەختیکرد.

(اَلشَقّ (ج) شُقوق): نارەحەتیی/ گیروگرفت/

کارسەختیی.
(اَلشَّــق= المَشَــقَّة): نارەحەتیی/ ســەختیی/ قورسیی کار.
(اَلشِــقَّة والشُــقَّة (ج) شُــقَق): ١-لایــەك و دوورییــەك کە ڕێبوارێــك و گوزارکارێك بۆی بچێــت ٢-گوزارێکــی دوور ٣-(نارەحەتیــی/ قورســیی/ گیروگرفت) ٤-ڕێگەیەك کە بڕینی بۆ ڕێبوارەکە گرانبێت.
(اَلمَشَــقَّة والمِشَــقَّة (ج) مَشــاقّ ومَشَقّات): گرانیی و سەختیی/ کوێرەوەریی/ نارەحەتیی و مەینەتیی. ڕەنج و ماندوێتیی زۆر.
٣-(تَشَــقَّقَ- الفَــرَسُ): چارەوێکــە تێقوپا/ فاقیدا.
٤-(اَلشِــقّ) (ح): جــۆرە مەیمونێکــە کە لە مرۆڤ دەچێت.
٥-(شَقشَــقَ- الجَمَلُ شَقشَــقَةً): حوشترەکە بۆرەبۆڕیکرد.
(-الطَيرُ): باڵندەکە خوێندی.
(شَقشَــقَتِ الفاسِــلَةُ الثیــابَ أَوِ الإنــاءَ): جلشــۆرەکەیان قاقشــۆرەکە شلپەشلپیکرد لە ناو هەڵکێشــان و پاککردنــەوەی جلەکەدا یان قاپەکەدا (عامیة).
(اَلشِقشِــقة (ج) شَقاشِق): شــتێکە وەك سی کاتێــك حوشــتر هاردەبێــت و هەڵدەچێت لە دەمیەوە دەیهێنێتە دەریّ و دەبۆڕێنێت.
(«هَدَرَت شِقشِقَتُهُ»): بۆڕەی بەرزبووەوە.

(«فُلان شِقشِقَةُ قَومِهِ»): فیسار گەورە پیاوو زمانحاڵی نەتەوەکەیەتی.
شقأ: (شَــقَأَ- النابُ. شَقأً وشُــقوءاً): دانەکە سەریدەرهێنا.
(-شَــعْرَ الــرأسِ): قژیســەری بــە شــانە بڵاوکردەوەو دایهێنا.
(-رأسَهُ): سەری شکاند.
(-فُلاناً): کێشای بە تەوقیسەریدا.
(اَلمِشقأ والمِشقاء والمِشقأة): شانە.
شقح: ١-(شَقُحَ. شَقاحَةً): ناشیرینبوو/ دزێو بوو.
(شَقیح): دزێو/ ناشیرین.
(شَقَحَ- هُ اللهُ): خودا ناشیرینی کرد/ دزێویکرد.
(شــاقَحَ- هُ. مُشاقَحَةً): شەرەجنێوی لەگەڵدا کرد.
(اَشقَحَ- هُ): دووریخستەوە.
(اَلشُقح والشَقح): دوور.
(«شُقحاً وشَــقحاً لَهُ»): لەوەلاتر چێت/ هەر بڕواو نەیەتەوە/ هەردوور بێت.
٢-(شَقَحَ- الشيءَ. شَقحاً): شتەکەی شکاند.
(-الجَــوزَةَ): گوێزەکەی شــکاندو کاکڵەکەی دەرهێنا.
٣-(شَقَّحَ- البُسْرُ): خورما سەوزەکە ڕەنگیگرت.
(اشقح- البسْرُ): ڕەنگیگرت.
(-النَخلُ): دارخورماکە جوان و گەشەبوو.
(اَلأشقَح (م) شَــقحاء (ج) شُقح): سوورفل/

سوورکاڵ/ سوورباو.

(اَلشُقحِيّ): سووری خەنەیی.

شقذ: ١-(شَقِذَ. شَقَذاً): چاو پیسبووو خەڵکی زوو بە چاوەوە دەکرد ٢-زۆر کەمخەو بوو.

شَقْذٌ وشَـقِذٌ وشقیذ وشَـقَذان: ١-چاوپیس ٢-کەمخەو ٣-کەموکووڕی.

(مالَهُ شَـقَذٌ ولا نَقَذٌ»): هیچ شـتێکی نیەو کەموکووڕیی‌و ناتەواوی نییە.

٢-(شَقَذَ وشَـقِذَ. شَقْذاً وشَـقَذاً): ڕۆیشت‌و دوور دوور کەوتەوە.

(شاقَذَ- هُ): دوژمنایەتیکردو لێی دوورکەوتەوە.

(اَشْقَذَ- هُ): دەریکرد.

٣-(اَلشَـقَذ والشُـقَذ والشِـقَذ (ج) شُقْذان وشُقاذی) (ح): بەچکە خۆرپەرست.

(اَلشَـقْذان) (ح): گـورگ ٢-(ح)هەمـوو مۆریچەیەك ٣-(ح) بەچکـە جێرگ‌و قەتێو هیتر.

(اَلشَـقَذان (ج) شِقذان والشَـقِذ والشَقذ): ١-(ح) خۆرپەرست ٢-(ح) گورگ.

شـقر: ١-(شَـقِرَ وشَقُرَ شَـقَراً وشُـقْرَةً): سوورهەڵبوو/ سووربوو/ سوورکاڵبوو.

(اَشْـقَر (م) شَـقْراء (ج) شُـقْر): سوورباو/ سوورکاڵ/ سوورهەڵ.

(اِشْـقَرَّ): سـوورهەڵبوو/ سـووورباو بـوو/ سـوورکاڵبوو لـە (شَـقِرَ وشَـقُرَ): باشـتر دەرچووە.

(اَلشُـقْرَةُ): سووری مەیلەو زەرد/ ڕەنگێك لە نێوان سوورو زەردا بێت.

(اَلشُقّار والشُقّاری) (ن): گوڵە میلاقە. جۆرە گوڵێکە شـێوە جوان. ڕەنگـی زۆرە جۆرێکی میلاقـی تاجەگوڵینی پێدەڵێـن لە ناوچەی خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـتدا بڵاوە لـە دوادوای زستاندا گوڵدەگرێت.

٢-(الشَـقْر (ج) شُـقُور): کاری گرنگ کە لە توێی دڵدایە.

(«اَفْضَیـتُ لَهُ بِشُـقُوري»): ئـەوەی کە لە توێی دڵمدا بوو/ ئەو نهێنییەی کە بە کەسـم نەدەوت بەوم وت/ دڵی خۆم بۆ کردەوە.

(«بَثَّـهُ شُـقُورَهُ»): سـکاڵای دڵـی خـۆی لاکردەوە.

(اَلشَقَر) (ح): ١-کەڵەشێر/ کەڵەباب ٢-درۆ.

(جاءَ بِالشُقَرِ والبُقَرِ): درۆو فیشاڵ‌و کەڵەك‌و کوڵەکی هەڵڕشت.

٣-(اَلشَـقِرّاق والشِـقِرّاق) (ح): دارکونکەرە پێشیدەڵێن (شُقُرّق والشَرَقْرَق).

٤-(اَلشَقِران اَو عُفنُ الحُبُوب) (ز): خەڵووزە ژەنـگ. دەردێکە دەداتــە ڕووەك بە تایبەتی دانەوێڵــە (گەنــم‌و جــۆ) بە هۆی کــەڕووی وردبینــەوە کە گرنگترینیان کــەڕووی ژەنگ پرتەقاڵییە.

شـقص: (شَـقَصَ- الذَبیحَـةَ): ئاژەڵـە سـەربڕراوەکەی لەتوکوتکـردو بەیەکسـانی

بەشبەشیکرد بەسەر بەشدارەکاندا.
(اَلشِقْص): ١-بەش ٢-بەش/ بەرکەوت ٣-کەرتی شتێك یان پارچە زەوییەك.
(اَلشَــقیص): ١-هاوبەش ٢-بەشــدارو پشکدار ٣-کەمەکێك لە شتی زۆر.
(اَلْمُشَقَص): قەساب.
٢-(اَلشَقیص): چارەوێی ڕەسەن.
(اَلْمِشْــقَص (ج) مَشاقِص): نووکە تیرێکی پان یان تیرێك نووکێکی پانی پێوەبێت.
شقع: (شَقَعَ- فِي الإناءِ شَقعاً): بۆ خواردنەوە دەمی ژەندە ناو قاپەکەوە.
(-الحَطَبَ) (عامية): دارەکەی هەڵچنی.
(شَــقَّعَ- لَــهُ): لە جنێوو قســەی ناشــیرین هەڵیکێشا (عامية).
شقف: (اَلشَقَف): فەخفووریی.
(شَفقَة): فەخفوورییەك.
(اَلشَقَف): لەتە فەخفوریی.
(اَلشَاقُوف) (ب) (آرامية): پیك/ چەکوشێکی گەورەی ئاسن.
(اَلمِلطــاس أو المِلْطَس): بە عەرەبی ڕەســەن پێی دەڵێن پیك.
(فُصیح): پیك.
(اَلشَــقیف): ١-گاتاوێرێکــی گــەورە کــە لە شاخەکەوە بەربێتەوەو تلۆربێتەوە ٢-بەردێکی بچووك (عامية سريانية)
(تَشــقیفُ الحَطَــبِ) (عاميــة ســريانية): وردکردنی دار.
شــقل: (شَــقَلَ- الدراهِمَ شَــقْلاً): پارەکەی کێشا.
(-هُ): بەرزیکردەوە (سريانية عامية).
(اَلشاقول) (عبرانية): شاوڵی بەناو خانەسازیی.
شقن: (شَقَنَ- العَطِيَّة شَقْناً): بەخششەکەی کەمکردەوە.
(شَــقُنَ- العَطــاءُ. شُــقونَةً): بەخششــەکە کەمبوو.
(شَقْن وشَقِن وشَقين): بەخششی کەم.
(اَشْقَنَ- العَطِيَّة): بەخششەکەی کەمکردەوە.
(-الرَجُلُ): داراکەی کەمبوو.
(اَلمِشــقَن= اَلمِسْــلَفَة): ماڵەزوویی، ئامێرێکە زەویی تۆوکراوی پێ تەختدەکرێت.
شقا: ١-(شَقا- اللهُ فُلاناً شَقْواً): خودا فیساری (کوڵۆڵکرد بەدبەختکرد ناشادکرد).
(شَــقِيَ. يَشقى. شَقاً وشَقاءً وشَقاوَةً وشِقاوَةً وشَقْوَةً وشِــقْوَةً): کوڵۆڵبــوو/ بەدبەختبوو/ ناشادبوو.
(-شَــقِي (ج) اَشْــقياء): کوڵۆڵ/ بەدبەخت/ ناشاد.
(شاقى- فُلاناً): لە فیسار کوڵۆڵتر بوو.
(اَشقى- اللهُ فُلاناً): خودا فیساری (کوڵۆڵکرد/ بەدبەختکرد/ ناشادکرد).
(اَلشَقا (مص) والشَقاء) (مص): ١-سەغڵەتیو تەنگانە/ ســەختی ٢-کوێرەوەریی/ کوڵۆڵی/

داماویی ٢-ناشادیی/ بەدبەختیی.

٢-(شاقى- هُ في الحَربِ ونَحْوَها): لە جەنگدا بەسەریدا زاڵبوو.

(-هُ على كذا): لەسەر ئەوە لەو بە ئازامتر بوو.

(-هُ) (عند العامة): بەدەست هەڵیدایە ئاسمانو گرتیەوەو هەڵیدایەو ئە ئاوا چەند جارێك وایلێكرد.

٣-(أشْقى- شَعْرَهُ): قژی بە شانە داهێنا.

(المِشقى): شانە.

٤-(الشاقِي- مِنَ الجبال) (ج) شَواقٍ وشُقيان): لێژگەیەكی درێژی شاخ/ باسكەیەكی درێژ.

شكّ: ١-(شَكَّ- في الأمرِ. شَكّاً): گومانی لە كارەكە كرد/ لە كارەكە بەگومانبوو.

(شاكٌّ): بەگومان/ گوماندار.

(أمرٌ مَشْكُوك): كارێكی گومان لێكراو.

(شَكَ- عَلَيهِ الأمْرُ): ١-سەری لە كارەكە دەرنەچوو و كارەكەی لێئاڵۆز بوو گومانیشی لێ پەیدابوو ٢-كارەكە سەختو گرانبوو.

(شَكَّكَ- هُ): گومانی خستە دڵیەوە/ گومانی پێ پەیداكرد.

(تَشَكَّكَ- في الأمرِ): گومانی لە كارەكە پەیداكرد.

(الشكّ (مص) (ج) شُكوك): گومان/ لێدڵنیانەبوون.

(الشَكّة): جارێك گومانكردن.

(الشاكَّة (ج) شَواكّ): مێی وشەی (شاكّ): بە گومان/ گوماندار.

٢-(شَكَّ- هُ بالرمحِ. شَكّاً): نێزەیەكی پێداكرد تا سەر ئێسقان بردی.

(-ت الشَوكةُ رِجْلَهُ): دڕكەكە بە قاچیدا چوو.

(-الخَيّاطُ الثوبَ): بەرگدرووە كە تەقەڵی جلەكەی شاش لێدا.

(-الشيءَ إلى الشيءِ): شتەكەی دایە پاڵ شتەكەیتر.

(-في السلاحِ): خۆی لە چەك هەڵكێشا.

(شاكُّ السلاحِ وشاكٌّ في السلاحِ (ج) شُكّاك): لە چەك هەڵكێشراو/ پڕچەك.

(-القومُ بيُوتَهُم): خوێشكەل خانووەكانیان لەسەر شێوەیەك یان ڕیزێك دروستكرد.

(«شَكُّ اللؤلؤِ أو الخَرَزِ»): ڕستی مرواری یان مووروو (عامية)

(الشَكَّة): ئازاری تەنشت یان شان یان شوێنیتر (عامية)

(الشِكّة (ج) شِكَك): ١-جۆرە خۆ لە چەكدانێك.

(«فُلانٌ مُخْتَلِفُ الشِكَّة»): ١-فیسار ڕەوشت جۆراوجۆرە ٢-پواز كە دەخرێتە كونی تەشویێو تەورەوەو پێی قایمدەكرێت.

(بيُوتٌ شِكاك): خانووی لە پاڵیەكدا ڕیزكراو.

(اَلشَـكيكَة (ج) شَكائِك وشُـكَك):١-ڕێگه ٢-تیپ/ دەستە شتێك.
(اَلمِشَـك (ج) مَشـاكّ):١-ئـەوەی خـۆی پێ چەكدار دەكەن ٢-زرێ.
(مِشكاكُ العَصافيرِ أو التبغ) (عامية):ڕستی چۆلەكە یان تووتن كە بە پەتەوە دەكرێت.
٣-(شَكَّ- إلَيهِ البلادَ شَكّاً):ئەو شارەی بۆ لای ئەو بری.
(-فُلاناً وإلَيهِ شَـكّاً):خۆی خستە پاڵ ئەو/ خۆی خستە پەنا ئەو.
(اَلشُكَّةُ= اَلشُقَّةُ):ماوە.
(بَينَهُما شُكَّةٌ بَعيدَة):ماوەیەكی دووریان لە نێوانداية.
٤-(اَلشَـكّ (ج) شُكوك):١-دەرزێكی بچووك لە ئێسقاندا ٢-دەرمانی مشككوژە.
(اَلشِـك) (ت) (انجليزيـة):چـەك/ چەكی بانك.
(اَلشـاكَّة (ج) شَـوّاك) (طب):هەڵاوسـانی لوویەكی گەروو.
(اَلشَكاكَة):كەنارێكی زەوی.
(اَلشُكيكَة (ج) شَكائِك وشُكَك):١-سەبەتولكەی میوە ٢-سروشت، ڕەوشت و خوو.
(«دَعهُ على شَـكيكَتِهِ»):لێیگەرێ با لەسەر ڕەوشتی خۆی بڕوات.
الملحق:
شــكّ: (اَلشَـكّاكون):تیپە فەیلەسـووفێكن دەڵێن كە ئاوەزی مرۆڤ ناتوانێت بسەلمێنێت نە بە ئاو بە بە نا. لە فەلسـەفەی ئیسلامیدا بە فەلسەفەی بێدەسەڵاتیی و نازانم ناونراوە، بەوە زانراون و ناسراون.

شـكر: ١-(شَكَرَ شُـكراً و شُـكوراً وشُكراناً- الرَجُـلَ ولَـهُ ولِلرَّجُل):(ئەمـەی دواتریان تەواوترە): سوپاسی پیاوەكەیكردو هەڵینا.
(«شَـكَرَ اللهُ سَـعيَكَ»): خـودا پاداشـتی ڕەنجەكەی داتەوە.
(«شـكرتُ لِفُلانٍ نِعْمَتَهُ»):سوپاسی چاكەو پیاوەتیی فیسارمكرد.
(«شَـكَرَ اللهَ ولِلهِ وبِاللهِ ونِعْمَـةَ اللهِ وبِنِعْمَةِ اللهِ):سوپاسی خودایكرد سوپاسی ڕووی نازی خودایكرد كە كردویەتیە ئەو.
(شاكِر (ج) شـاكِرون وشُكَّر):سوپاسگوزار/ سوپاسبژێرو پێزان.
(شاكَرَ- هُ):وایدەبینم كە ئەو سوپاسگوزاریەتی.
(تَشَكَّرَ- لَهُ):سوپاسیكرد.
(اَلشَـكور (ج) شُـكُر):(بۆ نێـرو مێ)، زۆر سوپاسبژێر.
(اَلشَـكور):(یەكێكـە لـە نـاوە پیرۆزەكانی خودا)، خـودا پاداشـتدەرێكی زۆری كارێكی چاكی كەمیشە.
٢-(شَكِرَ-تِ الناقَةُ. شَكَراً)گوانی مێحوشترەكە پڕ لە شیر بوو.
(شَـكِرَة (ج) شَـكِرات وشَـكارى وشَـكْرى

ومِشكار): حوشتری گوان پڕ لە شیر.
(-الرَجُلُ): پیاوە چرووکەکە دڵی فراوانبوو/ سەخیبوو.
(عَينٌ شَكْرى): چاوێکی پڕ لە فرمێسك.
(أَشْكَرَ الضَرعُ): گوانەکە پڕ لە شیر بوو.
(شَـكْران (م) شَكْرى (ج) شُكارى وشَكارى): گوانی پڕ لە شیر.
(إشتَكَرَ-تِ السَّماءُ): ئاسمان بارانی هێنا.
(-الضَرعُ): گوانەکە پڕبوو لە شیر.
(أَلشَكْرَةُ): ١-جارێك لە شیر پڕبوون ٢-جارێك سوپاسکردن.
أَلشَكْرَة والشَكريَّة): گوانی پڕبوونی لە شیر.
(أَلوَجْـهُ الشَـكُور): ڕووی تێکنەچوو ئەگەر خاوەنەکەیشی بە هۆی دەردەوە لەڕ بێت.
(أَلمَشْـكَرَة) («نَبات مَشـكَرَة»): ڕووەکێکە/ گیایەکە بەشیرە.
٣-(شَـكِرَ-تِ الشَجَرَةُ- شَكَراً): درەختەکە لە بنەوە بێچوولەی دەرکرد.
(أَشْـكَرَ واشْـتَكَر- الشَـجَرُ): درەختەکـە بێچوولەی دەرکرد.
(-الجَنينُ): کۆرپەلەکە گەنمەمووی دەرکرد.
(أَلشَـكير (ج) شُكُر): ١-بێچوولەی درەخت کە لـە بنیدا پەیدادەبێـت ٢-گەنمەموو و تووکە وردە یان گەنمە پـەڕ یان بێچوولەی درەخت کە لە بنـی گەورەکانیدا دەدرێـت ٣-توێکڵی درەخت ٤-مووی پشتیەلو ئەملاولای گەردن.
(شَكيرُ الإبلِ): بەچکە حوشتر.
٤-(شاكَرَ- هُ الحَديثَ): ئاخاوتنەکەی لەگەڵدا کردەوە.
٥-(إشْتَكَرَ- تِ الرياحُ): باکە توندیکرد.
(-الرَجُـلُ في عَـدْوِه): کابرا تونـد ڕایکرد/ قووچاندی.
(-البَـردُ أَوِ الحَرُّ): سـەرماکە یـان گەرماکە تیژبوو، تاویسەند.
٦-(الشـاكِريّ (ج) شـاكِريَّة): (فارسـية): بەکرێگیراو/ بەردەست/ نۆکەر.
(أَلشـاكِريَّة): ١-کرێـی نۆکەرو بەردەسـتو بەکرێگیراو ٢-چەقۆی سـەرچەماوە (عامية) ٣-(ط) خواردنێکە لە گۆشـتو شیر دەکرێت (عامية).
(أَلشَـكارَة) (عاميـة): ١-شـكارتە/ ئـەوەی نۆکەرێك لە زەویی ئاغادا بۆ خۆی دەچێنێت ٢-ئەوانـەی گیـای (خبـاز) کۆنەکەنـەوەو ئەیخەنـە شـوێنی پەروەردەکردنـی کردمی ئاوریشمو ئەو منالآنەی گەڵا توو کۆئەکەنەوە بۆ کرمی ئاوریشم (عامية).
(أَلشَوْكَران والشَيْكَران والشَيكُران): گیابۆگەنە (ن) ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی گێزەرەو ژەهرداره لـە گێتیـدا زۆر بـڵاوە بە زۆری لە شـوێنە ئاوەدانییەکاندا دەروێت بۆنێکی بۆگەنی لێدێت گوڵی سپی شێوە چەتری هەیە قەدی سەوزەو خاڵی سـووورباوی لە سەرە جاران کۆنەکان بە

تایبەتــی ئەغریقیەکان ژەهریان لێدەکوتـ
دەرخواردی تاوانبارەکانیاندەدا.
شکز: (شَــکَزَ- ەُ شَکزاً):١-بەنجەی تێوەژەند
٢-بەزمان ئازاری بە دڵی گەیاند.
(-ەُ بالرمحِ): نێزەی پێداکرد.
(اَلشَــکْز والشَــکز): بەدرەوشــت/ چەتوون/
چەپخوون.
(اَلشَکّاز):١-زۆر چەتوون/ ئەگریس ٢-هاروهاج و
بەجرت و فرت/ چەپخوون.
(شکس): (شَکُسَ وشَــکِسَ شَکاسَةً وشَکساً):
١-رژد بــوو/ چرووکبــوو ٢-چەتوونبــوو/
نالەباربوو ئەگریسوو/ چەپخوونبوو.
(شاکس- ەُ مشاکسة):بەرامبەری وەستایەوە/
بەربەرەکانێیکردو لەگەڵیدا ناڕێکبوو.
(تشــاکَسَ القَومُ): بەرامبەر یەك وەســتان و
ناکۆکبوون.
(«اللَّیلُ والنَّهارُ یَتَشاکســان»): شــەوو ڕۆژ لە
یەك جیان و دژبەیەکن.
(اَلشَکِس): چارە ڕەشیی/ شووم/ بەدووم.
(اَلمَشْــکَس= الشَــکِس): بەدووم/ چارەڕەش/
شووم.
ملحق:
شکش: (الشّاکوش) (ج) (شَواکیش):چەکوشی
بچووك.

---

شــکص: (اَلشَــکِص والشَــکیص): بەدخوو/
بەدرەوشت.

(اَلشَــکیصَة- مِنَ الإبل): مێحوشــتری قسر/
ئەمزۆك ئەسك ئەکات و نە شیریشی هەیە.
شــکع: ١-(شَکِعَ- المَریضُ شَکَعاً): نەخۆشەکە
ناڵەو نرکەی زۆر بوو وەڕسبوو.
(شاکِع وشَــکِع وشَکوع): نەخۆشی بێزارو بە
ناڵەو نرکەی زۆر.
(-الرَّجُــلُ): ١-تــووڕە بوو ٢-هــاواری ئازاری
لێهەستا.
(اَشْکَعَ- ەُ):١-تووڕەیکرد ٢-بێزارو هەراسانیکرد/
وەڕسیکرد.
٢-(شَــکِعَ- الزَرعُ. شَــکَعاً): کشــتەکە دانی
زۆرێگرت.
شکل: ١-(شَــکَلَ- الأَمرُ شَکْلاً): کارەکە ئاڵۆز
بوو/ چەواشە بوو/ گیروگرفتی تێکەوت.
(شَکَّلَ فُلانٌ المَسأَلَة): فیسار پرسە بابەتەکەی
ئاڵۆز کردو (عامیة) گیروگرفتی تێخست.
(اَلکِتابَ): سەروبۆری بۆ نووسینەکە کرد.
(-العِنَــبُ): ترێکــە ئاڵ و بۆڵبــوو/ خەریکی
گەیبوو.
(اَشْــکَلَ- الأَمــرُ): کارەکــە بەیەکداچــوو/
چەواشە بوو/ ئاڵۆز بوو.
(«اَشْــکَلَت علیَ الأَخبــارُ»): هەواڵەکانم لێ
چەواشە بوو.
(-الشَیءُ): شتەکە تەگەری تێکەوت.
(-الکِتابَ): ســەرو بۆری بۆ نووسینەکە کرد
(وەك بەوە چەواشەیی لێلابات).

(-العِنَبُ): ترێکە خەریکبوو بگات.

(-النَخْـلُ): فەریکـە خورماکەی گەیشـت و خۆشبوو.

(تَشَكَّلَ- العِنَبُ): ترێکە خەریکبوو بگات.

(إشـتَكَلَ واسْتَشـكَلَ- الأَمرُ): کارەکە ئاڵۆز بوو.

(الشَـكْل (ج) أَشْكال وشُـكُول): کاری (ئاڵۆز/ بەیەکداچوو/ کارێك کە سەری لێدەرنەکرێت).

(الشَـكْل (ج) أَشـكال وشُـكُول): کارێك کە سەری لێدەرنەکرێت.

(«أُمورٌ أَشكال»): کارانێکی ئاڵۆز.

(شَكْلُ الكِتابِ): سەروبۆر کردنی نووسینێك.

(الشَكلَةُ): جووڵەیەك.

(الشُكلَةُ): سووریی لەناو سپیدا.

(الأَشْـكَل (ج) شُكْل): ١-سـپیی مەیلەو سوور ٢-کەسێك کە چاوی خاڵی سووری تێدابێت.

(الشَكلاء): مێی وشـەی (الأَشْكَل) (الأَشْكَلَة): بەیەکداچوون/ ئاڵۆزیی.

(الشَـكيل): خوێـن و کـەف تێکەڵ بەسـەر لغاوەوە.

(المُشكِل والمُشكِلَة (ج) مَشاكل): تەنگژە/ کاری گران و ئاڵۆز/ کاری دژوارو بە گیروگرفت.

٢-(شَـكَلَ- المَريضُ. شَكْلاً): نەخۆشەکە ڕوو لە چاکبوونبوو.

(شَكَّلَ- الشيءَ): وێنەی شتەکەی کێشا.

(شَكَّلَ): پێکیەوەنا.

(شـاكَلَ- هُ. مُشـاكَلَةً): ١-وەك ئەوی لێهات/ بـە وێنەی ئـەو بوو ٢-لـە گەڵیـدا گونجاو ڕێککەوت.

(أَشْـكَلَ- المريـضُ): نەخۆشـەکە ڕوو لـە چاکبوونبوو.

(تَشَـكَّلَ): ١-وێنەی هێنایـە بەرچاوو وێنەی کێشا لە مێشـکی خۆیدا/ شێوەو وێنەی پێدا ٢-پێکهات.

(تَشاكَلا): ١-وەکیەکیان لێهات و لوان ٢-پێکهاتن.

(الشَكْل (ج) أَشكال وشُكُول): هاوشێواز/ هاو وێنە/ هاوچەشـن/ تەرز/ هاوشێوە ٢-وێنەی ئەو شتەی کە دەستی لێبدرێت یان لە مێشکدا بێت وەك شـێوەو باری لەش شـێوەخوار یان قنـج و ڕاسـت ٣-چون ئـەو شـتە هاووێنەو هاوشێوە ٤-ڕێڕەوو ئامانج/ نیاز.

("سَأَلتُهُ عَن شكل فلانٍ"): دەربارەی فیسارم لێپرسی کە چۆنە ڕێڕەویی و ئامانج و نیازی.

(الشَـكْل): ٥-ئـەوەی بۆ تـۆ دەگونجێت و بە کەڵکتدێت.

("لَيـسَ هذا مِـن شَـكلي"): ئـەوە بۆ من ناگونجێـت و بەکەڵکـم نایـەت ٦-جوانیـی دیمەن و شێوە.

("فُـلان شَـكْلُهُ جميل"): فیسـار قیافەت و شێوەی جوانە.

("فُلان يحب الشَكْلَ"): فیسار (حەز لە دیمەنی جوان دەکات/ دیمەنپەرستە).

(الأَشْكال): خشـڵو مرواریو زیو كه له یەك بچن.

(الشِّـكل): وەك خۆی/ لەو شـێوەو وێنەیە/ هاو.

(الشُكلَةُ والشاكِل): لێچوون/ شێوە وەرگرتن.

("فیه شُكلَةٌ مِن أبیه"): شێوەی باوكی تێدایە واتا لەو دەچێت.

(الأشكَل (ج) شُكْل): زۆرتر لێچوون.

(هذا أشكَلُ بِهِ): ئەمە زۆر لەو دەچێت.

(الأَشْكَلَةُ): لێچوون/ وەك ئەو بوو/ هاوشێوە.

(فیـهِ أشْـكَلَة مِـن أبیـهِ): شـێوەی باوكی تێدایە.

(الشاكِلَةُ (ج) شَواكِل): ١ـمێی وشەی(الشاكِل) ٢ـشـێوە/ وێنە/ وەكـو ٣ـچۆنیەتـیو ڕێگاو ڕێڕەو ٤ـنیازو ئامانج.

(التَشكیلَة) (ا ع): تاقم/ دەستە/ كۆمەڵ.

("تَشكیلَة مِن الدبابات"): كۆمەڵە دەبابەیەك.

(المُشَكَّل): قەلافەتو شێوەدار.

(المُشاكَلَة) (مص): لێچوون/ شێوە وەرگرتن.

("في فُـلان مُشـاكَلَةٌ مِن أبیهِ"): فیسـار لە باوكی دەچێت/ شێوەی باوكی تێدایە.

٣ـ(شَـكَلَ وشَكَّلَ- الدابَّةَ بالشِـكالِ. شَكْلاً): چوارپەلی وڵاخەكەی بە پەت بەستەوە.

(الشِّـكال): ١ـپەتێكـە چوارپەلـی وڵاخـی پێدەبەسـترێتەوە ٢ـپێوەندێكـە دەكرێتـە دەستەو قاچی وڵاخەوە.

(-في الخَیل): ئەوەیە سـێ پەلی سـپی بێت پەلێكی سپی تێدانەبێت.

(الشَكْلاء): پێداویستی.

(الشاكِلَة (ج) شَواكِل): پێداویستی.

(الأَشْكَلَة): ئەو نیازو پێداویستیەی كە مرۆڤی پێوە ببەسترێتەوە.

("لَنـا عِندَهُ أشْـكَلَةٌ): پێداویسـتیەكمان لە لایەتی.

(المَشْكول): ئەو وڵاخەی كە بە پەت چوارپەلی دەبەسترێتەوە.

(-مِنَ الخَیل): وڵاخێك سـێ پەلی سپیبێتو پەلێكی نەبێت.

٤ـ(شَكَلَ وشَـكَّلَ-تِ المَرأةُ. شَعرَها): تیسكی قژی پێشـی سـەری بەلای ڕاسـتو چەپیدا بادا.

(شَكِلَ-تِ المَرأةُ شَكَلاً): ژنەكە كەوتە عیشوەو ناز.

(تَشَـكَّلَ-تِ المـرأةُ) (عامیـة): ئافرەتەكـە چەپكە گوڵێكی لە سەری دا.

(الشَكْل (ج) أشكال وشُكول والشِكْل): عیشوەو نازی ژن.

(إمرَأةٌ شَكِلَةٌ): ژنێكی بەعیشوەو ناز.

(التَشـكیلَة) (عامیـة): ئـەو گـوڵو شـتە جوانانـەی كە ئافرەت لەسـەریدەداتو خۆی پێدەرازێنێتەوە (عامیة)

(المَرأةُ المُشـكَّلَة): ئەو ئافرەتەی كە خۆی بە

کوڵی سەرو شتیتر دەرئەزێنێتەوەو لە سەری دەدات (عامیة).

٥-(اَلشَّاكِلَةُ (ج) شَوَاكِل): ١-کەمەر ٢-لا/ کەنارو تەنشت.

(شاكلةُ الطريق): کەناری ڕێگا.

(فُلان يرى بِرَأيِهِ الشَّوَاكِل): ڕاکەی هەموو لایەکی ڕاستیی دەپێکێت.

(اَلشَّوَاكِل): قۆڵو لك کە لە ڕێگە سەرەکییەکە دەبێتەوە.

("هذا طريقٌ ذو شَوَاكِل"): ئەمە شەقامێکە قوڵی زۆری لێدەبێتەوە.

(اَلشَّوْكَلَةُ): ١-لا/ کەنارو تەنشت ٢-(ن) تووترکێك.

(الشَّوكَل = العَوسَج. شَوْكَل): تووترك.

ملحق:

شكل: (اَلتَّشكيلات): کۆی وشەی (التَّشْكيلَة)یە واتا پێکەوە نراو. کۆمەڵە پێکەوەنراوی سەربازیی کە ئەرکێکیان پێدەسپێردرێت.

(اَلتَّشكيلات في الإدارة): لە بەڕێوەبردندا گوێزانەوەو تاوتوێی کاری کارمەندان. لەوانەیە بۆ دانان و لابردن و پلەپێدان و بەرزکردنەوەیان بێت.

---

شكم: ١-(شَكَمَ- ه شَكْماً): پاداشتی دایەوەو بەخششیی دایە.

(-فُلاناً): بەرتیلیدایەو دەمکوتیکرد/ دەمکوتانەیدایە.

(شكيمَة): بەرتیل/ دەمکوتانە.

(شَكَمَ- هُ شَكْماً وشَكيماً): گەستی/ گازی لێگرت.

(شَكِمَ. شَكَماً): برسیبوو.

(اَشْكَمَ- هُ): پاداشتی دایەوە.

(اَلشُّكْمُ والشُّكْمى): بەخشش کە لە بری پاداشتبێت/ دەمکوتانە.

(اَلشَّكيمَة (ج) شَكَائِم وشُكُم وشَكيم): ١-سەربەرزیی/ نەبەردیی ٢-سەر بۆ ستەم دانەنەواندن ٣-ئاسنی لغاوی دەمی ئەسپ ٤-لووتبەرزیی ٥-لاساریی/ سەرسەختیی/ قیرسیچەمەیی.

("فُلانٌ ذو شَكيمَة أو شَديدُ الشَّكيمَة"): فیسار نەبەردەو سەرنانەوێنێت/ لاسارو سەرسەختە.

٢-(اَلشَّكِم) (ح): شێر.

(اَلشَّكيمَة (ج) شَكَائِم وشُكُم وشَكيم): ١-پەیمان ٢-سروشت ٣-لێچوون.

شكه: (شَاكَهَ- هُ. شِكاهاً ومُشَاكَهَةً): لەو چوو و لەوەوە نزیکبوو.

(اَشْكَهَ- الأمرُ): کارەکە وەکو یەك دەرچوو.

(تَشَاكَهَا): لەیەکچوون.

شكا: ١-(شَكَا- إلَيه زَيداً شَكْوَى وشَكْواً وشَكَاةً وشَكَاوَةً وشَكَايَةً وشَكِيَّةً): لای ئەو سکاڵای لەدەست خراپیی زەید کرد/ دادی لەدەست زەید کرد.

(شاك= المُشتَكي): سكالآكار، دادكار/ دادخواز.
(مَشــكُوٌ ومَشْـكِيّ ومُشْــتَكى عليه): سكالآ لەدەستكراو/ داد لەدەستكراو/ سكالآلێكراو.
(مَشــكو إليهِ): هاوار بۆ بــراو/ داد بۆ براو/ دادپرس/ سكالآلاكراو.
(الَشكوى): سكالآكردن/ دادكردن.
(شَــكا- الأمرَ أو العِلّةَ): هاوارو دادی لەدەست كارو ئازارەكە كرد.
(-أمــرَهُ إلى اللهِ): ســكالآی بردە بــەر قاپیی بارەگای خودا.
(شَكّى- الشَاكيَ تَشكِيَةً): سكالآی سكالآكەرەكەی پرسی.
(شــاكى- هُ): ١-ســكالآی لەدەســت ئــەو كرد ٢-دەردی دڵــی خۆی بــۆ هەڵرشــتو ئەوەی تووشی بووبوو پێیوت.
(أشْكى- فُلاناً. إشكاءً): ١-سكالآكەی لێوەرگرت ٢-بەدادو ســكالآكاری دانا ٣-ســكالآی تاســەو حــەزو پەرێشــانیی خــۆی لاكــرد ٤-كارێكی پێكرد ناچاریكرد هاواری لە دەستبكاو سكالآی لەدەســت بكاتــەوە ٥-قاپلیكردو دەســتی لە سزادانی هەڵگرتو ئەوەی كە هاواری لەدەست دەكرد لەســەری لابرد (ضد) سزای زۆریداو كارێكی پێكرد كە هاواری لێهەستێت.
(أشكى- فُلاناً مِن فُلانٍ): سكالآی لێ لەدەست چیبوو بۆی لە فیسارپسەند قاپلیكرد.
("هُــوَ يُشــكى بِكَــذا"): ئــەو بــەوە گومانباركراوە.
(تَشَــكّى- إلَيهِ): هــاواری بۆ برد/ ســكالآی لاكرد.
(تَشاكى- القَومُ. تَشاكياً): خوێشكەل سكالآیان لای یەكتریكرد. دادیان لای یەكتریكرد.
(إشْــتَكى- إليه): دادو ســكالآی بــۆ لای ئەو برد.
(الشكوى ج شكاوى): ئەوەی سكالآی لەدەست دەكرێت.
(الَشــكْوَة (ج) شَــكَوات وشَــكاء): جارێــك (سكالآكردن/ دادكردن).
(ألَشــكِي (م) شَــكِيَّة (ج) شَــكايا= المَشكو): ئەوەی سكالآی لەدەست دەكەن.
(ألَشــكِي والشــاكِي): ســكالآكار/ دادخــواز/ هاوارلێهەستاو.
٢-(شَــكا مَرَضَهُ لِلطبيب شَــكوَى وشَــكاةً وشكاوةً وشِــكايَة وشَــكِيَّة): نەخۆشەكە بۆ پزیشكەكەی روونكردەوە كە چییەتی.
(-المَرَضُ فُلاناً. شَــكْواً وشَــكوى وشَــكاةً): نەخۆشییەكە ئازاری بە نەخۆشەكە گەیاند.
(تَشَكّى): نەخۆشكەوت.
(-مِن جِرحٍ): برینەكــەی (ژانیكرد/ ئازاری دایە).
(تَشَكّى): نەخۆشكەوت.
(-من جرح): هاواری ژانی برینێكیكرد.
(الشُكوى والشَكاء والشكاة الشَكُو والشَكْواء):

نەخۆشیی/ بیماریی.

(اَلشَکْوَة (ج) شَکَوات و شَکاء)؛نەخۆشییەك/ بیمارییەك. دادو بێدادێك لەدەست نەخۆشی.

(اَلشَـکِيّ (م) شَکِيَّة (ج) شَـکَايا)؛١-ئازاردار ٢-نەخۆش.

(اَلشَکِي والشـاکي)؛نەخۆشێکی بێوره کە بە کەمە ئازارێك هاواری لێهەڵبسێت.

٣-(الشکوى) (ح)؛نێرە حوشترى بچووك.

(اَلشَـکْوَةُ و الشُـکَيَّةُ)؛دەفرێکی پێسـتینو لەپێست دروستکراو بۆ ئاو یان شیر.

(رجُـلٌ شـاکي السـلاح)؛پیاوێکـی خـۆ پرچەککردو کە سـڵی لێدەکەن (هەڵگێراوەی وشەی شائك)ە.

(اَلشَکاة)؛خەوش/ زەدە.

(اَلمِشْـکاة)؛١-دزی دیوار/ کە لەبەر کە پیایدا نەچـن یان دەرنەچێت ٢-تـاق/ چراگا یا ژێر چرا ٣-چرا.

شـکی: (شـکَی- إلَيهِ. شَـکياً)ئەمە وشەی (شَکا)ـەکە دوایییەکە (واو)ە. هاواری بۆ برد.

(اَلشَکِيَّة)؛پاشماوە.

شـلّ: ١-(شَلّ وشُلّ واُشِـلّ -ت يَدُهُ)؛دەستی (وشکبوو/ ئیفلیج بوو).

(اَشَلّ)؛ئیفلیج.

يَدٌ شَلاَّء (ج) شُلّ؛دەستی ئیفلیج، وشکبوو.

("لاشُلَّت يَداكَ أَو لاشُلَّت عَشرُك")؛هەردوو دەسـتت خۆش/ هەر دەپەنجەکەت خۆشبنو وشکنەبن.

(اَلدعاء للرامي "لاشِلال")؛دوعا بۆ تیرهاوێژ: دەستت خۆش/ دەستت نەرزێت.

(اَلشَـلَل) (طـب)؛دەسـت (ئیفلیجبـوون/ پەککەوتن).

٢-(شَـلّ-تِ العَـينُ دَمْعَهـا شَـلاًّ)؛چاوەکە فرمێسکی دارشت.

(اِنْشَـلّ- المَطَـرُ)؛ بـاران (هاتەخـوارێ/ دابڕشت).

(-السَـيلُ)؛لافاو/ شـێلاو هاتو سەرەوخوار بووەوە.

(اَلشُلَل والشُلُل والشَلُول)؛خێرا/ گورج.

(اَلشَـليل (ج) اَشِـلَّة)؛شێوی سـەرەکیی ناو دۆڵ.

(اَلشَلاَّلات واحدها شَلاَّل)؛تافگە.

(رَجُلٌ مِشَلٌّ)؛پیاوێکی خێرا/ گورجوگۆڵ.

٣-(شَـلّ- الثوبَ. شَـلاًّ)؛جلەکەی کۆککرد/ سووکدرونێك درووی/ شاشدرووی.

(-الـدرعَ وشَـلَّها عَلَيهِ)؛زرێکەی لە لەشـی هەڵکێشا.

(اَلشِلَّة- عِندَ الخَياطين)؛کلافە دەزووی لای بەرگدروو/ کنر.

(اَلشِـلالَة عِندَ الخَياطين)؛پارچەلێکدانێکی دوو پارچـەو درورنێکـی شـاش لـە لایـەن بەرگدرووەکانەوە.

(اَلشَـليل (ج) اَشِـلَّة)؛٤-پارچـە پەلاسـێك

دەخریتە سەر کەفەلی چارەوێوەو لە پشت زەینەکەوە قایمدەکرێت ٢-زرێی بچووك لەژێر زرێی گەورەدا دەبێتو دەپۆشرێت دروشمێکە لەژێر زرێکەوە دەپۆشرێت.

(اَلمِشَل): بەرگێکە ملی پێ دادەپۆشرێت.

٤-(شَلَّ- الإبلَ. شَلاًّ وشَلَلاً): حوشترەکەی دەرکردو رادا.

("اَلصُبحُ يَشُلُّ الظَلامَ"): بەیان تاریکی رادەدات.

(-الشَيءَ): شتەکەی بری/ لەتکرد.

(اِنْشَلَّ- الذِئبُ في الغَنَم): گورگەکە خۆی بە رانەکەدا دا.

(-تِ الإبلُ): حوشترەکە دەرکراو راونرا.

(اَلشَلَّةُ): جارێك دەرکردن.

(اَلشِلال): خوێشکەلی پەرش و بلاّوو لە یەکجیا.

("جاءَ القَوم شِلالاً"): خوێشکەل هاتن حوشترەکانیان دەربکەنو بلاّویکەنەوە.

٥-(اَلشَلَل): بواردنی پەلەی جل کە بە شتن پەلەکە نەروات.

(اَلشُلَل والشُلل والشَلول): خۆشبوونی هاورێیەتی/ کەسێکە هاورێیەتیی خۆشبێت.

(اَلشَلَّةُ والشُلَّةُ والشُلّى): خواست/ نیازو کاری دوور کە بتەوێت ٢-ئەو شوێنەی گوزارکارەکە دەیەوێت رووی تێبکات.

(رَجُلٌ مِشَلٌّ): پیاوێکە هاورێیەتی/ هاودەمیی خۆشبێت.

٦-(شَلْشَلَ- الماءُ. شَلْشَلَةً وشِلْشالاً): ئاوەکە تکەیکرد.

(-الماءَ وبالماءِ): ئاوەکەی پرژاند.

(شَرشَرَ) (عامية): ئاوەکەی پرژاند.

(شَلْشَلَ- الماءَ): ئاوەکەی دلۆپاند.

(-السَّيفُ الدَّمَ): شمشێرەکە خوێنێرشت.

(فالماءُ والدَّمُ شَلْشَلٌ ومُشَلْشِلٌ ومُشَلْشَلٌ): ئاوەکە یان خوێنەکە رژاوەو بلاّوبۆتەوە.

(تَشَلْشَلَ- الماءُ): ئاوەکە رژاو پەرش و بلاّو بووەوە.

(-السَيفُ بالدَّم): شمشێرەکە خوێنێرشت.

("جاءَ والجرحُ يَتَشَلْشَلُ دَماً"): هاتو برینەکەی خوێنی لێدەتکا.

(اَلشَلْشَل): (جیقنەی/ ریقنەی) شل.

(ماءٌ شَلْشَلٌ): ئاوی دلۆپاو/ دلۆپ دوای دلۆپ.

(ماءٌ ذو شَلْشَل): ئاوی بەدلۆپە.

٧-(اَلشَلْشَل والشُلْشُل- مِنَ الرجال): ١-پیاوێك کە زوو بە پیری پێویستەوە بچێتو چابوکبێت ٢-دەروونپاك/ دڵپاش.

شلح: (شَلَّحَ- هُ تَشْليحاً): رووتیکردەوە.

(تَشليح قُطاع الطرق للمسافرين): رووتکردنەوەی رێبوارو کاروانیی لەلایەن چەتەو رێگرەکانەوە.

(شلحُ الثياب) (سريانية): رووتبوونەوە/ جلداکەندن.

(اَلشالُوح) (عامية): دارێکی درێژ.

(اَلشلحاء و الشَلحى (ج) شُلح): شمشێری تیژ (وشـەکە کراوە بە مێ لەبەر ئەوەی بە نامێر دانراوە).

(اَلمَشـلَح) (عامية): عەبایەکی دەڵب/ فراوان کە بێ قۆڵ بێت.

(اَلمُشـلَج): ژووری ساردی گەرماو کە خۆی تێدا رووتدەکرێتەوە.

شلخ: (شَلَخَ- هُ بِالسَّـيفِ شَلخاً): بە شمشێر بڕی.

(اَلشَـلخ) (مص): ١-بنەچەو رەگەز/ ڕیشـەو رەسەن ٢-کوڕی پیاوەکە.

("هُوَ شَلخُ سوءٍ"): ئەو نارەسەنە.

(اَلشليخ) (ط): خواردنێکـە لە گۆشتو شیرو پیـاز لێدەنرێـتو دەکرێـت هەندێك کەس پێیدەڵێن (الشاکرية).

شلط: (اَلشَلطاء): چەقۆ.

(اَلشِلطة (ج) شِلَط): تیری درێژی بارێك.

شلغ: (شَلَغَ- الراسَ شَلغاً): سەرەکەی شکاند/ قرنجاند.

شلف: (شَلَفَ- البِنتَ. شَلفاً): کچەکەی فڕاند/ هەڵگرت.

(بنتٌ شَـلیفَة): کچێکی فڕێنـراو/ هەڵگیراو (عامية سريانية)

(اَلشِـلف- مِـنَ الحديـد): شیشـی ئاسـن (عامية)

(اَلشَلفَة) (عند العامة): لای ڕەشە خەڵکەکە: سونگی.

(اَلشـالُوف) (عنـد العامـة): ١-تاقگەی ئاو ٢-شوێنی تاقگەکە.

(اَلشَـلاّفَة- مِنَ النسـاء): ئافرەتی (قەحبە/ سۆزانی).

شلق: ١-(شَلَقَ- هُ. شَلقاً): لە ڕاستە هەڵیدڕی یان ڕاست دایدڕی.

(-هُ بِالسَوطِ): دایە بەر قامچی.

(-الحائـطُ) (عنـد العامـة): ١-دیوارەکـە لێبووەوە/ لێیهەڵوەری ٢-شەقیبرد.

(اَلشِلقاء): چەقۆ.

(اَلشَلقَةُ والشِـلقَةُ) (عامية): لە دیوارو شت بوونەوەو هەڵوەرین یان درزبەرێت.

(اَلمِشـليق): کەسـێکە لـە پێکەنینـدا دەم زۆربکاتەوە.

٢-(اِشـتَلَقَ) (عاميـة): بە مێشـك بۆ ئەوە چوو.

٣-(اَلشِـلق والشَـلِق (ح) (ج) اَشلاق): جۆرە ماسییەکە ئێسکنەرم.

(اَلشَـلقَةُ والشِـلقَةُ): هێلکـەی مارمێلکە کە فڕێیدەدات.

(اَلشَـلقَةُ = رۆلض الخيـل): ڕامکەرەکانـی ئەسپ.

(اَلشَلاّق): کەسێکە زۆر خۆی لە دەرۆزەکەرو هەژاران هەڵسوێت.

(اَلشَـوْلَقِيُّ): ١-حەڵواڤـرۆش‌و حەڵواكێــر/ دەســتگێری حەڵوا ٢-(كەسێكە زۆر ئالوودەی شیرینی بێت‌و حەزی لێبكات).

(شلم: (اَلشِلَّم): پریشكی ئاگر.

(فُـلان يَتَطايَر شِـلَّمُهُ"): تووڕەبووەو گڕی لێدەبێتەوە.

(اَلشَلْمَة): واقوڕمان/ حەپەسان بە شێوەیەك ئەو كەسە نەزانێت چی بكات.

(مَشْلُوم): حەپەساو واقوڕماو (عامية).

(اَلشَيْلَم والشَوْلَم والشالَم): ١-(ن)مرۆر كە لە ناو گەنمدا دەروێت ٢-(ن) = الشُـلت پەرشت (فارسية).

شلن: (اَلشِلَن): شـيلن پارەیەكی ئینگلیزییە. بیستیەكی لیرەی ئینگلیزییە.

شلا: ١-(شَلا. شَلْوا): ڕۆیشت.

(اَشـلی-الكَلْبَ على الصَّيدِ. إشْلاءً): سەگەی بۆ ڕاوكردن‌و نێچیر هاندا.

(شَلْو (ج) اَشْلاء): لاكـی نێچیر. هەمـوو لەشی بێگیان.

(-الناقَةَ): مێحوشـترەكەی تێـزە تێزەدا بۆ شیردان یان بۆ خواردن.

اَلشَلا: تەن‌و لەشی هەموو شتێك.

(اَلشِـلْو (ج) اَشْلاء): ١-ئەندامی لەشی هەموو شتێك ٢-پارچە گۆشتێك/ كوتە گۆشتێك ٣-(ح) بەچكە حوشتر ٤-پاشماوەی لاكی لێخوراو.

(اَشْلاءُ اللِّجام): قایشە كۆنەكانی لغاو.

(اَشْلاءُ الإنسـان): ئەندامی لەشی پۆرتكاوی مرۆڤ‌و لێكترازانی پاش مردنی.

("بَنو فلان اَشْـلاءُ في بَنی فلان"): فیسـار بەرە پاشماوەیەكی فیسار بەرەن لەناویاندا.

(اَلشَلِيّ): پاشماوەی هەموو شتێك.

(اَلشَلِيَّة (ج) شَلايا): ١-پاشماوەی داراو سامان ٢-كوتە گۆشت.

(اَلشُلَی): باریك/ لاواز.

٢-(شَـلا- الشَـيءَ. شَـلوا): شـتەكەی/ بەرزكردەوە/ هەڵیبڕی.

(شَلّی- الماءَ الحارّ) (عامية): ئاوە گەرمەكەی هەڵدەبــڕی‌و ڕۆیدەكــردەوە بــۆ ئــەوەی ساردبێتەوە.

٣-(إشْـتَلی- فُلانـاً): داوای لێكرد لە فەوتان یان تەنگانەیەك ڕزگاربكات.

(إسْتَشْـلا- هُ): داوای لێكــرد/ لــە مردن یان چورتومێك ڕزگاربكات.

٤-(إسْتَشْلی): تووڕە بوو.

شمّ: (١-شَمَّ- الوَرْدَ شَمّاً وشَميماً وشُمَّيمی): گوڵەكەی بۆنكرد.

(شَـمَّ): تاقیكــردەوە (لــە بۆنكردنــەوە وەرگیراوە).

(شَمَّمَ- الزَهرَ): گوڵەكەی بۆنكرد.

(-هُ الزَهْرَ): گوڵەكەی بە لووتدادا بۆنیبكات/ بۆنی گوڵەكەی پێكرد.

(شــامًّا وتَشــامًّا مُشــامَّةً وتَشـامًّا): بۆنی

یەکتریانکرد.
(أشَمَّ- هُ الوَرْدَ): بۆنی گوڵەکەی پێکرد.
("أشْمِمْني يَدَكَ"): دەستتم بدەرێ.
(تَشَمَّمَ- هُ): بۆنی هێواش هێواش بەسەردا چوو و بۆنیکرد.
(إشتَمَّ- الشيء): بۆنیکرد.
(إستَشَمَّ-هُ): ١-داوای لێکرد کە بۆنیبکات ٢-هەڵیمژی.
(الشَمّ) (مص): بۆنکردن/ هەست بە بوونی بونکراو.
(الشَمَم) (ضد): ١-نزیك ٢-دوور.
(الشامَّة): هەستی بۆنکردن.
(الشَمَّام والشَمُوم): باش بۆنکەر.
(الشَمَّامات): هەموو بۆنێکی خۆش کە بۆندەکرێت.
(المَشْمُوم) (مفع): ١-بۆنکراو/ ئەوەی کە بە بۆن پێیبزانرێت ٢-بۆنی مسك.
٢-(شَمَّ. شَمَماً): لووتبەرزیکرد، فیزی نواند.
(-الجَبَلُ أو الأنْفُ): کێو یان لووتەکە بەرزبووەوە.
(أشَمَ وشَميم): کەسێکی لووت لە ئاسمان یان کێوێکی لووتکە بڵند.
(أشَمَّ): سەربەرزانە ڕۆیشت.
("عَرَضْتُ عَلَيهِ كذا فَإذا هُوَ مُشِمٌّ لا يريدُهُ"): ئەوەم خستە بەردەستی کەچی لووتبەرزانە بێزی ئەهات و نەیویست.

(الشَمَم): بەرزیی و ڕاستیی بۆڕیی لووت و ڕێك و جوانیی لووت.
(شَمَّامَةُ القَنديل): شوێنی تێهەڵکێشانی پلیتەی چراکە.
(الشَميم): بڵند/ بەرز.
(الأشَمّ (م) شَمَّاء (ج) شُمّ): ١-(سەردارێکی/ گەورەیەکی) سەربەرز ٢-جوامێرو بەخشندە /بەدەست و دڵ ٣-خاوەن سەربەرزیی/ خۆبەرز/ ڕاگر.
٣-(أشَمَّ- القارئُ الحَرفَ): خوێنەرەکە سەروبۆری وشەکەی بەلێو بێدەنگ دەربڕی.
(الإشمام- عند القُرّاء أو النحاة): لای خوێنەران یان زمانەوانەکان ئاماژەی سەروبۆری وشە بەلێو بکرێت بە بێدەنگ پاش بێدەنگکردنی لە نیشانەی بۆرداریدا.
٤-(أشَم- عَنِ الأمر): وازی لە کارەکە هێنا.
٥-(الشَمَّام) (ن): کاڵەکی زەرد یان شەمامە.
شمب: (الشَمبانيا): شەمپانیا. مەیێکی زۆر چاکی فەرەنسییە بە ناوی ئەو شارەوە ناونراوە کە لێی دروستکراوە.
شمت: ١-(شَمِتَ- بِفُلان شَماتاً وشَماتَةً): بە لێقەومان وەیی فیسار کەس خۆشبوو.
شامِت (ج) شُمَّات: بە لێقەومانی خەڵك خۆشبوو.
(مَشْمُوت بِهِ): کەسێکە بە لێقەومانەکەی خۆشبووبن.

(شَمَتَ- العاطِسَ وشَـمَّتَ- عليه): نزاى بۆ پژميوەكە كرد، وتى: خێرت توشبێت يان خودا لێت خۆشبێت يان كەس پێتخۆشنەبێت.

(شَمَتَ- هُ): نائومێديكرد.

(أَشْـمَتَ- هُ اللهُ بِعَـدُوِّهِ): خـودا كارێكيكرد كـە بە دوژمنەكەى خۆشـبێتو دوژمنەكەى ژێرخستو گرفتاريكرد.

(تَشَـمَّتَ- القَومُ): خوێشكەل بە نائومێديىو بێدەسكەوت گەرانەوە.

(اَلشـامِت (ج) شُـمّات (فا) الشـامِتَةُ (ج) شَـوامِت): بەزەبوونيـىو داماويـى خەڵـك خۆشبوو.

("بـاتَ طَـوعَ الشَّـوامِت"): ئـەو شـەوە مايـەوە گوزەرانخراپ بە پێـى دڵى ئەوانەى پێيخۆشبوون/ ناحەزيبوو.

(اَلشُمات والشَماتى): بێهيواكان/ نائومێدەكان (ئەم وشەيە تاكى نييە).

(رَجَعَ القَوْمُ شِماتاً أَو شماتَى): بە نائومێديى گەرانەوە.

٢-(شَمَّتَ بَينَهُما): كۆيكردنەوە/ پەكيخستن.

٣-(الشامِتَةُ): پێيەكى ولاخ.

شـمج: ١-(شَمَجَ- الثوبَ. شَـمْجاً): جلەكەى شاش دروو.

(-هُ عَن كَذا): لەوە لايدا.

٢-(شَمَجَ-الشيءَ. شَـمْجاً): شتەكەى تێكەڵى شتيتر كرد.

٣-(شَـمَجَ- فُلاناً. شَـمْجاً): پەلەى لە فيسار كرد.

(ناقَةٌ شَمجى): مێحوشترێكى خێرا/ چابوك.

٤-(اَلشَماج): بەرماوەى ترێى خوراو.

٥-(شَـمْجَرَ- الرَجُـلُ): پياوەكـە وەك زيرەكردوويەك تێيتەقاند/ رايكرد.

شـمح: (اَلشَمْحَط والشِـمْحاط والشُمْحُوط) درێژداهۆڵ/ زۆر درێژ.

شمخ: ١-(شَـمَخَ-الجَبَلُ شَـمْخاً وشُمُوخاً): چياكە قووچبوو.

(شامِخ (ج) شُـمَّخ (م) شامِخَة (ج) شَوامِخ وشامِخات): شاخى قوچ/ بڵند.

(شامَخَ وشَمَّخَ- أَنْفَهُ وبِأَنفِهِ): سەربەرزانە يان بە فيزەوە لووتى بەرزكردەوەو فيزينواند.

(شَمّاخ): لووتبەرز/ بە دەعيەو فيز.

(تَشَـمَّخَ- بِأَنْفِـهِ): لووتبـەرزى نوانـد/ فيزيكرد.

(تَشامَخَ): ١-بڵندبووەوە ٢-فيزينواند.

(اَلشامِخ) (فا): بالا/ بەرز.

(نَسَبٌ شامِخ): رەسەنێكى بالاى پر شانازيى/ وەجاخزادە/ خانەدان.

(رَجُلٌ شامِخ): پياوێك بە خۆى زۆر بنازێت/ پياوێكى بەدەعيەو فيز.

(اَلشَمّاخ): زۆر بە دەعيەو فيز.

(جَبَلٌ شَـمّاخ): شـاخێكى زۆر بلند/ بەرز/ قووچ.

٢-(اَلشِمْخ): ١-(لقى/ جلّى/ پەلى) درەخت ٢-درەختێكى بچووك(عامية).

(مَفـازَةٌ شَـموُخٌ شَـمَخٌ): بیابانێكى دوورو درێژ.

٣-(شَمْخَرَ. شَمْخَرَةً): لووتبەرزیكرد.

(إِشْمَخَرَّ- الشيءُ. إِشْـمِخْراراً): شتەكە درێژ بوو.

(-الجَبَلُ): (كێوەكە/ شاخەكە) بەرزبوو.

(اَلشُـمَّخْر والشِـمَّخْر): ١-پیـاوى بە دەعیەو فیز/ ترزل/ فیزدار ٢-بەرز روان ٣-حوشـترو زەلامى قەبەو كەتە.

شمذ: (اَلشَمَّذَر والشِـمَّذَر والشِمذار): خێرا رۆیشتن.

(اَلشِمْذارَة والشَميذَر): مێرمندالّى سووكەڵەى چابوك.

شـمر: ١-(شَمَرَ. شَمْراً): بە پەلە رۆیشت یان بە خۆبادانەوە رۆیشت.

(شَمَّرَ. تَشْميراً): خێرا رۆیشت

(-هُ): خێراى لێكرد/ گورجیكرد.

(-السَفينَةَ أَو الصَقْرَ): پاپۆرەكە یان بازەكەى نارد/ رەوانەكرد.

(-تِ الحَربُ وشَـمَّرَ-ت عَن سـاقَيها): شەڕ (تیژ بوو/ ئاگریسەند).

(-لِلأَمرِ): بۆ كارەكە بازووى لێهەڵماڵى و خۆى بۆ ئامادەكرد/ بە تەنگیەوە هات.

(-في الأَمـرِ): بـەرەو پـیرى كارەكـە چـوو چوستیكرد.

(-الى المَكانِ): رووەو شوێنەكە رۆیشت.

(أَشْمَرَ- هُ): پەلەى پێكرد.

(تَشَـمَّرَ): بـە پەلـە یـان بـە خۆبادانەوە رۆیشت.

(-لِلأَمرِ): كارەكەى ویسـتو خۆى بۆ ئامادە كرد.

(إِنْشَمَرَ): چابوكانە یان بە خۆبادان رۆیشت.

(-لِلأَمرِ): ویسـتى كارەكە بـكاتو قۆڵى بۆ هەڵماڵى.

(اَلشِمْر): ١-هەمتەر لەسەر كارو خاوەنئەزموون ٢-بەسـەرنجو وریـاو چاوكراوە لـە هەموو شتێكدا.

(شَرٌّ شِمْرٌ): خراپەكارییەكى سەخت.

(اَلشِمِّير والشِمِّريّ والشَـمَّريّ والشِمَّريّ): ١-كۆششـكار/ هەمتەر/ چاك تێهەڵچوو ٢-لەسەر كار هەمتەرو ئەزمووندار.

(-مِن الإِبِلِ): حوشترى چابوك/ ئازا/ خێرا.

(اَلمُشَمِّر) (فا): ١-چاك تێهەڵچوو/ كۆششكار ٢-لەسەر كار رۆیشتووى ئەزمووندار.

٢-(شَـمَرَ- النَخـلَ. شَـمْراً): خورماكـەى (لێكردەوە/ چنى).

(شَمَّرَ- الشَيءَ تَشـميراً): شتەكەى هێنایەوە یەكو گردیكردەوە/ كورتیكردەوە.

(-الثَوبَ عَن سـاقَيهِ): كراسەكەى هەڵماڵى و قاچى دەرخست.

(أَشْمَرَ- هُ بِالسَّيفِ): به شمشێر پێچاپەوەو لوولیدا.
(ناقَةٌ أو شاةٌ شامِرٌ وشامِرَةٌ (ج) شَوامِر): مێحوشترێك یان مەڕێك گوانی هەڵقرچابێت و بە سکیەوە نووسابێت.
(لِثَّةٌ شامِرَةٌ): پووکێك بە بنیدانەوە نووسابێت.
٣-(شَمَرَ- ت نَفسُهُ مِنَ الشيء. شَمراً) (عامية سريانية): بێزی لە شتەکە هاتەوەو رقی لێبووەوە.
٤-(اَلشِمْر): بەخشندە/ دڵفراوان.
(اَلشُمْرَةُ والشَمار) (ن): رازیانە. بۆنێکی تیژی خۆشی لێدێت. گەڵاکەی باریك و وردە قەدەکەی لوول و رووتە بە درێژایی وڵاتانی دەریای ناوەراستدا بڵاوە تۆوەکەی کەڵکی پزیشکیی هەیە. لە ئیتالیادا جۆرێك هەیە وەك ئەوەو دەروێنرێت ناوی (شَمّار السُكَّري أو شَمّار فلورَنسا): شەکرە رازیانەیە.
(اَلشَمُّور): ئەڵماس.
٥-(شَمْرَجَ- الثَوبَ): درووني بەرگەکەی هەڵەمەکردو خراپ درووی و شاشدرووی.
(اَلشُمْرُج): بەرگی تەنکچنراو.
(ثوبٌ مُشَمْرَج): تەنکچنراو.
٦-(شَمْرَجَ- فِي الكَلام): قسەکەی تێکەڵ و پێکەڵکرد.
(اَلشِمراج (ج) شَماريج): ناخاوتنی هەڵەت و پەڵەت و پڕ لە درۆو فیشاڵ.
(اَلشَماريج): درۆو دەلەسەو فشە.
٧-(شَمْرَخَ العِذقَ): پەلە سەرووەکانی هەڵپاچی یان ئەو پەلانەی هەڵپاچی کە هێشوە خورما یان ترێی پێوەبوو.
(اَلشِمْراخ (ج) شَماريخ): ١-پەلێك هێشووە خورما یان ترێی پێوەبێت ٢-پۆپەی شاخ ٣-هەورە بەرزەکان.
(اَلشُمْرُوخ (ج) شَماريخ): ١-چڵێك کە خورما یان ترێی پێوەبێت ٢-چڵێکی باریك کەلە پووپەی چڵێکی ئەستوور بووبێتەوە.
٨-(اَلشُمارِق والشَماريق والمُشَمْرَق- مِنَ الثِياب): بەرگی (کورتکراوە/ کورت).
شمز: (شَمَزَ- ت نَفْسُهُ مِنهُ. شَمْزاً): بێزی لێکردەوە چونکە قێزەون بوو.
(تَشَمَّزَ- الوَجهُ): ڕووەکە گرژ بوو/ مۆنبوو.
(إِشْمَأَزَّ. إِشْمِئزازاً): قێزیهاتەوە/ بێزیکردەوە.
(اَلإِشْمِئزاز): قێزهاتنەوە/ بێزلێکردنەوە/ دڵ لێ تێکەڵهاتن.
(شُمْأَزِيزَة): ١-تۆقین ٢-موچڕکی ڕق و بێز پێداهاتن.
(-الشيءَ): شتەکەی لە بەرچاو کەوت ڕقی لێبووەوە.
(إِشْمَأَزَّ- مِنهُ): دڵی لێکیرا (بێزی/ قێزی) لێهاتەوەو ڕقی لێبووەوە.

شــمس: ١-(شَــمَسَ. شُمُوســاً وشِماســاً):
سەرپێچیکرد/ یاخیبوو سەربەرزانە ملینەدا.
(-لَهُ): پشــتی تێکردو بوو بە ناحەزی نیازی
خراپی لەگەڵدا هەبوو.
(-الفَــرَسُ): چارەوێکــە سەرکێشــییکرد/
چموشییکرد.
(شَــموس (ج) شُــمْس وشُــمُس وشــامِس
(ج) شَــوامِس): ســـەرکێش/ چارەوێی تۆر/
ملنەدەر/ چموش.
("شَــمَسَ. فُلاناً عِندَ الناسِ") (عامية): لای
خەڵك گومانبارِیکرد.
(مَشمُوس): گومانبارکراو.
(شَــمِسَ- لــي شَمَســاً): نەیارییەکــە/
دوژمنایەتیەکــەی بەرامبــەرم دەربــڕی‌و
نەیتوانی بیشارێتەوە.
(شَمَّسَ- هُ): هەراسانیکردو تەرەیکرد.
(شــامَسَ- هُ): دوژمنایەتــی لەگەڵــدا کردو
بەربەرەکانێیکرد/ لەگەڵیدا سەرسەختبوو.
(تَشَمَّسَ- عَلَينا): چرووکیی بەرامبەرمانکرد.
(اَلشَمُوس): مەی (چونکە خاوەنەکەی تووشی
کەللەرەقیی‌ویاخێتیدەکات سەرکەشیدەکات).
(اَلشَــمُوس (ج) شُمْس وشُــمُس): کەسێکی
دڕی رقئەســتوور لە دوژمنکاریداو کەللەرەق
بەرامبەر ناحەزەکەی.
(اَلشامِس- مِنَ الخَيل (ج) شوامِس): ئەسپی
تــۆرو ســەرکەش کــە ناهێڵێت ســواریببن‌و
سرەوتی نابێت.
(-مِنَ الرجالِ): پیاوی ناڵەبارو دەروونناڵۆز/
کەللەرەق/ سەرسەخت.
(اَلمُتَشَمِّس) (فا): ١-بەهێزی بە بڕشت‌و توند
٢-چرووك.
٢-(شَــمَسَ وشَمِسَ وأَشْــمَسَ- اليَومُ. شَمْساً
وشَمَساً): ئەمڕۆ خۆرەتاو بوو/ خۆر بەدەرەوە
بوو.
(شامِس ومُشمِس): رۆژێکی خۆرەتاو.
(شَــمَّسَ- الكافِــرُ): بێبڕواکــە/ کافرەکــە
خۆرپەرست.
(-الشيءَ): شتەکەی لەبەر خۆرەکە هەڵخست.
(تَشَمَّسَ): ١-خۆی دایە بەر هەتاوەکە/ لەبەر
بەرۆچکەکە دانیشــت ٢-بەرامبــەر خۆرەکە
وەستا.
(اَلشَــمس): خۆر. شُمَيسَــة: خۆرۆچکە (ج)
شُــموس (فك): خۆر هەســارەیەکی رۆژێنە
کوورەیەکی گازییە پلەی گەرمای ســەرەوەی
بــە (٦٠٠٠) و نــاوەوەی بە چەنــد ملیۆنێك
دەخەمڵێنرێــت. تیرەکــەی (١٠٩) ئەوەندەی
تیرەی زەوییە.
("بَسَطَ الشيءَ في الشَّمسِ"): شتەکەی لەبەر
هەتاو هەڵخست.
("دَخَلَتِ الشــمسُ إلى البَيت"): تیشکی خۆر
هاتە ماڵەکەوە.
(الشــمس عند الصوفِيَّة): لای ســوفییەکان

ڕووناكییه واتا هەق سوبحانەڵڵا.
(اَلشَمس- مِنَ الأيام): ڕۆژانی سایەقە.
(اَلشَـمِس والشُّـموس- مِنَ الأيـام): ڕۆژی سایەقەو خۆرەتاو.
(اَلشـامِس (فـا) – مِـن الأيـام): ڕۆژانــی خۆرەتاو.
(اَلشَمسِـيَّة= المِظَلَّة للشَمْسِ= ظِلَّة الشَمس): چەتر كە بۆ خۆپاراستنە لە هەتاوو باران.
٣-(شَـمَّسَ- فُلانٌ): بوو بە شـەماس و كاری شەماسی كرد.
(اَلشَمَّاس (ج) شَماميسَـة): لـە قەشە بەرەو خوارترە وشـەكە سریانییەو بە واتا مجێوری كڵێسە.
(اَلشَمَّاس الإنجيلي): مجێوری ئینجیلی.
(اَلشَمَّاسِيَّة): پیشەی مجێوریی كڵێسە.
٤-(اَلشَـمْس): ١-جـۆرە شـانەیەكە ٢-جۆرە ملوانكەیەكە.
(اَلشَمْسِيَّة) (مو): كلاو ڕۆژنە كونێكە بە ڕووی عودەكەوەیە لكی لێبۆتەوەو بە توولە دار یان توولە تەختە گیراوە لە كەماندا كۆمەڵە كونی خڕخڕە لە سنووقە دەنگدەرەكەیدا.
شمص: (شَمَصَ وشَـمَّص- الدوابَّ شَمصاً): چوارپێكـەی ڕاقڕانـدو زۆر بـە تونـدی دەرپەڕاند.
(-هُ بِالسَوطِ): بە قامچی لێیدا.
(-الرَجُـلَ): ئـازاری پیاوەكەیـدا بۆ ئەوەی تووڕە ببێت.
(-هُ الشيءُ): شتەكە دڵخوردیكرد.
(شمِصَ- شَمَصاً): بە پەلە دووا.
(اَشْمَصَ وانْشَمَصَ): تۆقێنرا.
(تَشَـمَّصَ): كرژبوو/ چووە یـەك/ گرمۆڵە بوو.
(اَلشِماص): فرتەكردن/ دەرپەڕین و قوتاربوون.
(اَلشُماص): پەلەكردن/ گورجبوون.
اَلشَـمُوص- مِـن الخَيـل: ئەسـپی (تـۆر/ سەركێش).
شـمط: ١-(شَمَطَ-الشيءَ شَـمْطاً): شتەكەی تێكەڵی شتێتر كرد.
(شَمِطَ واَشْـمَطَّ واشْماطَّ واشْـمَأَطَّ شَمَطاً واشْمِطاطاً واشمِيطاطاً واشْمِئطاطاً): ڕەش و سپیی مووی سەری ئاوێتە بوون.
(اَشْمَط (ج) شُمْط وشُمْطان (م) شَمْطاء (ج) شُمْط): سـەربۆز كەسێكە مووی ڕەش و سپی تێكەڵ بووە.
(شَمَّطَ- ه بِهِ): تێكەڵی ئەوەیكرد.
(اَشْمَطَ- الرَجُلُ): پیاوەكە سەری بۆز بوو.
(-هُ بِهِ): بەوەی تێكەڵكرد.
(اَلشَـمَط والشَـمْط والشِـمْط (ج) شِـماط وأَشْماط): بەهارات.
(اَلشَميط): ١-تێكەڵە ٢-سپێدەی بەیان (چونكە ڕووناكی تێكەڵی پاشماوەی شەو دەبێت).
(اَلشَـمَطاتُ في الرأسِ): تاڵە قژە سپییەكانی

سەر.

(اَلشَـمُّوط- مِنَ الخَيطـان): كلافە دەزوو/ گولۆڵە دەزوو/ بەكرە/ كنر.

٢-(شَمَطَ- الشَجَرُ. شَمطاً): گەڵای درەختەكە بڵاوبووەوە.

("شَـمَطَ- الشَـيءَ") (عامية): شتەكەی بە دزییەوە برد.

("شَمَطَ الفرسَةَ"): نەمامەكەی هەڵكێشا.

("شَمطَ أُذُنَهُ"): گوێی بادا (سريانية).

(اَلشِـمْطاط (ج) شَـماطيط): گوروویێكـی خەڵك یان هیتر.

("جاؤوا شَماطيطَ"): بڵاوبڵاوو دەستەدەستە هاتن.

(ثَوبٌ شِمطاط): بەرگێكی پارچەپارچە.

(اَلشُمْطوط والشِـمطيط): دەستە دەستەی خەڵك یان هیتر.

٣-(شَمَطَ- الإناءَ شَمْطاً): دەفرەكەی پڕكرد.

(-النَبـاتُ) (عاميـة): ڕووەكەكـە ڕاسـت بەرزبووەوە.

(اَلشَمُّوط) (عامية): گلكە گەنمەشامی.

(اَلشَمْطوط): درێژ.

شـمظ: (شَـمَظَ- هُ):١-دەسـتی نایەبـەر/ نەیهێشـت/ ڕێیلێگرت ٢-توندو نەرم دواندی ٣-هانیـدا/ تێزیكرد هانیـدا بێتوندو تیژبێ.

٤- الشَيءَ:شتەكەی تێكەڵی شتیتر كرد/ شتەكە تێكەڵدا ٥-شتەكەی تۆزە تۆزە برد.

شمع: ١-(شَـمَعَ. شَمْعاً وشُـمُوعاً ومَشمَعاً): یاریكردو گاڵتەیكرد.

(شَمُوع): گاڵتەبازو قۆشمە.

("اَشامِعٌ أنتَ أم جادٌ"): تۆ گاڵتە دەكەیت یان بە ڕاستتە.

(شَـمَّعَ- الرَجُلَ): پیاوەكەی خسـتە گاڵتەو یاری.

(اَلشِـماع والشِـماعَة): گاڵتـەو پێكەنـینو گۆرانیو ڕابواردن.

(اَلشَـمُوع- مِنَ النِسـاء): ئافرەتی قۆشـمەو گاڵتەبازو دەم بە پێكەنین.

٢-(شَمَعَ- الشَـيءُ. شُموعاً): شتەكە پەرشو بڵاوبووەوە.

(أَشْمَعَ السِراجُ): چراكە شەوقیدایەوە.

٣-(شَمَّعَ- الشيءَ): شـتەكەی لە مۆمی تواوە هەڵكێشا یان مۆمی تواوەی بەسەردا كرد.

(اَلشَـمَع والشَمْع):مێوی هەنگوین یان مۆمی چەوریی كە دەكرێت بە مۆمی دایگرساندنو بۆ ڕووناككردنەوە بەكاردێت.

(شَمَعَةٌ وشَمْعَةٌ (ج) شَمَعات): مۆمێك.

(اَلشَماع):١-مۆمفرۆش ٢-مۆمدروستكەر.

(اَلشَـمْعدان (ج) شَـماعِد وشَـمْعدانات): مۆمدان/ لالە وشەی (دان) فارسیە.

(الشمعدان= المَنارَة): مۆمدان/ چراگە/ لالە/ ژێر چرا.

(اَلمَشـمَعَة): فرۆشـگەی مۆم یان سازخانەی

مۆم/ کارخانەی مۆم.

(اَلْمُشَمَّع): مشەمای پەڕۆ پەڕۆیەکە لە مۆم هەڵکێشراوەو مشەمای باران کە لە لاستیك دروستدەکرێت و باران هەڵنامژێت/ مشەمای لاستیك کە ئاو دانادات و لەبەردەکرێت.

٤-(إِشْمَعَطَّ. إِشْمِعْطاطاً): کەللەبیبوو/ زۆر رقیهەستا.

(-القَومُ فِي الطَلَبِ): بۆ خواستەکەیان ئامادەبوون و هەڵپەیانکردو بڵاوبوونەوە.

(-تِ الإِبِلُ أَو الخَيلُ): حوشترەکان یان ئەسپەکان بڵاوبوونەوە.

٥-(شَمْعَلَ وتَشَمعَلَ-القَومُ): خوێشکەل جیابوونەوەو بڵاوبوونەوە.

(إِشْمَعَلَّ- القَومُ): جیابوونەوەو بڵاوبوونەوە.

(-الحَربُ): جەنگەکە هەڵگیرساو تەشەنەیکرد.

(-الغارَةُ): پەلامارەکە هەموو لایەکی گرتەوە.

(-الإِبِلُ): حوشترەکان بە دەماخەوە هەڵیانتیزان و بڵاوبوونەوە.

(-الرَجُلُ): لەسەر ڕۆیشتنەکەی تەکانیداو خۆی گوشی.

ملحق:

شمع: (اَلشَّمْعَة (ج) الشَمع): ستوونی پرد کە لەسەری دەوەستێت.

("شَمعَةٌ مِن رُخام"): ستوونێکی مەرمەڕ.

(اَلشَمْعَة): مۆم. یەکەی پێوانەی وزەی کارەبا.

("مِصباح مِن مِئَة شَمْعَة"): گڵۆپێك ڕووناکیی سەد مۆمە.

---

شمق: ١-(شَمِقَ. شَمَقاً): کەوتە هەوای خۆی و جرت و فرتی شێتانە.

(تَشَمَّقَ): کەوتە جرت و جۆپ و چابوکبوو.

(اَلشَماقَة): ١-جرت و جۆپ ٢-شێتیی.

(اَلشَمِق والشَمقمَق): جرت و جۆپکەر/ گورجوگۆڵ.

٢-(تَشَمَّقَ- الشيءُ): شتەکە بە قووتداچوو/ نوقومبوو.

٣-(اَلشِمِقّ والشَمَقْمَق): درێژ.

شمل: ١-(شَمَلَ- تِ الريحُ شُمُولاً): بای باکوور هەڵیکرد.

(-الشيءَ- شَملاً): شتەکەی دایە بەر بای باکوور.

(شَمِلَ- بِهِ): ئەوی بەرەو چەپبرد.

(شَمِلَ وشُمِلَ- القَومُ شَمَلاً وشَمْلاً): بەر بای باکوور کەوتن.

(شَمَّلَ- الرَجُلُ): بەرەو لای چەپ ڕۆیشت.

(أَشْمَلَ- القَومُ): خۆیان دایە بەربای باکوور.

(-تِ الريحُ): با بەرەو باکور هەڵیکرد.

(اَلشَمْل) (مص): بای باکوور.

(اَلشَمَل (مص) (ج) أَشْمال): بای باکوور.

(اَلشَمال والشَمْأَل والشَمْأَلّ والشَميل والشَمُول والشَوْمَل و الشَيمَل (ج) شَمالات): بای

باکوور.
("هَبَّتِ الشَّمالُ"): بای باکوور هەڵیکرد.
(اَلشِمال (ج) شَمالات): بای باکوور.
(اَلشِـمال (مؤنثـة) (ج) اَشْـمَل وشَـمُل وشِمال): (بەوتنیێك) (وشَمائِل) ١-لای چەپ ٢-بەدووم.
(فلانٌ عندي بِالشُّمال): فیسار لەلام چەپە/ لای من پایەی نزمە.
("هُوَ عِندي باليَمين"): ئەو لەلای من پلەی باشەو بەرزە.
(اَلشِمال): بەدووم/ شووم.
(اَلشِـمال) (فـك): خاڵــی یەكتربڕی ئاسـۆ لەگەڵ هێڵی ناوەڕاستی ڕۆژ لەلای جەمسەری ئاسـمانیی باکوور کە بەرامبەر بە باشـووری سەر زەوییە.
(طَيرُ شـمالٍ): هەموو باڵندەیەك لای خەڵك بەدوومبێت.
(اَلشِمال): چەپ.
(اَلمَشْـمول) (مفع): گرتوویەتیــەوە (ئەوەی بای باکوور گرتبێتیەوە).
(لَيلَةٌ مَشمولَة): شەوێکی سارد.
٢-(شَـمَلَ- الشـاةَ. شَـمْلاً): توورەکـەی/ چارۆکەی بە گوانی مەڕەکەوە پێچاو بەست.
(-الأمرُ القَومَ شَمْلاً وشَمَلاً وشُمُولاً): کارەکە خوێشگەلی هەموو گرتەوە.
("شَـمَلَ وشَـمِلَ القَومُ خَيراً أو شَرّاً): فەرو چاکە یان بەدیی‌و خراپە هەموو خوێشگەلی گرتەوە.
(شَـمِلَ- ـَ. شَـمْلاً وشُـمُولاً): بە چارشـێو داپۆشی.
(شَـمَّلَ- ـُ. تَشـميلاً): لـە چارشـێو یـان چارۆکەوەی ئاڵاندو پێچایەوە.
(اَشْـمَلَ- الشاةَ): چارۆکەی گوانی بۆ مەڕەکە کردو تێوەی پێچا.
(-القَومَ خَيراً أو شرّاً): خێرو فەڕ یان بەدیی‌و خراپە خوێشگەلی گرتەوە.
(-الرَجُلُ): پیاوەکە خەنجەردار یان قەمەدار بوو.
(-ـُه): عەبایدایە یان سەربەرگیدایە.
(تَشَمَّلَ- بِالشَّملَةِ تَشَـمُّلاً): خۆی لە عەباوە پێچایەوە.
(إشْتَمَلَ بِالثَّوبِ): خۆی لەبەرگەوە پێچایەوەو خۆی پێ داپۆشی.
(-الأَمرُ عَلَيهِ): کارەکە ئەویشی گرتەوە.
(-على فُلان): خۆی کرد بە سوپەری فیسارو پاراستی.
(اَلشَـمْل) (ضـد): ١-(کۆی/ گـردی) هەموو شتێك.
("فَرَّقَ اللهُ شَـمْلَهُم"): خودا کـۆی تێکدان‌و پـەرش‌و بڵاویکردنـەوە ٢-بـڵاوی هەمـوو شتێك.
("جَمَــعَ اللهُ شَـمْلَهُم"): خـودا کاری بڵاوی

یەکخستەوەو یەکی پێگرتنەوە.

(اَلشَمَل (ج) أشمال): کۆش و باوەش.

(اَلشَمِل): کەسێکە کە خۆی لە عەباوە پێچابێتەوە.

(اَلشِمال): ١-توورەکەیەکە لە گوانی مەڕەوە دەپێچرێت ٢-نیشانەیەکە بە گوانی مەڕەوەیە ٣-سواڵە/ چەپکە گەنم یا جۆ کە دەیدروونەوە.

(شُمیلَة) (عامیة): چەپکۆڵەیەک.

(اَلشَمْلَةُ (ج) شَمَلات): بەرگێکی فراوانە کە لە خۆوە دەپێچرێت.

(أُمّ شَملَة): ١-دنیا/ جیهان ٢-مەی ٣-خۆر.

(اَلشِّملَة): شێوەی خۆ لەبەرکردن و خۆپێچانەوە.

("هُوَ حَسَنُ الشِملَة"): ئەو چاک پۆشتەو پەرداخە.

(اَلشَمْألَةُ (ج) شَمائِل): کۆلێتی ڕاوکەر (چونکە هەرچی بچێتە ناوی نابینرێت).

(اَلشَمُول): مەی بە تایبەتی ساردەکەی چونکە دەست بەسەر هۆشی مەیخۆرەکەدا دەگرێت و دەیبات.

(اَلمِشمَل): خەنجەر یان قەمە.

(اَلمِشمَل والمِشمَلَة والمِشمال): ١-پۆشاکێکی فراوانە لە خۆوە دەپێچرێت وەک عەباو جبەو لەو بابەتانە ٢-لێفە.

(اَلمَشمولَة): مەی وتوویانە ساردەکەی.

٢-(شَمَلَ- النَخلَةَ. شَمْلاً): فەریکە خورمای دارەکەی چنی.

(أشْمَلَ- النَخلَةَ): فەریکە خورماکەی چنی.

(اَلشَمْل والشِمل): هێشووی خورما. بە تایبەتی دەڵێن هێشوویەک خورمای کەم پێوەبێت.

(اَلشَمَل (ج) أشمال): کەمەبارانێک/ ڕشێنەباران یان کەمە فەریکە خورمایەک یان خەڵکێکی کەم و هیتری کەم.

("أصابَنا شَمَلٌ مِنَ المَطَرِ"): بەر ڕشێنە بارانێک کەوتین.

("ماعلى النَخلَةِ إلا شَمَلٌ"): کەمەکە خورمایەک بە دارەکەوە ماوە.

(اَلشِمْلُ): هێشووی خورما کە دەنکی کەمی پێوەبێت.

٤-(شَمِّلَ- الرَجُلُ): کابرا پەلەیکرد.

(إشْتَمَلَ): پەلەیکرد.

(-فِي الحاجَةِ): بازووی جێبەجێکردنی پێداویستیەکەی لێهەڵکرد چابووکانە بۆ ئەوە چوو/ پەلەی لە پێویستییەکە کرد.

(إنْشَمَلَ): خێرایکرد.

("إنْشَمَلَ فِي حاجَتِهِ"): بۆ پێداویستیەکەی و ئامانجەکەی خێرایکرد.

(ناقَةٌ شِمّال): مێحوشترێکی خێرا.

(ناقَةٌ شِمِلَّةٌ): خێرا.

٥-(اَلشِمال (ج) شَمائِل): سروشت.

(لَیس مِن شِمالي أن أعْمَلَ بِشِمالي): سروشتی

من ئەوە نییە بە دەستی چەپ کاربکەم/ من چەپلەر نیم.
(اَلشِمیلَة (ج) شَمائِل): سروشت.
(اَلشمُول): ١-بەرِەوشت/ رِەوشتجوان.
(مَشمولَة): خراپ.
("أخلاقٌ مَشمُولَة): رِەوشتی (ناپەسند/ ناشیرین).
٦-(شَمْلَلَ- الرَجُلُ): پەلەیکرد.
(جَمَلٌ أو ناقَةٌ شِمْلال وشِمليل): حوشترێك یان مێحوشترێکی چابوك/ خێرا.
٧-(شَمْلَلَ- النَخلَةَ): چی بەر بە دار خورماکەوە بوو چنی.
(اَلشُمْلُول (ج) شَماليل): کەمە فەریکە خورمایەك یان خەڵکێکی کەم یان رِشێنە بارانێك/ بارانێکی کەم تۆزە بارانێك.
("ماعلی النَخْلَة إلاّ شَماليلَ"): کەمە خورمایەك بە دار خورماکەوە ماوە.
(اَلشَماليل): تەرزی پەلو پۆی درەخت.
("ذَهَبوا شَماليلَ): بە جیاو بلاّو رِۆیشتن.
(ثَوبٌ شَماليلُ): بەرگێکی دادرِ دادرِ.
٨-(اَلشِملال): چەپ/ چەپەکی.
٩-(اِمْرأةٌ شَمْلَق): ئافرەتێکی بەدرِەفتار/ بەرەلاّ/ بەدرِەوشت.
شمن: (اَلشَمَنْدَر والشَوَنْدَر): چەوەندەر (ن) رِووەکێکە دەچێنرێت لە وڵاتانی دەریای ناوەرِاستو ئۆقیانووسی ئەتڵەسی دەروێنرێت لە باکوری ئەوروپا زۆر دەروێنرێت شەکرەکەی بەربەرەکانیی قامیشی شەکر دەکات لە بازاری گێتیدا. جۆری هەیە کە وەك ئالیك بە ئاژەڵ دەدرێت جۆرە سوورەکەیشی مرۆڤ دەیخوات.
شمە: (شَمْهَدَ- السِكّينَ): چەقۆکەی تیژکرد.
(-الحَديدَ): ئاسنەکەی تەنککرد.
(اَلشَمْهَد): شتی لە ئاسن دروستکراو.
شَما: (شَما- الرَّجُلُ شُمَوّاً): پایەی بەرزبووەوەو بالأیکرد.
(اَلشَما= الشَمْع): مێوی هەنگوین.
شن: ١-(شَنَّ-الماءَ على الشَّراب. شَنّاً)ئاوی بەسەر هەموو لایەکی شەربەتەکەدا کرد.
(شَنَّ وأَشَنَّ- الغارَةَ عَلَيهِم): لە هەموو لایەکەوە پەلاماریدانو هێرشی کردنە سەر.
(اَلشَنين): ١-دڵۆپەکردنی ئاو/ رِۆیشتنی ئاو بە دڵۆپە دڵۆپ ٢-هەموو شیرێك کە ئاوی تێبکرێت ٣-ماستاو.
(اَلشُنان): ١-ئاوی سارد ٢-هەور ئاو بپرژێنێت.
(ماءٌ شُنان): ئاوی پرژاو.
(اَلشُنانَة): تکەی ئاوی کونەە یان سەر درەخت.
٢-(شَنَّ وشَنِنَ وأَشَنَّ- تِ القُربَةُ شَنّاً): مەشکەکە کۆنو دراو بوو رِەقهەڵاتو گرژبوو.
(تَشَنَّ وتَشانَّ- الجِلدُ): پێستەکە وشکبووەوە/

چووەیەك/ کرژ بوو.
(-جِلْدُ الإنسانِ): پێستی مرۆڤەکە لەبەر پیریی سیس و چرچبوو.
(تَشَنَّ وتَشانَّ واشْتَنَّ- السقاءُ): کوندەکە کونبوو.
(اَلشَنّ (مص) (ج) شِنان وأشنان والشَنَّة): کوندەی بچووکی کۆن و دڕاو.
(قَوسٌ شَنَّة): کەوانێکی کۆن.
(اَلشَنُون) (ضد): ١-لاواز/ لەر ٢-قەڵەو ٣-برسی.
٣-(تَشانَّ-الشَيئان): دووشتەکەبەیەکدا چوون و یەکتریان خواردەوە.
٤-(اَلأُشنان): ڕووەکێکە ترش یان تاڵ دەستی پێدەشۆرێت.
٥-(اَلشَنْشَنَةُ): خشەخشی جلی تازە یان کاغەز.
(اَلشِنشِنَةُ (ج) شَناشِن): ١-ڕەوشت و سروشت ٢-نەریت ٣-پلەگۆشت/ پارچە گۆشت.
شنأ: ١-(شَنَأَ وشَنِئَ الرَجُلَ. شَنْأً وشِنْأً وشُنْأً وشَنْأَةً وشَنَآنَا وشَنْآنَا ومَشْنَأً ومَشْنَأَةً ومَشْنُؤَةً): ڕقی لە کابرا هەڵگرت و دوژمنایەتیەکی سەختی خراپکارانەی بەرامبەر کرد.
(شانِئٌ (ج) شُنَّاء (م) شانِئَة (ج) شَوانِئ): دوژمنێکی قینەکێشی سەرسەختی بەدڕەفتار.
(مَشْنُوءٌ): کەسێکە دوژمنایەتیەکی سەرسەخت و ڕق لێبوونی بەدڕەوشتانەی لەگەڵدا بکرێت.
(شَنِئ): بێزاروو چارەرەش گەرچی جوانیشبێت.
(تَشانَأَ- القَومُ): ڕقیان لە یەکبوو و ناحەزی یەکبوون و بەدڕەفتار بوون لەگەڵ یەکتری.
(اَلشَناءَة): دوژمنایەتیی و کینەکێشان و بەدڕەفتاریی.
(الشَّوانِئ): کۆی وشەی (الشانِئة).
(شَوانِئُ المال): ماڵێك و پارەیەك کە لە دانیدا درێخی نەکرێت وەکو لەبەرچاو ڕەشبێت و ببەخشرێت و لە کۆڵ خۆبکرێتەوە.
(اَلشَنْآن (م) شَنْآنَة وشَنْأى): ڕقن/ کینەکێش/ ڕقنەستوور/ ڕقاوی.
(رَجُلٌ شَنائِيَّة): پیاوێکی (کینەکێش/ ڕقنە) ڕقاوی.
(اَلِمشناء): ١-کەسێکە بێزراو/ خەڵك خۆشی نەوێت/ ڕەزا تاڵ ٢-کەسێکە بە کردەوەو ڕەفتارەکانی خەڵك ڕقی لێهەڵبگرێت.
(اَلمَشَنَأ): ١-بێرەزا/ دزێو/ ناشیرین (بۆ نێرو مێ و تاك و کۆ وا دەوترێت) ٢-ئەو کەسەی ڕقی لە خەڵك دەبێتەوە.
٢-(شَنِئَ- الشيءَ. شَنْأَةً): شتەکەی دەرکرد/ دەرپەڕاند.
(-حَقَّهُ وبِحَقِّهِ): دانی بە مافەکەیدا ناو دایەوە.

شــنب: ١-(شَــنِبَ- اليَــومُ شَــنَباً): ڕۆژەکە ساردبوو.
(يومٌ شانِب وشَنِب): ڕۆژێکی سارد.
(الشُنبَة): ساردبوون.
(شَــنِبَ- الرَجُلُ): دانەکانی ســپیو ســفتو جوانبوو.
(أَشْنَب وشــانِب وشَنَيب ومِشنَب): کەسێکی دان سپیو سفتو جوان.
(المَشانِب): دەمە بۆنخۆشەکان.
٢-(شَــنْبَثَ- الهَوی قَلْبَهُ): ئەڤین/ دڵداریو حەز لە دڵیەوە ئالاَ.
(الشَنْبَث والشَنابِث) (ح): ١-شێر ٢-ئەستوور یان سەختو گران.
شــنت: ١-(الشَــنَتَةُ) (عامية): جانتا، کە لە پێستەو کاغەزو شتیتری تێدەخەن.
٢-(شَنْتَرَ- ثَوبَهُ): بەرگەکەی دڕاند.
(الشُنْتُرَةُ (ج) شَناتِر): ١-پەنجە ٢-نێوان دوو پەنجە.
("لأُضَمَّنَّكَ ضَمَّ الشَناتِر")وەك چۆن پەنجەکان دەنوشتێنمەوە ئاوا دەتنوشتێنمەوە.
شنج: (شَنِجَ وأَشْنَجَ وتَشَنَّجَ وانشَنَجَ- الجِلدُ- شَنَجاً): پێستەکە لەسەرماندا یان لە گەرماندا کرژبوو/ چووەیەك هەڵقرچا.
(جِلدٌ شَنِج): پێستێکی کرژبوو و هەڵقرچاو.
(الرَجُلُ شَــنِجٌ وأَشــنَجُ): پیاوی پێست کرژ بوو.

(شَنَّجَ- هُ): کرژیکرد.
(الشَنَج) (ح): حوشتر.
(التَشَــنُّج) (طب): کرژبوونێك کە تووشــی دەمــار بێــت نەهێڵێــت ئەندامــەکان ڕەوان بجووڵێن.
(تَشَنُّج العَضلات): ماسولکە کرژو ڕەقبوون/ ماسولکە بەگیروەستان.
شنح: (شَنَّحَ- عَلَيهِ): حەشری پێکرد/ خراپی دەرباره کرد/ ڕسوایکردو جنێوی زۆری پێدا.
(الشَناح والشَناحي والشَــناحِيّ والشَناحِيَّة (م) شَناحِيَةُ لاغير): حوشتری لەشدرێژ.
شــنخ: ١-(شَــنَّخَ- النَخْــلَ): دارخورماکەی چقڵبڕ کرد.
(الشِناخ): لوتی شاخ.
٢-(الشِنْخاب (ج) شَناخيب): بۆپەیشاخ.
(الشُنْخُوب): ١-قەڵاندۆشکان ٢-گرێی بڕبڕاگەی پشت.
(الشُــنْخُوب والشُــنْخُوبَة (ج) شَــناخيب): بۆپەیشاخ/ لووتکەیشاخ.
شــند: (الشُــندُخ): ١-درێــژی زۆر پتــەوی تێکسمراو ٢-شێر ٣-خواردنێك/ نانێك کەسێك دەیــکات کــە خانوویەکــی کردبێــت یان لە گوزارێك/ سەفەرێك هاتبێتەوە بۆ ڕێزلێنان.
شــنر: (شَــنَّرَ- عَلَيــهِ): ئابڕوویــبردو گاڵتەپێکرد.
(الشَنار): ١-ئەنگیی و ئابڕووچوون ٢-ناشیرینترین

(سووکیو بەدناویی/ شوورەیی).

(اَلشِّنْرِ والشَّنِيرَة):١-بەدڕەوشت ٢-خراپەکارو نەنگ/ بەدناو بێئابڕوو.

شــنز: (اَلشُّــوْنِيز والشِّــيْنِيز (ن) = الحَبَّة السَوداء): ڕەشکە، ڕووەکێکی گیایی ساڵانەیە دیمەنی ڕێکوپێکە جوانە. هەیەتی بۆ تۆوەکەی دەچێنرێــت یــان بــۆ گوڵەکەی هەمیشــیەتی دەشــتییەو لە کێڵگەکانــدا دەڕوێت بەرەکەی ڕەشــە بهارڕێت بۆنێکی خۆشی لێدەردەچێت وەك بەهاراتیش بەکاردەهێنرێت.

شنص: (شَنَصَ وشَــنِصَ بِهِ شُنوصاً): خۆی پێدا هەڵواسیو لێینەبووە.

(فَــرَسٌ شَــناصٌ وشَــناصِيٌّ وشُــناصِيّ وشَناصِيَّة): چارەوێیەکی درێژی بەبەر.

شــنط: (اَلشَــنُط): گۆشــتێك کــە ڕاوکــەر ڕاوپەدەکاتو بۆ خۆی دەیبرژێنێت.

(اَلْمُشَنَّط): ١-گۆشتی برژاو.

(شَواءٌ مُشَنَّط): برژاوێك کە زۆر نەبرژابێت.

شنظ: (شِناظُ الجَبَلِ): سەری چیا/ شاخ.

(إمْــرَأَةٌ ذاتِ شِــناظ): ئافرەتێکی (قەڵەوی/ گۆشتنی) خرتو خۆڵ.

٢-(اَلشُــنْظُب): کەڵەگەتی شــۆخو شــەنگ/ لەشجوانو ڕێك.

٣-(شَنْظَرَ- بِهِم): جنێوی بە ناموسیاندا.

(اَلشِــنْظِير (ج) شَــناظِير والشِــنْظِيرَةُ والشُّنظُورَة):١-بەدڕەوشت/ بەدخوو ٢-تاوێرێك لە کێو بەربێتەوەو بکەوێتە خوارێ.

(شَناظِيرُ الجَبَلِ): لووتکەو ئەملاولای شاخ.

٤-(شَــنْظى- بِهِ): ئــەوەی بە گوێیــدادا کە حەزی پێنەکات.

(شُــنْظُوَةُ الجَبَلِ (ج) شَناظٍ):١-سەری شاخ/ چیا ٢-لای شاخەکە.

شــنع: (شَنَعَ- هُ. شَــنْعاً):١-بە دزێوی دانا ٢-جنێوی پێداو ئابڕوویبرد/ ڕسوایکرد.

(شَــنِعَ- بِهِ. شُنْعاً): قسەی ســووکی پێوت/ ڕسوایکرد.

(شَــنُعَ. شَناعَةً وشُــنْعاً وشَــنَعاً وشُنوعاً): ناشیرینبوو/ ڕسوابوو.

(شَنيع (ج) شُنُع وشَــنِع وأَشْنَع): ناشیرین/ نەنگ/ پیس/ ڕسوا.

(شَنَّعَ- الرَجُلَ): کابرای زۆر ڕسواو سووککرد.

(-عَلَيه الأَمرَ): کارەکەی لێناشیرینکرد.

(تَشَــنَّعَ- القَــومُ): خوێشــگەل کارەکەیــان گەندبوو بەوەی ناتەباو ڕا جیابوون.

(تَشَــنَّعَ- الرَجُــلُ): کابــرا نیــازی شــتی ناشیرینیکرد.

(-الثَوبُ): جلەکە کۆنبوو دڕا.

(إستَنشَــعَ- هُ): بە ناشــیرینی دانا، بە دزێوی هاتە بەرچاو.

(الشُــنْعَةُ والشَناعَةُ والشُــنوع): ناشیرینی/ زشتی/ پیسی.

(اَلْمُشَنَّع): ١-ناشیرین قاوو هەواڵی درۆ داخەر.

(اَلَمْشْنُوع): به ناشیرین ناوزراو.
٢-(شَنَّعَ- الرَجُلُ): خێرا تێپەڕی.
(شَنَّعَ وَاَشْنَعَ- البَعیرُ): حوشترەکە خۆی گوشی‌و تیژ ڕۆیشت.
(تَشَنَّعَ): لە ڕۆیشتندا خۆی‌و گوشی‌و چابوکانە ڕۆیشت.
(للأمرِ) خۆی بۆ کارەکە ئامادە کرد.
(-السِلاحَ): چەکی لە خۆیدا/ خۆی چەکدار کرد.
(-الغارَةَ): لە هەموو لایەکەوە پەلاماریدا.
(-الفَرَسَ): سواری ئەسپەکە بوو.
٣-(اَلشَنْعَفَةُ): درێژیی.
(اَلشَنْعُوف والشِنْعاف): ١-سەرشاخ‌و بۆپەی شاخ ٢-کێوی قووچ ٣-پیاوی درێژداهۆڵی بێکارەی شل‌و شێواو.
شنف: ١-(شَنَفَ- إلَیهِ. شَنْفاً): بە ڕقەوە تەماشایکرد یان لێی لووتەلا بوو بێزی لێکردەوە.
(شَنَّفَ- إلَیهِ): بە تیلەی چاو تەماشایکرد.
(اَلشانِف) (فا): لووتەلا.
("إنَّهُ لَشانَفٌ عَنا بِأنْفِهِ"): لێمان لوتەلایەو لووتی لێکردووینەتە ئاسمان.
٢-(شَنِفَ- فُلاناً ولِفُلانٍ شَنَفاً): حەزی لە چارەی فیسار نەکردو ڕقی لێبووەوە.
(اَلشَنِف): ڕقلێبوو/ بێزکەرەوە.
٣-(شَنِفَ- لَهُ شَنَفاً): لێیتێگەیشت‌و زانی.

(-بِهِ): پێیزانی/ هەستی پێکرد.
٤-(شَنَّفَ- الجارِیَةَ): گوارەی کردە گوێی کەنیزەکەکە/ گوارەی بۆ کرد.
(-الکَلامَ): قسەکەی ڕێکخست‌و رازاندەوە.
(اَشْنَفَ- الجارِیَةَ): گوارەی بۆ کەنیزەکەکە کرد.
(تَشَنَّفَ- تِ الجارِیَةُ): کەنیزەکەکە گوارەی پەیداکردو کردیە گوێی.
(اَلشَنْف (ج) شُنُوف وَاَشْناف): گوارە یان خشڵێکە بەسەرو گوێدا هەڵدەواسرێت.
شنق: ١-(شَنَقَ البَعیرَ شَنْقاً): حوشتر سوارەکە هەوساری حوشترەکەی توند ڕاکێشا وابوو سەری حوشترەکەی بەرزکردەوە.
(-القِرْبَةَ): دەمی مەشکەکەی هێنایەوەیەک‌و بەرزیکردەوەو بە هەردوو دەستی بەستی.
(-رَأسَ الدابَّةِ): سەری چوارپێکەی بە شوێنێکی بەرزەوە بە درەختێک یان سنگێکی بەرزەوە بەست.
(-الشيءَ): شتەکەی هەڵواسی.
(-الخَلِیَّةَ): دارێکی هەنگوینەوی خستە ناوەراستی کوورەی هەنگەکەوە.
(شَنَقَ وشَنِقَ. شَنْقاً وشَنَقاً): حەزی لێکرد/ دڵی تێچوو پێوەی بەند بوو.
(شَنَّقَ- الخَلِیَّةَ): دارێکی هەنگوینەوی کە هەنگوینەکەی لێکرابێتەوە خستیە ناوەڕاستی کوورەکەی هەنگەکەوە.

(أَشْـنَقَ- البَعيرَ والقربَةَ): حوشترسـوارەکە هەوساری حوشترەکەی توند ڕاکێشا حوشترەکە سـەری بەرزکـردەوەو دەمـی مەشـکەکەی هێنایەوەیەک و بەرزیکردەوەو بەستی.

(-البَعيرُ): حوشترەکە سەری بەرزکردەوە.

(-علـى فُلانٍ): دەمدرێژیی و دەسـتدرێژیی کردە سەر فیسار.

(-الشَّيءَ): شتەکەی هەڵواسی.

(-اليَدَ الى العُنُقِ): دەستی ئاڵاندە گەردن.

(أَلشَنْق): خنکاندن بە هەڵواسین. پەت کردنە ملـی تاوانبارو هەڵواسـینی تـا دەخنکێت و دەمرێت.

(أَلشَنَق): ١-پەت ٢-درێژیی سەر.

(أَلشِـناق (ج) شُـنُق وأَشْـنِقَة): ١-قایشـێک یـان پەتێـک دەمـی مەشـکەو کوندەکـەی پێدەبەسـترێت ٢-ژێی کەوان ٣-درێژیی سـەر ٤-هەموو پەتێک کە شـتێکی پێهەڵواسرابێت ٥-هەوسـاری حوشـتر ٦-پەتێـک دەسـت بە گەردنەوە هەڵواسێت.

(أَلقَلْبُ الشَـنِقِ (ج) أَشناق): دڵێک کە حەزی زۆر بێت بچێتە سەر هەموو شتێک.

(فَرَسٌ أَشْنَق (م) شَـنْقاء وشِنقاء): ئەسپ و ماین و حوشترێک کە سەریان درێژ بێت.

(أَلشَنيق=المَشْنوق): ١-خنکێنراو/ لەسێدارەدراو ٢-دارێک هەنگوینەکەی لێبکرێتەوەو بخرێتە ناوەڕاستی کوورەی هەنگەکەوە.

(المِشناق): ئاواتەخوازی هەموو شتێک.

(أَلمَشْنَقَة): ١-شوێنی خنکانـدن و لێهەڵواسینی تاوانباران ٢-ئامێری پێخنکاندن.

٢-(شَـنَّقَ- الشـيءَ): شـتەکەی لەتلەتکرد/ پارچەپارچەکرد.

(شَـانَقَ- ە مُشَـانَقَةً وشِـناقاً): سامانەکەی تێکەڵی هی ئەو کرد.

(أَشْنَقَ- الرَّجُلُ) (ضد): ١-خوێنباییدا ٢-خوێنبایی وەرگرت.

(-غَنَمَه إلى غَنَم زيدٍ): مەڕەکانی خۆی کردە ناو مەڕەکانی زەید.

(تَشانَقا): سـامانەکانیان ئاوێتەی هی یەکتر کرد.

(أَلشَنَق) = (الأَرش): خوێنبایی.

(أَلمُشَنَّق): پارچە پارچەکراو/ کوتکوتکراو.

٣-(أَلشَنَق): تایەکی بار یان جەواڵ/ توورەکەی گەورە.

(أَلشَنِيق): کەسێکە کە ڕەسەنی نەزانرێت یان خۆی بە نەتەوەیەکی ترەوە هەڵواسێت.

(أَلشِنيِّق): کەسێکە زۆر بە خۆیەوە بنازێت.

شنک: (أَلشَنْكَل (ج) شَـناكِل): ١-ئەڵقەرێزی پەنجەرە یان چنگاڵ کە پەنجەرەی لە دەرەوە یـان لە ناوەوە پـێ قایمدەکرێت ٢-قولاپ یان سـنگ کە بە دیواردا دادەکوترێت و جلی پێدا هەڵدەواسرێت (عامية فارسية).

شـنم: (شَـنَم- الجلْدَ شَـنْماً): پێستەکەی

ڕووشاند.
(اَلشُنُم): گوێبڕاوەکان.
(ماءٌ شَنِم): ئاوی سارد.
شنه: (شَنْهَقَ أو شَهْنَقَ- الحِمارُ): کەرەکە زەڕی. (عامیة وفصیحُها= نَهَقَ أو شَهَقَ): زەڕی.
شني: (اَلشانِيَة (ج) شَوانٍ): کۆمەڵە گەمییەکی شەڕە/ جەنگە کە بە تاکەتاکە بەدەگمەن بەکاردەهێنرێت.
شهب: (شَهِبَ وشَهُبَ شَهَباً): ڕەنگی خۆڵەمێشیبوو.
(شاهِب وأَشْهَب): ڕەنگخۆڵەمێشیی.
(شَهَبَ وشَهَّبَ- هُ. الحَرُّ): گەرما ڕەنگی ڕەشداگەڕاندو ڕەنگی گۆڕی.
(أَشْهَبَ- العامُ القَومَ): وشکەساڵو ساڵی بێبەرامەتی خوێشگەلی هەڵپرووکاندو بێچارەیکردن/ هیچی بە دەستەوە نەهێشتن.
(إِشْهَبَّ وإِشْهابَّ واشْتَهَبَ): ڕەنگی خۆڵەمێشیبوو.
(-الزَرْعُ): کشتەکە وشکو زەردبوو تۆزێك سەوزیی لەناویدا ما.
(اَلشَهْب) (مص): کێو کە بەفر بە لوتکەکەیەوە ببێت.
(اَلشَهَب والشُهْبَة): ڕەنگی سپی ڕەشتێکەڵ/ خۆڵەمێشیی.
(اَلشَهاب والشَهابَة): شیرێك کە لە سێ بەشی دوو بەشی ئاو بێت/ شیری زۆر ڕوون.
(اَلشِهاب (ج) شُهُب و شُهْبان وشِهْبان وأَشْهُب): ١-هەمموو ڕوناکیدەرێك کە بە سووتان شەوقبداتەوە ٢-هەسارە بە گشتی ٣-سەری نێزە (چونکە شەوقدەداتەوە) ٤-ئەستێرەی کشاو.
(فُلانٌ شِهابُ حَربٍ): فیسار وەك ئەستێرەی کشاوە لە شەڕداو ئاگرێکە بۆ خۆی ٥-(ا ع) مووشەك.
(اَلشُهُب): سێ شەوی مانگەشەوە شەوە ڕووناکەکانە لە شەوی سیازدەوەیە تا شەوی پازدە پێیاندەڵێن شەوانی سپی چونکە مانگ تیایاندا ڕووناکیی تەواو دەدات.
(اَلأَشْهَب) (ج): ١-شێر ٢-کاری سەختو گران.
(عامٌ أَشْهَب (ج) شُهْب): وشکەساڵو ساڵی بێبەرهەم.
(يَومٌ أَشْهَب): ڕۆژێکی تووشی بە بەفرو بای سارد.
(جَيشٌ أَشْهَب): سوپایەکی بەهێزی بێشومارو توندوتیژ.
(اَلشَهْباء): ١-مێی وشەی (اَلأَشْهَب) ٢-نازناوی شاری حەڵەبە.
(اَلأَشْهَب- مِنَ الكَتائِب): دەستەی گەورەو پرچەکی سوپا.
(سَنَةٌ شَهْباء): ساڵێکی وشکی بێباران و سەوزی یان ساڵێکە بەفری زۆر تێدا ببارێت.
(اَلأَشاهِب): بەرەی (مُنذِری لوخمی) لەبەر

جوانییان وا ناونراون.
شـهد: ١-(شَـهِدَ- المَجْلِسَ. شُـهوداً): لـه ئەنجومەنەکەدا بوو/ لەوێ ئامادە بوو.
(-الشـيءَ): ١-شـتەکەیدیو پێداروانـیو سەرنجی لێگرت.
(-الجُمُعَةَ): فریای جومعەکە کەوت.
(-اللهُ شَهادَةً): خودا پێیزانی یان وەریگرت.
(شـاهَدَ- ه مُشـاهَدَةً): ویقڵەمەیکـردو سەرنجیدایە.
(أشْهَدَ- ه): ئامادەیکرد.
(الشاهِد) (فك): ئەستێرە.
(صلاةُ الشاهِد): نوێژی ئێوارێ.
(الشـاهِدَةُ (ج) شاهِدات وشَـواهِد): زەوی/ زەمین/ بوم.
(الشَـهادَة): جیهانێـك كـه لەبەرچـاو بێت بەرامبەرەکـەی (عالَـمُ الغَیـب): جیهانـی نادیار.
(الشَهید والشِهید): ئەو کەسەی کە هیچی لێ وننابێتو بە هەموو شتێك دەزانێت.
(المَشْـهَد (ج) مَشـاهِد): ١-ئامادەگای خەڵك ٢-کۆمەڵگای خەڵك ٣-پەردەیەکی شانۆگەریی.
(المَشْـهود) (مضـع): ١-ڕۆژی هەینـی ٢-ڕۆژی زیندووبوونەوە/ ڕۆژی قیامەتو لێپرسینەوە.
٢-(شَهِدَ- علی کذا شُهوداً): شایەتیی ڕاستیی لەسەر ئەوەدا.
(شاهِدٌ (ج) شُهود وشُهَّد): شایەت/ گەواه.
(شَهِدَ- بِکَذا شَهادَةً): سوێندی بەوە خوارد.
(شَـهِدَ وشَـهُدَ- عِندَ الحاکِمِ لِفلانِ أو علی فلان شَهادَةً): لای دادوەر شایەتی بۆ فیسار دا یان شایەتی دژی فیسار دا.
(شاهِد (ج) شَهْد وشُهُود وأشْهاد): شایەت.
(أشْـهَدَ- فُلاناً علی کذا): فیسـاری بۆ ئەوە کرد بە شایەت.
(أُشْـهِدَ): شەهیدکرا بۆ ڕێی خوداو لە ڕێگەی خودادا کوژرا.
(تَشَهَّدَ): شەهیدبوونی خواست.
(-المُسْلِمُ): موسوڵمانەکە لە نوێژدا تەحیاتی خوێند کە دوو تەحیاتە.
(إسْتَشْهَدَ- هُ): داوای لێکرد شایەتی بۆ بدات.
(-بِهِ): ئەویکرد بە شایەتی.
(أُسْتُشهِدَ): شەهیدبوو.
(الشاهِد) (فا): ١-شایەت ٢-فریشتە ٣-زمان.
("مالَهُ رَواءٌ ولا شـاهِدٌ"): نە دیمەنی هەیەو نـە زمـان. ٢-الشـاهد: ئاخاوتنی کەسـێکە کە بڕوا بـە زمانە عەرەبیەکـەی بکرێت بۆ چەسپاندنی دەستورێکی ڕێزمانی عەرەبی.
(الشاهِدَةُ (ج) شاهِدات وشَواهِد): مێی وشەی (الشاهد).
(الشَّهادَة) (مص): ١-شایەتی/ هەواڵێکی بنەبڕ ٢-شـایەتیدان بۆ یەکێك یـان دژی یەکێك ٣-سـوێند ٤-شەهیدبوون لە پێناوی ڕێی خودادا ٥-بڕوانامەیەك کە پزیشـك بە یەکێکی بدات

بۆ نەخۆشی یان تەندروستی ئەو کەسە بڕوانامەیەکی ڕێکخراو کە بە شێوەیەکی تایبەتی دەکرێت لە لایەن میرییەوە یان قوتابخانەیەکەوە کە تیایدا قوتابیەکە دەرچووە سا قوتابیەکە هی سەرەتایی بێت یان ئامادەیی‌و یان هەر قۆناغێکی خوێندن بێت.

(الشَهید والشِهید): ١-دڵنیاو دەرچو لە بڕوانامەکەیدا ٢-شایەت - (ج)(شُهَداء (م) شَهیدَة): لە ڕێی خودادا کوژراو/ شەهید.

(اَلشَهادَة): لە ڕێی خودادا شەهیدبوون دەڵێن بۆیە وای پێوتراوە چونکە دەربارەی کارو ڕێی راستی خودا شایەتیداوە.

(اَلمَشهَد (ج) مَشاهِد): شوێنی شەهیدبوون.

(اَلمُشهَد): کوژراو لە پێناوی ڕێی خودادا/ شەهید.

٣-(اَلشُهْد والشَهْد (ج) شِهاد): هەنگوین بە مێومکەیەوە.

(اَلشُهْدَة والشَهْدَةُ): هەنگوینی پاڵاوتە.

اَلشاهِد- مِنَ الأُمور: کاری گورج.

شهر: ١-(شَهَرَ- هُ- بِکَذا): بەوە ناوی هێناو ناساندیو بلاویکردەوە.

(-السَیفَ): شمشێرەکەی لە کێلان هەڵکێشاو بەرزیکردەوە/ هەڵیبڕی.

(شَهَّرَ- هُ بِکَذا): بەوە ناویهێناو ناساندیو جاڕی لێدا.

(-فُلاناً): ناوی فیساری بە خراپە زڕاندو جاڕی لێداو بەدناویکرد.

(-السَّیفَ): شمشێرەکەی لە کێلان دەرهێناو هەڵیبڕی.

(اَشْهَرَ-الأَمرَ): کارەکەی دەرخستو ناودێریکرد.

(اِشْتَهَرَ- الأَمرُ): کارەکە ناویدەرکرد پێیزانرا.

(-الأَمرَ): کارەکەی بە خەڵک ناساندو ناوبانگیدایە.

(-بالفَضلِ): بە چاکەو پیاوەتی ناویدەرکردو بەناوبانگبوو.

(اَلشَهْر (مص) (ج) اَشْهُر وشُهور): ١-زانا ٢-مانگی یەکشەوە/ داسە مانگ ٣-مانگ (چونکە دەردەکەوێتو بەناوبانگە).

(اَلشُهرَة): ١-ناوزڕان/ بەخراپە ناودەرکردن ٢-کاردەرکەوتنو ڕوونبوونەوەی شت ٣-ئابڕووچوون.

(اَلشَهیر (م) شَهیرَة): ١-بەناوبانگ/ ناودەرکردوو لەناو خەڵکدا ٢-بڵندپایە/ خانەدان.

(اَلمَشهُور (م) مَشهورَة): بەناوبانگ ناودەرکردوو/ ناودێر.

٢-(شاهَرَ- هُ. شِهاراً و مُشاهَرَةً): بە مانگ بەکرێیگرت.

(اَشْهَرَ): مانگێك بە سەریدا تێپەری.

("اَشْهَرنا في هذا المَکانِ"): مانگێکمان لێرە بەسەربرد.

(-تِ المَـرأةُ):ژنه ئاوسـەکە کەوتـە مانگی خۆیەوە.

(الشَهْر (ج) أشْهُر وشُهُور):مانگێك.

(الشُـهُور الشمسـية):مانگـە خۆرییەکان/ هەتاوییەکان.

(کانون الثاني)یەکـەم مانگ ٣١ رۆژە/ چلە شۆر. دەکەوێتە زستانەوە لە (١-٢٠) بەفرانبار ٢١-٣١ رێبەنـدان

( شـباط) مانگی دووەمە مانگی ڕەشەمێ یان ٢٨ رۆژ یان ٢٩رۆژ دەبێت.

٣-(مارت/ مارس/ ئازار) خاکەلێو/ نەورۆز (سەرەتای بەهار ٣١ رۆژە).

٤-(نیسـان): گـولان/ شەسـتەباران/ هەرمێپشکوان. مانگی چوارەمە (٣٠) رۆژە.

(مایس): بەختەبـاران/ جـۆزەردان مانگی پێنجەمە ٣١ رۆژە.

(حزیران):بارانبڕان/ پووشـپەر/ خەرمانان ٣٠ رۆژە مانگی شەشەمە.

(تمـوز):میوەگەنـان مانگـی حەوتەمە ٣١ ڕۆژە.

(آب):گەلاوێژ مانگی هەشتەمە ٣١ رۆژە.

(أیلول):ڕەزبەر. مانگی نۆهەمە ٣٠ رۆژە.

(تشـرین الاول/ اکتوبـر): گەلارێـزان/ خەزەلوەر مانگی دەهەمە ٣١ رۆژە.

(تشرین الثاني)سەرماوەز مانگی یازدەهەمە ٣٠ رۆژە.

(کانـون الاول):٣١ رۆژە بەفرانبـار مانگـی دوازدەهەمی زایینە.

(الأشْـهُرُ الحُرُم عنـد العـرب أربَعَة):ئەو مانگانەی کـە تیایدا لای عەرەب شـەڕکردن قەدەغـە بـوو/ حەرامبوو چوار بـون: (ذو القعِدَ وذو الحِجَّة ومُحَرَّم ورَجَب).

شهق: (شَهَقَ وشَهِقَ- الحِمارُ. شَهيقاً وتَشْهاقاً): کەرەکە زەڕی.

(-الرَجُلُ شَهيقاً وتَشهاقاً وشُهاقاً)دڵی قوڵپی گریانیداو هەنسکی هەڵدا.

(-الجَبَلُ و غَيرُهُ شُـهوقاً):چیاکە یان شتیتر زۆر بڵندو قووچبوو.

(شاهِق):زۆر بەرزی گەردنکەش.

(شَـهِقَ- الرَجُلُ):کابرا هەناسـەی هەڵکێشا هەناسەکە دەنگی پێوە بوو وەك چۆن یەکێك بە سەرسـامییەوە هەناسـەی نا بە دڵیی بۆ شتێك هەڵکێشێت.

("شَـهِقَت عَيني عَلَيـهِ"):چاوم لەسـەری ئەبڵەقبوو.

(تَشَـهَّقَ- عَلَيهِ):چـاوی زۆر تێبڕی بۆ ئەوە چاك کاری تێبکاتو بە چاویەوە بکات.

(ذو شاهِق):زۆر توورە/ قوشقیو ئاگراوی.

(ألشَـهْقَة):١-هەنسـکهەڵدانێك ٢-زەڕینێـك ٣-هاوارێکی فریاکەوتن.

("شَـهِقَ فُـلانٌ شَـهقَةَ المَـوت"): فیسـار هەناسـەیەکی وای هەڵکێشـا وەك هـی

سەرەمەرگ.

(اَلشَهْقَةُ (عند العامة) (طب): کۆکەڕەشە.

(اَلتَشْهاق) (مص): بینگرتن.

(ضَحِكَ تِشْـهاقٌ): بینی بـە پێکەنینەکەوە گرت.

ملحق:

شهق: (اَلشُّهاق والشّـاهوق= الشَهْقَةُ= السُعالُ الدّيكي): کۆکەڕەشە.

---

شهل: (شَهِلَ واشْـهَلّ شَهْلاً واشْهِلالاً): چاوی کاڵ بوو.

(اَلشْـهَل (م) شَهْلاء (ج) شُهْل): چاوکاڵ/ چاو مەیلەو شین.

(عَيْنٌ شَهْلاء): چاوی کاڵ.

(شَـهَّلَ- ثَوْبَهُ): کراسـەکەی کورتکـرد یان کەمێك هەڵیبڕیو کورتبوو یان بەرزبووەوە.

(فشَهَّلَ): کورتبوو (عامية).

(شَـهَّلَ في عَمَلِـهِ فَتَشَـهَّلَ): بەشـی زۆری کارەکەی تەواو کرد بەوە کارەکەی هاتە کزی یان خێرایکرد (عامية).

(شـاهَلَ- هُ مُشـاهَلَةً): تەرزەشـکێنی یەکتریانکردو شەڕە جنێویانکرد.

(تَشَهَّلَ): ئاوی ڕووی تکا/ ئابڕووی تکا.

(اَلشَهَل والشُهْلَة): چاوکاڵیی.

(اَلشَهْلَة): پیر.

(اَلشَهْلاء): پێداویستی.

("قَضَيتُ مِن فلان شَهْلاني"): پێداویستییەکەم لە فیسار جێبەجێکرد.

شهم: ١-(شَهَمَ- الفَرَسَ شَـهماً وشُهُوماً): لە ئەسپەکەی خوڕیو تیژیکرد.

(-الرَجُلَ): پیاوەکەی تۆقاند.

(اَلمَشهُوم): تۆقیو.

٢-(شَـهُمَ. شَـهامَةً وشُـهومَةً): دڵوریا بوو/ مەرد بوو ٢-سـەردارێکی قسەڕۆیشتوو بوو ٣-زیرەك و شیار بوو.

(اَلشَهْم (ج) شِـهام):١-دڵوریاو زیرەك ٢-مەرد ٣-جوامێـر ٤-بەفریـا. گەورەو سـەردارێکی دەستو قسەڕۆیشتوو.

(اَلشَهْم (ج) شُهُوم): ئەسپی چابوك و تیژڕەوو قایم.

(اَلمَشهوم): دڵوریاو زیرەك.

٣-(الشيهَم (ج) شَياهِم) (ح): نێرە ژیشك.

(اَلشَيْهَمَة): پیر.

شهن: (اَلشاهِين (ج) شَواهين وشَياهين) (ح): ١-شەهێن (باڵندەیەکە وەك هەڵۆ باڵدرێژ) ٢-شایەن یان داری ترازوو (فارسية).

شها: ١-(شَها وشَـهِيَ يَشهى واشْتَهى- الشَيءَ. شَهْوَةً): دڵی زۆر چووە سەر ئەو شتەو حەزی لێکردو بۆی بە پەرۆشبوو.

(شَهُوَ الطَعامُ): خواردنەکە زۆر خۆشبوو.

(شَهَّى- الرَجُلَ): وای لە پیاوەکە کرد حەزی بجووڵێت.

(-عليه كذا): تامیتامی ئەوەی دا/ پێشنیاری

ئەومیکرد.

(هذا الشـــيءُ يُشَهِّي الطَّعامَ"): ئەم شتە چێژ بۆ خواردنەکە دەجوولێنێت.

(أشهى- هُ): حەزی جوولاندو لای خۆشکرد.

(تَشَهَّى- الشيءَ): حەزی لە شتەکە کردو دڵی چووە سەری.

(-عليه كذا): پێشـنیاری ئەو شتەی جار لە دوایجار بۆ کرد.

(اَلشَـهْوَة (مـص) (ج) شَـهَوات وشُـهىً): ١-حەزلێکردن/ کامبۆکردن/ تـام ٢-دڵچوونە سـەر خواردن/ دەروون بۆ شتێك ببزوێت کە پێیخۆشبێتو چێژی لێوەرگرێت.

(- طب): خواردن پێخۆشبوون و حەزلێکردنیو دڵبردنی.

(اَلشَهّاء): ١-مرۆڤی بە ئاڵۆش ٢-چڵێس.

(اَلشَّهِي): خواردنی خۆشو بەچێژ ٢-کەسێکە حەزی سێکسی زۆر بێت.

(اَلشَــهِيّ ماالمُشْـتَهي): چێـژدار/ خـۆش/ خوازراو/ حەزلێکراو.

("شَيءٌ شَهِيّ"): شتێکی خۆش.

(اَلشَهْوان (م) شَهْوى (ج) شَهاوى والشَهْوانِي): حەشـەری/ بە ئاڵـۆش/ خاوەن ئـارەزووی جوتبوونی زۆر/ رەگەزخواز.

(اَلشاهِيَة=اَلشَــهْوَة): ١-حەز رەگەزیی/ حەزی سێکس ٢-حەزێکی زۆری دەروون بۆ ئەو شتەی دڵ بۆیدەچێت ٣-خواردن لەلاخۆشبوون.

٢-(شاهَى- هُ): لەو چوو/ وەك ئەو بوو.

٣-(أشهى- هُ): بە چاویەوە کرد.

(شاهِي البَصَر): تیژیی چاو.

ملحق:

(شهو) (اَلشَهيَّة): دڵبردنی خواردن.

(اَلشَّهوَة لِلطَّعام): حەز لە خوارد کردن.

---

شـاب: ١-(شـابَ- الشيءَ شَـوْباً وشِـياباً): شتەکەی ئاوێتە کرد/ تێکەڵکرد.

(إنشـابَ واشْـتابَ. إنشِـياباً وإشـتياباً): تێکەڵبوو.

(اَلشَـوْب) (مـص): ئـەوەی تێکەڵـی هیتر دەکەیت.

(اَلشَوْبَة): جارێك تێکەڵکردن.

(اَلشِياب) (مص): تێکەڵکردن.

(اَلمَشوب والمَشيب): تێکەڵە.

(اَلمُشاوِب (ج) مَشَاوِب): بەرگی بوتڵ.

٢-(شابَ- الرَجُلَ. شَـوْباً وشياباً): ناپاکییو دەغەڵیی لەگەڵ پیاوەکەدا کرد/ چاوبەسـتی لێکردو لەخشتەیبرد.

(اَلشَوبَة): چاوبەسـتلێکردن/ فێڵلێکردن/ لە خشتەبردن.

(اَلشـائِبَة): مێـی وشـەی (اَلشـائِب) (ج) (اَلشَّـوائِب): ١-خەوش/ لەکـە/ کەموکوریی ٢-نەنگییو شەرمەزاریی ٣-لێقەومانی گەورەو سەخت.

٣-(شـابَ- عَنهُ وشَوَّبَ عَنهُ. شَـوْباً وشِياباً

وتَشــوِيباً): بەرگــری لێکــرد بــەڵام تەواو تێهەڵنەچوو.

٤-(شَوَّبَ- فلانٌ): گەرما بردی.

(مُشَــوَّب (م) مُشَــوَّبَة): گەرمــا بــردوو (عامية).

(اَلشَوْب): گەرما (عامية سريانية).

٥-(اَلشَوْب): ١-گونکە هەویرێك ٢-هەنگوین.

(لَيْلَةُ الشَيْباء): دواشەوی مانگ.

شوح: (شَــوَّحَ- الشيءَ): پێی لە شتەکە نەنا/ حاشای لێکرد/ دانی بە شتەکەدا نەنا.

(اَلشَوْحَة) (ح): کۆلارە.

٢-(الشَوحَطُ واحِدَتُهُ الشَوْحَطة): درەختێکی هەمیشە سەوزە جۆرە درەختێکی کاژە.

شوذ: ١-(شَوَّذَ- تِ الشَمسُ): خۆرەکە داکەوت/ بەرەو ئاوابوون ڕۆیشت.

(-السَّحابُ الشَمسَ): هەور خۆرەکەی داپۆشی/ بەری خۆرەکەیگرت.

(-هُ): (مێزەری/ سەروبەستی) نایە سەر ئەو.

(تَشَوَّذَ واشْتاذَ): مێزەری لەسەرنا.

(اَلمِشْــوَذ والمشــواذ (ج) مَشــاوِذ ومَشاوِيذ): مێزەر.

٢-(اَلأشاوذ): بەدیهاتوو.

(اَلمِشوَذ والمِشواذ (ج) مَشاوِذ ومَشاويذ):١-شا ٢-گەورە/ سەروەر.

شــار: ١-(شَــارَ- الدابَّةَ. شَــوْراً وشِــواراً): ١-وڵاخەکــەی ڕامکــرد ٢-ســواری وڵاخەکــە بــوو تا تاقیبکاتەوە ٣-ســواریبوو تا پیشــانی کڕیارەکەیبدات.

(شَــوَّرَ-الدابَّةَ): ١-وڵاخەکــەی ڕام کــرد ٢-بۆ تاقیکردنەوە سواریبوو ٣-پیشانی کڕیارەکەیدا.

(إستشار- لَبِسَ لَباساً حسناً): جلێکی جوانی لەبەر کرد.

(اَشارَة والشُورَة والشُــوَار والشِوار والشِيار): جوانیی‌و شۆخ‌و شەنگیی ٢-سەرو شێوەو ڕووی ڕێك‌و پێك ٣-پۆشــاك‌و ڕازاندنــەوەی خۆ ٤-کەلوپەلی کۆك‌و ڕێکوپێکی ناوماڵ ٥-دیمەن‌و چاو ئەنداز.

(اَلشَوار= الشُوار): هێمنی‌و خۆشیی.

(رِيحٌ شَوار): بایەکی هێمنی خۆش.

(اَلشَوْرَة= الشــارة):١-نیشانە ٢-بڕینی شانەی هەنگ‌و دەرهێنانی هەنگوینەکەی.

(اَلشَــيِّر (ج) شُورَاء): جوانییەکی بێخەوش‌و تەواو.

(اَلمَشُور) (مفع): جوانکراوو ڕازێنراوە.

(اَلمِشوار (ج) مَشاوير):١-هەواڵزانین/ زانینی شــت بەبێ بینین ٢-دیمەن بینین ٣-مەیدانی وڵاخفرۆشتن‌و پیشاندان.

٢-(شــارَ- العَسَــلَ. شَــوْراً وشِــياراً وشَيارَةً ومَشاراً ومَشارَةً): هەنگوینەکەی لە کوورەکە دەرهێناو کۆیکردەوە.

(اَلعَسَلُ المَشُور): هەنگوینی دەرهاتوو.

(أشــارَ- العَسَــلَ): هەنگوینەکــەی دەرهێناو

کۆکردەوە.
(-فُلاناً عَسَلاً): یاریدەی کابرایدا بۆ برِینی کوورەی هەنگەکەو دەرهێنانی هەنگوینەکەو کۆکردنەوەی.
(إشـتارَ العَسَلَ. إشـتیاراً): هەنگوینەکەی دەرهێناو کۆکردەوە.
(إسْتَشارَ- العَسَلَ): هەگوینەکەی کۆکردەوە.
(اَلشَـوْر) (مـص): هەنگوینـی دەرهاتوو و کۆکراوە.
(اَلشُورَة): کووره هەنگ.
(اَلمَشار): کووره هەنگ. شانەهەنگوین.
(اَلمِشْوَر (ج) مَشـاوِر): ئەوەی هەنگوینەکەی پێ دەردەهێنرێتو کۆدەکرێتەوە.
(اَلمِشوار (ج) مَشاوِیر): ئەوەی هەنگوینی پێ دەردەهێنرێتو کۆدەکرێتەوە.
(اَلمِشوار (ج) مَشاوِیر): ئەوەی هەنگوینی پێ دەردەهێنرێتو کۆدەکرێتەوە.
(اَلمِشوارة): شـوێنی هەنگوین دروستکردن لە لایەن هەنگەوە/ شانەی هەنگوین.
٣-(-شارَ-تِ الإبِلُ. شَوْراً وشِواراً): حوشترەکە بە خۆیدا هاتو قەڵەوو جوانبوو.
(إشتارَ- تِ الإبِلُ): حوشترەکە کەمێك قەڵەو بوو.
(إسْتَشـارَ- تِ الإبِلُ): حوشـترەکە بە خۆیدا هاتو جوانو قەڵەو بوو.
(اَلشِیار): قەڵەوو جوان.
("خَیلٌ شیار"): ئەسپی قەڵەوو جوان.
(اَلمِشـوار): قەڵـەوو جوانبـوون/ بەخۆیـدا هاتن.
("اَخَذَتِ الخَیلُ مِشوارها"): ئەسپەکە قەڵەوو جوانبوو/ بەخۆیدا هات.
٤-(شَوَّرَ- إلیهِ): ئاماژەی بۆ کرد.
(أشـارَ إلَیهِ وأشـارَ بیَدِهِ): ئاماژەی بۆ کردو دەستی بۆ راکێشا.
(أشارَ- بِهِ): ناساندی.
(عَلَیـهِ): ئامۆژگاریکـردو رِانومایکـرد/ فەرمانیداو رێی راستی پیشاندا.
(شاوَرَ- هُ في الأمرِ): راوێژی پێکرد.
(تَشاوَرَ واشْـتَوَرَ- القَوْمُ): تەگبیرو راوێژیان بەیەکتریکرد.
(إسْتَشارَ- الأمرُ): کارەکە روونو ئاشکرابوو.
(-هُ): راوێژی پێکرد.
(الإشارَة) (ع. ح): نیشانەو دروشم.
(شاراتُ الرَّنك): نیشانەی نگینیی زوو لەسەر قەڵغانە بچووکەکان یان لەسەر دیواری کۆشکی ماڵە گەورەکان وێنەی دەکێشرا.
(اَلشَـوْر في اصطـلاح العامـة): راوێـژ/ تەگبیرکردن.
("شارَ عَلیهِ أن یَفعَلَ کذا"): ئاماژەو تەگبیری بۆ کرد کە ئاوا بکات.
(اَلشُوری= التَّشاور): راوێژو تەگبیر.
("تَـرَكَ عُمَرُ الخلافَةَ شـوری"): حەزرەتی

عومەر جێنشینی کرد بە ڕاوێژ.
(مَجلِسُ الشـورى): ئەنجومەنــی ڕاوێــژو تەگبــیری کاروبــاری وڵات، یــان بیســتنو وەرگرتنی سکاڵای هاووڵاتیان، بە پێی نەریتو دەستووری باوو پەیرەوکراو.
(اَلشَیِّر (ج) شُوَراء المُشـاوِر): ١-ڕاوێژپێکراو تەگبیرپێکراو ٢-وەزیر.
(اَلمَشُورَةو المَشْوَرَة (ج) مَشْوَرات): ١-ڕاوێژکارییو تەگبیر ٢-ئامۆژگارییو ڕێنوێدانان.
(اَلمُشــیر) (فا) (في اصطلاح أرباب السیاسة): ڕاوێژکاری تایبەت کە لە سەروو وەزیرەوەیە.
(اَلمُشیرِیَّة): ڕاوێژکاریی تایبەتی.
(اَلمُشیرَة): پەنجەی شایەتمان.
٥-(شَوَّرَ- بِهِ): تەریقیکردەوە/ شەرمەزاریکرد.
(تَشَوَّرَ): شەرمەزار بوو/ تەریقبووەوە.
(اَلشَـوْرَة): شــەرمەزاربوون/ تەریقبوونەوە شەرمکردن.
٦-(شَــوَّرَ- النارَ وبِالنارِ): گــڕی بە ئاگرەکە سەند/ کڵپەی بە ئاگرەکە سەند.
(اَشارَ النارَ وبِالنارِ): گڕی بە ئاگرەکە سەند.
أشْــوَرَ- النــارَ وبِالنــارِ إشـواراً: ئاگرەکەی خۆشکردو کڵپەو گڕی پێسەند.
٧-(اَلشُــوار) (عند العامة): لێواری شوێنێکی بەرز کە لێوەی داپەڕیتە خوارێ وەك پشتەبان کە لێوەی بێیتە خوارێ.
(اَلشُــورَة) (عند العامة): ١-ڕیزە درەختێك/ ڕیزێــك درەخت ٢-پارچە زەوییەکی تەســکی درێژ.
(اَلمَشارَة (ج) مَشاوِر ومَشائِر): پەڵە زەوییەك کە بە کشتەکرێت.
(اَلمِشــوار (ج) مَشــاوِیر): ١-ژێکەوانی هەلاج ٢-پیاســەو گەڕانێك (عامیة) بــە پێ یان بە سواریی.
٨-(اَلشَــوْرَبَة) (ط) (فارسیة): شۆربا کە بە برنج یان نیسك یان سەوزیو گۆشت دەکرێتو لێدەنرێت یان بە ڕۆن لێدەنرێت.
ملحق:
شور: (الإستِشارَة): ڕاوێژپێکردنو ڕاخواستن بۆ هەر کارێك بێت.
(طلــبُ رَأيِ مُحــامٍ في قَضيَّــةٍ قانونیــة): وەرگرتنــی ڕای پارێزەرێك بۆ کێشــەیەك لە ڕووی یاساوەو تەگبیرو ڕاوێژپێکردنی.
(طلب رأي طبیب في حالةٍ صِحیَّة): وەرگرتنی ڕای پزیشــکێك بۆ بارێکی تەن ناتەندروستی.
(رَأيُ المُحامي أَو الطبیب في القَضیَةِ القانونیة أو الحالــةِ الصحیــة): ڕای پارێزەرەکــە یان پزیشــکەکە دەربارەی کێشە یاســاییەکە یان بارە نا تەندروستییەکە.
(الإستِشــارات في النِظــام الدیمقراطــي): ڕاوێژکــردن لە ڕژێمــی دیموکراتیدا ئەوەیە گفتوگــۆو ڕاوێــژ بکرێت لە نێوان ســەرۆکی وڵاتو نوێنەرەکانی میللەت بۆ دانانی میرێتیو

دیاریکردنی شوێنی وەزیرەکان و ناونانیان.
(المُسْتَشار): ١-ڕاوێژپێکراو ٢-پلەیەکە لە دادوەریدا.
("المُستَشار في محكمة الإستِئناف"): ڕاوێژپێکراو لە دادگای تێهەڵچوونەوەدا (المستشار) ٣-شارەزاو کارزان کە لە کاروباری هونەری یان ڕامیاریی یان بەڕێوەبردندا ڕاوێژی پێدەکەن ٤-نازناوی سەرۆکی (کاربەدەستان/ میری/ حکومەت) لە کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتوودا.

---

شوز: (شیزَ- بِهِ. شَوْزاً): بۆی گرفتارو شپرزە بوو.
(الأشْوَز): لووتبەرز/ بەدەعیەو فیز/ ترزل.
شاس: ١-(شاسَ وشَوِسَ. شَوَساً): ١-بە لووتبەرزییەوە یان ڕقەوە بە تیلە خیسەی لێکرد ٢-پێڵووی هێنایەوەو یەك و چاوی بچووککردەوەو تەماشایکرد.
(تَشاوَسَ. تَشاوُساً): ١-بە فیزەوە یان قینەوە بە تیلە خیسەی لێکرد ٢-پێڵوو چاوی بۆ تەماشاکردن هێنایەوەیەك و چاوی بچووککردەوە ٣-مەردیی و بێباکیی نواند.
(الأشْوَس): ١-جەربەزە لە جەنگدا ٢-سەربەرزو بەفیز.
(الشوْس): زۆر درێژ.
٢-(شاسَ وشَوِسَ. شَوَساً): لە (شەڕ/ جەنگ)دا بێباك و جەربەزە بوو.

(أشْوَس (م) شَوْساء (ج) شُوْس): بێباك و جەربەزە.
("رُمِيَ فُلانٌ بِخُطوب شُوْسٍ"): فیسار بەرامبەر گرفتاریی قایم و سەختبوو.
(تَشاوَسَ تَشاوُساً): بێباك و جەربەزە بوو/ جەربەزەییکرد.
شوش: (١-شَوَّشَ- الأمرَ): ١-کارەکەی (تێکدا/ ئاڵۆزکرد) ٢-کارەکەی ژاکاند/ چەواشەکرد.
(تَشَوَّش- عليهِ الأمْرُ): کارەکەی لێ چەواشە بوو/ لێشێوا.
(تشاوش- القَومُ): خوێشکەل بەیەکداچوون/ تێکەڵی یەکبوون و شپرزەبوون.
(الشَواش): ١-شڵەژان و جیایی و شپرزەیی ٢-تێکەڵوپێکەڵبوون.
(عبارَةٌ مُشَوَّشَة): دەربڕینێکی ناڕێکی ناتەواوی نارەوان/ لە واتاو داڕشتندا ناتەواو.
٢-(الشّاش): ١-شاش/ مەندیلێك و چنراوێکی تەنکی لۆکەیە ٢-سەرپێچێکی ئاوریشمین (عبرانية).
(الشَّاشَةُ البَيضاء): پەردەی سپی سینەماکە وێنەکانی لەسەر دەردەکەوێت.
(الشَّاشِيَّة): فێستی سوور کە ڕیشوویەکی بچووکی پێوەیە سەربازە مەغریبییەکان لە سەریدەکەن.
(الشاويش(ا ع) (فارسية): چاوەش.
شاص: (شاصَ. شَوصاً وشَوَصاً): هەڵچوو/

خرۆشا.
(-الجَنينُ): کۆرپەلەکە لە سکی دایکیدا کەوتە پەلەقاژێو جوولە جوول.
(-بِـهِ العِـرقُ): دەمـاری لەشـی کـرژو شپرزەبوو.
(-فُلانٌ بِفُلانٍ): فیسار بە هۆی فیسار کەسەوە تووشی خراپەو شپرزەییبوو.
(-هُ شَوْصاً): جێی پێلێژکرد.
(شَوِصَ-ت عَينُهُ. شَوَصاً): پێڵوی چاوی زۆر فری.
(أشْوَص): پێڵوی چاو فریو.
(عَينٌ شَوصاء (ج) شُـوْص): چاوێکی پێڵوو فریو.
(الشَوْصَةُ): دەمارکرژبوون‌و بەیەکداچوون.
(الشِياص): شێتگیریی/ درسروشتیی.
٢-(شـاصَ- الرَجُل. شَوصاً وشَوَصاً): ئازاری دانی یان ژانە سك گینگڵی پێدا.
(-هُ. شَوصاً): ١-بەدەست شێلای ٢-شتی.
(-فاهُ بالسِواك): بە سیواك دەمی پاككردەوە.
(شَوَّصَ وأشاصَ- الرَجُلُ. تَشْوِيصاً وإشاصَةً): سیواکی بە دانیدا هێنا.
(شَـوْصُ السِواك): بە سـیواك پاككردنەوەی دەمو دان.
(الشَـوْصَةُ) (طب): ئازاری باكردنی سك كە پیایدا دێت‌و دەچێت.
٣-(شَـوِصَ-ت عَينُـهُ شَـوَصاً): چـاوی وا دەرپـەڕی پێڵووەکانی نەدەنیشـتە سـەری‌و لێکنەدەدران.
(الشَوْصَةُ) (طب): لوویەك كە لە سووڕێنچك دەردێت.
شاط: ١-(شاطَ بِهِ الغَضَبُ. شَوْطاً): وا تووڕە بوو ئاگریگرت.
(شـاطَ وشَوْشَـطَ- الطَعـامُ. شَـوِيطاً): خواردنەکە بە بنی مەنجەڵەکە جزاو سـووتا بـە هـۆی گـڕی زۆری ئاگرەکەوە یـان زۆر مانەوەی لە مەنجەڵەکەدا.
(شائِط ومُشَوْشِـط) (عامية): بنکڕی پێدا سووتاو.
(شَوَّطَ- القِدرَ): مەنجەڵەکەی هێنایە کوڵ.
(-اللَّحمَ): گۆشتەکەی پێگەیاند.
(-الصَقيـعُ النَباتَ): سـەرماکە ڕووەکەکەی برد/ سووتاندی.
٢-(شَوَّطَ): گوزارەکەی درێژەیکێشا.
(تَشَـوَّطَ- الفَرَسَ): چارەوێکـەی وا ڕاونا تا شەکەتبوو.
(الشَوْط (ج) أشْواط): ١-قۆناغ ٢-ئامانج/ نیاز ٣-یەکسەڵەف ڕۆیشـتن‌و غاردان تا بە ئامانـج بگەیت.
("جرى الفَرَسُ شَوْطاً"): ئەسپەکە قۆناغێکی بڕی/ کایەیەك/ خولێکی بڕی.
شاظ: ١-(شَظَ- بِفُلانٍ شَوظاً): جنێوو قسەی ناشیرینی پێووت.

(تَشـاوَظَ- القَومُ): جنێوو قسەی ناشیرینیان بەیەکداو بەیەکووت.

(اَلشُواظ والشِواظ): ١-شیرەشیر ٢-شەرەجنێو.

٢-(شاظَ- بِهِ الغَضَبُ شَوْظاً): ئاگری تووڕەیی گرتی.

(اَلشُـواظ والشِـواظ): ١-گـڕی بێدووکەڵ ٢-تینی گەرمیی ئاگرو گەرمیی خۆرەتاو ٣-تینی تینوێتیی.

شوع: (شَوِعَ. يَشْـوَعَ الرأسُ. شَوَعاً): تووکی سەرەکە بژ بووەوەو بۆز بوو.

(-الفَرَسُ): لایەکی ڕووی ئەسپەکە سپیبوو.

(اَشْـوَع (م) شَـوعاء (ج) شُـوْع): چارەوێ لایەکی ڕووی سپیبێت.

(شَوَّعَ- القَومَ تَشويعاً): کۆیکردنەوە.

(اَلشُـوْع (ج) شِـياع) (ن): درەختـی بێـن، درەختێکـە گـەڵا درێـژو ئاوێتەیـە گوڵەکەی سپیو بۆنخۆشـە ڕۆنێکی تایبەتی لێدەردەهێنرێت.

شُوعَة: درەختێکی بێن.

(اَلمِشـواع): کۆڵەوژی تەنوور (لـە بنچینەدا (مِشياع) بووە.

شاف: ١-(شافَ- هُ. شَوْفاً): لووسو سافیکردو بریقەی لێهێنا.

(-الجَمَلَ بِالقَطران): قەترانی لە حوشترەکە هەڵسوو.

(شِيفَ-تِ الجارِيَةُ): کەنیزەکەکە ئارایشتکراو ڕازێنرایەوە.

(شَـوَّفَ- الجارِيَةَ): کەنیزەکـەی ڕازندەوەو جوانکرد.

(تَشَوَّفَ- تَشَـوُّفاً): ئارایشتی خۆیکردو خۆی ڕازاندەوە.

(اَلشَـوْف) (مص): ئامێرێکە زەوی کێڵراوی پێ تەخت دەکرێت.

(اَلمَشُوف) (مفع): ئارایشـتکراوو ڕازێنراوەو جوانکراو.

(-مِـنَ الجمـال): حوشـتری قەتـران تێهەڵسووراو.

٢-(شـافَ- هُ. شَـوفاً) (عامية): دی/ بینی/ تەماشایکرد.

(شَـوَّفَ- هُ الشَـيءَ): شـتەکەی پیشـاندا (عامية).

(اَشـافَ- عَلَيه. إشـافَةً): سەرپەرستیکرد/ بەسەریدا ڕوانی.

(-الشيءُ): شتەکە بەرزبووەوە.

(تَشَوَّفَ- مِن السَّطحِ. تَشَوُّفاً): لە سەربانەوە تەماشایکردو بە سەریدا ڕوانی.

(- إلى الشيءِ): لە شتەکەیڕوانی.

(-الشيءُ): شتەکە بڵند بووەوە.

(- إشـتافا إلَيهِ. إشْتِيافاً): ملی بۆ درێژکردو تەماشایکرد.

(-البَرقَ): چاوی بۆ هەورە تریشـقەکە گێڕا بزانێت لە کوێوەیەو لە کوێ باران دەبارێت.

(اَلشَــيِّفَةُ والشَــيِّفان): دەیدەوانی ســوپا کە پێیان ســپێردراوە بەســـەر دوژمندا بروانن‌و چاودێریی بکەن.

(اَلشَوّاف- مِنَ الرجال): پیاوە چاوتیژەکان.

(اَلشِیاف): دەرمانێکە بۆ چاوە.

٣-(اَشــافَ- مِنهُ إشافَةً): لێیســەڵەمییەوەو لێیترسا.

٤-(إشــتافَ واشْتَشــافَ- الجــرحُ): برینەکە رەق‌و ئەستوور بوو.

شاق: ١-(شَاقَني- الحُبُّ إلَیهِ شَوقاً وتَشْواقاً): تاســـەو حەزی لای ئەوم لێـــوڕووژا/ ئەوین/ ئاگرم بۆی تێبەربوو.

(اَنا مَشُــوقٌ): من پەرێشــان‌و تاسە کردووی ئەوم.

(هُوَ شائِق): ئەو تاسەو حەز بۆ کراوە.

(شَــوَّقَ- هُ إلَیهِ): تاســـەو حـــەزی لای ئەوی پێپەیداکردو جووڵاندی.

(اَشاقَ- هُ إشاقَةً): دی کە بە پەرۆشەو تاسەی جووڵاوە.

(تَشَوَّقَ- الشــيءَ وإلَیهِ): تاسەو بە پەرۆشیی بێئەندازەی بۆ لای شتەکە پیشاندا یان حەزی زۆری لەو شتە کرد.

(إشْــتاقَ- هُ وإشــتاقَ- إلَیهِ): دڵی بۆ لای بە پەرۆش‌و پەرێشانبوو/ تاسەی زۆر کرد.

(اَلشَــوْق (مص) (ج) اَشواق): دڵبۆداکەوتن‌و حەزلێکردنێکی زۆری کەسێك یان شتێك یان بیرکردنێکی زۆری کەسێك.

(اَلشــائِق= العاشِــق): دڵـــدار (ج) الشُــوّق= العُشاق): دڵداران/ حەزلێکردووان.

(اَلشَيِّق= المُشــتاق): حەزلێکردوو، دڵ پڕ لە تاسە/ ئارەزوومەند/ تامەزرۆ.

("قَلْبُ شَــيِّقٌ"): دڵێکی پڕ لە تاســـە/ حەز/ ئارەزوو/ ئارەزوومەند.

٢-(شاقَ-القَربَةَ. شَوقاً وتَشْواقاً): کوندەکەی بە دیوارەکەدا هەڵپەسارد.

(اَلقُربَةَ المُشوقَة): کوندەی هەڵپەسێردراو.

(-الطُنُبُ الی الوَتَدِ): (گوشمکە/ گوریسەکە/ تەنافەکە)ی بە سنگەکەوە بەست‌و قایمکرد.

(اَلشِــیاق والشِــیْق): پەت‌و گوریس‌و تەناف کە بە شتێکەوە دەبەسترێت‌و بە شتێکیترەوە بەندو قایمدەکرێت وەك تەنافی رەشماڵ.

٣-(اَلرَجُــلُ- الأَشْــوَق (ج) شُــوْق): پیـــاوی (باڵابەرز/ درێژ).

(قَومٌ شُوق): خوێنشگەلێکی یان نەتەوەیەکی باڵابەرز.

شاك: (١-شاكَ- هُ. شَوْکاً): درکێکی پێداکرد.

(-لَحْیا البَعیر): دانی حوشترەکە درێژ بوو.

(-ثَدِيُ الجارِیَةِ): مەمکی کەنیزەکەکە بەرز بوو دەرهات/ مەمکیکرد.

(-تْهُ الشَوکَةُ): درکەکە بە لەشیدا چوو.

(-شاكَةً وشیکَةً): کەوتە ناو درکەوە.

(-الشَوكَ): کەوتە ناو درکەوە.

(-هُ بالشَوْكةِ): دايه بەر درك.

(- شيْك): درك بە بەدەنيدا چوو.

(شَوِّكَ- الشَــجَرُ): ١-درەختەكە دڕكاويبوو ٢-دڕكى دەردا.

(-الحائِــطَ): ديوارەكــەى دڕكاويكرد/ دڕكى خستە سەرى.

(-الفَرْخُ): زەرنەقووتەكــە گەنەى پەڕەكەى سەريدەرهێنا.

(-شارِبُ الغُلام): جێسـمێڵى مێردمندالەكە زبر بوو.

(-الرَأْسُ بَعدَ الحلقِ): سەرەكەى پاش تاشينى مووىدەركردەوە.

(أَشاكَ- هُ): دڕكى بەلەشيداكرد.

(أَشْوَكَ- المَكانُ): شوێنەكە (دڕكاويبوو/ دڕكى زۆر بوو).

(-تِ الشَــجَرَةُ): درەختەكــە دڕكاويبوو يان دڕكى زۆر بوو.

(مُشوكَة): دڕكاوى.

(الشَوْك (ج) أَشواك): درك/ چقل.

(شَوكَة) (ن): دڕكێك دڕكى درەختو گيا.

(شَــوكُ الجِمــال): وشــترخۆرگە/ گيايەكى دەشــتەكييە گەلا گەورەى دڕكاوييە گوڵەكەى پەمەييە ئــەم جــۆرە ڕووەكانە لــە هەموو ولاتێكدا هەنو بلاون.

(شَــوكُ الــدُرَّاج) (ن): تاڵيشــك ڕووەكێكــە گــەلاو ســەرەكەى دڕكاوييــە وەك ئاليك بە ئــاژەڵ دەدرێت پــاش كوتانــى خومگەرەكان ســەرەكەى بــۆ نەرمكردنــى كووتاڵى خورى بەكاريدەهێنن.

(ألشَــوكة): ١-دڕكێــك ٢-چــزووى دووپشــك ٣-(ز) چنگە ئامێرێكى كشــتەيە ٤-چنگاڵ كە بۆ پێخواردن بەكاردێت، فرتيكەشى پێدەڵێن (ايطالية): چنگاڵ.

(رِيحُ الشَــوكَةِ) (طب): موو كــە لە پەنجە گــەورە دێــتو زۆر بــە ئــازارە (دوحاس) (عامية) = (ريح الشوكة): دوحاس.

(شوكَةُ الحائِك): شانەى جۆلايى.

(الشائِك (ج) شاكة والشوك): دڕكاوى.

(أَرضٌ أَو شَــجَرَةٌ شــاكة): زەوييــەك يــان درەختێك دڕكى زۆربێت.

٢-(شــاكَ. شَــوْكاً): بڕشــتو توانــا دڕكو توندوتيژيى دەركەوت.

(شائِك وشَــوِكُ- السِلاحِ): مرۆڤى پڕچەكو چەك بە كارو كارامەيە.

("شاكُ الســلاح وشاكُ الســلاحِ وشاكيهِ"): چەكدارو چەكبەكار.

(ألشَــوكَة): ١-زاتو زەبــرو زەنــگ ٢-چەكو بڕشتو كارى ٣-پەرێشانكردنى دوژمن.

("لاتَشُــوكُكَ مِني شــوكَة"): لە منەوە هيچ ئازارێكت پێناگات.

(الأَشــوَك (م) شَــوكاء مِنَ الثِياب ونَحْوَها): بەرگو شتيترى زبر كە بە هۆى تازەبوونيەوە

دەبێت.

٢-(شِيْكَ- الجَسَـدُ): لەشەکە پەڵەی سووری پەیداکرد/ دەردا.

(مَشُـوك): جەسـتەیەکە کە پەڵەی سووری پەیداکردبێت‌و دەردابێت.

(اَلشَوْكَة): پەڵەی سووری لەش.

(اَلشَوْكَة المُبارَكة والشوكَة اليهودِيَّة والشَوكة البَيضاء): دەرمانن چارەی پێدەکەن.

٤-(اَلشَوكَران) (اُنظُر شَكَر)

٥-(الشُـوكُولاتا): چوکلێـت کـە لـە کاکاوو شەکر دەکرێت (إسبانية. مكسيكيَّةُ الأَصل): ئیسپانی‌و مەکسیکیە.

ملحق:

شوك: (اَلشَوكِيّ): ١-دڕکاوی/ دڕکن ٢-بە زەبرو زەنگ‌و بڕشت/ دڕکدار.

(اَلحَبْلُ الشَـوكي أَو النُخاع الشَّوكي): مۆخی مووڕەگەپشت کە بەشێکی گرنگی کۆئەندامی هەستە.

---

(اَلتـين الشَـوكي= الصُبّـار) (ن): هەنجیرە دڕکە.

شال: ١-(شالَ- الذَنَبُ وغيرُهُ. شَوْلاً. وشَوَلاناً) کلکەکەو شتیتر بەرزبووەوە.

(-الشيءَ وبِالشَّيءِ): شتەکەی هەڵبڕی.

(-الميزان): ترازووەکە تایەکی بەرزو یەکێکی نزمبوو/ لاسەنگبوو.

(-تِ القِربَـةُ أَو الزِقُّ): پەلـی کوندەکە یان جەوەندە پڕەکە ڕەپبووو بەرزبووەوە.

(شاوَلَ- الحجرَ): بەردەکەی بەرزکردەوە.

(أَشـالَ- الشَـيءَ): شـتەکەی هەڵـبڕی‌و هەڵیگرت.

(إِشْتالَ. إِشْتيالاً): بەرزبووەوە.

(إِنشالَ إِنْشِيالاً): بەرزبووەوە.

(إِسْتَشـالَ- تِ الناقَةُ ذَنَبَها): مێحوشـترەکە کلکی هەڵبڕی.

(اَلشَولَهُ): ١-جارێك بەرزبوونەوە یان هەڵبڕین ٢-بەرزکردنەوەی کلکی دووپشك.

(شُولَةٌ وشَوَّالَةٌ): دووپشك.

(اَلشال (ج) شِيلان وشالات) (فارسية): شاڵ کە بەسەر شـاندا دەدرێت/ دەسماڵ/ کۆڵوانە (بە تایبەتی بە وشەی (شالَة) دەوترێت).

(اَلناقَةُ الشـائِل (ج) شُـوَّال وشَـوَّال وشُيَّل وشِـيَّل): مێحوشـترێکی بـە فاڵ کـە کلکی هەڵدەبرێت‌و شیریشی هیچ نەبێت.

(اَلشـائِلَةُ (ج) شَوْل وأَشْـوال وشَوائِل): مێی وشەی (الشائِل).

(شَـوَّال (ج) شَـوَّالات و (جج) شَـواوِيل): شەشـەڵان دەهەمـین مانگـی عەرەبییە کە دەکەوێتـە نێـوان ڕەمـەزان‌و ڤیلقەعیدەیە (٢٩) ڕۆژە (بۆیە وا ناونراوە گوایا لەو مانگەدا حوشتر دێتە فاڵ‌و کلك هەڵدەبرێت).

(اَلمِشْـوال): بەردێکـە کـە بەرزدەکرێتەوەو هەڵدەگیرێت.

٢-(شالَ- ت نَعامَتُهُ شَوْلاً وشَوَلاناً): ١-هەڵچوو و توورەبوو پاشان هێوربووەوە ٢-مرد.

(-ت نَعامَـةُ القَوم): خانووەكانیان چۆڵكردو پـەرش‌و بڵاوبوونـەوە یـان ناتەبـا بوون‌و بایەخ‌و نگینیان نەما.

(شَوَّلَ- لبَنُ النَّاقَةِ تَشْویلاً): شیری حوشترەكە كزیكرد.

(-تِ النُـوقُ): مێحوشـترەكان شـیرەكەیان وشكیكرد.

(-الماءُ): ئاوەكە كەمیكرد.

(- المَزادَةُ): كوندەكە كەمەكێك ئاوی تێداما. كەمێك ئاوی لە كوندەكەدا هێشتەوە.

(اَلشَـوْل (مص) (ج) اَشْـوال): ١-سـووكەڵ ٢-پاشماوەی ئاوی دۆڵكەو سەتڵی چاڵاوو شتیتر.

(اَلشَـوِل): لـەش‌و دەستسـووك لـە كارو كارگوزاریدا.

(اَلشـائِلَةُ- مِـنَ الإِبل (ج) شَـوْل و اَشْـوال وشَـوائِل): حوشـترێك حـەوت مانگبێـت ئاوسبێت یان حەوت مانگبێت زابێت‌و گوانی سەركەوتبێتەوەو شیرەكەی وشكیكردبێت.

٣-(شـاوَلَ- هُ وبِهِ): كەوتە كێشـمەكێش لە گەڵیدا.

(شاوَلَ وتَشـاوَلَ- القَومُ بِالرِماحِ): یەكتریان دایە بەر نێزە.

(اِشْـتالَ- لَـهُ اِشْـتیالاً): بەگژیـدا چـوو/ بەرەنگاریبوو تێر جنێویكرد.

٤-(الشَّولَةُ- مِنَ النِساءِ): ئافرەتی گەوج.

(اَلشَوَّالَة): ئافرەتی زمانبەدو دووزمان.

(اَلشِـوال) (عند العامَّة) (فارسیة): جەواڵ توورەكەیەكـی گەورەی لە مـوو یان خوریی دروسـتكراو. ئەمـە وەرگێڕانـی وشـەی (الجوالق)ە (فارسیة).

(اَلمِشْوَل): داسولكە.

شـان: ١-(شـانَ- الرُؤُوسَ. شَـوناً): كاسەی سەرەكەیان هەڵگرت تا ئەو مۆریچانەی كە لە سەرەوەی مێشكدان دەربهێنن.

(تَشَوَّنَ): ئاوەزی سووكبوو.

(اَلشَونَة): ئافرەتی گەوج.

(اَلشُونَة) (ج) شَـوان): ١-عەماری دەغڵ یان هێزرە/ كەندوو بۆ دەغڵ ٢-كەشتیی جەنگی.

(اَلشَوَّان): عەماركاری دەغڵ.

٢-(اَلشُـونیز (ن) اُنظُر شنس): گیایەكە لە كۆمەڵەی نێرگز گوڵـی پەمەیی ئەرخەوانی دەگرێت.

شـاه: ١-(شـاهَ- الوَجْهُ شَـوْهاً وشَـوْهَةً): دەمووچاوەكە ناشیرینبوو تێكچوو.

(شَوِهَ- الوَجْهُ. یَشْـوَهُ. شَوَهاً): دەموچاوەكە ناشیرینبوو تێكچوو.

(شَوَّهَ- اللهُ وَجْهَهُ): خودا ڕووی ناشیرین بكات.

(تَشَوَّهَ): ناشیرینبوون‌و/ ڕوو تێكچوون.

(-لِفُلانٍ): ڕووی لە فیسـار وەرگێڕاو چارەی خۆی ناشیرینكرد.

(أَلشَــوَه) (مــص) (ضــد): ناشــيرينبوون/ ناشــيرينى رووتێكچــوون ٢ـجوانبــوون/ جوانيى.

(أَلشَوْهاء): ١ـئافرەتى گرژو مۆن ٢ـچارەگران و روو ناشيرين (ضد) روو جوان.

أَلْمُشَوَّه: ١ـسەرو سيماتێكچوو/ ناشيرين بەدفەسال ٢ـهەموو شتێكى ناتەواو بەديهاتوو كە ئەندامو پارچەكانى جياوازيان لەگەڵ يەكدا هەبێت، لەيەكنەچن و لەگەڵ يەك نەگونجێن.

٢-(شــاهَ- الرَجُلَ. شَوْهاً وشَوْهَةً): ١ـ(ئيرەيى حەسووديى( پێبرد). ٢ـبەچاويەوە كرد.

("شــاهت نَفْسُــهُ إلى كذا"): ئاواتى بەو شتە خواست.

(تَشَــوَّهَ- لِفُلان): چاوى پێــدا هەڵهێنا تا بە چاويەوە بكات.

("هوَ يَتَشَوَّهُ لَموالَ الناسِ ليُصيبَها بالعَين): ئەو چاودەبرێتە ماڵى خەڵك تا بە چاويانەوە بكات.

(أَلشــائِه (فــا) (ج) شُــوَّه): ئيرەييبــاز/ حەسوود/ لەچە ٢ـچاوپيس.

("رَجُلٌ شائِهُ البَصَرِ"): پياوێكى چاوپيس.

(رَجُــلٌ شــاهٌ وشــاهي البَصَــرِ): پياوێكــى چاوتيژە.

(أَلأشْوَه (م) شَوهاء (ج) شُوْهٌ): زۆر چاوپيس كە زوو خەڵك بە چاوەوە دەكات.

(أَلشَوهاء): ئافرەتى بەدووم/ شووم.

(فَرَسٌ شَوهاء): چارەوێيەكى چاوتيژ.

٣-(شاهَ- الرَجُلَ. شَوْهاً وشَوهَةً): پياوەكەى تۆقاند.

٤-(شَــوِهَ-تِ العُنقُ يَشــوَهُ شَــوَهاً) (ضد): ١ـ(گەردنەكە/ ملەكە) درێژ بوو ٢ـكورتبوو.

(أَلشَوَه): ١ـبەرزى ملو درێژيى ٢ـسەربڵندبوون.

(أَلأَشْــوَه (م) شَوهاء (ج) شُــوْهٌ): ١ـملبەرز/ گەردنبــەرز ٢ـبــە دەعيەو فيــز/ لووتبەرز ٣ـناشيرين ٤ـچاوپيس.

٥-(تَشَوَّهَ- الرَجُلُ شاةً): كابرا مەڕێكى گرت.

(أَلشــاة) (ح): مەڕێك/ بەزێك (بە نێرو مێى دەوترێت) (ج) (شــاءٌ وشِياهٌ وشِــواهٌ وأَشاوِه وشِــيْهٌ وشِيَّهٌ وشــويّ شُوَيَّة وشُــوَيْهَة (ج) شُوَيْهات): مەرۆكەيەك/ بەزۆكەيەك.

شاويّ: مەڕيى.

(أَلشاهي): خاوەنبەز.

(أَرضٌ مَشاهَة): خاكێكى پڕ (بەز/ مەڕ).

٢-(أَلشُوهَةُ): دووريى.

(أَلشاه): شا.

(شاهيّ وشاهانِيّ) (فارسية): شاهى.

(شــاهان شــاه- مَلِكُ الملوك): شــاى شاهان (فارسية).

(الشــاه بَلُّوط) (ن) = شــجرةُ الكســتنة): شابەروو/ كەستانە.

(شاه بَنْدَر) (فارسية): سەربازرگانەكان.

(اَلشّاهْتَرَج) (ن): شاتەرە. رووەكێكە ساڵانەیە بریتییە لە كۆمەڵە گیای بچووك گەڵا تیژەو گوڵ شێوە هێشووە لە باخچەو ڕێو بانەكاندا زۆرە گەڵاو تۆوەكەی بۆ چارەسەركردنی گەری و خوروو بەكاردێت.

شوی: ١-(شَوَى- اللَّحْمَ. شَيّاً): گۆشتەكەی برژاند.

(مَشوي): گۆشتی برژاو.

(-الماءَ): ئاوەكەی گەرمكرد.

(شَوَّى- القَومَ): گۆشتی برژاوی دەرخوارد خوێشكەل دا.

(اَشْوى- القَومَ): گۆشتی برژاوی دەرخوارد خوێشكەل دا.

(-السَّعَفُ): چڵە دارخورماكە زەردو وشكبوو.

("ماأعياهُ وما اَشواهُ"): ئای كە شەكەتو چرووساوە/ ئای كە لاوازە.

(اَشوى- الزَرعُ): گوڵی كشتەكەی هەڵووڵیو وابوو كە ببرژێنرێت.

(اِشْتَوى. اِشْتِواءً): برژا.

(-الرُجُلُ): گۆشتی برژاوی پەیداكرد یان كەبابی كڕی.

(اِنشَوى اِنشِواءً): برژا.

(اَلشِواء والشُواء): گۆشتی برژاوو شتی برژاو.

(اَلشِواء والشُواء والشِواءَة والشَواءَة والشَواة): پلە گۆشتێكی برژاو یان كەبابێكی برژاو.

(اَلشَوَّاء): گۆشتبرژێن، ئەو كەسەی گۆشت دەبرژێنێت.

(اَلشَويّ): گۆشتی برژاو.

(سَعْفَةٌ شاوِيَةٌ): لقێكی دارخورمای وشكبوو.

(اَلمِشواة (ج) مَشاوٍ): گۆشتبرژێن.

٢-(شَوَى الرَجُلَ): بەر شوێنێكی ناكوشندەی كەوت.

(اَشْوى الرَجُلَ): بەر شوێنێكی ناكوشندەی كەوت.

(-السَّهْمُ): نێزەكە ئامانجەكەی نەپێكا.

(اَلشَوَى): ١-شوێنی ناكوشندە/ ناكاریگەر ٢-هەردوو دەستو هەردوو قاچو پەلەكان ٣-كاری بێبایەخو لاواز.

(اَلشَوى والشَواة): كاسەو پێستی سەر.

٣-(اَشْوى- الرَجُلُ): كابرا شتی كۆنەو شڕكەو پڕكەیكڕی.

(اَلشَوى): شتی شڕكەو پڕكەو كۆنو بێبایەخ.

(اَلشُوايە والشَوايَة والشِوايە والشَويَّة- مِن المال (ج) شَوايا): شڕكەو پڕكەو كۆن/ بێبایەخ.

٤-(اَشوى- الرَجُلُ): شتێك لە خواردنی ئێوارەكەی هێشتەوە.

(اَلشُوايَة والشَوايَة والشِوايَة والشَويَّة (ج) شَوايا): پاشماوەی نەتەوەیەك یان سامانو داراییەك كە فەوتابن.

٥-(اَلشَوايا. واحدتها شاوِيَة) (عامية): دەشتایی پایانی چیا/ دامێنی شاخ.

ملحق:

شـــوي: (اَلشَـــوّاية): نامێری گۆشـــتبرژاندن/ گۆشتبرژێن.

---

شـــاء: ١-(شاءَ- هُ. شَـــيئاً ومَشـــيئَةً ومَشاءَةً ومَشـــائِيَّةً): ئەوەی ویســـت/ خوازیاری ئەوە بوو.

(شاءِ = مَشيء): خوازیار/ خواهیست.

(مَشـــيءُ- الله الشَّـــيءَ): خودا خوازیاری ئەو شتەیە/ ئەوەی داناوەکە ببێت.

("ماشـــاءَ الله") ماشـــەلَّا. خواستی خودایە بۆ سەرسامی دەوترێت.

(اَلشِيئَة): خواستن/ ویستن.

(اَلشيئَة والمَشيئَة): خواست.

("كُلُّ شـــيءٍ بِشـــيئَةِ الله"): هەموو شتێك بە خواستی خودایە.

٢-(شَـــيَّأَ- هُ علـــى الأمرِ): خواســـتی كردنی كارەكەی پێكرد/ ناچاری كردنی كارەكەیكرد.

(اَشاءَ- هُ إِشـــاءَةً): ناچاریكرد/ پەنای ئەوەی پێبرد.

٣-(شَيَّأَ- اللهُ وَجْهَهُ): چارەی/ ڕووی ناشیرین كرد.

(اَلمَشَيَّأ): بەدرەوشتو ناشیرینكردەوە.

٤-(تَشَيَّأَ. تَشَيُّؤاً): تووڕەییەكەی دامركایەوە/ هێمنبووەوە.

٥-(اَلشَيء (ج) اَشياء و (جج) اَشاوى واَشياوات واَشـــايا): شـــت. (ئەوەی دەشـــێت بزانرێتو هەواڵی بگەیەنرێتو ناوی بهێنرێت).

(شُيَيءُ وشِيَيءُ): شتۆكە/ شتی بچووك.

شـــاب: (شابَ. شَيْباً وشَـــيْبَةً ومَشيباً): قژی سەری سپیبوو.

(اَشْـــيَب وشـــائِب (م) شـــائِبَة): سەرســـپی/ قژسپی.

("شـــابَت رؤوسُ الآكام"): سەری گردەكان بە بەفر سپیبوون.

شَيَّبَت-الحُزنُ فُلاناً وبِفُلانٍ): پەژارەو خەفەت سەری فیساری سپیكرد.

(اَشـــابَ- الحُـــزنُ فُلاناً وبفُـــلانٍ): جەخارو خەفەت سەری فیساری سپیكرد.

(اَشـــابَ- الرَجُلُ): كوڕەكانی پیاوەكە سەریان سپیبوو.

(اَلأشيَب (ج) شيب وشُيُب): سەرتەواو سپی.

(-مِنَ الأيام): ڕۆژانێكی بەهەورو بەفر.

(اَلشِيب): كێوانی بە بەفر سپیبوو.

(الشـــائِب (فـــا) (م) شـــائِبَة (ج) شُـــيَّب): سەرسپی.

("شَيبٌ شائِبٌ"): سەرسپییەكی تەواو سپی.

(شَـــيْبان وشِـــيبان): مانگی بەفرانبار لەبەر سپیبوونی زەویو بەستەڵەكی زستان.

(يَومٌ شَيْبانُ): ڕۆژی بەفرو هەورو سەرما.

(اَلشَيبَةُ): ١-تاڵێك مووی سپی ٢-سەرسپیبوون/ پیربوون.

٢-(اَلشـــيب) (ح): بەچكـــە كەمتیـــار كە لە

نێرەی گورگبێت.

شاح: ١-(شاحَ- على حاجَتِهِ شَيحاً): بەتەنگ دەستکەوتنی پێداویستیەکەیەوە بوو، بۆی بە پارێز بوو/ وریا بوو.

(شَيَّحَ- هُ): وریایکردەوە.

(-خَصْمَهُ)بە بێزارییەوە روانییە نەیارەکەی.

(أشــاحَ- في أمرِهِ إشاحَةً):١-باش لە کارەکەی هەڵچوو بۆی دابڕا/ هەتەر بوو ٢-لە کارکەیدا بە پارێز بوو/ وریا بوو.

(-وَجْهَــهُ وبِوَجهِــهِ وعَنــهُ وَجْهَــهُ): بــە بێزلێکردنەوە رووی لێوەرگێڕا.

(ألشِــيحُ- مِــنَ الرجال): پیاوی بــە پارێزو ورپاو سڵکەرو بەهەتەر.

(ألشِــياح): ســڵکردن/ بەپارێــز بــوون/ وشیاربوون.

(ألشَيحان والشِــيحان والمُشِيح): کەسێکە بە تەنگەوەبێتو کار توند بگرێت.

٢-(شــاحَ- علــى حاجَتِــهِ. شَــيحاً):١-بــۆ پێداویســتیەکەی بــە پارێزو بە کۆششــبوو ٢-باش تێهەڵچوو.

(أشــاحَ- في أمْرِهِ. إشــاحَةً): لــە کارەکەیدا هەتەریکرد/ باش تێهەڵچوو کۆششیکرد.

(شــايَحَ. مُشــايَحَةً وشِــياحاً): جەنگیی/ شەڕیکرد.

(-في الأمــرِ): لە کارەکەدا باش تێهەڵچوو/ بۆ کارەکە لێبڕا.

(ألشيح- مِنَ الرجال): پیاوێکی لە کاردا باش تێهەڵچوو/ لێبڕاو هەتەر.

(ألشِياح) (مص): باش تێهەڵچوون/ لێبڕان.

٣-(أشــاحَ- المَكانُ. إشاحَةً): شوێنەکە ڕێحانە کێویلەی لێڕوا.

(ألشِيح): ڕێحانە کێویلە.

(شِــيْحَة) (ن): ڕێحانە کێویلەیەك/ گیایەکی بۆنخۆشــە، گەلێــك گیــای بۆنخــۆش هەیە، جۆرێکی هەیە لــە وڵاتە عەرەبیەکاندا ئاژەڵ دەیخوات.

٤-(أشاحَ- الفَرَسُ بِذَنَبِهِ إشاحَةً): چارەوێکە کلکی بەرداپەوە.

٥-(ألشِياح): گرانییو وشکە ساڵ.

(ألشَيحان والشِيحان والمُشيح): درێژ.

شاخ: ١-(شــاخَ. شَيخاً وشِــيُوخَةً وشُيُوخَةً وشُــيُوخِيَّةً وشَــيْخوخَة وشَــيخوخِيَّة): پیربوو.

(شَيَّخَ): پیربوو.

(-هُ): بانگیکــرد: پــیرە یان بــۆ گەورەکردن پێیوت مامەپیرە.

(تَشَيَّخَ): پیربوو.

(ألشَــيْخ (ج) شُيُوخ وشِيُوخ وأشياخ وشِيخَة وشَيخَة وشِيْخان ومَشْيَخَة ومَشيَخَة و (حجج) مَشايِخ وأشايِيخ (م) شَــيْخَة): هەر کەسێك تەمەن پێوەی دیاربوو و سەری سپیبوو.

(شُيَيْخ وشِيَيْخ): پیرۆکە.

(كَلِمَةُ الشَّـيْخ): لەلای خێڵە نیشتەنییەکانی کێـوەکان وەك کێـوی لوبنانو دەوروپشـتی نازنـاوی بـۆ دەسـتە پیاوماقوڵانێـك کە لە خوارووی میرو پێشـەواکانە هەروەها بە وانە دەڵێن کە مامۆسـتاو زاناو گـەورەی فامیلیاو وەسـتای پیشـەو بە وانەی کە لـە بەرچاوی نەتەوەو خەڵك بە هۆی زانسـتیو پیاوەتیو چاکـەو پایـەو پلـەو شـتی وەهـاوە بەرزن دەوترێت شێخ/ پیر/ سەردار.

(شـیخ المَـرأة): گـەورەو سـەرداری ژن کە مێردە.

(اَلشَیْخون= الشَیخ):

٢-(شَـيَّخَ- عَلَيهِ): گەورەیی خۆی بە سەردا سـەپاندو قسـەی ناشـیرینی پێووتو تەرزە شکێنیکرد.

(-بِهِ): کەموکوڕی دەرخستو ئابڕوویبرد.

٣-(شَـيَّخُ النـارِ): پـیری ئاگر واتا شـەیتان (ئیدیۆمە).

(اَلشَـیخِیَّة) (ن): گوڵـە شـێخانی ڕەگـەزە گوڵێکە لە وڵاتە فێنکەکاندا زۆرە لە شـوێنە چێنراوەکاندا یان لە قەراغ ڕێگاکاندا دەڕوێت هەندێـك جۆری بـۆ جوانیـیو ڕازاندنەوە دەڕوێنرێت.

شـاد: (شـادَ- البِناءَ. شَـیْداً): (خانوەکەی/ بیناکەی) هەستاند.

(شَیَّدَ- البِناءَ): خانوەکەی هەستاندو سازاند/ دروستیکرد.

(أشـادَ بِذِکـرِهِ): نـاوی بـە باشـیی هێناو ستایشیکرد/ ناوی بەرزکردەوە.

(-عَلَیهِ قَبیحاً وبِقَبیحٍ): شتی ناشیرینی دایە پاڵو ناوی پێزڕاند.

(-عَلَیـهِ): شـتی ناشـیرنی شوێنخسـت/ بەدناویکرد/ ڕسوایکرد.

(شَـیَّدَ- المُغَنِّيّ): گۆرانیبێژەکە گۆرانیچڕی/ دەنگی لێهەڵبڕی/ چریکاندی/ بۆ گۆرانیەکەی هەستا.

(-صَوتَـهُ وبِصَوتِـهِ): کەوتە شـیڕە شـیڕو شاتەشـاتیکرد/ قسـەی بەرزونـزمو نیمچە هەڕەشەیکرد.

(-الضالَّة): نیشـانەی ونبووەکەی دیاریکرد/ ونبووەکەی ناساند.

(-البُنیانَ): خانەکەی/ بیناکەی دروستکردو زۆر بەرز هەڵساند.

(اَلمَشید والمُشَیَّد): هەڵسێنراو.

٢-(شادَ وشَـیَّدَ- الحائِطَ شَیْداً): دیوارەکەی بە گەچ یان چیمەنتۆ سـواغدا، گەچکاریکرد یان لە بخیکرد.

(-جِلْـدَهُ بِالطیبِ): بۆنیخۆشـی لە لەشـی هەڵسوو.

(اَلشِـیْد): ئەوەی سـواغی دیواری پێدەدرێت وەك گەچو چیمەنتۆ.

(اَلمَشید) (مفع): سواغدراو/ تێهەڵسووراو.

٣-(شادَ- الرَجُلُ. شَيداً): فەوتا/ مرد.

(أَشاد- هُ إِشادَةً): فەوتاندی/ مراندی.

٤-(شـادَ- الإِبِـلَ. شِـياداً): حوشـترەکانی بانگکرد.

شیر: (الشیر) (عند العامة): تاوێرێکی زلەیە کـە خەریکە بەربێتەوە خوارێ پێشـیدەڵێن (مِسّاراً) (هەردوو وشەکە (سریانیة).

شَیَّز: (شُیَّزَ- البُرْدَ): هێڵی سووری بە پۆشاکە (بوردەکەدا) هێنا.

(أَلشِـیْز والشِـیْزَی): دارێکـە ڕەش‌و قایم‌و زۆر پتـەو یان داری ئەبەنووسـە کە لەگەڵی سەربازیی لێدروستدەکرێت.

("فُلان یَمْلأُ الشـیزی"): فیسـار لەگەڵەنە لە دار ئەبەنوسە دروسـتکراوەکە پڕدەکات، واتا دڵفراوانە (ئیدیۆمە)/ نانبدەیە.

شـاش: (أَشـاشَ-تِ النَخلَـةُ): دارخورماکە بەرەکەی بێناوك‌و سیس‌و پووچەڵبوو شیرین نەبوو.

(أَلشـیش): خورمای بێناوك کە وشکیش بوو سیس‌و پووچەڵ دەبێت‌و شیرین نابێت (عند العامة) شیشی گۆشتبرژاندن (ترکیة).

(وفَصیحها= السفود) (الشیشة= النارجیله) (فارسیة): نێرگەلە.

شاص: (شَیَّصَ- القَومَ): تاڵاوی بە خوێنگەل نۆشی/ و ئازارو سزایدان.

(أَلشیاص) ڕەوشت شرودڕ/ شەڕانی.

(أَلْمُشایَصَة): ڕق لەیەکبوون‌و ناتەبابوون.

٢-(شَـیَّصَ-تِ النَخْلَةُ): دارخورماکە گەنبوو بەرەکەی پووچەڵ‌و خراپبوو.

(أَلشِیص): خورمای خراپ.

(أَلشـیْصاء): خورمایەکـە نـاوك نـەکات خراپبێت.

(شـیصاءَة): خورمایەکی خراپـی بێناوك‌و گەن.

٣-(أَلشـیُّص الواحدة شَـیْصَة) (ح): جۆرە ماسییەکە.

شاط: ١-(شـاطَ- الشـيءُ شَـيْطاً وشیاطَةً وشَیْطوطَةً): شتەکە سووتا.

(-تِ القِدرُ): شـتی نـاو مەنجەڵەکە بەبنی مەنجەڵەکـەوە نووسـاو سـووتا مەنجەڵەکە بنکریگرت.

(-الزَیتُ):شلەڕۆنەکە خەستبووەوەو خەریکبوو بسووتێت.

(شَـیَّطَ وأَشـاطَ- الصَقیعُ النَبتَ أَو الدواءُ الجِـرحَ): زوقـەو سـەرماکە ڕووەکەکـەی برد/ سـووتاند یـان دەرمانەکـە برینەکەی هەڵقرچاندو سووتاند.

(-الـرأسَ أَو الکُراعَ): کەللەکە یان پاچەکەی دایــە بەرئاگـر تاتووکەکـە هەڵپروکێنێت‌و بسوتێنێت.

(-القِـدرَ): مەنجەڵەکـەی هێنایــە (کـوڵ/ جۆش).

(تَشَيَّطَ): سووتا.
(إشـــتاطَ- عَلَيهِ. إشتياطاً): گڕی فینەو ڕقی لێگرت.
(إسْتَشاطَ- عَلَيه): ئاگری ڕقی لێگرت.
(-في الحَربِ): لە جەنگدا جۆشیسەند.
(الشِياط): بۆسۆ.
(الشَويط) (عامية): بۆسۆ.
(التَشـــييط والمُشَـــيِّط): گۆشـــتی بـــرژاو بۆ خوێشگەل.
٢-(شـــاطَ- تِ النَبيحَةُ. شَـــيْطاً وشياطَةً و شَـــيْطُوطَةً): گۆشتی مەڕە ســـەربڕراوەکەلە نێوان خۆیاندا بەشبوو.
(-فُلانٌ): مرد/ فەوتا.
(-دَمُهُ): خوێنەکەی بە فیڕۆ ڕۆیشت.
(-فُـــلانٌ الدِمـــاءَ): خوێنەکانـــی تێکەڵکـــرد هەروەکو خوێنی کوژراوو بکوژی بەسەریەکدا کردبێت.
(أشـــاطَ- اللَّحْمَ علـــى القَومِ): گۆشـــتەکەی بەسەر خوێشگەلدا دابەشکرد.
(-فُلاناً): مراندی/ فەوتاندی.
(-دَمَ الجَزورِ): خوێنی ئاژەڵە سەربڕراوەکەی بەردا.
(-السُـــلطانُ دَمَهُ وبِدَمِهِ): ســـوڵتان فیســـاری تووشی کوشتنکردو ڕشتنی خوێنی حەڵاڵ کرد.
٣-(شـــاطَ- فِي الأَمـــرِ. شَـــيْطاً وشـــياطَةً وشَيْطوطَةً): لە کارەکەدا پەلەیکرد.
(إسْتَشـــاطَ – الحَمامُ): کۆترەکـــە چابوکانە فڕی.
(-مِنَ الأَمرِ): کارەکەی ســـووك بە دەســـتەوە هات/ گورجبوو.
٤-(الشَيْطِيّ): تۆزی هەستا بە ئاسمانەوە.
(المُسْتَشيط): ١-حیلکە حیلکەرێکی زۆر/ زۆر پێکەن ٢-حوشتری قەڵەو.
٥-(شَيطَن وشَيْطان) شەیتانییکرد/ زۆرزانییکرد.
شـــاعَ: ١-(شاعَ- بِالخَبَرِ شَـــيْعاً): هەواڵەکەی پەخشکرد/ بڵاوکردەوە/ جاردا.
(_-الخَبَرُ. شَيعاً وشُـــيُوعاً ومَشاعاً وشَيَعاناً وشَـــيْعُوعَةً): هەواڵەکە بڵاوبووەوەو بوو بە قاو/ ئاشکرابوو.
(-فيه الشيبُ): سەری سپیبوو.
(أشاعَ- الخَبَرَ وبِالخَبَرِ):هەواڵ ودەنگوباسەکەی (بڵاوکردەوە/ ڕاگەیاند/ ئاشکرایکرد).
(تَشَيَّعَ- هُ الشَيبُ): پیری سەری بە تەواویی سپیکرد.
(-اللَّبَـــنُ فِي المـــاءِ): شـــیرەکە لـــە ئاوەکـــەدا پەخشانبوو/ بڵاوبووەوە.
(تَشايَعَ- تِ الإبِلُ): حوشترەکان لێکجیابوونەوەو بڵاوبوونـــەوە (الشـــائِع) (فـــا) (ن): بـــڵاو/ پەخش.
(حديثٌ شـــائِع): ئاخاوتنێکی لەناو خەڵکدا بڵاو/ قاو.
(شاعَ= ذائِع): بڵاو.

(اَلشَّـــاعَةُ): هەواڵە (بڵاوەكان/ ڤاوەكان). ئەم وشەیە كۆی (شائِع)ە.

(اَلمَشاع والمُشَاع): ڤاو/ بڵاو.

(رجُلٌ مِشـــياع): پیاوێكی زۆر بڵێ كە دەمی نەوەســـتێتو هەمـــوو شـــتێك بڵاوبكاتەوەو ئاشكرابكاتو بڵێت.

٢-(شـــاعَ- هُ. شیاعاً): شـــوێنیكەوتو بوو بە هاوڕێی.

("شاعَكُمُ السلامُ وشاعَكُمُ اللهُ بِالسلام"): بە خۆشی بڕۆنو خودا ئاگادارتانبێت/ خوداتان لەگەڵ.

(شَیَّعَ- هُ): بەرێیكرد یان گەیاندیە هەوار.

(-الشيءَ): شتەكەیناردو دوایكەوت.

(-الرَجُلُ): بانگی شیعەییدا.

(شـــایَعَ-هُ): شـــوێنی ئەو كـــەوتو كردی بە سەرپەرشتیاری كاروباری.

(-بِهِم الدَليلُ): ڕانوماكارەكە بانگیكردن.

(-بالإبِـــلِ): دەنگـــی لـــە حوشـــترەكانكردو گازیكردن.

(أشـــاعَ-بالإبِلِ): دەنگی لە حوشترەكان كردو یخەی لە دواكەوتووەكانكرد.

("أشاعَكُمُ اللهُ الســـلامَ وبِالسَلام"): خوداتان لەگەڵبێت.

(تَشَيَّعَ): بانگەوازی شـــیعەیی خۆیكرد/ بوو بە شیعە.

(تَشایَعَ- القَومُ): خوێشكەل بەرەبەرە بوون.

(تَشـــایَعوا- علـــى الامـــر): لەســـەر كارەكە (ڕێككەوتن/ پێكهاتن).

(-فِي دارٍ): لە خانوویەكدا هاوبەشییانكرد.

(إشْتاعا فِي دارٍ. إشْتیاعاً): لە خانوویەكدا ئەو دوانە هاوبەشییانكرد.

(اَلشِـــیاع): شمشـــاڵی شـــوان یان دەنگی شوان (چونكە ئاژەڵەكان بەوە كۆدەكاتەوە).

(اَلشـــیعَة: الواحد "شیعي"): شیعە (بەیەكو دوو و كۆو نێرومـــێ دەوترێت) ئەمە هەموو ئەوە كەسانە دەگرێتەوە كە سەر بە حەزرەتی عەلیو خانەوادەكەین و ئەمە بووە بە ناوێكی تایبەتی بۆیـــان پێشـــیاندەڵێن (مُتَوالي (ج) مُتَوالِیَة).

(شـــیعَةُ الرَجُـــلِ (ج) شِـــیَع وأَشـــیاع): شوێنكەوتووی پیاوەكەو ئەوانەی سەر بەونو پشتگیریدەكەن.

(سَـــهُمٌ شـــائِعٌ وشـــاعٌ): بەشـــی تێكەڵـــی بەشنەكراو.

(الشـــاعَة): ژنی پیاو (چونكە شوێنكەوتووی پیاوە).

(اَلشـــیِّع (ج) شُیَعاء (م) شَـــیِّعَة): هاوبەش/ بەشدار.

("هذا شَـــیِّعٌ لِهذا"): ئەم هاوبەشە لە كارێكی هاوبەشیی نێوانیاندا.

("الـــدارُ شَـــیِّعَةٌ بَینَهُمـــا"): خانووەكـــە هی هەردووكیانەو تیایدا هاوبەشن.

(أَلشُـيوعي): كۆمۆنيسـت/ شـيوعى كەسـێكە ڕێڕەوى بيروبڕواى كۆمۆنيسـتيى هەڵبژاردبێت‌و پەيرەوى بكات.

(أَلشُـيوعِيَّة): كۆمۆنيسـتيى (ڕێڕەوى بيرى كۆمەڵايەتيى كارل ماركس).

(أَلمَشاع والمُشَاع): گشتەبەش كە بەشنەكرێت.

(مَشـاعُ القُرى): دێى گشتەبەشى ناوابيەكە بە زەويى‌و ئـاوو دارسـتانەوە بێجياوازى بۆ هەمووانە.

(أَلمُتَشايع والمُشتاع): هاوبەش.

٣-(شاعَ- الإناءَ. شَيْعاً): قاپەكەى پڕكرد.

(أَلشيع): ١-قاپى پڕ ٢-قينلەدڵيكى بەدزمان.

٤-(شَـيَّعَ- الرَجُـلَ): هانيداو پشـتيگرت‌و بەهێزيكرد.

(-النارَ): دارى بە ئاگرەكەوە ناو خۆشيكرد.

(-الشـيءَ بِالنارِ): شـتەكەى دايە بەر ئاگرو سووتاندى.

(تَشَيَّعَ- هُ الغَضَبُ): ئاگرى/ تووڕەيى‌و قينى تێبەربوو.

(-فُلانٌ فِي الشيءِ): هەموو حەزى خستە سەر ئەو شتە.

(أَلشِـياع): چاوگـى ئاگـر/ ئـەوەى ئاگرى پێدەكرێتەوە.

(أَلشَيوع): ئەوەى ئاگرى پێدەكرێتەوە.

(أَلمِشياع): كوڵەوژى تەنوور.

(أَلمُشَـيَّع) (مفـع): ١-دلاوەر/ ئـازا ٢-بزێـو/ ئەسرەوت.

٥-(شَـيَّعَ- شَـهْرَ رَمَضـان): شەشـڕۆژى شەشەڵانيشى پاش ڕەمەزان گرت.

(أَلشَـيْع (ج) أَشْـياع): بڕ/ چەنـد/ هێندە/ ئەندازە.

("أَقمتُ عِندَهُ شَـهراً أَو شَـيْعَ شَهرٍ): لەلاى مانگێك يان نزيكەى مانگێك مامەوە.

("كان مَعَهُ مائَةُ رَجُل أَو شَـيْعُ ذلك"): سەد پياوى لەگەڵدا بوو يان نزيكەى هێندە ٢-وەكو هێندەى.

("كما فَعَلَ بأَشْـياعِهِم"): بە وانەيشيكرد كە وەكو ئەوانبوون.

("هذا شَيْعُ ذاك"): ئەمە وەكو ئەوەيە.

("نَزلوا موضِعَ كذا أَو شَـيْعَهُ): لەو شـوێنە باريانخست يان نزيك ئەوێ.

("آتِـكَ غداً أَو شَـيْعَهُ"): بەيانـى يان دواى بەيانى سەرت لێدەدەم.

٦-(أَلمِشْـيَعَة): سـەبەتەيەكە ژن لۆكەو شتى وەهاى تێدەخات.

ملحق:

شيع: (الشَّائِعَة): ئەواتـير/ واتەوات/ هەواڵ‌و دەنگى بڵاو كە ساغنەبووبێتەوە/ قاو.

("راجَـت شـائِعات"): قـاو وا بـڵاوە/ وا داكەوتووە/ دەنگ وا بڵاوە.

(أَلشَّائِعَة): هەواڵێك كە بە درۆ دەرچووبێت.

("كان ذلك شـائِعَة"): ئـەوە هەواڵێكى درۆ

بوو، قاوێکی درۆ بوو.

(الإشاعة= الشائِعَة): قاو.

شاق: (شـاقَ- هُ إلَيهِ شـيقاً): بۆی (ڕاکێشا/ درێژکرد) و بەستیەوە.

("شـاقَ الطُنُبُ إلى الوتَـدِ"): تەنافەکەی بۆ سنگەکە درێژکردو پێوەیبەست.

(اَلشـيْق): ١-بۆیەی شـاخ. وتراوە سەختترین شوێنی شاخ ٢-ڕێی تەسـکی تەنگەبەری شاخ ٣-کەناری شاخ ٤-تووکی کلکی جوارپێ.

(اَلشِيَق) (ح): جۆرە ماسییەکە لە ماسیی نقە دەچێت.

(اَلشيقة): یەکێك لەو ماسییە.

شال: (شـالَ- الشـيءَ شَيلاً): شـتەکەی لە شوێنەکەی هەڵبڕی دەرهێناو بەرزیکردەوە.

(-دودَ القَزِّ): کرمی ئاوریشمی بەخێوکرد.

(اَلشَـيْلَةُ): قورس/ بەردێکی (قورس/ گران) یان پارچە ئاسـنێك و شتیوەها کە پیاو هێزی خـۆی پـێ تاقیبکاتـەوەو لـە زەوی بیڕێت/ بەرزیکاتەوە.

(اَلشَيَّال): کۆڵهەڵگر.

(اَلشِيالَة): کۆڵهەڵگریی.

(اَلشَيَّالَة): دەستگرە، پەڕۆیەکە مەنجەڵی پێ لەسەر ئاگر لادەبرێ (عامية).

شام: ١-(شامَ. شَيْماً): لەشی خاڵی دەرکرد.

(أشْيَم (م) شَيْماء (ج) شِيم وشُوْم): مرۆڤـی خاڵاوی.

(اَلشـامَة (ج) شـامٌ وشـامات): ١-خـاڵ/ نیشانەیەکی گۆشتینی ڕەشەو تووکی بەدەوردا بێت.

("صاروا شـاماً في البـلادَ): وەك خاڵی لەش بە وڵاتدا بڵاووبوونەوە ٢-نیشـانە جیاوێکی ڕەش لـە زەویدا ٣-خاڵتاریکی سـەر مانگ کە پەڵەی سەر مانگە ٤-(ح) مێحوشتری ڕەش.

(اَلمَشـيْم والمَشْـوُم والمَشْـيُوم= الأشْـيَم): خاڵاویی.

٢-(شامَ- السَيفَ شَيْماً) (ضد): ١-شمشێرەکەی بە کێلاندا کردەوە ٢-شمشـێرەکەی لە کێلان هەڵکێشا.

(-الرَجُلُ. شَـيْماً وشُـيُوماً): لـە پەلاماری جەنگەکەدا سەرکەوت.

(-في الشَيءِ): چووە شتەکەوە.

(-الشَيءَ في الشيءِ): شتەکەی لە شتەکەیتردا شاردەوە.

(شَيَّمَ يَدَيهِ في راسِ فُلان أو ثَوبِهِ): لەشەڕدا چنگی لە قژی فیسار گیرکرد یان لە جلەکەی گیرکرد

(-في الشـيءِ أوِ الأمرِ): چـووە کارەکەوە یان شتەکەوە.

(أشامَ وانْشـامَ واشْتامَ في الشـيءِ أوِ الأمرِ): چووە ئەو شتەوە یان ئەو کارەوە.

(تَشـيَّمَ- الشـيءُ في الشَـيءِ): شـتەکە بـە شتەکەیتردا چوو.

(-الشَّـيبُ فُلاناً): مووی سـپی کەوتە سەری فیسارەوە.
(اَلَمشـيمَة (ج) مَشيم ومَشايم): ئاوەڵمندال/ ئەو کیسە تەنکەیە کە لەگەڵ کۆرپەکەدا دێتە دەرێ/ وێڵداش.
٣-(شـامَ- البَرقَ. شَـيْماً): تەماشای هەورە برووسـکەکەیکرد بۆ کـوێ دەچێت و لە کوێ دەبارێت.
("شامَ مَخايلَ الشيءِ"): سەرنجیدایە تارمایی شتەکەو چاوەرێیکرد.
(إنْشـامَ- الرَجُـلُ): کابـرا چـاوی تێـبڕرا/ لەبەرچاو بوو.
٤-(شامَ- الشيءَ. شَيْماً وشُـيُوماً): شتەکەی خەملاندو هەڵیسەنگاند.
٥-(تَشَـيَّمَ- أَباهُ): سروشت و ڕەوشت و خووی لە باوکی چوو.
(اَلشيمَة والشِئْمَة (ج) شِيَم): سروشت و خوو ڕەوشت ٢-نەریت.
٦-(اَلشَيَم): زەویەکی ڕەقەنی بووە کە هێشتا هەڵنەکەنرابێت.
(اَلشَـيام): ١-زەویی تەختان/ دەشت ٢-خاك/ خۆڵ/ گڵ.
(اَلشِيَام (ج) شِيَم): ١-خۆڵ/ گڵ/ خاك ٢-(ح) مشك.
شان: (شانَ- هُ. شَيْناً): لە کەداریکردو گاڵتەی پێکرد/ ڕسـوایکرد/ ئابڕوویبرد/ بێڕێزیکرد/ شکاندی.
شَـيْن: (ئەنگییو ئابڕووچوون/ شـوورەیی/ ناوزڕان).
(شَيِّنَ- الشينَ): پیتی شینی نووسی.
(اَلمشاين): ١-خەوش و لەکەکان ٢-ئەنگییەکان ڕسواییەکان/ دزێوییەکان.
(شاهَ- هُ شَيْهاً): بە چاوییەوە کرد.
(اَلشَـيُوه): مرۆڤـی چاوپیس کـە خەڵك بە چاوەو دەکات.
(هُوَ شَيوهٌ مِن أشْيَهِ الناسِ): ئەو چاوپیسێکە لە هەموان چاوپیستر.
(اَلشِـيَه): ١-نیشـانە ٢-ڕەنگێکـە جیـا لـە ڕەنگەکانیتر.
شـیی: (اَلشـاي) (ن): چا. پەڵـە دەوەنێکە هەمیشە سەوز بەرزییەکەی مەترەو نیو تا دوو مەتر دەبێت لە بنچینەدا لە خۆرهەڵاتی دور بووە لە نێوان چین و هندسـتان. بۆ گەڵاکەی دەروێنرێت کە مادەیەکی وشیارکەری ناوداری تێدایـە لە ئاودا دەکوڵێنرێـت و دەخورێتەوە ئەمڕۆ بووە بە خواردنەوەیەکی گێتیانە.